61
پرۆژەی تیشك



د. ئەکرەم زیا ئولعومەری

# سەردەمی خیلافەتی راشیدە



وەرگێڕانی
ئیحسان بورهانەدین

# سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە

## هەوڵێك بۆ ڕەخنەگرتن لە هەواڵی مێژوویی بە پێی بەرنامەی فەرموودەناسان

نووسینی: دکتۆر ئەکرەم زیائولعومەیری
وەرگێڕانی: ئیحسان بورهانەدین

ناوی کتێب: سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە

نووسینی:  د. ئەکرەم زیائوکوەمەیری

وەرگێڕانی:  ئیحسان بورهانەدین

ژمارەی سپاردن: ژمارە (٢٤١٦)ی  ساڵی (٢٠٠٩) ی پێدراوە

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٦١)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

# پێڕستی بابەتەکان

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی وەرگێڕ:

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە، دروودو سڵاوی فراوانیش لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرو یارو یاوەران‌و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوای.

نووسین دەربارەی مێژووی ئیسلامیی مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ‌و هەستیارە، چونکە بریتی یە لە دەستنیشانکردن‌و خستنەڕووی قۆناغێك لە قۆناغەکانی، بە هەموو ئەو ڕووداوانەی کە تیایدا ڕوویان داوە، ئاشکرایشە کە سەدەی یەکەمی کۆچی هەندێك ڕووداوی گەورەی لەخۆ گرتبوو، تەنانەت بە بیرو زەینی ئەوانەیشدا نەدەهات کە بەشداریان تیادا کرد، بژاردەی موسڵمانان تووشی هەندێك ڕووداوی سەخت بوون، بڕیاردان تیایدا لە ئەوپەڕی گرانی‌و ترسناکیدا بوو، چونکە هاوەڵان پێشتر ڕووداوگەلی لەو جۆرەیان پیا ڕەتنەبوو بوو، ئەگەرچی ڕواڵەتی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان‌و چەند ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هەبوو لەوبارەوە، بەڵام دیمەنەکە ئەوەندە ڕوون نەبوو لە پێش چاوی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت)، کە بتوانن بە شێوەیەك مەسەلەکان یەکلابکەنەوە، دووبەرەکی دروست نەبێت و شەڕ بەرپا نەبێت لە نێوانیاندا.

هیچ کاتێکیش ڕێگە نەدراوە بەو موسڵمانانەی دوای ئەوان دێن، کە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربارەی ئەو ڕووداوانە بخەنە ڕوو، یان قسانێك بکەن لەگەڵ پلەو پایەی هاوەڵاندا نەگونجێت، چونکە ئەوان - سەرەڕای هەموو شتێك - مەزن‌و سەرگەورەی ئێمەن، گەر بێت‌و ئێمە ئەوەندەی کێوەکان ئاڵتوون ببەخشین لە پێناو خوادا، یاخود بە بێ وچان خەریکی نوێژو ڕۆژوو بین، هەرگیز فریای ئەوان ناکەوین، ئەمەیش ڕاستی یەکە ڕواڵەتی ئایەتەکان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ شایەتی لەسەر دەدەن، ئینجا خوای گەورە دەستمانی پاراست لە بەشداریکردن لە ئەو ڕووداوانە، ئایا ئێمە خۆمان نەپارێزین لە قسەیەك کە شیاو نەبێت لەو بارەوە بوترێت‌و لەوانەشە زیانی بۆ ئیمانمان هەبێت؟.

بەڵام هەندێك لەو مێژوونووسانەی کە بە هەواو ئارەزووی خۆیان قسەیان کردووە، گومڕایان پاڵی پێوە ناون کە سەدان لاپەڕە ڕەش بکەنەوە بە درۆو نیازی خراپ بەرانبەر ئەو هاوەڵە ئازیزانە، بە بێ ئەوەی هیچ ڕێزێك دابنێن بۆ کەسانێك کە یەکەمین هەڵگرانی ئیسلام و پشتیوانانی پێغەمبەرەکەی بوون‌و وەحی خوایش بەسەر ئەواندا دابەزیوە.

لە ڕاستی دا نووسین لە بواری مێژوو بە گشتیی بابەتێکی گەلێك وردە، پێویستە نووسەری - لە پێناو ئەوەی قسەکانی وەرگیراو بێت - لە ئەهلی سوننەتو جەماعەت بێتو شایەتی بۆ درابێت بە سەر ڕاستیی و زانست فراوانی و ڕاستگۆی، لە پاش هەموو ئەوانەش بە دڵسۆزی ناسرابێت بۆ ئیسلامو موسڵمانان، ئەو کەسانەش بە درێژای مێژوو هەمیشە بوونیان هەبووە، با ژمارەشیان کەم بوو بێت.

ئالێرەشەوە دەمەوێ ئاماژە بکەم بۆ ئەم کتێبەی دکتۆر (أكرم ضياء العمري) کە وەرمگێڕاوە لە زمانی عەرەبی یەوە، کە تیایدا باس لە قۆناغێکی هەرە گرنگو ترسناك دەکات لە مێژووی ئیسلام، لە ڕاستیشدا نووسەر نموونەی مێژوونووسی موسڵمانی بیروباوەڕ ڕاستە، ئەم کتێبەشی - لەگەڵ چەندین کتێبی تردا - لەسەر ڕێڕەوی فەرموودەناسان نووسیوێتی، واتە هەڵساوە بە لێکۆڵینەوەی هەواڵەکان لە رووی شیتەڵکردنەوەی کەسایەتی مێژوونووسەکانو گێڕەرەوانی هەواڵەکان، بۆیە منیش لەسەر داواکاری پرۆژەی (تیشك) هەڵساوم بە وەرگێڕانی کتێبەکە، کە هیوادارم ببێتە مایەی بڵاوکردنەوەی واتایەکی راست دەربارەی ئەو قۆناغە مێژووی یەی ئیسلامو کەلێنیکیش لە کتێبخانەی کوردیی پڕ بکاتەوە، کە پێویستی زۆری هەیە بەم جۆرە کتێبانە، بەڵکو سەرەتاو هاندەرێکیش بێت بۆ کەسانی تر کە هەڵسن بە وەرگێڕانی ئەو کتێبانەی کە راستی یە مێژووی یەکان دەخەنە روو لە دیدی ئەهلی سوننەتو جەماعەتەوە.

چونکە - لە ڕاستی دا - مێژوو یەکێکە لەو بوارانەی دەستی شێواندنی پێگەیشتووە لە کۆنو نوێداو هەوڵی ڕاستکردنەوەی ڕووداوەکانو دووبارە نووسینەوەی مێژوو، هەڵمەتێکی گەورەی پێویستە، هاوکات لەگەڵ هەستکردن بە لێپرسراوێتی بەرانبەر خوای گەورەو موسڵمانانو ترسانیش لە مەحکوم کردنی خودی مێژوو بۆ ئەو کەسانەی هەڵوێستیان نەبووە لە ڕاستکردنەوەی واتاکاندا.

ئەوەشم لە یادناچێت - لە کۆتای ئەم چەند دێڕەدا - داوا بکەم لە خوێنەری ئەم بەرهەمە بپاڕێتەوە خوای گەورە پاداشتی چاکەی نووسەرو وەرگێڕی ئەم کتێبە بداتەوە، ئەوەش ئەوپەڕی هیواو داواکاریمە.

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً كثيرا.

وەرگێڕ

ئیحسان بورهان نورەددین

کەلار - ٢٠٠٨/١٢/٢٨

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەن نیعمەت و چاکە، درووود و سڵاوی بێپایانیش لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی.

سەردەمی خیلافەتی راشیدە درێژەپێدانێك بوو بۆ سەردەم و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ، کاتێك کە بەها ئیسلامیەکان کاریگەریان هەبوو لە سەر خەڵکیی لە چالاکی یە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری یەکاندا. هەروەها رەنگدانەوەی هەبوو لەسەر مەسەلەی حوکمڕانیی لە رووی پەیوەندی بە نەتەوە لە لایەکەوە، ئینجا بە هێزە دەرەکیەکان لە لایەکی ترەوە. هەروەها کاریگەریشی هەبوو لەسەر هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا و بەهاکانی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا لە رووی گوێڕایەڵی سنووردار بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی شەریعەت و پاراستنی یەکڕیزیی نەتەوەی ئیسلام و شوورا و هەڵسان بە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە و کۆششکردنی تاك و کۆمەڵ بۆ هەڵێنجانی حوکمی شەرعیی لە قورئان و سوننەت، سەبارەت بەو رووداوە تازە و جۆراو جۆرانە بە تایبەت لە دوای بڵاوبوونەوە لە دەڤەرەکانی (الهلال الخصيب) و وڵاتی ئێران و میصر، کە بەرکەوتنیان هەبوو لەگەڵ هەندێ شارستانی رابردوو و چەند سیستمێکی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی رەسەن. ئەگەر (إجتهاد) نەبوایە نەدەکرا حوکمە شەرعیەکان دابەزێنرێنە سەر رووداوەکان. ئەگەر کرانەوەی بیروهۆش و گیانی ئیلهام نەبوایە سەرکردەکانی فتوحاتی ئیسلامی توانای هەڵسوکەوتیان نەدەبوو لەگەڵ کۆمەڵگا تازەکان و بەخشینی مۆرکی ئیسلامی بە ئەوان، هاوکات لەگەڵ پاراستنی پێشکەوتن لە بواری شارستانێتیی و ساختماندا، لە مێژوودا ئەوە باوە کە نەتەوە بیابانشینەکان دەتوێنەوە لە نێو ژیارە بەهێزەکاندا، تەنانەت ئەگەر ئەو نەتەوانە هەڵسن بە راماڵینی ئەو ژیارانەش، بەڵام بە خێرای پەیوەندی یەکانیان هەڵدەوەشێتەوە و گیانی بەرگریان تیا دەتوێتەوە و بە مۆری ژیانی تازەیان مۆر دەکرێن. بەڵام ئەوەی کە روویدا لەگەڵ سەرکردە موسڵمانەکان و نەتەوەکانی تر سوود بە یەکگەیاندن و ئاڵوگۆڕێکی بەهێز بوو، ئیسلامیش بە بەها و رۆشنبیری کراوەی کاریگەریی فراوانی بوو لە روودانی ئەو ئاڵوگۆڕەدا، بیروباوەڕی ئیسلامی و ئەو بەها و رۆشنبیریەی لێوە هەڵقوڵاون وایانکرد کە موسڵمانان کەسایەتی و بەها و زمان و رەوشت و مۆرکی ژیانیان بپارێزن و کۆمەڵگا تازەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بگۆڕن و وا بکەن ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبیی کە بووە زمانی وێژەی گشتیی و فەرمانڕەوای و سیاسیی و ئیداریی بە تەواوی رەنگ بداتەوە لە

نێویاندا،بەشێوازێك کە پاش ماوەیەکی کەم زمانی عەرەبی زاڵ بووە بەسەر زمان و شێوەزمانە ناوخۆی یەکان.

موسڵمانان وا دەڕواننە سەردەمی خیلافەتی راشیدەکان وەکو نموونەیترین سەردەم پاش سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەو ساتەی کە سەرانی هاوەڵانی نزیك لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانڕەوایان لە دەست گرتبوو، لەوانەی کە شایەتی رابردووی باش و چاکە و مژدەی چوونە بەهەشتیان بۆ دراوە، بە پاڵپشتی کۆمەڵێك لەو هاوەڵانەی کە قورئان باسی لەسەر راستیی ئەوانە کردووە، هەر ئەوانیش بوون کە بژاردەی سەرکردایەتی بیر و سیاسەت و کارگێڕی و ئابووریی و فتوحاتیان پێکدەهێنا، ئەوانیش بوون کە هەڵسان بە گەیاندنی قورئان و سوننەت بە نەوەکانی دوای خۆیان، هەر بۆیە پێویست بوو لێکۆڵینەوە بکرێت بۆ ئەو هەواڵانەی لە ئەوانەوە پێمان گەیشتوون.

بێگومان شێوازی حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنو ئاڕاستەکردن کە ئەوان هەڵسان بە رەچاوکردنی، لایەنی سیستەمی ئیسلامی روونکردەوەو بوو بە نموونەیەك بۆ تێڕوانینی موسڵمانان لە هەموو نەوەکانی دوای خۆیانو بارودۆخی سەردەمەکانی خۆیانی پێدەپێون، هەروەها وەسفی دەکەن بۆ دەرخستنی لادانو ستەمو داڕووخانی بەها رەوشتیو کۆمەڵایەتیو سیاسی یەکانو بانگەشەی گەڕانەوە دەکەن بۆ ئەو نموونەی جێبەجێ بوو لە سەردەمی خیلافەتی راشیدەدا.

حوکمڕانیی لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوێتەی پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام بەو شێوازە نەما لە سەردەمی خەلیفە راشیدەکاندا، چونکە وەرگرتنی ئەوان بۆ دەسەڵات بە فەرمانێکی خوای، یان راسپاردەیەکی پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بەڵکو خودی موسڵمانان هەڵسان بە هەڵبژاردنی ئەوانو پەیمان پێدانیان، تەنانەت ئەبو بەکر کە هەڵسا بە پاڵاوتنی عومەری کوڕی خەتتاب ((رەزای خوایان لێ بێت)) بۆ جێنشینیی پاش راپرسی بە سەرانی هاوەڵان، جێنشینی بۆ عومەر دانەمەزرا ئەگەر بەیعەتی موسڵمانان نەبوایە لە شاری مەدینە، دواتریش بەیعەتی لە فەرمانڕەواکان بۆ وەرگیرا لەسەرتاسەری دەوڵەتی ئیسلامی.

چوار خەلیفەکان بە تەواوی پەیڕەویان کرد لە رێنمای یە ئیسلامی یەکانو گرنگیان دایە مەسەلەی شوورا لەسەر ئاستی تاكو کۆمەڵ، بەڵام ئەنجومەنێکی هەمیشەیان بۆ دانەمەزران، بەڵکو زیاتر پەیوەست بوو بە هاوەڵە ناودارەکانی خاوەن پێشەنگو شارەزای، کۆمەڵانی خەڵکیش دانیان بەو پلەو پایە دەنا بۆ ئەو هاوەڵانە، بەڵام بەیعەت وەرگرتن بۆ خەلیفە کورت نەکرابووە سەر ئەواندا،

بەڵكو زۆری خەڵك بەشداریان دەكرد لە بەیعەتدانی گشتی لە مزگەوتدا پاش بەیعەتی تایبەت كە گەورە هاوەڵەكان دەیاندایە خەلیفە.

یەكێ لە گرنگترین ئەو دیاردانەی سەریانهەڵدا لە سەردەمی خیلافەت، بریتی بوو لە رێكخستنی كارگێڕییو سوپاو بەخشینو رێكخستنی ناوچە ئازادكراوەكان، بە تایبەت لەسەردەمی عومەر (رەزای خوای لێبێت).

سەبارەت بە گرنگترین رووداوەكانی ئەو سەردەمە خۆیان دەبیننەوە لە سەركوتكردنی بزووتنەوەی دابڕانخوازەكانو گێڕانەوەی یەكڕیزیی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەكری صددیق (رەزای خوای لێبێت)، كە دواتر رێخۆشكەر بوو بۆ رووداوی گەورەی دووەم كە بریتی بوو لە بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی كە ئەو سەردەمەی سەرقاڵ كردو ئیمتیازی بڵاوبوونەوەی خێرای هەبوو لە دەڤەرەكانی (الهلال الخصیب)و ئێران و میصر، كە سەركردە واڵاكەرەكان تیایدا سەركەوتنە سەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتەو ساسانی یەكان، كە بە دوو هێزی هەرە گەورەی ئەو سەردەمە دێنە ئەژمار، زاڵبوونی شارستانیی كە خۆی لە شكۆمەندیی ئیسلامو زمانی عەرەبیدا دەبینی یەوە، گرنگ تر بوو لەو سەركەوتنە سەربازیانەی خێرا بەدەست دەهێنرا، چونكە رێگای واڵا كرد بۆ ئیسلامو زمانی عەرەبی تەشەنە بكات لە ناوچە ئازادكراوەكان تاوەكو ئەمڕۆ، بە پێچەوانەی ئەو فتوحاتەی ئەنجامدرا بە سەركردایەتی هانیباڵو ئەسكەندەرو هۆلاكۆ لە رابردوودا، لە سەردەمی ئەمڕۆشدا بەریتانیاو ئیسپانیاو پورتوگالو هۆڵەندا شوێنپی ئەوانیان هەڵگرت، چونكە سەرەڕای سەركەوتنی سەربازیی ئەو هێزانە، بەڵام ئەوان هەرگیز نەیانتوانی ناوچە كراوەكان بتوێننەوە لە شارستانیی خۆیاندا، ئەگەرچی توانیان شوینەواری جیاجیا لە گرنگیدا بەجێ بهێڵن.

شوێنەواری كاریگەری فتوحاتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی دانیشتوان بەرەو ئیسلام لە رووی بیروباوەڕو شەریعەتو رەوشتەوە، فەرمانو ئامۆژگاری یەكانی ئیسلام پەلهاوێشتنە نێو هەموو لایەنە جیاجیاكانی ژیان، كاریگەریشیان هەیە لەسەر سروشتی رۆشنبیریی و كۆمەڵایەتییو ئابووریی، بەهاكانی لێبوردن و دادگەریی و یەكسانیش شوێنەواری گەورەیان هەبوو لە راكێشانی دانیشتوانی ناوچە ئازادكراوەكانو یەكخستنیان لەگەڵ سەركردەكان.

رووداوی ناوخۆیی گرنگیش بریتیی بوو لە رووداوو ئاژاوەی كوژرانی خەلیفەی سێ یەم عوسمانی كوڕی عەففان (رەزای خوای لێبێت). كە دەرەنجامەكانی زاڵبوویە سەر رووداوەكانی سەردەمی

خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێبێت)، کە ڕووبەڕووی نەیارانی جۆراوجۆر بوویەوە لە جەنگەکانی جەمەلو نەهرەوان و صەففین، هەروەها شەهیدیش بوو بەرلەوەی دەوڵەتی ئیسلامی سەقامگیربێت لەسەر شێوازێك.

بێگومان ئەزموونی سیاسی کە هێشتا چل ساڵی بەسەردا تیپەڕ بووبوو خۆڕاگریی نوان لە ڕووی ئەو گەردەلوولە نالەبارەو بە ئەزموونێکی قورسو شارەزای یەکەوە لی دەرچوو، هاوکات دەبیڕوانی یە تەبایو بەردەوامییو هاریکاریی لەگەڵ گەشەکردنی نوێ لە دەوڵەتی ئومەوی.

لەم کتێبەدا پابەندم بە ڕەچاوکردنی ڕێڕەوی فەرمووودەناسان لە ڕەخنەگرتن لە ڕیوایەتی مێژووی ئەگەر پەیوەندیی هەبێت بە بواری عەقیدەتو شەریعەت، بەڵام ئەو هەواڵانەی کە باس لە فتوحات دەکاتو مەسەلەی دانانی فەرمانڕەواو دادوەرو فەرمانبەر بە پێویستم نەزانی هەمان ڕێڕەوی ڕەخنەی بەکاربهێنم، هەروەها دوور بن لە جیاوازیی و ناتەبایو بوونی نیازی پاك لەلای ئەو کەسانەی ڕیوایەتەکانیان گەیاندووە، نەوەکو بەشێوەیەك دەستکاریی هەواڵەکان بکەن خزمەتی ڕەوتی بیروبۆچوونو سیاسیی خۆیان بکات، بەم شێوازەش پێشینانی ئەم ئومەتە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم جۆرە هەواڵانە کردووە، ئەگەر بێت ئەو مەرجانەی بە مەرجیان زانیوە بۆ وەرگرتنی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە هەمان شێوە جێبەجی بکردایە بە سەر باسە مێژووی یەکان، بەشێکی یەکجار کەم دەمایەوە، هەر بۆیە مێژوو دەمێنێتەوە وەکو زانستێکی سەربەخۆ کەرەستەی تایبەتو ڕێڕەوی ڕەخنەی جیاوازی خۆی هەیە.

خوای گەورەیش ئاگایە لە نیازو مەبەستمان، هەرئەویش پشتیوانو پەروەردگارمانە.

نووسەر

دکتۆر ئەکرەم زیائولعومەیری

مەدینەی منەوەرە

١٧/ذی الحجة/١٤١٤ ك

## شیکردنەوەی سەرچاوەکان

### ١ـ کتێبەکانی مێژوو:

**موحەممەدی کوڕی ئیسحاق:**

کتێبی (المبدأ والمبعث والمغازي) چاکترین کتێبە دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ نووسیوێتی، لە کۆتای یەکەیشیدا چەند بابەتێکی نووسیوە دەربارەی سەقیفەو جێنشینی ئەبوبەکرو پاشگەزبوونەوەی هەندێ لە هەواڵەکانی سەردەمی خەلیفە راشیدەکان.

ئیبنوئیسحاق لە کتێبێکی تری بە ناونیشانی (تأريخ الخلفاء) هەندێ ریوایەتی دوورودرێژ لەمەڕ ئەو سەردەمەی باسکردووە، بەڵام ئەو کتێبە ون بووەو بە دەستمان نەگەیشتووە، چەند بڕگەیەك لەو کتێبە دەتوانین ببینین لە نێو کتێبی (تأريخ الطبري)و کتێبی تر.

**خەلیفەی کوڕی خەیات:**

مێژووی خەلیفەی کوڕی خەیات (٢٤٠ك) بە کۆنترین کتێبی مێژوو دێتە ئەژمار کە پێمان گەیشتووە کە بە شێوەی ساڵەکان نووسراوە، زۆربەی ئەو کتێبانەی بەو شێوە نووسراون پێش ئەو لە نێوچوونە، گرنگیی ئەم کتێبە لە وردیی زانیاری یەکانو پاڵاوتنی ریوایەتەکانو ئەوە دایە کە نووسەرەکەی سەر بە قوتابخانەی فەرموودەناسانەو گرنگیی دەدات بە باسکردنی سەنەد، ئەمەو گرنگی یەکی زۆری داوەتە خشتەی فەرمانڕەواو داوەرەکان، هەروەها گرنگیی داوەتە ئەو رووداوانەی لە ئاژاوەی سەردەمی عوسمان روویداوە، هەواڵەکانیشی کاریگەری هەبوو لەسەر دیدی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بۆ ئەو رووداوانەی بەهۆی ئەو متمانەی خەلیفە هەیەتی لە رووی قایمکردنی هەواڵەکانی مێژوو، هەروەها بە هۆی زۆر هێنانەوەی ریوایەتەکانی فەرموودەناسان، کە ئەمە وایکرد ببێتە سەرچاوەیەکی متمانەدار لەلای توێژەرەوانی مێژووی سەرەتای ئیسلام، کە ئەوکاتە ئارەزووەکان زۆر کاریگەریی هەبوو لە ئاڕاستەکردنی ریوایەتەکانو هەڵبژاردنیان.

**موحەممەدی کوڕی سەعد (٢٣٠ك)**[1]

کتێبی (الطبقات الكبرى)ی موحەممەدی کوڕی سەعد باسی ژیاننامەی ئەو کەسانە دەکات کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ یان گێراوەتەوە، لە هاوەڵانو شوێنکەوتووانیانو ئەوانەی پاش ئەوان

١) بڕوانە: اكرم العمري: مقدمة لتأريخ خليفة بن خياط٣.

هاتوون، تا دەگاتە چینی مامۆستاکانی خۆی، بەسەرهاتو پلەوپایەو وەسفی رەوشتو جلو بەرگو دابونەریتی ئەوانی بە تێروتەسەلی باسکردووە، هەندێ لەوانەش خەلیفەو فەرمانڕەواو سەرکردە بوون، بەم شێوەیەش زانیاری یەکی چاك پێشکەش دەکات دەربارەی مێژووی سیاسیو شارستانییو رۆشنبیریی، سەبارەت بە هاوەڵانو شوێنکەوتووەکانیان زیاتر درێژەی داوەتە باسکردنیان.

گرنگیی کتێبەکە لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئیبنو سەعد شانسدار بوو بە متمانە پێکردنی فەرمووەدەناسان، بەڵام رەخنەشیان لیگرتووە کە هەواڵی لە کەسانێکی وەکو هیشامی کوڕی کەلبیو موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدیی وەرگرتووە کە لاوازن، واقیدیی کتێبێکی لە (طبقات)دا نووسیوە ئیبنو سەعد نزیکەی چواریەکی کتێبەکەی خۆی لە ئەو وەرگرتووە.[١]

بەڵام بێ دادیە بۆ ئیبنو سەعد کە باوەڕ بکەین بە وتەی ئیبنونەدیم دەربارەی کە وتوویەتی کتێبەکانی خۆی لە نووسنیەکانی واقیدیی وەرگرتووە.[٢] چونکە ئەو لە چەندین سەرچاوەی تر سوودی وەرگرتووە، تەنانەت ژمارەی مامۆستاکانی لە (الطبقات الکبری) گەیشتووەتە شەست شێخ، زۆربەیان لە فەرموودەناسانن، ئەوەشی کە وەریگرتووە لە ئەبی نوعەیمی فەزلی کوڕی دوکەینو عەففانی کوڕی موسلیمو عوبەیدوڵڵای کوڕی موسای عەبسیو مەعنی کوڕی عیسای ئەشجەعی زیاترە لەوەی وەریگرتووە لە واقیدیی، ئەمە جگە لەوەی لە کەسانی تریشی وەرگرتووە.[٣]

ئیبنو سەعد (١٦٨) ریوایەتی گێڕاوەتەوە دەربارەی خیلافەتی صدیق (رەزای خوای لێبێت)، تەنها (٣٦) ریوایەتی لە رێگەی واقیدیە، واتە کەمتر لە چواریەکی، هەندێ زانیاریی درێژی باسکردووە زۆربەی تایبەتە بە خۆیەوە،[٤] زۆربەی پیاوانی ئیسنادەکانی، کەسانی ناسراونو ژیاننامەیان لە کتێبەکاندا هاتووە، بێجگە لە مامۆستاکانیو واقیدیی مامۆستای[٥] ئەوەش تێبینی دەکرێت کە

١) اکرم العمري: بحوث في تأريخ السنة المشرفة ٨٠.

٢) ابن الندیم: الفهرست.

٣) اکرم العمري: بحوث في تأريخ السنة المشرفة ٨٠.

٤) عبدالعزیز بن سلیمان المقبل: خلافة أبی بکر الصدیق ل١٧ (ماستەرنامەیەکە پێشکەش کراوە بە زانکۆی ئیسلامیی لە مەدینە بە دەزگای چاپکردن نووسراوتەوە).

٥) محمد بن عبدالله الغبان: فتنة مقتل عثمان بن عفان١: ١٦ (ماستەرنامەیەکە پێشکەش کراوە بە زانکۆی ئیسلامیی لە مەدینە بە دەزگای چاپکردن نووسراوەتەوە).

ئەو ڕووداوەکانی ئاژاوەی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە هیچ شێوەیەك ریوایەتی لە سەیفی کوڕی عومەر وەرنەگرتووە.[1]

**(البلاذري):**

ئەحمەدی کوڕی یەحیای کوڕی جابیر لە ساڵی ٢٧٩ك کۆچی دوای کردووە، لە خێزانێکدا لە شاری بەغدا هەڵکەوتووە کە هەندێ لە پیاوەکانی بە کاری نووسین ناسراون، ئەویش لە ئەوانەوە فێری ئەو کارە بوو، لە پێناو زانستدا گەشتی کردووە بە شارو شوێنەکاندا، ئەو یەکێك بوو لە وەرگێڕانی زمانی فارسیو کتێبی (عهد أردشیر، ونظمه شعراً)ی وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی.[2]

(البلاذري) یەکێکە لە دیارترین مێژوونووسانی موسڵمان لە دوای تەبەری لە ڕووی فراوانی زانیارییی کە لە کتێبەکانیدا هاتووە، ئەو بادە مێژووی یانەی کە گرتوونیەتی یەوە، بەڵام کتێبی (أنساب الاشراف) ریوایەتەکانی باشتر بژارکراوەو سەنەدەکانی پاراوترەو زیاتر دەگونجێ لەگەڵ ریوایەتی متمانە پێکراو راستگۆکانی مێژووی تەبەری.

کتێبی ئەنسابولئەشراف باس لە مێژووی ئیسلامی دەکات لە چوارچێوەی ڕەچەڵەکدا، سەرەتا لە خێزانو هۆزە قورەیشیەکان، دواتریش بە هۆزەکانی تر کۆتای پێدەهێنێت.[3]

بە خوێندنەوەیەك بۆ مامۆستاکانی ئەم مێژوونووسە دەبینین کە زۆربەیان پێش مردنی خۆی بە زیاتر لە بیست ساڵ کۆچی دوایان کردووە، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە کتێبەکەی زوو نووسیوە پێش نەخۆشکەوتنەکەی، بە بەراوردی ریوایەتەکانیشی لەگەڵ ریوایەتەکانی ئیبنوسەعدو خەلیفەی کوڕی خەیات، بۆ نموونە دەبینین کە ڕێکدەکەوێت لەگەڵ ریوایەتە (حسن)و (صحیح)ەکان کە لە کتێبەکانی فەرموودەو مێژوودا هاتوون، بۆیە کاتێك کە لە ریوایەتەکانیدا لاوازی یان ناتەبای ڕوو دەدات، ئەوە پەیوەستە بەو کەسانەی کە ریوایەتی لێوەرگرتوون نەوەك لە خودی خۆیەوە.[4]

ئەو ریوایەتەکانی لەمەڕ ڕووداوەکانی (الفتن) لە فەرموودەناسە متمانە پێکراوەکانەوە وەرگرتووە، لە مامۆستاکانی بوخارییو موسلیم لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا وەکو عەففانی کوڕی موسلیم و

---

١) هەمان سەرچاوە ١:١٦.

٢) شاكر مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون ١:٢٤٣، ومحمد صامل السلمي: منهج كتابة التأريخ الاسلامي ٣٨٨ـ ٣٨٩.

٣) احسان صدقي العمد: پێشەکییەکی بۆ بەشی تایبەت بە ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب لە کتێبی (انساب الاشراف)ی بیلازوری ل١٠ی چاپی کوەیت.

٤) عبدالحميد علي ناصر محمد: خلافة علي بن أبي طالب ل١٣.

ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی دەورەقییو عەلی کوڕی مەدینییو عەمری کوڕی موحەممەدی ناقید و ئەبوبەکری کوڕی شەیبەو ئەبو خەیسەمە[1]، هەروەها سوودی لە کتێبی مامۆستا بەغدادیەکانی وەرگرتووە وەکو قاسمی کوڕی سەلامو عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینیو موحەممەدی کوڕی سەعدو ئیبنولئەعرابیو عەلی کوڕی عەبدوڵڵای مەدینییو موسعەبی زوبەیریو موحەممەدی کوڕی حەبیبی بەغدادییو عومەری کوڕی شەبە[2].

کتێبێکی دیکەی پێشکەشی کتێبخانەی مێژوو کردووە کە پێمان گەیشتووە، ئەویش کتێبی (فتوح البلدان)ە تیایدا باسی بەسەرهاتی فەتحکردنی هەر وڵاتێك بە جودا دەکات، هەندێ زانیاریی گرنگیشی باسکردووە تایبەت بە ژیانی ئابووریی‌و کارگێڕیو رۆشنبیریی بە شێوەیەك کە نیاز نامێنێت بە لێکۆڵینەوەیەکی تر دەربارەی مامەڵەی موسڵمانان بۆ ئەو ناوچانەی والآیان کردووە، گرنگیی کتێبەکەشی لەوەدا دەردەکەوێت کە بۆ هەر ناوچەیەك پشتی بەستووە بە سەرچاوە ناوخۆیەکان.[3]

### ئیبنو عەبدولحەکەم:

ئەبولقاسمی عەبدورڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولحەکەمی میصریی (١٨٧- ٢٥٧ك) لە خێزانێکی زانستپەروەرە، باوکی زانایەکی مالیکیی پایەبەرز بووە و چەندین کتێبی فیقهیو، کتێبی (سیرة عمر بن عبدالعزیز)ی داناوە، هەرسێ براکانیشی زاناو فەرموودەناس بوون.

ئیبنو عەبدولحەکەم چەندین کتێبی نووسیوە بەناوبانگترینیان کتێبی (فتوح مصر و افریقیة) تیایدا باسی فەتحی ئیسلامی کردووە بۆ میصر لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت). هەروەها باسی لە پلانەکانی (الفسطاط)کردووە، هەروەها مەسەلەی سەرانەو باجو چەندێتیو چۆنێتی وەرگرتنیو هەڵکەندنی کەنداوی (أمیر المؤمنین) و بەڕێوەبردنی میصر لە فەرمانڕەوای عەمری کوڕی عاصدا، دواتر فەرمانڕەوای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوسەرح، کۆششی فەرمانڕەواکان لە والآکردنی ناوچەکان.

---

١) عبدالحمید علي ناصر محمد: خلافة علي بن أبي طالب ل١٤.

٢) احسان صدیقی العمد: پیشەکییەکەی ل١٠.

٣) شاكر مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون (٢٤٣).

ئەو زۆرجار پشت دەبەستێت بە ریوایەتێکی سەرەکییو دواتر دەریدەخات کە ریوایەتەکانی تر چی زیادەیەك یان جیاوازی یەکی تیادا بێت، جار جارەیش سەنەدەکان کۆدەکاتەوە، زۆربەی ئیسنادەکانیشی راستنو پیاوەکانیشی ناسراون، ریوایەتیشی بە زۆری وەرنەگرتووە لەوانەی بە (الاخبارين) ناسراون.[1]

**ئەزدیی:**

ئەبوئیسماعیل موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەزدیی بەصرەی (لە سەدەی دووەمی کۆچی ژیاوە) هەڵساوە بە نووسینی کتێبی (فتوح الشام) کە کۆنترین نووسینە لە بابەتی خۆی پێمانگەیشتووە، چونکە هەردوو کتێبەکەی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق (١٥١ك)و ئەبو میخنەف (لوط)ی کوڕی یەحیا ونبوون.[2]

ئەم کتێبە زانیاریی دووردرێژی دەربارەی فتوحاتی شام تێدایە، دەست پێدەکات بە باسی راوێژکردنی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) لەگەڵ گەورە هاوەڵەکان دەربارەی نیازی والآکردنی شام، راوبۆچوونی هەندێکیشیان تۆمار دەکات، دواتر باسی بانگهێشتی خەڵکییو هاتنیان بۆ مەدینە دەکات، بەتایبەت خەڵکی یەمەن، هەروەها باسی پەلامارە یەك بە دوای یەکەکانو راسپاردەکانی صدیق بۆ سەرکردەکانی و وەڵامەکانی ئەوان دەکات، ئەمجا باسی جەنگەکان دەکات بێئەوەی رێکیان بخات بە پی ساڵ، ئەوە نەبێت کە لە نێو ریوایەتەکان باسی مێژووەکان دەکات، هەندێکی زۆری لەو نامانەی ئاڵوگۆڕی پێکراوە لە نێوان ئەبوبەکرو عومەر لەگەڵ سەرکردەکانیاندا پاراستووە، کە باسیان لێوە نەکراوە لە سەرچاوە مێژوویەکاندا، یان هەندێ باسیان کراوە بەڵام لە رێگەیەکی دیکەوە یان بە کورتی.[3]

ئەزدیی (٩٣) ئیسنادی هێناوەتەوە، ئەوەش هەندێ لە سەرچاوەکانی ئاشکرا دەکات، زۆربەشیان گێڕەرەوەن لە هۆزی ئەزد کە خۆیشی سەر بە ئەوانەو ستایشی رۆڵیانی کردووە لە فتوحاتدا.[4]

١) محمد بن صامل السلمي: منهج كتابة التأريخ الاسلامي ٣٨٣ـ ٣٨٧.

٢) ابن النديم: الفهرست ٩٣، وابن حجر: الاصابة ٤:٤.

٣) اكرم العمري: دراسات تأريخية ٦٩ـ ٧٩.

٤) هەمان سەرچاوە: ٦٩ـ ٧٩.

**ئیبنو شەببە :**

عومەری کوڕی شەببەی نومەیری (٢٦٧ك) کەسێکی متمانە پێکراوی شارەزا لە بەسەرهاتەو ڕووداوەکان، نووسینی زۆری هەیە.[١]

کتێبی (تأريخ المدينة)ی ئەومان پێگەیشتووە کە تیایدا زانیاریی چڕی تۆمارکردووە دەربارەی خەلیفە ڕاشیدەکانو پلانەکانی مەدینە ـ پایتەختی خیلافەت ـ ئەو ڕیوایەتەکان هەڵدەبژێرێت بۆیە ڕێژەی ڕیوایەتی (صحيح)و (حسن)ی تیا بەرز دەبێت نیسبەت بە سەرچاوەکانی تر، هەروەها تاك دەبێتەوە لە هێنانەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ڕیوایەت، لێکۆڵینەوە نوێکانیش سوودیان لێوەرنەگرتووە بە هۆی دواکەوتنی بڵاوبوونەوەیان.

ئەگەرچی ئیبنوشەببە لە (تأريخ المدينة) هەواڵی خەلیفە ڕاشیدەکانی بە تێروتەسەل باسکردووە لە مەدینە، بەڵام ئەو درێژەی داوەتە ئەو باسە لە کتێبێکی دیکەیدا بەناونیشانی (تأريخ البصرة) کە ون بووە، بەڵام حافز ئیبنو حەجەر لە (فتح الباري شرح صحيح البخاري)، لەوێدا بەشێکی هێناوەتەوە باس لە جەنگی جەمەل دەکات.[٢] بەڵام ئیبنو حەجەر ڕیوایەتە (صحيح)و (حسن)ەکانی هەڵبژاردووە و ڕیوایەتەکانی دیکەی پشتگوێ خستووە.

**یەعقوبی :**

ئەحمەد کوڕی یەعقوب ئیسحاق (٢٨٤ك) مێژوونووسێکی شیعەیە، لە نووسینی (دواوین) کاری دەکرد لە فەرمانڕەوای عەبباسی یەکان، یەکێکە لە گەڕۆکە جوگرافیاناسەکان، سوودی وەرگرت لە کارەکەی خۆی و تێبینیی ڕاستەوخۆ لە گەشتەکانی بۆ دانانی کتێبی (التأريخ)و کتێبی (البلدان) بەشی یەکەمی مێژووەکەی بەسەرەتای بوونەوەر دەستی پێکردو ئەمجا باسی پێغەمبەرانو مێژووی نەتەوەکانی پێش ئیسلام، لە بەشی دووەمیشدا باسی لە ژیاننامەو سەردەمی خیلافەتی چوار خەلیفەکەو دەوڵەتی ئومەوییو عەبباسی تاکو ساڵی (٢٥٩ك)، لەم بەشەدا ناوی سەرچاوەکانی خۆی دەستنیشان کردووە، کە (١١) گێڕەرەوەو دوو ئەستێرەناس کە لیانەوە مەسەلەی دەرکەوتنی

١) الخطيب: تأريخ بغداد ١١: ٢٠٨.

٢) فتح الباري ١٣: ٥٤ـ ٥٦.

ئەستێرەکانی وەرگرتووە،[1] جاری وا هەیە بە کورتی باس لە بابەتەکانی دەکات لە لایەکەوە،[2] لە لایەکی تریشەوە بە لایەنگیری بیروباوەڕ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەی هەیە ریوایەتەکان بگێڕێتەوە بۆ سەرچاوە سەرەکی یەکان، هەروەها تێڕوانینی ئیسنادو ناوەڕۆکەکان تا چەند سەلامەتن لە هەڵەو کەموکوڕیو کامیان لەگەڵ ریوایەتی گێڕەرەوە متمانە پێکراو و راستگۆکان دەگونجێت یان تێدەگیرێت؟

## ئیبنو قوتەیبەی دەینەوەریی :

عەبدوڵلای کوڕی موسلیم (٢١٣ـ ٢٧٠ك)، زانایەکی گەورەیە لە بواری قورئانو فەرموودەو زمانەوانیی، رەخنەگران،[3] بە متمانە پێکراو لە قەڵەمیان داوە، بایەخی داوە بە مێژوو لە ڕێگەی دانانی کتێبی (المعارف)و (عیون الاخبار).

سەبارەت بە کتێبی یەکەم پێدەچێت هۆکاری دانانی پڕکردنەوە بێت بۆ بۆشای کتێب لەو بارەوە پێویستە خەڵکیی بە مێژوویەکی پوختە زانیاری یە سەرەکی یەکانی تیادا بێت، لەوانەشە مەبەستی لی پرۆژەیەك بێت بۆ نووسینی مێژوویەکی جیهانیی، بە سەرەتای بوونەوەر دەست پێبکاتو بە باسکردنی سەردەمی موعتەسیم کۆتای پێ بێت، بێجگە لە باسی مێژووی پێغەمبەرانو نەژادی عەرەبو ژیاننامەی هاوەڵانو شوێنکەوتووەکانیان، هەروەها خەلیفەکانو خاوەن راوبۆچوونو رەچەڵەکناسو مێژوونووسو فەرموودەناسو شاعیرو فەرمانڕەواو پیشەی کەسە ناودارەکانو مێژووی شاکانی عەرەبو عەجەم... سەرچاوەکانی پشت دەبەستن بە کتێبو گێڕانەوەی زارەکی، چونکە ئەو لە ئیبنو ئیسحاق و واقیدییو کەلبی سوود وەردەگرێت.[4] بەڵام کتێبی (عیون الاخبار) دەربارەی مێژووی شارستانیی دەدوێ، ئیدی شوێنەواری سیاسەتو رووداوەکانو زەمەنی بە دوای یەك هاتووی پێوە دیار نی یە،[5] هەڵەیشە کاتێك دەوترێت کتێبی (الامامة والسیاسة) ئەو دایناوە.

---

١) شاكر مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون ١: ٢٤٩ـ ٢٥٣، و محمد بن صامل السلمي: منهج كتابة التأريخ الاسلامي ٤٢٦ـ ٤٣٢.

٢) مێژووە چاپکراوەکەی باس لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین دەکات لە (٩٢) لاپەڕە لە ل١٢٣ـ ٢١٥.

٣) لەوانە: (الخطیب البغدادي) و(ابن تیمیة) و(الذهبي) (تأریخ بغداد١٠: ١٧٠ـ ١٧١، وتذكرة الحفاظ٢: ٦٣٢، وسیر أعلام النبلاء ١٣: ٢٩٦ـ ٣٠٢.

٤) شاكر مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون ١: ٢٤٠، والدوري: نشأة علم التأريخ عند العرب ١٣٦.

٥) شاكر مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون ١: ٢٤٠.

**تەبەریی:**

موحەممەد کوڕی جەریر (٢٢٤ـ ٣١٠ك) پێشەوایە لە تەفسیرو فیقهو مێژوو، ناوبانگی دەرکردووە بە هەردوو کتێبەکەی لە تەفسیرو مێژوو، کە بە ئینسکلۆپیدیا دەژمێرێن لە بواری خۆیاندا، گرنگە لامان بایەخی مێژووی ئەو کتێبە بزانین لە توێژینەوەی سەردەمی خەلیفە راشیدەکان، چونکە دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەمە، لەو کارەی پشتی بە کتێبی گێڕەرەوەکان بەستووە کە کتێبیان داناوە دەربارەی رووداوە جۆراوجۆرەکانی ئەو سەردەمە، بۆ نمونە لە مەسەلەی پاشگەزبوونەوە متمانەی کردووە بە کتێبی (الردة)ی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی (١٧٠ك) کە ناسرا بوو بە لایەنگیری هۆزایەتیی بۆ تەمیمو عێراق، بۆیە شانسدار نەبوو بە متمانە پێکردنی کەسێك لە فەرمووودەناسەکان، بەڵکو وازیان لە ریوایەتەکانی هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا رێزی خۆی پاراستووە لای مێژوونووسەکان، چونکە ئەو تاك بووەتەوە لە وێنەکێشانی رووداوەکان بە لێزانیو رێکوپێکی، هەروەها بەهۆی هەندێ درێژەپێدان کە جگە لە ئەو کەس باسی نەکردووە.

لە بواری فتوحاتدا متمانەی کردووە بە کتێبی (الفتوح)ی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی لەگەڵ دوو کتێبی تر (فتوح الشام)و (فتوح العراق)ی ئەبو میخنەف (١٥٧ك) کە لە دانیشتوانی کوفەیەو لایەنگیری شیعەی کردووە، جگە لە کتێبەکانی عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینییو سەیفی کوڕی عومەرو عومەری کوڕی شەببە، بەڵام لە فیتنەی کوژرانی عوسمانی کوڕی عەففان خوای لێ رازی بێت متمانەی کردووەتە سەر کتێبەکانی واقیدیو تەواوی کردووە بە ریوایەتی سەیفی کوڕی عومەرو عومەری کوڕی شەببە، و ئیبنو ئیسحاق،[1] سەبارەت بە جەنگی جەمەلو صەففین متمانەی کردووە بە کتێبەکانی عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینی (٢٢٥ك) کە ناسراوە بە مامۆستای ئەوانەی ریوایەتی مێژووی یان گێڕاوەتەوە، چەندین کتێبیشی دەربارەی بابەتەکانی سەردەمی راشیدین داناوە، ریوایەتەکانیشی مامناوەندو نزیکن لە راستی یەوە بە زۆری، هەروەها متمانەی کردووەتە سەر کتێبی (صفین)ی ئەبومخنەف (لوط)ی کوڕی یەحیا، بە پلەیەکی کەمیش لەسەر کتێبی (صفین)ی نەصری کوڕی موزاحیم (٢١٢ك) کە خەڵکی کووفەیەو ئارەزووی بەلای

١) السلمي: منهج كتابة التأريخ الاسلامي ٤٤٤.

شیعەدا بووە، بۆیە فەرمووەدناسان بە توندی رەخنەیان لێگرتووە بە هۆی ئەو بیروباوەڕەی یان بە هۆی لاوازیی کارامەی لە ریوایەتدا، یان لەبەر هەردوو هۆکارەکە پێکەوە.[١]

لەبارەی لیستی سەرکردەکانی حەجو فەرمانڕەوای هەرێمەکانو دەنگوباسی موجاهیدەکان پشتی بەستووە بە واقیدیو ئەبومەعشەری سیندیی.[٢]

هەروەها سوودی وەرگرتووە لە کتێبی (تأريخ الخلفاء)ی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق (١٥١ك)و مێژووی ئیبنو ئەبی خەیسەمە (٢٧٩)و مێژوو بە پی ساڵەکانی هەیسەمی کوڕی عەدی (٢٠٦)و کتێبەکانی موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدی (٢٠٧)و ئیبنو سەعد (٢٣٠)ی دانەری (الطبقات الكبرى في أخبار عصر الخلافة الراشدة) تەبەریی بە راشکاوی باسی لە ئەو سەرچاوانە نەکردووە کە زانیاریی لێوەرگرتوون ئەوە نەبێت کە ناوی دانەرەکان دەبات، بەڵام دەناسرێن لە رێگەی ژیاننامەو سروشتی ناوەڕۆکی ریوایەتەکانیان.

تەبەریی ریوایەتی مێژووی باس دەکات بە ئیسنادەوە، سەرەڕای ئەوەش کە هەڵێدەبژێرێت لە کتێبی بەسەرهاتو نووسەرەکان، بەڵام کۆششی نەکرد بۆ پالاوتنی ریوایەتە متمانە پێکراوەکان، بەڵکو بواری بۆ خوێنەر کردەوە خۆی رەخنەبگرێت و بڕیار بدات، خۆیشی تەنها هەواڵەکە بداتە پاڵ سەرچاوەکان کە زۆربەیان نەماون، بەم کارەش بابەتێکی مێژووی فراوانی بۆ پاراستین، لێکۆڵینەوەی پێویستی بە هەندێ پێوەری رەخنەگری روون هەیە پێش ئەوەی متمانەیان پێبکرێت لە شیتاڵ کردنەوەو بەهانە گرتن، چونکە نوێنەرایەتی هەندێ قوتابخانەی فیکریی‌و سیاسی هەمەجۆر دەکەن، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نی یە ئەگەر ریوایەتو بیروبۆچوونەکانی لێکدانو جیاوازیی تیا بەدی بکرێت لەمەڕ رووداوەکان.

تەبەریی بە درێژیی باسی لە ژیاننامەی خەلیفە راشیدەکان کردووە، بە تێروتەسەل باسی رووداوەکانی پاشگەزبوونەوەو فتوحاتو ئاژاوەکانی کردووە، بەم شێوەیەش بوو بە فراوانترین سەرچاوە بۆ سەردەمی خیلافەتی راشیدەو بە تایبەت لە بوارەکانی ژیانی سیاسیو چالاکیی سەربازیدا.

---

١) الذهبي: ميزان الاعتدال ٤: ٢٥٣ـ ٢٥٤.

٢) السلمي: منهج كتابة التأريخ الاسلامي.

**مەسعوودی:**

عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی (٣٤٦ك) لە دایکبوونو پێگەیشتنی لە بەغدا بووە، هەر لە سەرتای لاویی دەستی کردووە بە گەشتو گوزار بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاریی مێژوویو جوگرافیی، گەڕاوە بە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیو دەرەوشیدا. کتێبە هەمەجۆرەکانی کە دایناون رۆشنبیریی و زانینی بەربلاوی ئەو دەردەخات، سەردەمی خیلافەتی راشیدەی باس کردووە لە کتێبی (مروج الذهب ومعادن الجوهر) لە (١٥٦) لاپەڕەدا، لە (ل٣٢٥ بۆ ل٤٨١) پێشەوا زەهەبی وای بۆ دەچێت کە مەسعودیی موعتەزیلی بێت،[١] ئیبنوحەجەریش دەڵێت: "کتبه طافحة بانه کان شیعیاً معتزلیاً".[٢] یەکێ لە توێژەرەوانیش گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە هەواو ئارەزووی شیعەگەریی تیایدا بەهێز بووە، هەندێ بەڵگەی بەهێزیشی لەم بارەوە هێناوەتەوە.[٣]

مەسعودیی نە ئیسنادی ریواتەکانو نە ناوی کتێبەکان کە لیان وەردەگرێت ئاشکرای نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت ئاماژەی بە لیستێك کتێبی مێژووی سەردەمی راشیدین دەکات، کتێبەکانی ئەبومیخنەفو هەیسەمی کوڕی عەدی تائی (٢٠٧ك)و موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدی (٢٠٧ك) عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینی (٢٢٥ك) و ئەحمەدی کوڕی یەحیای بیلازوریی (٢٧٩ك)، یەکێ لە توێژەرەوانی ئەوەی تێبینیی کردووە کە ئەو فەزڵی عەلی دەداتە سەر هەموو هاوەڵاندا، ئاماژە بەوەش دەکات کە لە هەموان لەبەرتربووە بۆ وەرگرتنی خیلافەت، نەیارەکانی (عەلی)ش لە هاوەڵان بە عوسمانی یەکان ناوزەد دەکاتو تۆمەتی تەماعکاریان دەداتە پاڵ، دەرئەنجامەکانی جەنگی (صفین) بە دەستکەوتێکی ئاشکرا دەزانێت، بە وتەی لێکۆڵەرەوەیەکی تر، مەسعودیی هەوڵی دەدا راوبۆچوونی شیعەکان پێش بخات لە سەرەتای مێژووی ئیسلام.[٤]

**ئیبنو ئەعسەمیی کووفی:**

ئەبو موحەممەد ئەحمەدی ئەعسەمیی ئەزدیی دوای ساڵی (٣٢٠ك) لە دونیا دەرچووە مێژوونووسێکی شیعەیە، کتێبەکەی یەکێکە لە بەرینترین کتێبەکانی فتوحات، هەروەها بە

١) الذهبي: سير أعلام النبلاء ١٥: ٥٦٩.

٢) ابن حجر: لسان الميزان ٤: ٢٢٥.

٣) سليمان بن عبدالله السويكت: منهج المسعودي في كتابة التأريخ ٧٤.

٤) السويكت: منهج المسعودي ٣٥٨ـ ٣٦٢.

شیکراوەی باسی لە بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە کردووە، متمانەی بە هەندێ سەرچاوە کردووە کە لە نێوچوون. ئیسنادەکانیشی ـ کە پارێزراوە لە نوسخەی خدابەخش ـ بەرز دەبێتەوە بۆ عوروەی کوڕی زوبێر (٩٣ك)و موحەممەدی کوڕی موسلیمی شیهابی زوهریی (١٢٤ك)و یەزیدی کوڕی ڕۆمانی ئەسەدیی (١٣٠ك)و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق (١٥١ك)و موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدیی (٢٠٧ك). وایش دەردەکەوێت کە ڕیوایەتەکانی واقیدیی دەکاتە بنچینە بۆ مەسەلەی پاشگەزبوونەوەو دواتر هەندێ سەرچاوەی بۆ زیاد دەکات، بە تایبەت لە بواری ئامۆژگارییو شیعر.[١]

هەروەها سوودی وەرگرتووە لە ڕیوایەتەکانی ئەبومیخنەفو هیشامی کەلبیو عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینی (٢٢٥ك).

بایەخ پێدانی ئیبنو ئەعسەم بە هۆنراوە ئاشکرایە لە ڕێگەی ئەو هەموو هۆنراوەی لە کتێبەکەی هێناویەتی یەوە هۆکاری یارمەتیدەریش لەم بارەوە ئەوە بووە کە خۆی شاعیر بووە، هەروەها بایەخی داوە بە باسکردنی وتارو نامەی ئالوگۆڕکراو، کە ئەو تاك دەبێتەوە بە بابەتێکی وێژەی فراوان.

ڕێڕەوی ئەو لە لابردنی ئیسنادداو، هەروەها هێنانەوەی کورتە هۆنراوە لەسەر زمانی پاڵەوانەکان بە ڕاستەوخۆ، یارمەتی داوە بۆ دروستبوونی وێنەی داستان بە تەواوی و ڕەچاوکردنی شێوازی چیرۆکی زنجیرەی.

## ئیبنو حوبەیش :

ئەبوقاسمی عەبدوڕەحمانی کوڕی موحەممەدی ئەنصاریی (٥٠٤ـ ٥٨٤ك) لە میریە لە دایکبووەو قورئانی تەواو کردووە، دواتر زانستەکانی فیقھ و وێژەو عەرەبی فێربووە، لە ساڵی (٥٣٠ك) ڕۆیشتووە بۆ قورتوبەو سوودی لە زاناکانی وەرگرتووە، لە ساڵی ٥٣٤ك گەڕاوەتەوە بۆ میریەو تیایدا ماوەتەوە تاکو ئەو کاتەی ڕۆمەکان دەست دەگرنە سەر ناوچەکەو ئیبنوحوبەیش بە دیلی دەستگیر دەکرێت، لە ساڵی (٥٤٢ك) ئازاد دەکرێتو دەچێت بۆ مەرسی یە، لەوێشەوە دەچێتە دوورگەی شەقەرو پلەی قازێتیی دەدرێتی تاکو ساڵی (٥٥٤ك) دواتر وتاربێژی مزگەوتی مەرسیەی پێ سپێردراوە، پێش ئەوەی ببێتە قازیی لەوێ لە ساڵی (٥٧٥ك) لە سەردەمی یوسفی کوڕی

١) عبدالعزيز البيتي: ابن اعثم الكوفي، منهجه وموراده عن خلافة أبي بكر الصديق رضي الله عنه ل١٣٩.

عەبدولمولئمین (٥٥٨ـ ٥٨٠ك) لەم ساڵەدا و لە تەمەنی حەفتا ساڵیی دەستی کرد بە دانانی کتێبی (الغزوات الضامنة الكافلة والفتوح الجامعة الحافلة والكائنة فى أيام الخلفاء الائمة الاول الثلاثة أبي بكر الصديق وأبي حفص الفاروق وأبي عمرو ذي النورين)، لە مەرسیە و هێشتا قازیی دەبێت کۆچی دوای دەکات.

ئیبنوحوبەیش بە دادپەروەریی‌و دوورکەوتنەوە لە خراپە باسکراوە، هەروەها بە زبری‌و توندوتیژی لە فەرماندا، مێژوویش یەکێك نەبوو لەو زانستانەی کە خوێندبوونی وەك (قراءات)و فەرموودەو زمانەوانیی‌و نامۆ، کتێبی (الغزوات)ی دانەناوە بە فەرمانی سەرکردەی موەحیدەکان نەبێت، یوسفی کوڕی عەبدولموئمین کە کردبووی بە قازیی سەرەڕای ئەوەی کە مالیکیی مەزهەب بوو، موەحیدەکانیش دژایەتی ئەوانیان دەکرد، لەوانەشە گەورەی تەمەنی‌و لاوازیی نیازی هۆکاری دانانی بن وەکو داوەریی‌و هەروەها ستایش کردنی بۆ موەحیدەکان کە وەسفی (ابن تؤمرت)ی کردووە بە پێشەوای پارێزراوو مەهدیی ئاشکرا، بەڵام دواکەوتنی لە دانانی کتێبی (المغازی) ئەوە ناگەیەنێت کە بایەخی نەداوە بە هونەری مێژوو، چونکە ژمارەیەك لە مێژووی ئەندەلووسێکانی نووسیوەتەوە، وەکو ئیبنوحەیان‌و خەشنیی و عەیاز، ئەوانەی گێڕاوەتەوەو قسەی لەسەر کردوون.[1] ئیبنو شەهبە تەنها کەسێك بووە بە راشکاوی ئاماژەی بە لێهاتووی ئیبنو حوبەیش کردووە لە بواری مێژوودا، لەوانەشە مەبەستی پیاوانی زانستی فەرموودە بێت، بۆ ئەوەی قسەکەی بگونجێ لەگەڵ راوبۆچوونی زاناکانی تر،[2] گرنگیی کتێبی (الغزوات الضامنة) لەوە دەردەکەوێت کە لە هەندێ سەرچاوەی ونبوو زانیاری وەرگرتووە سەبارەت بە بابەتی پاشگەزبوونەوەو فتوحات، گرنگترینیان کتێبی (الردة)ی واقیدی‌و کتێبی یەعقوبی کوڕی موحەممەدی زوهریی (٢١٣ك)و کتێبی (فتوح الشام)ی سەعیدی کوڕی فەزڵ (لە کۆتای سەدەی دووەمی کۆچی وەفاتی کردووە)و کتێبی (الردة والفتوح)ی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمیی (١٧٠ك)، هەروەها زیادکردنەکانی ئاشکرایە لە بواری بەڵگەنامەو نووسین‌و نامە ئاڵوگۆڕپێکراوەکان‌و هۆنراوە کە تاك بووەتەوە لە باسکردنی هەندێکیاندا، هەر بۆیە بە سەرچاوەیەك لە جیاتی سەرچاوە سەرەکی یە ونبووەکان لەمەڕ بابەتەکانی (الردة والفتوح)، بەڵام دادەبەزێت بۆ ئاستی سەرچاوەی لاوەکیی لە بابەتەکانی تر.

---

١) طلال بن مسعود الدعجاني: پێشەکییەکی بۆ کتێبی (الغزوات الضامنة) ل٣١٠٣.

٢) سەرچاوەی پێشوو ٣١٠٥.

**کولاعیی :**

ئەبو ڕەبیع سولەیمانی کوڕی مووسا (٥٦٥ـ ٦٣٤ك) فەرمووده‌ناس‌و (حافظ) و متمانە پێکراوە، خەڵکی ئەندەلووسە، لە سەردەمی موەحیدەکان ژیاوە (٥١٥ـ ٦٦٨ك) لە شاری بەلەنسیە، گەشەکردنی زانست لەوێ کاریگەریی هەبوو بۆ ئاراستەکردنی بەرەو فێربوونی زانست‌و دواتر کتێب دانان، ململانی نێوان موسڵمانان‌و گاورەکان لە ئەندەلووس هانیدا بۆ بەشداریکردن لە رووداوە جیهادی یەکاندا، لە ئەنجامدا لە شەڕێکدا لە نزیك بەلەنسیە لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا شەهید بوو، هەڵگری ئاڵای ئیسلام بوو لەو جەنگەدا.

کولاعیی دادوەری گرتە دەست لە شاری بەلەنسیە، کە خۆی زانایەکی مالیکیی بوو، لاپەڕەی دادوەریشی بە دادگەریی‌و چاکەو باسی باشە ناسراوە، هەروەها ئەو پێشنوێژو وتاربێژیی مزگەوتی بەلەفسیەی گرتە ئەستۆ، ناونیشانی کتێبەکانی کە بریتین لە نۆ کتێب لە فەرموودەو شەش کتێب لە زانستی ژیاننامەی پیاوانی فەرموودە، دە کتێب لە وێژەی (نامەو وتارو هۆنراوە)و یەك کتێب لە(المغازي)،ئاماژە دەکەن بۆ شێوەی رۆشنبیری یەکەی کە کۆی کردووە لە نێوان فەرموودەو مێژوو وێژە، سەرەڕای ئەوەش کە قازیی بووە، هیچ کتێبێکی دانەناوە لە فیقە و فەتواو دادوەریی، تەنها کتێبێکی ئەومان پێگەیشتبێت کتێبی (المغازي)یە، کە باسی سەردەمی خیلافەتی راشیدە دەکات تا کۆتای خیلافەتی عوسمان (رەزای خوای لێبێت).

لەم کتێبەیدا سوودی لە پوختەی ئیبنوهیشام وەرگرتووە بۆ کتێبی (المغازي) موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی موتتەلیبی[1] (١٥١ك)، کتێبی (المغازي) واقیدیشی پشتگوێ خستووە، سەرەڕای ئەوەی کە شارەزای بووە دەربارەی،[2] وتوویەتی: (بەڵام بۆم دەرکەوتووە زۆرجار قسەکانی وەکو ئیبنوئیسحاقە، بۆیە وازم لی هێنا لە پێناو زمانپاراوی ئیبنوئیسحاق).

یەکێ لە کارەکانیشی ئەوەبوو ریوایەتی ئیبنوئیسحاقی پوختە کردەوەو پاراوی کرد لە زۆرێك لە زمانەکان‌و رەچەڵەك‌و هۆنراوەکان.[3] سەبارەت بە بابەتی (الفتوح) کەڵکی لە کتێبی (الردة والفتوح)ی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمیی (١٨٠ك) و کتێبێکی عوسمان سەعیدی کوڕی فەزڵ

---

١) الكلاعي: مقدمة الاكتفاء لوحة١.

٢) سەرچاوە پێشوو لوحە ٢.

٣) الكلاعی: الاكتفا لوحە ٤.

(لە کۆتای سەدەی دووەم لە دونیا دەرچووە)، هەروەها لە کتێبی (فتوح الشام)ی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەزدیی بەصرەی (لە سەدەی دووەمی کۆچی وەفاتی کردووە)، هەروەها لە موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدیی (٢٠٧ك)و عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینی (٢٢٥ك)و (التأريخ الكبير)ی ئیبنو ئەبی خەیسەمە (٢٧٩ك) و کتێبی (أخبار المدينة)ی زوبێری کوڕی بەککار (٢٥٦ك)و مێژووی تەبەریی[1] (٣١٠ك) خۆیشی بە راشکاوی ئەوەی ئاشکرا کردووە لە کتێبی مامۆستاکەی ئەبو قاسمی کوڕی حوبەیش بەناونیشانی (الغزاوت الضامنة)[2] زانیاریی وەرگرتووە.
ڕێبازی ئەویش ئەوە نەبووە کە وەکو خۆی زانیاری یەکان بگێڕێتەوە، بەڵکو زۆر کات دەستکاریی دەکات وەکو لابردنو پێکەوە بەستنو پوختەکردنو نزیك کردنەوە، ڕێبازی نووسینیش لەوە رونترە کە پێویست بکات توێژەرەوە خۆی ماندوو کات بە مەبەستی لێتێك نەگەیشتنی، کتێبەکەشی بەشێوەیەکی زۆر بەشداری لە پاراستنی ریوایەتە هەمە جۆرەکان کردووە، جگە لە هەندێ گواستنەوەی گرنگ لە نووسەرەکانی دیکەو ئەو نامانەی خەلیفە ئاراستەی سەرکردە سەربازی یەکانی کردووەو بە پێچەوانەوە، کە لەوانەیە لە سەرچاوەیەکی تر بەرچاومان نەکەوێت.[3]

**موحیببی تەبەریی (٦٩٤ك):**

کتێبی (الرياض النضرة في مناقب العشرة) تیایدا پشتی بەستووە بە هەندێ سەرچاوەی ونبوو وەکو (السيرة)ی مەلائیو ئیسنادەکانی لابردووە، لیستێکی تازەشی خستووەتە روو لە سەرچاوە لە نێوەڕۆکی کتێبەکەی، نووسینەکانی هیچیان نەخستووەتە سەر ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستماندایە.[4]

موحەممەدی کوڕی یەحیای ئەشعەریی مالیکیی ـ ئیبنوبەکر ـ (٧٤١):

کتێبی (التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان) وەختە ببێتە پوختەیەك بۆ ریوایەتەکانی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمیی و زۆربەشی لە مێژووی تەبەریدایە، بەڵام دانەر وا پیشان دەدا کە لە کتێبەکەی سەیفەوە راستەوخۆ وەردەگرێت، جا لەوانەیە چاوی پێکەوتبێت.[5]

---

١) جمال محمد صادق القاضي: فتوح الشام من كتاب الاكتفا ١٤٢، ١٥٠، ١٥٣.

٢) الكلاعي: مقدمة الاكتفا لوحة٤.

٣) خورشيد أحمد: تأريخ الردة ١١.

٤) محمد عبدالله الغبان: فتنة مقتل عثمان بن عفان رضي الله عنه، ل٢٠ (ماستەرنامەیەکە لە زانکۆی ئیسلامیی لە مەدینە بە سەرپەرشتی ئەکرەم ئەلعومەریی).

٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢١.

**(إبن كثير):**

كتێبی (البداية والنهاية) بە ئینسكلۆپیدیایەكی مێژووی گشتگیر دەژمێردرێت، كە تیایدا دانەر مێژووی سەرەتای بوونەوەرو پێغەمبەرانو عەرەبی پێش ئیسلامی نووسیوە، هەروەها بە تێروتەسەلو بە شێوەیەكی فراوان باسی سەردەمی پێغەمبەر ﷺی كردووەو متمانەی كردووەتە سەر كتێبی (سيرة إبن هيشام) لە ڕێگەی بەككائیو ژمارەیەكی تر لە گێڕەرەوانی سیرە، لەوانە: ئیبنوئیسحاق و وەكو یونسی كوڕی بەككیر (لە ڕێگەی بەیهەقی و ئیبنو عەساكیرەوە) كە هەندێ زیادەی هەیە لەسەر سیرەی ئیبنو ئیسحاق، هەروەها (یەحیای كوڕی سەعیدی ئومەویی) لە ڕێگەی (مقازی) سەعیدی كوڕی یەحیای كوڕی سەعدی ئومەویی)و سەلەمەی كوڕی فەزڵ (لە ڕێگەی تەبەریی). [1]

بەم شێوازەش دانەر توانی وێنەیەك دروست بكات بۆ ڕووداوەكانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ فراوانتر لە سیرەی ئیبنو هیشام، بێجگە لە تێبینی یە ڕەخنەی یە گرنگەكانی دەربارەی ئیسنادو ناوەرۆكی ریوایەتەكان، ئەوەش وا دەكات (إبن كثير) بچێتە پێشەنگی ئەوانەی بە ڕێبازی ڕەخنەگری مێژووی كاریان كردووە.

سەبارەت بە سەردەمی راشیدەكان، بە شێوەیەكی سەرەكیی متمانەی كردووەتە سەر مێژووی تەبەریی، بەڵام لە بابەتی ژیاننامەدا هەندێكی خستۆتە سەری، لە كتێبی (تأريخ الاسلام)ی پێشەوا زەهەبی، بەتایبەتی لە مێژووی مردنەكان (الوفيات).

گرنگیی راستەقینەی ئەم سەرچاوەیە بۆ مێژووی سەرەتای ئیسلام، دەگەڕێتەوە بۆ فراوانیی بازنەكەیو دەركەوتنی سەرتاكانی ڕەخنەگری مێژووی، زیاتر لەوەی كە دەقە مێژووی یە سەرەتاكانی پاراستبێت، چونكە سەرچاوەكانی (إبن كثير) بۆ ئەو ماوەیەو پێشەوەی، یەكجار سنووردارە، ئەمە جگە لەوەی كە چاپكراون وەكو (تأريخ إبن عساكر)و (دلائل النبوة)ی بەیهەقیو تەبەرییو ئیبنوهیشام) لە وەرگرتنی ریوایەتی دێرینەكان لەو كەسانەی كە مێژوویان گەیاندوە، وەكو عوروەی كوڕی زوبێرو زوهرییو موسای كوڕی عوقبەو موحەممەدی كوڕی ئیسحاقو ئەبومەعشەری سیندییو واقیدییو سولەیمانی كوڕی تەرخانو عەلی كوڕی موحەممەدی كوڕی سەعدو یەعقوبی كوڕی سوفیان، بەم شێوەیەش دەكرێت بە سەرچاوەیەكی لاوەكی دابنرێت سەبارەت

1) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بە لێكۆڵینەوەی سەرەتای بوونەوەرو مێژووی پێغەمبەرانو سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و راشیدین، چونكە ئەو سەرچاوانەی پشتی پێبەستوون چاپكراون، بەڵام وەكو سەرچاوەیەكی (بدیل) هەردەمێنێ بۆ ئەوانە كە ونبوونە وەكو كتێبی (صفین)ی ئیبنو دیزیلو كتێبی (مغازی) سەعیدی كوڕی یەحیای ئومەویی، چونكە (إبن كثير) هەندێ ریوایاتی لە ئەو دوو كتێبە پاراستووە (٦٦ دەق) لە (مغازي) سەعیدی ئومەویی.

سەبارەت بە (علم الرجال)و رەخنەگری ئیسناد، پشتی بەستووە بە كتێبی (التكميل في الثقات والضعفاء والمجاهيل) كە ئەویش بەشێوەیەكی سەرەكی پشتی بەستووە بە كتێبی (تهذيب الكمال)ی میززی مامۆستای و (ميزان الاعتدال)ی زەهەبی مامۆستای، لەگەڵ چەند زیادەیەك كە لە سەرچاوەی دیكەوە وەریگرتووە.

لەوانەشە ئەو فەرموودانەی كە هێناونیێتی یەوە لە (البداية والنهاية) كە موسنەدی ئەحمەد و هەردوو كتێبی بوخارییو موسلیمو سەرچاوەكانی تری فەرموودەی پێشخستووە، پشتی بەستبێت بە كتێبی هەرە گەورەی (جامع المسانيد)، هەندێ جاریش هەواڵەی كردووە بۆ كتێبێكی خۆی بە ناوی (الاحكام الكبرى) كە لەوێ بە شیكراوەی باسی لە رەخنەگریی فەرموودە كردووە.

وایش دەردەكەوێت كە (إبن كثير) سەرقاڵی دانانی چەند كتێبێك بووە لە یەك كاتدا، لەوەشدا بابەتو ریوایەتە هاوبەشەكان یارمەتیداون، بێگومان سەرچاوە دیاریكراوەكانی كە شارەزایان بووە، بابەتی سەرچاوە سەرەكی یەكانی بە چڕیی بۆی دەستەبەركردووە كە پتر لە (٢٠) كتێبە.

**(الذهبي):**

كتێبی (تأريخ الاسلام ـ عصر الخلفاء الراشدين) بە سەرچاوەیەكی لاوەكی دەژمێردرێت، نیسبەت بە ئەو بڕە زۆرەی پێمان گەیشتووە لە كتێبەكان كە سوودمەند بووە لیان، وەكو (سيرة ابن هشام)و (طبقات ابن سعد)و (صحيح البخاري)و (صحيح مسلم)و (موطأ مالك)و (سنن أبى داود)و (سنن الترمذي)و (سنن النسائي)و (مسند أحمد)و (تأريخ خليفة بن خياط وطبقاته) و (مغازي الواقدي)و (تأريخ الطبري)، بەڵام بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستی سەرچاوەی (بدیل)، كاتێك لە هەندێ كتێبی ونبوو زانیاریی دەگێڕێتەوە وەكو (مغازي) عوروەو مەغازی ئیبنو شیهابی زوهریی (گێڕەرەوەی موقری)و (مغازي) موسای كوڕی عوقبە، كتێبەكانی عەلی كوڕی موحەممەدی مەدائینییو (الردة الفتوح)ی سەیفی كوڕی عومەری تەمیمییو كتێبەكانی هیشامی كەلبیو (تأريخ نيسابور)ی حاكم، ئەو

ریوایەتگەلێكیش دەگێڕێتەوە لەو كتێبانەی كە مافی (السماع والاجازە)ی هەبێت، ئیسنادی دانەرەكانیش هەتا كۆتای باس دەكات (وەكو شایەتحاڵێك لە هاوەڵانو شوێنكەوتوانیان)، جارجارەش ئیسنادەكان كورت دەكاتەوە، یان سەرتاكەی لادەباتو تەنها باسی كۆتای یەكەی دەكات، بەڵام سەنەدی خۆی بۆ دانەرەكە هەمیشە پشتگوێ دەخات بە مەبەستی كورتكردنەوە... ئینجا كتێبەكەی لەسەر ساڵەكان رێكخستووە، باسی رووداوەكانی ئەو ساڵە دەكاتو دواتر ژیاننامەی ژمارەیەك لە هاوەڵان باس دەكات كە لەو ساڵەدا لە دونیا دەرچوون.

### ٢- كتێبەكانی فەرموودە:

دوو كۆمەڵی گرنگ هەن لە كتێبی فەرموودە، یەكەمیان رێكخراوە لەسەر بابەتەكان، دووەمیش لەسەر موسنەدی هاوەڵەكان.

ئەم دوو كۆمەڵە ئەو فەرمودانەیانە لە خۆگرتووە كە بە ئیسنادی دانەرەكانیان دەگاتە پێغەمبەر ﷺ و بابەتی بیروباوەڕو شەریعەتو ئادابو (فضائل)و (رقائق)و هەندی بابەتی تری لە خۆگرتووە، وەكو هەواڵی مێژووی پەرشو بڵاو، بەڵام لە كتێبی (مغازي) بە چڕی زیاتر لە چەند دانراوێكی فەرموودەی رێكخراو لەسەر بابەتەكان دەبینرێت، ئەمە لە كاتێكدا ریوایەتەكانی سەردەمی خیلافەتی راشیدە بڵاوەی كردووە لە چەندین بەشو كتێبی جیاجیادا، لەوانە (فضائل الصحابة)و (الفتن والجهاد)و (قصة الشورى)... سەرەڕای كورتی كە بە فەرموودەكانەوە تێبینیی دەكرێن، بەڵام جاری وا هەیە وردەكاریی زۆری تیا بەدی دەكرێت، جگە لەوەش بەشێكی زۆری هەوڵ و كۆششی رەخنەگری ناوازەی بۆ كراوە بە تایبەتی لە هەردوو صەحیحی بوخارییو موسلیمدا، بە پلەیەك نزمتریش بۆ صەحیحی ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیبانو موستەدرەكی حاكیم دوای شەش كتێبەكە، كە ئەوانیش شانسدار بوون لە پوختەكردنو وردبینی، بێ ئەوەی هەوڵەكان كورتكرابێتنەوە سەر صەحیح، وەكو سونەنی ئەبوداودو نەسائیو تیرمیزییو ئیبنوماجە، ئەمجا سونەنی دارمییو دارەقووتنییو سەعیدی كوڕی مەنسورو بەیهەقیی، هەروەها موستەخرەجی ئەبو عوانەو ئەبو نوعەیمو ئیسماعیلی بەرقانیی.

سەبارەت بەو كۆمەڵەیش كە دەناسرێن بە (مجموعة المسانيد الحديثية) موسنەدی ئیمامی ئەحمەد لە سەرووی هەموویانەوە دێت، لە رووی دێرینییو فراوانییو بایەخدان بە هەواڵەكانی سەردەمی

خیلافەتی راشیدین، ئەمجا موسنەدەکانی ئیسحاقی کوڕی راهەوەیە و بەزازو تەیالیسی، پێویستە لێرەش ئاماژە بکەین بۆ گرنگیی فەرهەنگیی تەبەرانیی گەورەو هەردوو موسەننەفی عەبدورڕەزاقی کوڕی هومامو سەنعانییو ئیبنو ئەبی شەیبە، سەبارەت بە (المصنف)ی سەنعانی (١٢٦ـ ٢١١ك) بە گەورەترین کۆکەرەوە دەژمێردرێت، ئیسنادەکانی بەرزن، هەواڵە مێژووی یەکان زیاتر لە "کتاب المغازی"دایە،[1] سەبارەت بە باسەکانی سەردەمی راشیدین بڵاوەی کردووەو لەیەك جێگادا نی یە، کتێبی (المصنف فی الاحادیث والآثار)ی ئیبنو ئەبی شەیبە (٢٣٥ك) کە فەرموودەناسو (حافظ)و متمانەپێکراو[2] بووە (٣٧٤٣) فەرمودەو شوێنەواری لە خۆگرتووە، ڕێکیشخراوە بە پی باسە فیقهی یەکان، لە دوو توێشیدا فەرموودەی (صحیح)و (حسن)و (ضعیف)و (واهي) تیادا هەیە، ریژەی (صحیح) لەو ریوایەتانەی کە باس لە کاروباری دارای دەکات لە خیلافەتی عومەر رەزای خولی لێبێت دەگاتە (٢٢٪) لە کۆی ریوایەتەکان کە ژمارەیان دەگاتە (١٥٠) ریوایەت.[3]

ریوایەتەکانیش بە ئیسنادەوەیەو زۆربەی پیاوانیشی هەمان پیاوانی شەش کتێبەکەن،[4] بابەتی مێژووی لە کتێبی (المصنف) خۆی لە (کتاب التأریخ والجمل، وصفین، والخوارج، والمغازي) دەبینێتەوە.

جێگای خۆشێتی باسی بکەین لە کتێبی (فتح الباري شرح صحیح البخاري) ئیبنوحەجەری عەسقەلانیی (٨٥٢ك) کە دانراوێکی گەورەیە لە (٨١٥٦) لاپەڕەدایە، دانەری رێکخستووە بە پی رێکخستنی صەحیحی بوخاریی، لەسەر دەرکە فیقهی یەکان، بۆیە بابەتە مێژووی یەکەی بڵاوەی کردووە، ناشکرێت هەڵسەنگێنرێتو بایەخیان بزانرێت تاکو کۆنەکرێتەوەو لەسەر بنچینەی مێژووی ریز نەکرێت، دوو کەس لە توێژەرەوان هەڵساون بەم ئەرکە، دوو لێکۆڵەرەوە کە بازنە فراوانی بابەتە مێژووی یەکان لە (فتح الباري) دەردەخات، رێگای پێداچوونەوەش خۆش دەکات بە پێڕستی شیکراوە، ئەو کتێبخانە کولتووریە قەبەیەش دەردەخات کە ئیبنو حەجەر زانیاری یەکانی

١) بڕوانە بەرگی پێنجەم ٣١٣ـ ٤٩٢.

٢) إبن حجر: تقریب التهذیب ١: ٤٤٥.

٣) عبدالسلام محسن آل عیسی: النواحي المالیة في خلافة عمر ل٣١.

٤) عبدالحمید علي ناصر: خلافة علي بن أبي طالب ص١١ (ماستەرنامەیەکە بەسەرپەرشتی ئەکرم عومەری).

لێوەرگرتووە،[1] ئەوانەش کتیبی فەرمودەو تەفسیرو (فقه)و مێژوو (رجال)و رەچەڵەکناسیو هەواڵو وێژەیە، زۆرجاران هەواڵە دەکاتە سەر ناوی دانەرەکان، بێ ئەوەی باسی ناونیشانی کتێبەکانیان بکات، بە دەگمەن خوێنەر هەواڵە دەکاتە سەر دانەرو کتێبەکەی پێکەوە.[2] جاری واش هەیە دەقەکە وەکو خۆی لە سەرچاوەکە وەردەگرێت، یان ماناکەی دەهێنێت، یان کورتیان دەکاتەوە، ئەوەش گرنگیی زۆری هەیە لە چارەسەرکردنی کێشەی دەقەکان لە رێگەی کۆکردنەوە لە نێوانیاندا، ئەگەرنا یەکێکیان پێشدەخاتە سەر ئەویتریان، هەروەها گرنگیی لەوەدایە کە ئیبنوحەجەر بڕیار دەدا لەسەر ریوایەتەکان بە (تصحيح)و (تحسين)و (تضعيف)، جگە لە بەدواداچوونە هەمە جۆرەکانی لەسەر ئەو دانەرانەی لیان وەردەگرێت.

بیگومان هەندێ لەو کتێبانەی کە ریوایەتگەلێك دەهێنێت مۆرکێکی فیقهی پێوە دیارە، زانیاریی گرنگ پێشکەش دەکەن دەربارەی سیستمی ئیسلامی دارایو کارگێڕی لە سەردەمی خیلافەتی راشیدە، لە سەروشیانەوە کتێبی (ألأموال)ی ئەبوعوبەید قاسمی کوڕی سەلام (٢٢٤ك)، کە گرنگترین سەرچاوەیە باس لە سیستمی دارای بکات لە سەرەتای ئیسلام، باسی جۆرەکانی ماڵو سەروەت دەکات وەکو دەستکەوتەکانی (الغنائم والصفايا والفيئ)و مامەڵەی ناوچە والأکراوەکانو ئەو ماڵانەی بە پی رێککەوتننامە بە دەست دەهات و هەروەها بەخشینو خەڵاتو ئەو مولکانەی دەدرایە کەسانێکی دیاریکراوو پێنج یەكو زەکات، ئیسنادی ریوایەتەکانیشی باسکردووە.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری دوروسنەوەی وا بۆی دەچێت کە کتێبی (ألأموال) باشترین کتێبە نووسرابێت لە بوارە فیقهی یەکاندا، بۆچوونیشی وایە کە ئەبوعوبەید راوبۆچوونەکانی هەردوو مەزهەبی مالیکیو شافیعی رەچاو کردووە،[3] بەڵام تەبەرییو ئیبنو سورەیج بۆچوونێکی تریان هەیە، پرسیاریان لێکرا دەربارەی کتێبە فیقهی یەکانی ئەبوعوبەید، وتیان: هیچ نی یە، نابینین کتێبی (ألأموال)ی کە باشترین کتێبێتی چۆن بنیاتی ناوە لەسەر بابەتی ناڕەسەن، شتی هەڵەشی کردووە، بە بەڵگە.

---

١) يحي بن إبراهيم اليحي: الروايات التأريخية في فتح الباري ـ الخلافة الراشدة والدولة الاموية ـ کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە (نامەیەکی دکتۆرایە لە زانکۆی ئیسلامیی لە ساڵی ١٤١١ك بەسەرپەرشتی ئەکرەم عومەری). محمد الامين الشنقيطي: السيرة النبوية في فتح الباري (نامەیەکی دکتۆرایە لە زانکۆی ئیسلامیی ساڵی ١٤١٣ك بە سەرپەرشتی ئەکرەم عومەری).

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٣) الخطيب: تأريخ بغداد ١٢: ٤٠٥.

ئەمجا وتیان: ئەو کەسانە شیاوی ئەوتۆ کارێك نین، بەلای زۆرەوە زمانەکەیان هەیە، ئەگەر فیقهت دەوێت برۆ بەلای کتێبەکانی شافیعیو داوودو هاوتاکانیان.[1]

رێژەی ریوایەتی (صحيح)و (حسن) بەرانبەر کۆی ئەو ریوایەتانەی کە پەیوەندیان هەیە بە ژیانی ئابووری یەوە لە خیلافەتی عومەر (رەزای خوای لێبێت) (٣٥٪)ە.[2]

کتێبێکی تر کە شایانی ئاماژە پێکردنە (شرح معاني الآثار)ی ئەبوجەعفەر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەلامەی ئەزدیی حەنەفی یە (٣٢١ك)، کە هەندێ پێشینەی فیقهی روون دەکاتەوە دەربارەی خیلافەتی راشیدە.

ئەم سەرچاوە سەرەتاییانە ریوایەتی رەسەنمان پێشکەش دەکەن دەربارەی سەردەمی خیلافەتی راشیدە، گومانیش نی یە کە هەندێ سەرچاوەی لاوەکی هەن هەر قسەکانی ئەوان دووپات دەکەنەوە، بە دەگمەن شتیکی تازە دەربارەی ئەو سەردەمە پێشکەش دەکەن، هەر چەند دەوڵەمەند دیارن لە رووی زانیاریی سەردەمەکانی تر، وەکو (الكامل في التأريخ)ی ئیبنولئەسیر (٦٣٠ك)و (البداية والنهاية)ی (إبن كثير)، بەڵام سەرچاوەیەکی درەنگ دانراو هەیە ئەویش (تأريخ الاسلام)ی ئیمامی (الذهبي) (٧٤٨)، کە شایستەی ئەوەیە ئاماژەی پێبکەین، چونکە لە هەندێ سەرچاوەی سەرەتای ونبوو زانیاری یەکانی وەرگرتووە، بۆیە بووەتە سەرچاوەیەك لە جیاتی ئەوان، هەروەها بە هۆی ئەوەی کە بڕیاری (تصحيح)و (تضعيف)ی لەسەر ژمارەیەکی زۆری ریوایەت گرتووەتە ئەستۆ، زەهەبیش رەخنەگرێکی گەورەیە، بیروڕاشی بایەخی یەکجار زۆری هەیە، چونکە ئەو ـ وەکو وتراوە ـ توانای خوێندنەوەو تێگەیشتنی تەواوی هەیە، ئەو بە ئەنقەست ئیسنادە (معلق)ەکانی هێناوەتەوە، ئەوەندەی پێویست زانیوە ئیسنادانێك بهێنێ لە یەك کەس بۆ پێنج کەس پێکهاتبێت، زۆرجاریش بە دانەرێك یان زانایەك پێکدێت وەکو عوروەو زوهرییو وەلیدی کوڕی موسلیمی دیمەشقیو موسای کوڕی عوقبەو موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبێرو موحەممەدی کوڕی عومەری واقیدیو خەلیفەی کوڕی خەیاتو موحەممەدی کوڕی جەریری تەبەریی، بەوەش رانەوەستا

---

١) الذهبي: سير أعلام النبلاء ١٣: ١٠٢، ٣٠١.

٢) عبدالسلام محسن آل عيسى: النواحي المالية في خلافة عمر بن الخطاب، ل٢٦ (ماستەرنامەیەکە بەسەرپەرشتی ئەکرەم عومەری).

کە زانیاریی لە کتێبەکانی مێژوو و ژیاننامەکان وەربگرێت، بەڵکو لە شەش کتێبەکەو کتێبەکانی تری فەرموودەش زانیاریی وەرگرتووە.

بۆ یەکەمجاریش وا دەردەکەوێت کە زەهەبی سوودی لەو کتێبانە وەرگرتووە بە رێگەی (وَجادة)، بەڵام کەسی وردبین پێشبینی دەکات کە ئەو مافی ریوایەتو گێڕانەوەی زۆرێك لەو کتێبانەی هەبێت لە رێگەی بیستن لە زانایان (السماع) یان وەرگرتنی مۆڵەت (إجازە).

### ٣- كتب علم الرجال:

کتێبەکانی ئەم زانستە ژیاننامەی گێڕەروانی فەرموودە دەگێڕێتەوە، لەوانەش هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، کە بریتین لە نەوەی سەردەمی خیلافەتی راشیدە، ئەوان بوون پاڵەوانێتی مێژوویان دروست کردو ئەو سەروەریانەیان بەدیهێنا کە خۆی لە یەکرێزی نەتەوەو پەروەردەکردنیان لە ژێر رۆشنای چەمکی ئاشکراو رێکخستنیان لە رووی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی، بێگومان کتێبەکانی ناسینی هاوەڵان ـ کە یەکێکە لە لقەکانی (علم الرجال) ـ بە گرنگترین ئەو سەرچاوانە دەژمێردرێن کە دەوڵەمەندمان دەکەن بە رووبارێك لە زانیاریی دەربارەی ئەو کەڵەپیاوانە.

کتێبی (فضائل الصحابة)ی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو (معرفة الصحابة)ی ئەبو نوعەیمو (الاصابة في تميز الصحابة)ی حافظ ئیبنو حەجەر لە سەروو ئەو کتێبانە دێنە ئەژمار، بەڵام کتێبی (فضائل الصحابە)ی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (٢٤٠ك) ژیاننامەی خەلیفە راشیدینەکانی بە چڕی باس کردووە، ژمارەی ئەو ریوایەتانەیش پەیوەندیان هەیە بە ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لێبێت) دەگاتە (٥٠٠)، هەندێ زانیاریی گرتووەتەوە خۆی لە سەردەمی نەفامی تاکو کۆچی دوای، لە نیوەشی زیاتر پەیوەندیی هەیە بە چاکەو هەڵوێستە پڕشنگدارەکانی،[1] زۆربەی ریوایەتەکانی ئەم کتێبە راستەو گونجاوە لەگەڵ پێوەری فەرموودەناسان، بەڵام رێژەی (صحيح) لە زیادەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەمبەلدا کەمە، لە لایەکی تریشەوە لاوازیی زاڵە بەسەر زیادەکانی قەطیعی.[2]

---

١) عبدالعزيز سليمان المقبل: خلافة أبي بكر الصديق رضي الله عنه ـ دراسة نقدية للروايات باستثناء حروب الردة، ل١٦ (ماستەرنامەیەکە بەسەرپەرشتی ئەکرەم عومەری).

٢) وصي الله محمد عباس: مقدمة فضائل الصحابة١: ٤١.

سەبارەت بە کتێبی (معرفة الصحابة)ی ئەبو نوعەیمی ئەصفەهانی (٣٣٦ـ ٤٣٠ ك) یەکێکە لە چاکترین کتێبەکانی ناسینی هاوەڵان، ئەو بارودۆخە بۆ ئەبونوعەیم رەخسا لە چاوپێکەوتنی گەورە زاناکان بۆ هیچ (حافظ)ێکی دی نەڕەخسا.[١]

ئەو پێشەوایەکی پێشڕەو و ئیسنادبەرز بوو، شارەزا بوو بە فەرموودەو رێگەکانی، ریوایەتی فراوان، مامۆستای زۆری هەبوو، خاوەنی کۆمەڵێ دانراویش بوو، توێژەرەوەیەکی هاوچەرخ (١٠٢) مامۆستاو (٥٨) قوتابیو (١٠٠) کتێبو نامیلکەی ئەبو نوعەیمی ژماردووە.[٢]

یەکێك لە گرنگی یەکانی ئەو کتێبە ئەوەیە کە ئەبونوعەیم ریوایەتەکان بە ئیسنادی تەواو دەگێڕێتەوە، ئەوەش هەلێك ساز دەکات بۆ رەخنەگرە شارەزاکان کە بتوانن بڕیار بدەن لەسەر سەنەدو ناوەرۆکەکەی.

یەکێك لە گرنگی یە نوێکانی ئەوەیە کە زۆر باسی فەرموودەو (علە)کانی دەکات، لەسەر ئەم هۆکارەیش (إبن کثیر) سەرزەنشتی کردووە، چونکە درێژە دەداتە باسی رەچەڵەکی کەسەکەو زانیاریی دەربارەی،[٣] ئەم رەخنەش لەوە سەرچاوە دەگرێت کە (إبن کثیر) وەك مێژوونووسێك دەڕوانێتە ئەبو نوعەیم نەك فەرموودەناس، ئەمە سەرەڕای ئەوە کە ئەبونوعەیم بە راشکاوی وتوویەتی کە تەنها فەرموودەیەك یان دوان یان زیاتری لە گێڕاوەی هاوەڵان باس کردووە، نەك هەموو ئەو فەرموودانەی لایەتی. ئەو کەسانەش کە فەرموودەیانی دەست نەکەوتووە ژیاننامەیانی دواخستووە[٤].

دانراوەکانی تر لە (علم الرجال) بە تایبەت کتێبەکانی (الجرح والتعدیل) زانیاریی وردمان دەدەنێ دەربارەی حاڵی گێڕەرەوەکان کە هەواڵەکانی سەردەمی خیلافەتی راشیدەیان پێمان گەیاندووە، جیایان دەکاتەوە بە دەستنیشانکردنی ناوو رەچەڵەكو ناوچەکانیان، هەروەها باسی ناوە لەیەك چووەکان دەکاتو پلەو پایەیان روون دەکاتەوە لە زانستو باریان لە رووی متمانە پێکردنو بە لاواز دانانو پەیوەندی یە زانستی یەکانیان بە مامۆستاو قوتابییەکانیان، ئەوەیش دەبێتە زانینی

١) الذهبي: تذكرة الحفاظ ٣: ١٠٩٣.

٢) محمد راضي عثمان: پێشەکییەکەی بۆ (معرفة الصحابة)ی ئەبونوعەیم ١: ٣٠ـ ٥٥ گرنگیی کتێبەکەو سەرچاوەکانی دانەرەکەی روون نەکردووەتەوە.

٣) إبن الاثير: أسد الغابة ١: ٥.

٤) بڕوانە: (معرفة الصحابة)ی ئەبونوعەیم، اكرم العمري: بحوث في تأريخ السنة المشرفة ٧١ـ ٧٢.

پەیوەندییو پچڕانی پەیوەندیی بە سەنەدی ریوایەتەكان، هەموو ئەم زانیاریانەش خزمەتی رەخنەگرتن دەكات لە سەنەدی ریوایەتەكان، هەروەها رەوتی بیروباوەڕو سیاسیان دەخاتە روو و هەلێكیش دەرەخسێنێ بۆ رەخنەگری هاوچەرخ، بۆ ئەوەی بزانێ رەوتی كەسەكە تا چەن كاریگەری هەیە لەسەر ئاراستەی ریوایەتەكە لە رووی شێوە و ناوەرۆكەوە.

ئالێرەشەوە دەردەكەوێت كتێبخانەی ناسینی پیاوانی سەنەد چەند گرنگیی هەیە بۆ رەخنەگرتن لە بابەتی مێژووی، جگە لەوەی كە زانیاریی مێژووی بۆمان دەستەبەر دەكات.

لە راستیدا كارێكی ئاسان نی یە ئێمە باس لە ئەو هەموو دانراوانە بكەین بە شیكراوەی لەبەر زۆریان، بەڵام گرنگە ئاماژە بكەین بۆ كتێبی (تقریب التهذیب) ی ئیبنو حەجەر، چونكە پوختەی حوكمدانی تیایە بەسەر گێڕەرەوەكاندا، هەروەها بۆ بنچینەی ئەم كتێبەش كە (تهذیب التهذیب)ی ئیبنو حەجەر خۆیەتیو لەسەر رۆیشتنی وردی تیایە، هەروەها بۆ بنچینەی ئەم كتێبەش كە (تهذیب الكمال)ی (حافظ)ی میززیە، كە جودای هەیە بە دروستكردنی لیستی درێژو رێكوپێك بۆ مامۆستاو قوتابی یەكان، جگە لە گواستنەوەی وەكو خۆی لە سەرچاوە سەرەتای یەكان.

ژیاننامەكان زیاتر لە كامڵبوون نزیك دەبنەوە كاتێك كتێبی (إكمال تهذیب الكمال)ی (حافظ)ی موغڵەتای یان بخرێتە سەر، چونكە تەواوكەری ئەو ریوایەتانەیە كە میززی پشتگوی خستووە، یان رێگای تیان نەكەوتووە، موغڵەتای شارەزایەكی فراوانی هەیە لەسەر سەرچاوە سەرەكی یەكانو ئەوەی كە دەبێتە تەواوكەر بۆ زانیاریی لە گێڕەرەوەكان، هەركەسێكیش بیەوێت شارەزای پەیدا بكات دەربارەی سەرچاوە سەرەتای یەكانی (علم الرجال) لەوانە ئەو ئارەزووەی لە توێژینەوە پسپۆڕە هاوچەرخەكاندا دەستبكەوێت،[1] پێویستیشە بۆ كەسێك بیەوێت هەڵسێ بە رەخنەگرتن لە ریوایەتەكان لەسەر رێڕەوی فەرموودەناسان، لێكۆڵینەوە بكات لە كتێبەكانی (مصطلح الحدیث) بە تایبەت (علم الجرح والتعدیل)و بنچینەكانی كۆكردنەوەو پێشخستن لە كاتی جیاوازدا.

كتێبی (میزان الاعتدال)ی زەهەبی، و (لسان المیزان)ی ئیبنوحەجەر، كە دوو كتێبی پسپۆڕن لە ناسینی لاوازەكان، لەگەڵ ئەوەش نابێت ئێمە حوكمی لاواز بوون بدەینە سەر هەموو ئەوانەی ژیاننامەیان لەوێ باسكراوە، چونكە هەندێ گێڕەوە هەن رەخنەگران قسەیان لەسەر لاوازكردنیان

١) بڕوانە: أكرم العمري: بحوث في تأريخ السنة المشرفة.

کردووە، بەڵام زەهەبی لە (المیزان) باسیکردوونو بەرگری لێکردوونو گەیشتووەتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەوان جێگای متمانەن.

هەندێکی دیکەش هەن ناویان لە نێو ئەو کتێبانە نابینین، دەبێت پشکنین بکرێت دەربارەیان لە کتێبەکانی تری وەکو (الجرح والتعدیل)ی ئیبنو ئەبی حاتیم، (الثقات)ی ئیبنو حیببانو (تعجیل المنفعة)ی ئیبنو حەجەر، ژمارەیەك گێڕەرەوەی تر هەن لە سەردەمی چوارەمی کۆچی، پێویستمان بە پێداچوونەوەی ژیاننامەکانیان هەیە لە کتێبی (تأریخ بغداد)ی خەتیب.

هەندێ لە گێڕەرەوە درەنگهاتووەکان (المتأخرون)ی سەدەی پێنجەمو شەشەم، لەوانەیە پێویستی زۆرمان نەبێت بە زانینی بارودۆخیان لە رووی لاوازیو متمانەپێکردن سەبارەت بەو ریوایەتانەی گێڕاویانەتەوە لەسەر سەردەمی خیلافەتی راشیدە، چونکە ئەوانە بە زۆری لە کتێبی تر زانیاریی دەگوێزنەوە، لێکۆڵینەوەش لە دانەری کتێب بۆ کۆتای سەنەد ئەنجام دەدرێت، ئەگەر دڵنیای دروست بوو لەسەر راستیی بنچینە دەستنووسەکان.

یەکێك لەو کتێبە گشتگیرانەی دانراون بۆ ناسینی هاوەڵان لە سەدە دواینەکانو بەناوبانگەو جێگای متمانەی خەڵکی یە (أسد الغابة في معرفة الصحابة)ی ئیبولئەسیری جەزەری یە (٦٣٠ك)و کتێبی (الاصابة في تمیز الصحابة)ی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی یە (٨٥٢ك).

سەبارەت بە کتێبی (أسد الغابة في معرفة الصحابة) پێنج بەرگەو دانەرەکەی کۆی کردووەتەوە لە نێوان هەندێ کتێب لە ناسینی هاوەڵان وەکو ئیبنومەندە و ئەبونوعەیمی ئەصفەهانییو موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەصفەهانییو ئیبنو عەبدولبەڕ، زۆرجاران ناوی ئەوانە دەبات لە خاوەنی چوار کتێبەکە کە ژیاننامە باس دەکەن، بە هەندێ هێما کە روونی کردووەتەوە لە پێشەکی کتێبەکەی، ئەوەشی باسکردووە کە ئەو لە هەموو دانەرێك باشترین قسەکانی یان ئەوەی کە نیازی پێدەکەوێت وەریگرتووە، تەنها بە بابەتی نێو ئەو چوار کتێبەش وازی نەهێناوە، بەڵکو هەندێ بابەتی لە چەند کتێبێکی تری بۆ زیادکردووە. ناوی هەندێکیانی بردووە لە پێشەکی کتێبەکەیو هەندێ هەڵەشی لێگرتوون سەرەڕای ئەوەش ئیبنو حەجەر رەخنەی لێگرتوە وتوویەتی: ئەو شوێنی ئەوانەی پێش خۆی کەوتووەو هەندێ ناوی لەگەڵ هاوەڵاندا تێکەڵ کردووە، هاوکات بێ ئاگاشە لە زۆرێك لەو هەڵانەی لە کتێبەکانیان رویداوە.[1]

١) إبن حجر: الإصابة ١: ٤.

ئیبنولئەسیر گرنگیی داوە بە باسکردنی رەچەڵەكو هەواڵو ئەوەی بە هاوەڵ دەناسرێت، زیاتر لە هێنانەوەی فەرموودەو (علة) و رێگەکانی، چونکە دیدی ئەو وایە ئەو باسانە شیاوە لە کتێبەکانی فەرمودەدا بن، ژیاننامەکانی بە شێوازێکی وردو لەسەر سیستمی ئەلفوبێ رێکخستووە، بەو کارەیش دۆزینەوەی ناوەکانی ئاسان کردووە، سەرەتا بە ناوەکان دەست پێدەکاتو ئەمجا بە نازناوو دوایی بە ناوی ژنان.[١]

بەڵام کتێبی (الاصابة في تميز الصحابة)ی ئیبنو حەجەر گشتگیرترین کتێبەکانی ناسینی هاوەڵانە، دانەر بابەتی کتێبەکەی لە ژمارەیەکی زۆر لە کتێبەکانی ناسینی هاوەڵان پوختەکردووتەوە کە پێش خۆی دانراون، هەروەها سودمەند بووە لە کتێبەکانی (الجرح والتعديل)و مێژووی شارە ناوخۆیەکانو کتێبەکانی زەبتی ناوەکانو فەرموودەو تەفسیرو (رقائق)، بە هەمان شێوە سوودی وەرگرتووە لە کتێبەکانی رەچەڵەكو هەواڵو زمانو وێژە. زۆربەی لێوەرگرتنەکانی راستەوخۆیە لەو کتێبانە، ئەوەیش وا دەگەیەنێت کە شارەزای تەواوی هەبووە لەسەریان.

کتێبەکە لە چوار بەرگدایە، سێ بەرگی ژیاننامەی ئەوانەیە بە ناویان ناسراون، ژمارەشی (٩٤٧٧) ژیاننامەیە، بەڵام بەرگی چوارەم باسی ئەوانە دەکات کە بە نازناوو ناسراونو ژمارەیان (١٢٦٨) ناودارە، هەروەها باسی لە ژیاننامەی ئافرەتان کردووەو ژمارەیان (١٥٢٢) ئافرەتە، هەموو ئەم کەسانەش کە باسی کردوون، جێگیر نەبووە کە پلەی هاوەڵێتیان بووبێت، هەر خۆی لە پێشەکی کتێبەکەی پۆلێنی ناوەکانی کردووە بە چوار بەشەوە، بەشی یەکەم: ئەوانەی کە هاوەڵێتیان جێگیر بووە لە رێگەی ریوایەت لە خۆیان، یان کەسی تر، ئیتر ئەو رێگە (صحيح) بێت یان (حسن)، یان (ضعيف) یان بە شێوەیەك باسکراوە کە ئاماژە بەوە دەکات ئەو هاوەڵ بووە، لە هەر رێگەیەکەوە بێت، بەشی دووەم: باس لەو منداڵانە دەکات لە نێو هاوەڵان باسکراون کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە دایکبوونەو پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووەو ئەوان نەگەیشتوونەتە تەمەنی جیاکردنەوە (سن التميز)، ئەوانە زۆر پێدەچێت گەیشتبێتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ. بەشی سێ یەم: ئەوانەن کە باسکراون لە کتێبە کۆنەکاندا کە (مخضرم) بوونە، واتە فریای سەردەمی نەفامیی و سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ کەوتوون، لە هیچ هەواڵێکدا هەرگیز نەهاتووە کە ئەوان پێغەمبەر ﷺ یان چاوپێکەوتبێت، ئیتر ئایا موسڵمان بووبێتن لەژیاندا یان نا، ئەوانەیش بە کۆی دەنگ بە

١) إبن الأثير: أسد الغابة ١: ٦٠٤.

هاوەڵ ناژمێردرێن. بەشی چوارەم: ئەوانەن کە لە کتێبە دێرینەکان بە هاوەڵ لە قەڵەم دراون وەکو هاوەڵ.
ئیبنو حەجەر ژیاننامەکانی بە پی ئەلفوبێ رێکخستووە، لە هەموو پیتێکدا بە بەشی یەکەم دەستی پێکردووە، ئەمجا بەشی دووەم.. هتد.
زۆرجاریش لە ژیاننامەکەدا ناوی ئەو خاوەن کتێبە دەبات لە فەرمووودەناسان کە باسی ئەو خاوەن ژیاننامەی کردووە، گرنگیش دەدات بە پێناسەکردنی رەچەڵەکی هاوەڵەکەو نموونەیەك یان زیاتر باس دەکات لە فەرموودەی ئەو، جاری وایش هەیە هەندێ لە باسی ئەو هاوەڵە لە غەزاکاندا یان رووداوە گرنگەکاندا دەکات، کاتی لە دنیا دەرچوونیشی ئەگەر زانرا بێت تۆماری دەکات.
بێگومان ئیبنوحەجەر بە سوودمەندبوونی لە تێبینییو راستکردنەوەکانی زانایانی پێش خۆیو بەو خستنە سەرە گرنگانە و ئاگادارکردنەوە وردانەی کە لە دوو توی کتێبە مەزنەکەی هاتووە، بێگومان ئەو تایبەتمەندیانە لە کتێبەکانی دیکەی ناسینی هاوەڵان وەدەست ناکەون ئەگەرچی ئەو کتێبانە خاوەنی چاکەی یەکەمو رێگەخۆشکەربوونە بۆی.

## سەرچاوە هاوچەرخەکان:

گرنگترین ئەو سەرچاوانەی سوودم لێوەرگرتوون بۆ کتێبەکەم، سەبارەت بە ئەو بەشانەی پەیوەندیان هەیە بە خەلیفەکان و پشێوی یە ناوخۆیو ئابووری یەکان بریتین لەو توێژینەوە زانستیو نامە زانکۆیانەی کە سەرپەرشتیم کردووە لە زانکۆی ئیسلامی لە شاری مەدینە، کە تیایدا وابەستەی رێرەوی رەخنەگری فەرموودەناسان بووم، بە مەبەستی رەخنەگرتن لە گێراوە مێژووی یەکان، ئەو کارانەش ـ لە راستیدا ـ زۆر ناوازەو پێشرەون لەم گۆرەپانە گرنگەدا، هیوایشم وایە بە زووترین کات رۆشنای ببینن، ئەو توێژینەوانەش بریتین لە: (خلافة أبی بكر الصديق)ی عەبدولعەزیز موقبیل، (النواحي المالية في خلافة عمر بن الخطاب)ی عەبدولسسەلام موحسین ئال عیسا، (خلافة عثمان بن عفان)ی موحەممەدی کوری موحەممەدی عەلی عەواجی، (فتنة مقتل عثمان بن عفان)ی موحەممەد عەبدوڵڵا غەببان، (خلافة علي بن أبي طالب)ی عەبدولحەمید عەلی ناصر فەقیهی، هەموو ئەو نووسەرانەش مامۆستان لە زانکۆی ئیسلامی لە شاری مەدینە، هەروەها (الروايات التأريخية في

فتح الباري ـ عصر الخلافة الراشدة)ی دکتۆر یەحیا ئیبراهیم یەحیا، هەموو ئەم توێژینەوانە لە ساڵەکانی (١٤٠٨ـ ١٤١٢ك) ئەنجامدراون.

بەڵام لە دوا بەشەکانی کتێبەکە پشتم بە ستووە بەوانە بێژی یەکانی خۆم کە ئاڕاستەی قوتابی یەکانی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدام کردووە لە نێوان ساڵەکانی **١٩٦٧ـ ١٩٧٦**زاینی، بێگومان پاش ئەوەی بژارم کردووەو لەسەرچاوە کۆنو نوێکان خستوومەتە سەریان.

# بەشی یەکەم

# جێنشینی (الخلافة)

## باسی یەکەم:

## سیستمی خیلافەت

بیرۆکەی یەك نەتەوەی و یەك فەرمانڕەوای کە یاساو ڕێسای ئیسلامی تیا باڵا دەست بێت، هەروەها ئارەزوی بەهێزی گەیاندنی پەیامی ئیسلامی بۆ دەرەوەی سنووری خۆی، جێگیربوو بوو لای بژاردەی موسڵمانان، کاتێك ڕووبەڕووی ڕووداوی دڵتەزێنی لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بوونەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەربارەی کارتێکردنی ئەو ڕووداوە لە دەروونی هاوەڵاندا دەفەرموێت: ".. لما كان اليوم الذي قدم رسول الله ﷺ المدينة أضاء منها كل شيء، فلما كان اليوم الذي مات فيه أظلم منها كل شيء.. وما نفضنا عن رسول الله ﷺ الايدي حتي انكرنا قلوبنا..".[1]

واتە: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە هەموو شتێکی تیا ڕووناك بوویەوە، ئەو ڕۆژەش تیایدا کۆچی دوای کرد تاریکی باڵی ڕەشی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا، دەستیشمان لە خۆڵی ئارامگاکەی نەتەکاند تاکو هەستمان کرد دڵەکانمان گۆڕاوە.

تەنانەت بە هۆی واق وڕمانەوە، عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) دەیووت: "والله مامات رسول الله ﷺ وليبعثنه الله فليقطعن ايدي رجال ارجلهم[2] ولكن ربه ارسل اليه كما ارسل الى موسى، فلبث عن قومه أربعين ليلة[3] وأخذ بقائم سيفه وقال: لا أسمع احد يقول مات رسول الله الا ضربته بسيفي هذا". واتە: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ نەمردووە، خوای گەورەش دەینێرێتەوەو دەستو قاچی کەسانێك دەبڕێت کە دەڵێن مردووە، بەڵکو خوای گەورە ناردویەتی بە دوایدا. وەکو چۆن ناردی بە دوای موسا، کە چل ڕۆژ لە نەتەوەکەی دواکەوت ئینجا عومەر کردی

١) أحمد: المسند ٣: ٢٢١، والترمذي: سنن ٥: ٥٨٨ وقال: حديث غريب صحيح، وإبن ماجة: السنن ١: ٥٢٢، وقال ابن كثير: إسناده على شرط الصحيحين (البداية والنهاية ٥: ٣٠٨).

٢) البخاري: الصحيح ٥: ٨.

٣) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٤٣٣ باسناد صحيح، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٢: ٢٦٦، ٢٦٩، باسناد رجاله ثقات.

بە مشتی شمشێرەکەیداو وتی: گوێم لە هەر کەس بێت بڵێت پێغەمبەر ﷺ مردووە بەم شمشێرە لێی دەدەم.

خەڵکیی داوایان لە سالمی کوڕی عوبەیدی ئەشجەعی کرد ئەبوبەکر بانگ بکات (ڕەزای خوای لێبێت)، جا لە مزگەوت بینیو هەواڵی مردنی پێغەمبەر ﷺی پێ ڕاگەیاند،[1] دوای ئەوەی ئەبوبەکر چووە ژوورەکەی عائیشەو ڕوومەتی پێغەمبەر ﷺی دەرخست، کە بە پۆشاکێك داپۆشرابوو پی دەگووترا (برد حبرة) ئەمجار ماچی کردو گریاو وتی: "باوكو دایکم بە قوربانت بێت، بۆنت خۆشە بە زیندویو بە مردووی" دوای ئەوە لە وتارێکدا مردنی پێغەمبەر ﷺی ڕاگەیاندو فەرمووی: هەرکەسێك موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد مرد، هەرکەسێکیش خوای گەورەی دەپەرست، ئەوا خوا زیندووەو هەرگیز نامرێت، دواتر ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز خوێندەوەو موسڵمانان دەستیان کرد بە گریان".[2]

لەو ڕووداوەدا، زانیارییو دڵ دامەزراویی و ئازایو جوانیی بیروبۆچوونی ئەبوبەکر بە ئاشکرا دەرکەوت.[3]

سەرەڕای ئەو واق وڕمانەی تووشی بژاردەو موسڵمانان بوو بە گشتیی، گرنگی ڕاگرتنی دەسەڵات لە ئیسلامدا وایلێکردن جووڵە بکەن بە ئاڕاستەی فەرمانڕەوایەك تەنانەت پێش بە ڕێخستنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بەرەو ئارامگای، لەوانەشە هۆکاری ئەو جموجووڵە خێرایە پەیبردنی بژاردەی موسڵمانان بێت بە ترسناکی ئەو بارودۆخەی دەوربەری قەوارەی ئیسلامی دەدا، کە تەنها دە ساڵی بەسەر تێپەڕ بووبوو، کە تیایدا دەوڵەتەکە بنیات نراو فراوان بوویەوە و پشتیوانانی زۆر بوون لە نێو هەرسێ شارەکانی حیجاز، بە تایبەت لە کاتێکدا هۆزە گەورەکان بڵاوەیان کردبوو لە ساراو لادێکانی دەوربەری ناوەندە ئیسلامیەکان لە هەموو لایەك.

ڕێخەرە شەرعیەکانی هەڵبژاردنی بەرپرسی یەکەم بۆ دەوڵەت، لەوە خۆی دەبینێتەوە کە لە هۆزی قورەیش بێت، هەروەها سەنگینی کەسەکە، ئەویش بریتی بوو لە دێرینی لە ئیسلامو خزمەتی بۆ

---

١) الترمذي: الشمائل المحمدية ٣٠٨، والنسائي: كتاب الوفاة ٧٣ و صححه الالباني (مختصر الشمائل المحمدية ١٩٨)، والطبراني: المعجم الكبير ٧: ٥٦ وقال الهيثمي: رجاله ثقات (مجمع الزوائد ٥: ١٨٢).

٢) البخاري: الصحيح ٢: ٩٠ و ٥: ٨، ١٦: ١٧.

٣) ابن حجر: فتح الباري ٧: ٣٠ء ٨: ١٤٦.

پەیامو دەوڵەتەکەی، ئینجا پلەو پایەی ئەو کەسە لای پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ گونجانی کۆمەڵبەستنی موسڵمانان، یان زۆربەیان، سەبارەت بە سەرداریکردنی بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەتو جێنیشینی پێغەمبەر ﷺ.

بژاردەی موسڵمانانیش بریتی بوون لە کۆچکردووەکان (المهاجرون) کە دەیانڕوانیە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) و هەندێکیان لەگەڵ عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) سەرقاڵی بەڕێکردنی تەرمی پێغەمبەر ﷺ بوون، هەروەها پشتیوانان (الأنصار) کۆبوونەوە لە دەوری سەرکردەکەیان سەعدی کوڕی عوبادە لە سەقیفەی بەنی ساعیدە، بۆ تاوتوێ کردنی هەڵوێستی نوێ، جا لەبەرئەوەی پشتیوانان دانیشتووی ڕەسەنی شاری مەدینە بوونو پەنای کۆچبەرانیان داوەو ئاینی ئیسلامیان بە گیانو بە ماڵ سەرخستووەو هەلی ئۆقرەگرتنو پەرسەندنیان بۆ دەستەبەر کردوون، هەروەها ناسراون بە فیدارکارییو ئارامگرتن و قوربانیدان، ئایا مافی سەرکردایەتی دەوڵەتو چاودێری ئیسلامیان نی یە؟

هەواڵی کۆبوونەوەی ئەنصارەکان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە گەیشتە موهاجیرەکان لە کاتێکدا کە ئەوانیش کۆبووبوونەوە لەگەڵ ئەبوبەکر بۆ پاڵاوتنی جێنشینی پێغەمبەر[1] ﷺ. موهاجیرەکان لە نێو خۆیاندا وتیان: "انطلقوا بنا الى اخواننا من الانصار، فان لهم في هذا الحق نصيباً".[2] واتە: با بچین بۆ لای برا ئەنصارەکانمان، چونکە ئەوانیش لەم مافەدا بەشیان هەیە.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: "فانطلقنا نريدهم، فلما دونونا لقينا منهم رجلان صالحان، فذكر ما تمالأ عليه القوم، فقالا: اين تريدون يا معشر المهاجرين؟ قلنا: نريد اخواننا هؤلاء من الانصار، فقالا: لا عليكم الا تقربوهم، اقضوا امركم، فقلت والله لنأتينهم، فانطلقنا حتى اتيناهم في سقيفة بني ساعدة، فاذا رجل مزمل بين ظهرانيهم، فقلت من هذا؟ فقالوا: سعد بن عبادة، فقلت: ماله؟ قالوا: يوعك".[3]

---

١) البخاري: الصحيح ٨: ٢١٠، وعبدالرزاق: المصنف٥: ٤٣٩، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٦١٥، والترمذي: الشمائل المحمدية ٣٠٨، والنسائي: كتاب الوفاة ٧٥، والطبراني: المعجم الكبير ٧: ٥٦، وإبن أبي شيبة: المصنف ١٤: ٥٦٥، وصرح إبن إسحاق بالسماع كما في فتح الباري ١٢: ١٥٣ لإبن حجر.

٢) الترمذي: الشمائل المحمدية ٣٠٨، والنسائي: كتاب الوفاة ٧٥، والطبراني: المعجم الكبير ٧: ٥٦ وصححه الالباني (مختصر الشمائل ١٩٨).

٣) البخاري: الصحيح ٨: ٢١٠.

واتە: پاشان چووینە لایان، کاتێك لیان نزیك بووینەوە دوو پیاوچاکمان تووش بوو لە ئەوانو باسی ئەوەیان کرد کە لەسەری پێکهاتوون، وتیان: بۆ کوێ دەچن، ئەی کۆمەڵی موهاجران؟ وتمان دەچینە لای برا ئەنسارەکانمان، وتیان: چاکترە نزیکیان نەکەونەوە، هەڵسن بە کاری خۆتان، وتم: سوێند بە خوای گەورە دەچینە لایان، بینیمان کەسێك لە نێوانیاندا داپۆشراوە، وتم ئەوە کیە؟ وتیان: سەعدی کوڕی عوبادەیە، وتم: چیەتی؟ وتیان: نەخۆشە".

ئەو دوو پیاوەیش ناویان بە راشکاوی لە هەندێ ریوایەتی صەحیحدا هاتووە کە عوەیمی کوڕی ساعیدەو مەعنی کوڕی عەدی[1] بوون، هەڵوێستیشیان بەڵگەیە لەسەر نەبوونی یەکهەڵوێستیی لای ئەنصارەکان.[2]

وا دەردەکەوێت ژمارەی موهاجیرەکانیش کە چوونە سەقیفەوە کەم بووە، لەوانەشە سەرەتا ئەبوبەکرو عومەرو ئەبوعوبەیدە چووبێتنە ژوورەوە و موهاجیرەکان بە دوایاندا.[3]

مشتومڕێکی زۆریش لە نێوان هەردوولا دروست بوو سەبارە بە مافدارێتی هەر لایەنێك بۆ وەرگرتنی خیلافەت، یەکێك لە ئەنصارەکان باسی ئەو مافدارێتیە دەکاتو دەڵێت: "اما بعد فنحن انصار الله، وكتيبة الاسلام، وانتم معشر المهاجرين رهط، وقد دفت دافة من قومكم، فاذا هم يريدون ان يختزلونا من اصلنا، وان يخصونا من الامر".[4]

واتە: ئێمە پشتیوانانی خواینو دەستە سوارەی ئیسلامین، ئێوەش ئەی دەستەی کۆچکردووەکان کۆمەڵێکن، کەسوکارەکانتان بە ژمارەیەکی کەمەوە دەیانەوێت دامانبڕنو تاکڕەویی بکەن لە دەسەڵاتو ئێمەی لێوەدوور بخەن.

بەڵام موهاجیرەکان ئەبوبەکر بە هێمنیو سەنگینی لە جیاتی ئەوان قسەی کردووە ـ وەکو عومەر وەسفی کردووە ـ وتی: "ماذكرتم فيه من خير فأنتم له أهل، ولن يعرف هذا الامر الا لهذا الحي من قريش، هم أوسط العرب نسباً وداراً، يا معشر الانصار انا واللهماننكر فضلكم، ولا بلاءكم في الاسلام، ولا حقكم الواجب علينا، ولكنكم عرفتم ان هذا الحي من قريش بمنزلة من العرب ليس بها

---

١) عبدالرزاق: المصنف٥: ٤٤٥، وابن أبي شيبة: المصنف ١٤: ٥٦٣، واحمد: المسند ١: ٥٦، والبخاري: الصحيح ٥: ١١٠.

٢) إبن حجر: فتح الباري ١٢: ١٥١.

٣) إبن حجر: فتح الباري ١٢: ١٥٣.

٤) البخاري: الصحيح٨: ٢١٠.

غيرهم، وان العرب لن تجتمع الا على رجل منهم، فنحن الامراء وأنتم الوزراء، فاتقوا الله ولا تصدعوا الاسلام، ولا تكونوا اول من أحدث في الاسلام".[1]

واتە: ئێوە شایستەی هەموو چاکەیەکن دەربارەتان وتراوە، بەڵام ئەم فەرمانە نابێت بۆ کەس بێت جگە لە ئەم گەڕەکەی قوڕەیش، ئەوان لە رووی هەوارو نەژادەوە ناوەندی عەرەبن، ئەی دەستەی ئەنصار، سوێند بە خوا ئێمە نکوڵی ناکەین لە چاکەو پیاوەتی ئێوە، نە لە مەینەتی ئێوەش لە پێناو ئیسلامو نە لەو مافانەیش کە لە سەرمانە، بەڵام ئێوە دەزانن کەس لە نێو هەموو عەرەب ناگاتە پلەو پایەی هۆزی قوڕەیش، عەرەبیش کۆنابنەوە بە دەوری یەك پیاو نەبێت، بۆیە ئێمە فەرمانڕەواینو ئێوەش یارمەتیدەرو پشتیوان، لە خوا بترسنو یەکڕیزیی ئیسلام شەق مەکەنو مەبنە یەکەمین کەسانێك کە رووداو لە نێو ئیسلام دابهێنن.

هەندێ ریوایەتی لاوازیش هاتووە ئەوە دەگەیەنن کە موهاجیرەکان لەم بارەوە نارەزایان لە دژی ئەنصارەکان پیشان داوە پاڵپشت بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ (قريش ولاة هذا الامر).[2]

واتە: فەرمانڕەوای موسڵمانان بۆ قوڕەیشە.

بەڵام وادەردەکەوێت ئەم فەرموودەیان لەیادنەبووبێت، یان ئەوەیە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) ئاماژەی پێکردووە لە نێو قسەکانیدا هێنانەوەی فەرموودەیش وەکو بەڵگە بەهێزتر بوو، چونکە مەسەلەکە لە بەرژەوەندیی موهاجیرەکان یەکلادەبوویەوەو مشتومڕ کۆتای پێدەهات.

ئەنصارەکان لە گۆشەیەکەوە دەیانڕوانیە مەسەلەی خیلافەت کە سنووردار بوو بە بارودۆخی کۆمەڵی مەدینەو پەیوەندی یە مێژووی یەکانی نێوان هەردوولا، بەڵام موهاجیرەکان لە روانگەیەکی فراوانترو لەسەر ئاستی تێکڕای دەوڵەتەکە تەماشای ئەم مەسەلەیەیان دەکرد، هەروەها ئەوەیان لەبەر چاو دەگرت کە دەرچوونی دەسەڵات لە دەستی قوڕەیش چ ئاکامێکی ترسناکی لێ وەدەردەکەوێت، عەرەب بە سەرکردایەتی ئەوان قایل دەبن، بەڵام ئەگەر ئەنصارەکان فەرمانڕەوایان گرتە دەست، ئەوا مەترسی دروستبوونی وەها قڵیشانەوەیەك دروست دەبێت، ببێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی ئیسلامی.

---

١) إبن أبي شيبة: المصنف ١٤: ٥٦٣ وصرح إبن إسحق بالسماع كما في فتح الباري ١٢: ١٥٣.

٢) أحمد: المسند١: ٥ باسناد رجاله ثقات لكنه من مرسل حميد بن عبدالرحمن الحميري وهو ثقة فقيه، وحسنه البزار وابن تيمية (إبن تيمية: منهاج السنة النبوية١: ٥٣٦، والمتقي الهندي: كنز العمال ٥: ٦٣٨ عن إبن المنذر).

هەندێك لە ئەنصارەكان بیرۆكەی ئەوەیان خستەڕوو گوایە دوو فەرمانڕەوا دیاریی بكرێت لە هەردوولا[1] بەڵام ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموی: "لا، ولكنا الامراء وانتم الوزراء"[2] واتە: نەخێر، بەڵكو ئێمە فەرمانڕەواینو ئێوە یارمەتیدەرو پشتیوانمانن". عومەریش فەرمووی: "سیفان في غمد واحد!! إذاً لا يصلحان" واتە: دوو شمشێر لەیەك كێلانەدا هەرگیز ڕێك ناكەوێت.[3]

ئالێرەدا یەكێك لە نووسەرانی سرووش كە زەیدی كوڕی سابیت بوو وتی: "ان رسول الله ﷺ كان من المهاجرين، ونحن أنصارهم كما كنا انصار رسول الله ﷺ".

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە موهاجیرەكان بوو، ئێمەش پشتیوانی ئەوان بووین، وەكو چۆن پشتیوانی پێغەمبەر ﷺ بووین، ئەمجا ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ".. جزاكم الله من حي يا معشر الانصار، وثبت قائلكم، والله لو فعلتم غير ذلك لما صالحناكم".[4]

واتە: خوا پاداشتی چاكەتان بداتەوەو بێژەرتان دابمەزرێنێ، سوێند بە خوا جگە لەم كردارەتان كردبا لەگەڵتان ڕێكنەدەكەوتین.

بەم شێوازەش هۆزی خەزرەج خۆیان دابەزین لە بۆچوونەكەیان وەدووی ڕاستیی كەوتنو ڕەچاوی بەرژەوەندیی ئیسلامیان كرد. دابەزینەكەشیان لەبەر ئەوە نەبوو گوایە هۆزی ئەوس ئارەزوویان لە فەرمانڕەوای هۆزی خەزرەج نەبوو، وەكو ئەبو میخنەفی مێژوونووس بانگەشە دەكات[5] .

---

١) احمد: المسند ٥: ١٨٥ باسناد صحيح، وإبن سعد: الطبقات ٣: ٢١٢، وغبن أبي شيبة: المصنف ١٤: ٥٦١، والبلاذري: أنساب الاشراف (الشيخان) ٦٥، والطبراني: المعجم الكبير ٥: ١١٤. وصححه إبن كثير: البداية والنهاية ٥: ٢٨١.

٢) البخاري: الصحيح ٥: ٨.

٣) الترمذي: الشمائل المحمدية ٣٠٨، وصححه الالباني (مختصر الشمائل ١٩٨)ـ والنسائي: كتاب الوفاة: ٧٥، والطبراني: المعجم الكبير ٧: ٥٦.

٤) أحمد: المسند ٥: ١٨٥ باسناد صحيح، وابن أبي شيبة: المصنف ٤: ٥٦١، وإبن سعد: الطبقات ٣: ٢١٢، والبلاذري: أنساب الاشراف ٦٥، والطبراني: المعجم الكبير ٥: ١١٤. وصححه إبن كثير: (البداية والنهاية ٥: ٢٨١).

٥) الطبري: تأريخ ٣: ٢٢١ـ ٢٢٢ عن أبي مختف.

**باسی دووەم:**

**خیلافەتی ئەبوبەکر ((ڕەزای خوای لێبێت))**

پاش ئەوەی راوبۆچوون لەسەر ئەوە جێگیر بوو یەکێ لە موهاجیرەکان بۆ جێنشینیی دەشتنیشان بکرێت، ئەبوبەکر هەڵسا بە پاڵاوتنی یەکێك لە نێوان دوو کەسدا: عومەرو ئەبوعوبەیدە، عومەر وتی: "بل نبايعك أنت، فانت سيدنا وخيرنا، واحبنا الى رسول الله ﷺ".[1]

واتە: بەڵکو بەیعەت بە تۆ ئەدەین، تۆ سەرگەورەو چاکترینی هەمووماننی، هەروەها خۆشەویسترین کەس بووی لای پێغەمبەر ﷺ.

هەروەها چاکەو جوامێریی ئەبوبەکری وەبیرهێنایەوە و وتی: "ألستم تعلمون ان رسول الله ﷺ قد أمر أبابكر أن يصلي بالناس، فأيكم تطيب نفسه أن يتقدم أبابكر؟ قالوا نعوذ بالله أن نتقدم أبابكر".[2]

واتە: ئایا نازانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبوبەکر کرد کە پێشنوێژی موسڵمانان بکات؟ کامتان دڵتان رێگەتان دەدات پێشی ئەبوبەکر بکەون، وتیان: پەنا ئەگرینە خوا پێشی ئەبوبەکر بکەوین.

"بە بەرچاوخستنی ئەو ریوایەتە راستانەی پێمان گەیشتووە سەبارەت بە کۆبوونەوەی سەقیفەو بەیعەتدان بە ئەبوبەکر وەك خەلیفەیەك، وا دەردەکەوێت کۆبوونەوەکە درێژخایەن نەبوو، چەنوچوونی زۆریش نەکەوتە نێوان موهاجیرو ئەنصارەکان، یان ململانێ لەسەر وەرگرتنی خیلافەت، یان بەکارهێنانی توندوتیژیی و هەڕەشەو بەیەکداچوون لە نێوان ئامادەبوواندا، چونکە هەندێ هەواڵی نادروست کۆبوونەوەی سەقیفە بەو شێوازە دەردەخات و نووسەرە هاوچەرخەکانیش ئەو هەواڵانەیان وەکو خۆی گواستووەتەوە،[3] رووی گەشی ئەو کۆبوونەوە مێژوویی یە بەرێزەیان شێواند کە بڕیاری چارەنووسی خیلافەتو دەوڵەتی ئیسلامی تیا درا بە ئەوپەڕی ئازایەتییو هەستکردنی زۆر بە لێپرسراوێتی کە لە سەرووی هەموو حەزو ئارەزوویەکەوە بوو.

---

١) البخاري: الصحيح ٨: ٢١١و ٥: ٨.

٢) النسائي: السنن ٢: ٧٤ـ ٧٥ وحسنه الالباني (صحيح سنن النسائي ١: ١٦٨). إبن سعد: الطبقات الكبرى٢: ٢٢٤و ٣: ١٧٨، وإبن أبي شيبة: المصنف ١٤: ٥٦٧، واحمد: المسند١: ٢١٣ (. شاكر) وصحيح إسناده أحمد شاكر، وله شاهد ١: ١٧٢ (ط. شاكر) وصححه أحمد شاكر. واحمد: فضائل الصحابة ١: ١٨٢ باسناد حسن.

٣) عبدالعزيز بن سليمان المقبل: خلافة أبي بكر الصديق ٤٢.

ئەوەی راستیی بێت ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) هیچ کاتێك سوور نەبوو لەسەر فەمانڕەوای، بەڵکو پی ناخۆش بوو بەوکارە هەڵسێ بە بۆنەی ئاگاداربوونی لە مەزنی لێپرساوێتی لە لای خواو مەترسی روودانی کەموکوڕیی تیایدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هاوەڵان دەیانزانیی ئەو لە هەمویان مافدارترو شیاوترە، چەندین جاریش باسی هەست و نەستی خۆی بۆ موسڵمانان دەکردو دەیگوت:

"والله ما كنت حريصاً على الامارة يوماً ولا ليلة قط، ولا كنت راغباً فيها، ولا سألتها الله عزوجل في سر و علانية، ولكني اشفقت من الفتنة، و مالي في الامارة من راحة، ولكن قلدت أمراً عظيماً مالى به من طاقة، ولابد الا بتقوية الله عزوجل، ولوددت أن أقوى الناس عليها مكاني اليوم".[1]

واتە: سوێند بە پەروەردگارم، هەرگیز رۆژێك یان شەوێك من سوور نەبووم لەسەر وەرگرتنی فەرمانڕەوای، نە ئارەزوویشم لی بووە، نە لە خوای گەورەشم داوا کردووە چی بە پەنهانی یان بە ئاشکرا، بەڵام من مەترسی ئاژاوەم بوو، ئەگەرنا ئاسوودەیم نی یە لە فەرمانڕەوای، ئەمە کارێکی مەزن بوو بە من سپێردراو لە توانامدا نی یە مەگەر بە یارمەتی و پشتیوانی خوای گەورە نەبێت، بریا کەسێکی لە من بە تواناتر لەم جێگایەم بوایە.

جا بڕوانە ئەم سۆزو هەستە بەتینە، چەند خاوەنێکی پایەبەرزو ئاگاداری هەیە بە مافەکانی خوای گەرەو موسڵمانان، ئەوەیە دینداریی پتەوو پشت بەستنی راستیی بە خوای گەورە، ئەوەیە خۆ بە کەمزانینو راستگۆی لە ئاواتو خۆزگەکانیدا، هیچ رێگەچارەیەکی نەبوو جگە لە قبووڵ کردنی خیلافەت لە پێناو سەرکردایەتیی موسڵمانان بەرەو یەکبوونو ئیمانو بەرزکردنەوەی بەیداخی پەیامی ئیسلام، سەرەڕای ئەوەی دەروونی گوێڕایەڵی نەبوو بۆ چوونە ژێر باری ئەو لێپرساوێتی یە قورسە، لەبەر مەترسیو کەمووکووڕی و زیادەڕەوی، ئەم شێوەیەش دەردەکەوێت کە وەرگرتنی ئەبوبەکر بۆ ئەرکی جێنشینی خۆبەختکردن بوو لە پێناو بەرژەوەندیی ئاینی ئیسلامو نەتەوەکەی، نەك دەستکەوتێك بێت هەوڵی بۆ دابێت، خوای گەورەش پشتیوانی ئەبوبەکر بوو لەبەر پاکیی نیەتو راستیی ئاراستەکەی.

---

١) أخرجه موسى بن عقبة في مغازيه (الذهبي: تأريخ الاسلام٣: ٨، وإبن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٤١، قال ابن كثير: اسناده جيد، البداية والنهاية ٥: ٢٨١، والحاكم: المستدرك ٣: ٦٦ وصححه ووافقه الذهبي).

ئەمەو بەیعەتی ئەبوبەکر لە سەقیفە بە بەیعەتی تایبەت ناسرا کە لە رۆژی دووشەممە ١٢/ ربیع الاول ساڵی ١١ کۆچی بوو، رۆژی دوای ئەوەش (سێشەممە)[١] ئەبوبەکر روویکردە مزگەوت و خەڵکیی پەیمانیان پێداو ئەوە بە بەیعەتی گشتیی ناوزەد کرا، لە پاش وتارێك کە عومەری کوڕی خەتتاب پێشکەشی کردو تیایدا داوای لێبوردنی کرد سەبارەت بە هەڵوێستی لە نکوڵی کردن لە مردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەمجا باسی لە پلەو پایەی و هاوەڵێتی و کۆچکردنی ئەبوبەکر کرد، ئەبوبەکریش بێدەنگ بوو قسەی نەدەکرد، تاکو عومەر کۆتای بە وتارەکەی هێناو داوای لە ئەبوبەکر کرد بچێتە سەر مینبەرو بەیعەت لە خەڵکیی وەربگرێت،[٢] شایەتحاڵێك کە خۆی ئامادە بوو لەوێ باسی شێوازی بەیعەتەکە دەکاتو دەڵێت: کۆمەڵێك خەڵك لە ئەبوبەکر کۆدەبوونەوەو پیانی دەگوت: بەیعەتم پێبدەن لەسەر گوێڕایەڵی بۆ خوای گەورەو قورئانەکەیو ئەمجا بۆ فەرمانڕەوا .[٣]

دوابەدوای ئەم بەیعەتە گشتی یە، ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) دەستی کرد بە وتاردان و وتی: "إني وليت عليكم ولست بخيركم، فان أحسنت فاعينوني، وان أسأت فقوموني، الصدق امانة، والكذب خيانة، والضعيف فيكم قوي عندي حتى آخذ الحق منه ـ إن شاء الله ـ لا يدع قوم الجهاد في سبيل الله الا ضربهم الله بالذل، ولا تشيع الفاحشة في قوم الا عمهم الله بالبلاء، أطيعوني ما أطعت الله ورسوله، فاذا عصيت الله ورسوله فلا طاعة لي عليكم، قوموا الى صلاتكم يرحمكم الله.."[٤]

واتە: من کرام بە فەرمانڕەوای ئێوە لە ئێوە باشتر نیم، جا ئەگەر چاکم کرد یارمەتیم بدەن، ئەگەرنا راستم بکەنەوە، راستگۆی ئەسپەردەیە، درۆکردنیش ناپاکی یە، بێهێزتان لام بەهێزە تا مافەکەی بۆ دەگێڕمەوە، ـ بە پشتیوانی خوای گەورە ـ بە تواناتانیش لام بێتوانایە تاکو مافەکەی لێوەردەگرمەوە ـ بە پشتیوانی خوای گەورە ـ هەرگیز خەڵکانێك پشت لە جیهاد هەڵناکەن تا خوای

١) عبدالعزيز المقبل: خلافة أبي بكر ٥٧ـ ٥٨، والطبري: تأريخ ٣: ١٩٩، والسهيلي: الروض الانف ٤: ٢٧٠، وابن كثير: البداية والنهاية٥: ٢٨٦، والخزاعي: تخريج الدلالات السمعية ٣٦، وابن حجر: فتح الباري ٨: ١٢٩.

٢) البخاري: الصحيح ٩: ١٠٠، وعبدالرزاق: المصنف ٥: ٤٣٧.

٣) الحارث أبي أسامة: المسند باسناد حسن (الهيثمي: بغية الباحث ٣: ٧٥٣).

٤) إبن هشام: السيرة النبوية ٤: ٦٦ زصحيح إسناده إبن كثير (البداية والنهاية ٥: ٢٨٠و ٦: ٣٤٠) وعبدالرزاق: المصنف ١١: ٣٣٦ من طريق معمر قال: حدثني بعض أهل المدينة (بعض أصحابي).

گەورە ریسوایان نەکات، داوێن پیسیش لە ناو هەرنەتەوەیەك بڵاوبێتەوە خوای گەورە بەڵایان بەسەرا بڵاودەکاتەوە، گوێڕایەڵیم بکەن تا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری دەکەم، ئەگەر لە قسەی خواو پێغەمبەر لامدا، کەس بۆی نی یە بە قسەم بکات، هەڵسن بۆ نوێژەکانتان بەر رەحمەتی خوا کەون".

ئەم کورتە وتارە باسی پەیوەندیی فەرمانڕەواو فەرمان بە سەراکراوانی لە خۆگرت، ئەوەشی ئاشکرا کرد کە هاتنی بۆ جێنشینیی بە ویستی موسڵمانانو بە پی گرێبەستێکی روونو ئاشکرایە، گوێڕایەڵیی لە لایەن خەڵکەوە، بەرانبەر پابەندبوونی فەرمانڕەوا بە شەریعەتی ئیسلامەوە، هەروەها چاودێریکردنی موسڵمانان بۆ سیاسەتی بەڕێوەبردنی خەلیفەو یارمەتیدانی لە سەر چاکەو راستکردنەوەی سەروکاری ئەگەر لە رێگا لایدا، هەروەها لە وتارەکەیدا هاتووە کە خەلیفە بەرپرسیارە لە راگرتنی دادوەریی و جیهادو پاراوکردنی کۆمەڵگا لە هەموو جۆرە لادانێکی رەوشتیی، ئەمە جگە لە خۆبەکەمزانینی صددیق کە بە ئاشکرا لە سەرەتای وتارەکەی دەردەکەوێت.

لە راستیدا هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بۆ خیلافەت بەرزراگرتنی بەها ئیمانیەکانو ملکەچی پێوەرە کەسێتی یەکان بۆ ئەو بەهایانە پیشان دەدا، چونکە ئەبوبەکر لە هۆزی تەمیم بوو، تەمیمیش لاوازترین هۆزەکانی قورەیشە.

هەروەها ریوایەتە راستەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە راوێژ پێنەکردنی سەبارەت بە مەسەلەی خیلافەت زویر بوو، بەڵکو ئەو ریوایەتەی کە لە بوخاریی و موسلیمدا هاتووە ئاماژە بەوە دەکات کە عەلی شەش مانگ لە بەیعەتی ئەبوبەکر دواکەوت، هۆکاری دواکەوتنەکەشی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبوبەکر بە قسەی فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺی نەکردووەو کاتێك داوای میراتی باوکی کردووە لە مەدینە و فەدەكو پاشماوەی پێنج یەکی خەیبەر، ئەبوبەکریش نارەزای دەربڕی پاڵپشت بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: "لا نورث ما ترکناه صدقة". واتە: ئێمەی پێغەمبەران میراتمان بۆ کەس نیە، ئەوەی بە جی دەهێڵین خێرو صەدەقەیە. بۆیە فاتیمە تووڕە بوو لە ئەبوبەکرو پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاند تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد، لە دوای مردنی فاتیمە، عەلی لە مزگەوتدا پاش نوێژی نیوەڕۆ بەیعەتی بە ئەبوبەکر دا.[1]

---

١) البخاري: الصحيح ٥: ١٧٧، ومسلم: الصحيح ٣: ١٣٨٠.

ئەمە بەهێزترین ریوایەتە پێمان گەیشتووە سەبارەت بە بەیعەتی عەلی بۆ ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێبێت). بەڵام لە لایەکی ترەوە هەندێ ریوایەتی دروست هاتووە ئەوە دەگەیەنێت کە عەلی لە ڕۆژی بەیعەتی گشتیدا لە مزگەوت بەیعەتی داوەو هۆکاری تووڕەبوونی خۆی ڕوونکردۆتەوەو وتوویەتی: "ما غضبنا إلاّ لأنّا اخرنا عن المشاورة، وانا نرى أبابكر أحق الناس بها بعد رسول الله ﷺ، إنه الصاحب الغار، وثاني اثنين، وأنا لنعلم شرفه، وكبره، ولقد أمره رسول الله ﷺ بالصلاة بالناس وهو حي".[1]

واتە: ئێمە لەبەر ئەوە زویر بوین، چونکە دواخراین لە ڕاوێژکردن، ئەگەرنا ئێمە ئەبوبەکر بە مافدارترین کەس دەزانین لە پاش پێغەمبەر ﷺ، ئەو هاوڕێ ئەشکەوتەو (ثاني اثنين)ە کە خوای گەورە باسی کردووە، ئێمە بە مەزنیی و شکۆی ئەبوبەکر دەزانینو پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵی ژیانیدا فەرمانی پێکردووە پێشنوێژیی موسڵمانان بکات.[2]

ئیبن کەسیرو ئینوحەجەر ئەم ریوایەتە ڕاستەیان پێکەوە گونجاندووە، بەوەی وتوویانە عەلی سەرەتا بەیعەتی لەگەڵ خەڵکیی داوە، بەڵام دوای کۆچی فاتیمەی خێزانی بەیعەتێکی دیکەی داوە وەکو سەلماندنو دووپاتکردنەوە بۆ بەیعەتی یەکەمو لابردنێکیش بۆ شوێنەواری ئەو مامەڵە ناخۆشەی ڕوویدا، بە هۆی ناکۆکی لەسەر میراتی.

١) موسى بن عقبة: المغازي (الذهبي: تأريخ الاسلام ٣: ٨، وإبن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٤١ باسناد صحيح، عەلی کە بە ڕەزامەندیی خۆی بووە بڕوانە: کتێبی (السنه)ی عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد ٢: ٥٦٣.

٢) إبن كثير: البداية والنهاية ٥: ٢٨١، ٣٢١، ٦: ٣٤١، وإبن حجر: فتح الباري ٧: ٤٩٥.

## باسی سێیەم:

## خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)

ئەبوبەکر خوای لیێ ڕازی بێت نەخۆش کەوتو هەستی بە نزیك بوونەوەی سەرەمەرگ کرد، بۆیە ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد سەبارەت بە کێشەی خیلافەت لە دوای خۆیو فەرمووی:

"أني قد نزل بي ما ترون ولا اظنني الا لمأتي، فامروا عليكم من احببتم، فانكم ان امرتم عليكم في حياة مني كان اجدر لا تختلفوا بعدي".

واتە: من ئەوەم بەسەرهاتووە کە دەیبینینو گومانیش نابەم بە کەمتر لە مردن لی دەربچم، جا هەرکەستان پێخۆشە بیکەن بە فەرمانڕەوای خۆتان، چونکە ئێوە ئەگەر لە حاڵەتی ژیانمدا کەسێك هەڵبژێرن شیاوترە کە دوای مردنم ناکۆکیتان نەکەوێتە نێوان.

دوای ئەوەی دەستیان کرد بە ڕاوێژکردن لە نێوان خۆیانداو گەڕانەوە لایو داوایان کرد کە خۆی کەسێکیان بۆ دەستنیشان بکات، ئەویش پرسیاری لێکردن: لەوانەیە جیاوازیتان تیا دروست بێت لە بۆچووندا، وتیان نەخێر، فەرمووی: کەواتە پەیمانی خواتانی لەسەر بێت کە ڕازیی بن، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: مۆڵەتم بدەن تا ببینم بۆ خواو ئاینەکەی و بەندەکانی کێ چاکترە.

دواتر ناردی بە دوای عوسمانی کوڕی عەففان و ڕاوێژی پێکرد، ئەویش ئاماژەی بە عومەر کرد، ئیتر ئەویش فەرمانی پێکرد بەڵێنێکی بۆ بنووسێ.[1]

موسڵمانانیش بە تێکڕای دەنگ بەیعەتیان پێداو پی ڕازیی بوون.[2]

---

١) إبن الجوزي: مناقب عمر بن الخطاب ٥٢ من مرسل الحسن البصري، بەڵام ئەوەی تەبەری باسی کردووە لە تأريخ ٣: ٤٢٩ دەربارەی عومەر (علوان بن داود) لە سەنەدەکەیدایەو ئەویش بە (منكر الحديث) ناسراوە (الذهبي: ميزان الاعتدال ٣: ١٠٨). هەر خۆیشی (علوان بن صالح) لە ڕیوایەتی تەبەری ٣: ٤٣١.

٢) ڕوایەتێك ئاماژە دەکات کە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێت) بە ئەبوبەکری وتووە (ڕەزای خوای لێبێت): "استخلفت على الناس عمر وقد رأيت ما يلقى الناس منه وأنت معه، فكيف به اذا خلا بهم، وأنت لاق ربك فسائلك عن رعيتك ... فقال أبوبكر: أبالله تخوفني: اذا لقيت الله ربي فساءلني قلت: استخلفت على اهلك خير اهلك الطبري: تأريخ ٣: ٤٣٣ وفي اسناده علتان عنعنة ابن اسحق وهو مدلس ومحمد بن حميد الرازي ضعيف.

واتە: تۆ عومەرت کردۆتە خەلیفە لە پاش خۆت، بە چاوی خۆتیش بینییت خەڵکیی چییان لە ئەو چەشت کە خۆیشت لەگەڵیدا بووی، ئەی چۆن دەبێت بەبێ تۆ، تۆیش سبەینێ ڕووبەڕووی خوای خۆت دەبیتەوە و پرسیارت لێدەکات دەربارەی ڕەشو ڕووت.. ئەبوبەکر وتی: بەخوا دەمترسێنی کە ڕووبەڕووی خوای خۆم بوومەوەو پرسیاری لێکرد دەڵێم: باشترین کەسم

هەندێ ریوایەتی لاوازیش هاتووە ناوی ئەو هاوەڵانە دەستنیشان دەکات کە ئەبوبەکر راوێژی پێکردن، لەوانە: عوسمانی کوڕی عەففان، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، سەعیدی کوڕی زەید، ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو هەندێکی تر لە موهاجیرو ئەنسارەکان.

لە راوێژەکانی ئەبوبەکر ئەوە دەرکەوت کە موسڵمانان عومەر بە باش دەزانن بۆ جێنشینیی، بۆیە فەرمانی بە عوسمان کرد بەڵێنامەیەکی بۆ بنووسێت[1] ئەوەی ناوبانگی هەیە لە مێژوودا لەم بارەوە ئەوەیە کە ئەبوبەکر راسپاردەی خیلافەتی کرد بۆ عومەر،[2] لە راستیدا ئەوەش زیاتر نەبوو لە پاڵاوتنێك بە مەبەستی ئامۆژگاریکردنی ئوممەتو رێنموونی سەرانی موسڵمانان کە دەناسران بە (أهل الحل والعقد) بە تەنها پێشنیازکردنیش خیلافەت دانامەزرێت، بەڵکو پێویستی بەوەیە کە سەرجەم موسڵمانان لە سەری قایل بن، بە راستیی ئەوەش بۆ عومەر رەخسا کاتێك تێکڕای موسڵمانان لە شاری مەدینە بەیعەتیان پێدا و دواتریش پەیمانو بەیعەت لە سەرجەم شارو شوێنەکانی تر وەرگیرا.

---

کرد بە خەلیفە لە داوای خۆم، بەڵام لە ئیسنادی ئەم ریوایەتە دوو (علة) هەیە، یەکەم: عەنعەنە کردن لە لایەن ئیبنو ئیسحاقەوە و سەربارى ئەوەی کە مودەللیسە، دووەم: موحەممەدی کوڕی حەمیدی رازیی کە بە بێمتمانە دادەنرێت.

لە رێگایەکی تریشەوە ئەم ریوایەتە هاتووە بە بێ ناوبردنی تەڵحە، بەڵکو وشەی (الناسی) هاتووە لە جێگەی (إبن أبی شیبە: المصنف ١٢: ٣٥ـ ٣٦ فەرمووی ژمارە ١٢٠٦٢ لە مورسەلەکانی (زبید اليامی)یە کە شیعەیەکی عەلەوی بووەو نە ئەبوبەکر نە هیچ هاوەڵێکی گەورەی نەبینیوە، ئەم ریوایەتەیش لەگەڵ حەزو ئارەزووەکانیدا دەگونجێت (أبو نعيم: الاصابە ٢٧٥).

هەروەها دوو هەواڵی تر هاتووە یەکێکیان (مرسل)و ئەویتر (منقطع)ە دەربارەی وتەی صدديق بۆ هاوەڵان: "أترضون بمن استخلف عليكم؟.. وأني فد استخلف عمر فاسمعوا له وأطيعوا، فقالوا: سمعنا وأطعنا (إبن أبي شيبة: المصنف١٢: ٣٨ وفي اسناده الصلت بن بهرام عزيز الحديث، وثقه ابن حبان وسكت عنه البخاري وابن ابي حاتم، ثم ان الخبر منقطع راويه سيار ابي الحكم ت ١٠٢ ه والطبري: تأريخ ٣: ٤٢٨ وفي اسناده محمد بن حميد الرازي ضعف ثم هو مرسل لان راويه أبا السفر لم يلحق أبابكر وعمر.

١) ابن سعد: الطبقات الكبرى٣: ١٩٩ـ ٢٠٠ لە رێگەی واقیدیی، سەرچاوەکانیش لە واقیدییەوە وەریانگرتووە، والبلاذري: انساب الاشراف، (الشيخان) ٧٠، والطبري: تأريخ ٣: ٤١٨ـ ٤٢٩ بە کورتکراوەیی، و ابن الجوزي: مناقب عمر بن الخطاب ٥٤ بە کورتکراوەیی.

٢) الطبري: تأريخ ٣: ٤٢٩، بە ئیسنادێك لە ریوایەتی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف کە خۆی شاهیدی حاڵ بووە.

## باسی چوارەم:

## خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێبێت)

بەیعت بە عوسمان درا (ڕەزای خوای لێبێت) لە ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی شورا کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەستنیشانی کرد پاش لێدرانەکەی، ئەندامانیش شەش کەس بوون: عوسمانی کوڕی عەففان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، زوبەیری کوڕی عەووام، هاوکات عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ئامادەی دانیشتنەکان دەبێت بۆ دەربڕینی ئامۆژگاریی بێ ئەوەی مافی خۆپاڵاوتنی هەبێت بۆ خیلافەت، یان دەنگدان لە بەرژەوەندیی یەکێك لە پاڵێوراوەکان، لە یەکەمین دانیشتنی ئەنجومەندا ئەم وتووێژە ڕوویدا:

عەبدوڕەحمان وتی: ڕاتان بخەنە دەستی سێ کەس لە نێو خۆتاندا.

زوبەیر وتی: ڕای خۆمم دایە دەستی عەلی.

تەڵحە وتی: ڕای خۆمم دایە دەستی عوسمان.

سەعد وتی: ڕای خۆمم دایە دەستی عەبدوڕەحمان.

عەبدوڕەحمان وتی: کامتان لەم مەسەلەیە خۆی دەبورێو لی دەردەچێتو هەڵبژاردنی یەکێك لە دوو کەسەکەی تر بخەینە دەستی، خواو ئیسلامی لەسەر بێت باشترینیان هەڵبژێرێ؟

هەردوو پیاوە گەورەکە، عوسمان و عەلی بێدەنگ بوون.

عەبدوڕەحمان وتی: مافی هەڵبژاردنی یەکێکتانم پێ ئەدەنو خوای گەورە شایەت بێت لەسەرم شیاوترینتان هەڵبژێرم.

وتیان: بەڵێ.[1]

عەبدوڕەحمان سێ ڕۆژ بێ وچان خەریکی ڕاوێژکردن بوو هاوەڵانی ئەنجومەنی شورا، لە سپێدەی ڕۆژی چوارەم ناردی بە دوای هەموو ئامادەبوانی مەدینە لە موهاجیر و ئەنصارەکان، هەروەها ناردی بە دوای سەرکردە سەربازی یەکاندا کە مەبەستی حەج کردن هاتبوون لەگەڵ عومەر، کاتێك کۆبوونەوە عەبدوڕەحمان وتی:

"يا علي أني نظرت في أمر الناس فلم أرهم يعدلون بعثمان، فلا تجعلن على نفسك سبيلا".

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٦٠ـ ٦١).

واتە: ئەی عەلی، من گوێم لە راوبۆچوونی خەڵکیی گرتو بۆم دەرکەوت کە کەس بە هاوتای عوسمان نازانن، بۆیە داواکارم هەموو رێگەیەك لەسەر نەفسی خۆت دابخەیت، ئەمجا بەیعەتی دا بە عوسمانو وتی:

"أبايعك على سنة الله ورسوله والخليفتين من بعده، فبايع عبدالرحمن بن عوف، وبايعه المهاجرون والانصار وأمراء الاجناد والمسلمون".[1]

واتە: پەیمانت پێدەدەم لەسەر رێبازی خوای گەورە و پێغەمبەرو هەردوو خەلیفەکەی دوای خۆی، جا کاتێك عەبدورەحمان بەیعەتی پێدا ئیدی موهاجیرو ئەنسارەکان و سەرکردەی سەربازەکانو تێکڕای موسڵمانان بەیعەتیان پێ دا.

هەندێ ریوایەت راستیش هەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بۆچوونی گشتیی لە سەردەمی عومەر ئەوەبوو کە بەیعەت بە عوسمان بدرێت لە پاش عومەر، کاتێکیش عومەر چاوی بە حوزەیفەی کوڕی یەمان کەوت لە عەرەفات لی پرسی: "من ترى قومك مؤمرين بعدي؟ قال حذيفة: رأيت الناس قد اسندوا أمرهم الى عثمان".[2]

واتە: پێت وایە موسڵمانان کێ دەکەنە فەرمانڕەوای خۆیان لە پاش من؟ حوزەیفە وتی: وا ئەزانم موسڵمانان رای خۆیان داوەتە دەستی عوسمانەوە دوای تۆ.

خاریجەی کوڕی مەزریب دەیوت: ساڵێك لەگەڵ عومەر حەجم کرد، بینیم خەڵکیی گومانیان لەوە نەبوو کە خەلیفە لە دوای عومەر، عوسمان دەبێت و گوێشم لە وشتەوان بوو دەیوت: فەرمانڕەوا لە دوای عومەر عوسمانە، لە خیلافەتی عوسمانیشدا دەیوت: فەرمانڕەوا لە دوای عوسمان عەلی یە.[3]

مەبەستی عومەر لەوەی کە خیلافەتی کرد بە پرسو را لە نێو شەش کەسدا، ئەوە بوو کە بەرپرسێتی لە خۆی دووربخاتەوەو موسڵمانانیش هەڵسن بە ئەنجامدانی راوێژ لە بەرزترین ئاستدا، کە بریتی یە لە هەڵبژاردنی بەرپرسی یەکەمی دەوڵەت.

تەبەری دەڵێت: "ولم يكن في أهل الاسلام أحد له من المنزلة في الدين والهجرة والسابقة والعقل والعلم والمعرفة بالسياسة ما للستة الذين جعل عمر الامر شورى بينهم..".[1]

---

١) البخاري: الصحيح _فتح الباري ١٣: ١٩٣ـ ١٩٤).

٢) إبن شبة: تأريخ المدينة ٣: ٩٣٢ بسند صحيح.

٣) إبن شبة: تأريخ المدينة ٣: ٩٣٢ـ ٩٣٣ بسند حسن.

واتە: لە نێو هەموو موسڵماناندا کەسیان تیادا نەبوو بگاتە پلەو پایەی ئەو شەش کەسەی کە عومەر دەستنیشانی کردن بۆ خیلافەت، لە رووی دینداریی‌و کۆچکردن‌و رابوردووی پرشنگدارو هۆش‌و زانیاریی‌و توانای بەڕێوەبردنەوە.

**باسی پێنجەم:**

**خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رەزای خوای لێبێت)**

عەلی هەڵسا بە کاروباری خیلافەت لە پاش کوژرانی عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێبێت) لە بارودۆخێکی ترسناکدا، لە کاتێکدا کە رق لە دڵانی دژ بە عوسمان زاڵبووبوون بە سەر شاری مەدینەداو گەورە هاوەڵان فەرمانیان لە دەستدا نەمابوو، بەڵکو هیچ دەسەڵاتێکی باڵایش نەمابوو فەرمانڕەوای دەوڵەتی ئیسلام بکات.

ئاژاوەچی یەکان هەوڵیان دەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بکەن بە خەلیفەو هەڕەشەشیان لێکرد ئەگەر رازی نەبێت، بەڵام جگە لە نارەزای هیچیان لێ بەدەستنەهێنا.[2] بۆیان دەرکەوت کە مەسەلەی خیلافەت لە دەستی خەڵکی مەدینەیە لە موهاجیرو ئەنصارو بەشداربووانی جەنگی بەدر، تەواوی خەڵکیش شوێنکەوتووی ئەوانن.[3]

بۆیە خەڵکیی دەست‌و بردیان کرد بۆ لای عەلی بەیعەتی پێبدەن ئەویش نارەزای دەربڕی لە ئاوها بارودۆخێکدا وتی:

"والله إني لاستحي ان أبايع قوماً قتلوا رجلاً قال فيه رسول الله ﷺ (ألا أستحي ممن تستحي منه الملائكة) واني لاستحي من الله ان ابايع وعثمان قتيل على الارض لم يدفن".

واتە: سوێند بە پەروەردگارم شەرم دەکەم لە خوا بەیعەت لە کەسانێك وەربگرم دەستیان لە کوشتنی پیاوێکدا بوو پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك فریشتەکان

١) إبن حجر: فتح الباري ١٣: ١٩٨.

٢) أحمد بن حنبل: فضائل الصحابة ٢: ٨٩٥، وإبن سعد: الطبقات الكبرى٤: ١٥١، وأبو نعم: حلية الاولياء ١: ٢٩٣ هەمووشیان لە رێگەی حەسەنی بەصری بەسەنەدێکی راست.

٣) عبدالحميد علي ناصر فقيه: خلافة علي بن أبي طالب ل٩٢ (ماستەرنامەیەکە لە زانکۆی ئیسلامیی لە مەدینە بە سەرپەرشتی نووسەر)، هەروەها بڕوانە البخاری (فتح الباري ١٢: ١٤٤ـ ١٤٥)، وأحمد: المسند ١: ٣٢٣ بە ئیسنادێکی راست (چاپی ئەحمەد شاکر)، البلاذري: أنساب الاشراف ٢: ٣٥ب.

شەرمی لێدەکەن، ئینجا من تەریق دەبمەوەو شەرمی خوا دەمگرێ بەیعەت وەربگرم، هێشتا تەرمی عوسمان بەخاك نەسپێرراوە. ئیتر ئەوانیش لێگەڕانو وازیان هێنا، لە پاش ناشتنی تەرمی عوسمان خوای لێ رازی بێت، جارێکی دی گەڕانەوە لای عەلیو وتیان: مەحاڵە موسڵمانان بێ خەلیفە بمێننەوە، کەسیش نی یە لە تۆ مافدارتر بێت، عەلی پی وتن: منتان نەوێت، من یارمەتیدەرتم بۆ ئێوە چاکترە لەوەی فەرمانڕەوا بم، وتیان: سوێند بە خوا نازانین کەسێك هەبێت لە تۆ وەبەرتربێت.

لێرەدا زەینو زرنگی عەلی کرایەوە لەسەر سۆنگەیەك کە بەیعەت بە ئاشکرا لە سەرجەم موسڵمانان وەربگرێت، بۆ ئەوەی قین لە دڵەکان بەیعەتێکی تایبەتی پێبدەن، لەگەڵ خۆیدا وتی ـ وەکو دواتر خۆی ئەمەی راگەیاند ـ خوایە گیان من لەوەی بەرەو رووی دەچم ترساوم، پی وتن: "فاذا أبيتم عليّ فان بيعتي لا تكون سرّاً، ولكن اخرج الى المسجد فمن شاء ان يبايعني بايعني".

واتە: ئەگەر هەر رازیی نابن، ئەوا بەیعەت نابێت لە پەنهانیدا ئەنجام بدرێت، بەڵام من دەچمە مزگەوت، کێ ئارەزووی بوو بەیعەتم پێبدات. ئەمجار عەلی دەرچوو بۆ مزگەوتو خەڵکیی بە رەزامەندیی خۆیان بەیعەتیان پێدا،[1] جگە لە تەڵحەو زوبەیر کە نابەدڵ بەیعەتیان دا، رازیی نەبوون لە شێوازی بەیعەت وەرگرتنەکە، چونکە سەرانی هاوەڵان (أهل الحل والعقد) تاوتوی ئەم مەسەلەیان نەکرد، هەروەها ئەنجومەنی شورا بەسترا[2] بۆ ئەو مەبەستە، لەبەر ئەوەی ئاژاوەچی یەکان ئەوانیان بە شێوەیەکی توندو ناشیرین ئامادەکرد بێگومان ئەو شێوازەش سروشتی رووداوەکان دەیسەپاند بە بۆنەی زاڵبوونی عەرەبە بیاباننشینەکان (الأعراب) بەسەر شاری مەدینەدا.[3]

هەندێ لە هاوەڵانیش دووریان گرتو بەیعەتیان بە عەلی نەدا، لەوانە: موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و ئوهبانی کوڕی صەیفی و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، چونکە ئەوان دەیانبینی خەڵکیی کەوتوونەتە نێو بەربەرەکانی و ئاژاوە، بۆیە چاوەڕوان بوون تا بارودۆخ

١) أحمد بن حنبل: فضائل الصحابة ٢: ٥٧٣ بە ئیسنادێکی (حسن)، و البلاذري: أنساب الاشراف ٢: ٣٦أ، والحاكم: المستدرك٣: ١٠٣، وأبو نعيم: الامامة والرد على الرافضة ٣٢٩، والمحب الطبري: الرياض النضرة ٣: ٧٨.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢ : ١٤٤ـ ١٤٥)، وأحمد: المسند ١: ٣٢٣ـ ٣٢٧ (ط، أحمد شاكر)، وإبن أبي خيثمة: التأريخ الكبير، جەڵدی پەنجا ق١٨أ ریوایەتەکەش لە ئیبنو عومەر (منقطع)ەو نابێتە بەڵگە (نسخة المكتبة المحمودية بالمدينة المنورة رقم ٢٨٦ـ ٢٣١).

٣) عبدالحميد على ناصر فقيه: خلافة علي ١: ٩٧.

ئارام بێتەوەو ئە وساتە بەیعەت بدەن، هەروەها بەهەمان شێوە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانو خەڵکی شامو زۆرێك لە خەڵکی بەسرەو میسرو یەمەن بەیعەتیان نەدا لەبەر هەمان هۆ.

بە بۆچوونی ئیبنوحەزم ژمارەی ئەوانەی رازینەبوون بەیعەت بدەن هێندەی ئەوانە بوون کە بەیعەتیان دا، ژمارەشیانی بە سەد هەزار کەس مەزەندە کردووە.[1]

بەڵام زۆرینەی ئەوانەی کە بە (أهل الحل والعقد) ناسراون لە بەشداربوانی جەنگی بەدر و موهاجیرو ئەنصارەکان لە شاری مەدینە بەیعەتیان بە عەلی دا (رەزای خوای لێبێت)و بەوەش بەیعەتەکە دامەزراو عەلی بوو بە خەلیفەی موسڵمانانو دواین جێنیشینی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدەکات "خلافة النبوة ثلاثون سنة، ثم يؤتى الله ملكه من يشاء..".[2]

واتە: جێنشینی پێغەمبەرایەتی سی ساڵە، دوای ئەوە خوای گەورە فەرمانڕەوای دەداتە دەستی هەر کەسێك ویستی لەسەر بێت.

١) إبن حزم: الفصل في الملل والاهواء والنحل٤: ١٦٧.

٢) أبوداود: السنن٥: ٣٦ـ ٣٧، والترمذي: السنن (تحفة الاحوذي) ٦: ٤٧٦ـ ٤٧٨ وحسنه الترمذي، وإبن حجر: فتح الباري ١٣: ١٨٢ ونقل تصحيح ابن حبان له والالباني: السلسلة الصحيحة ١: ٧٤٢ـ ٧٤٩.

## باسی شەشەم:
## قەیرانی خیلافەت و گوێزانەوەی بۆ عێراق

خیلافەتی عوسمان دەرئەنجامێك بوو بۆ كۆبوونەوەكانی ئەنجومەنی شورای عومەر (ڕەزای خوای لێبێت)، كاتێك كە موسڵمانان بە كۆی ڕاو بێناكۆكی ئەویان هەڵبژارد، سیاسەتی عوسمانیش لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، سیمای لێبوردن و فراوانی خەڵات بۆ موسڵمانانو بەردەوام بوونی بزووتنەوەی فتوحاتی پێوە دیار بوو، هەربۆیە نیشانەی دەوڵەمەندیی و بوژانەوەی ئابووریی دەركەوت لە ڕێگەی هەڵقوڵانی داهات بۆ دەوڵەتی ئیسلام، بەم شێوەیەش گۆڕانكاری یەكی فراوان دروست بوو لە بژێویو خواردنو پۆشاكی خەڵكیدا.[1]

موهاجیرو ئەنصارەكان و خاوەن ڕابوردووی كۆشش لە پێناو خوادا، شانسدار بوون زیاتر لەوانەی كە لە كاتێكی درەنگدا گەیشتنە كاروانی جیهاد،[2] زۆرێكیش لەوانە لەو هۆزانە بوون كە لە شارە تازەكان جێگیر بوون (كوفەو بەصرەو فوستات) دواتر بەشداریان كرد لە فتوحاتی وڵاتەكان.

---

١) عمر بن شيبه: تأريخ المدينة ٣: ١٠٢٣ـ ١٠٢٤ بە سەندێكی ڕاست، حەسەنی بەسریی ـ كە خۆی شایەتحاڵێك بووە ـ زۆریی ماڵو سامانی وەسف كردووە، هەروەها لە كتێبی (الاوائل)ی ئەبوهیلالی عەسكەریی ١: ٢٤٦ لە ڕێگەی مەدائینییەوە كە داهاتەكانی (السواد) لە سەردەمی خیلافەتی عوسماندا گەیشتە سەدو بیست ملیۆن درهەم، یەعقوبییش لە تاریخەكەی ٢: ١٥٢ دەڵێت: گەیشتە سەدوبیست ملیۆن درهەم، بەڵام ئیبنو خردازبە لە (المسالك والممالك ١٤) دەڵێت: گەیشتووەتە سەدوبیستو هەشت ملیۆن درهەم. لەوانەشە ئەم جیاوازییە لەلایەن مێژوونووسەكانەوە هۆی ئەوە بێت هەریەكێ لە ئەوان باسی لە داهاتی ساڵێكی دیاریكراو كردبێت، جا زیادو كەم دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی بەروبوومو ڕێژەی دانیشتوان، سەرانەو باجی میسریش دوو بەرانبەر بویەوە و لە سەردەمی خیلافەتی عومەر دەگەیشتە دوو ملیۆن دیناری ئاڵتوون و لە سەردەمی خیلافەتی عوسمان بەرزبوویەوە بۆ چوار ملیۆن دیناری ئاڵتوونی، لەو كاتەی فەرمانڕەوایی میصر عەبدوڵڵای كوڕی سەعدی كوڕی سەرح بوو (البلاذري: فتوح البلدان ٢١٧، وقدامة بن جعفر: الخراج وصناعة الكتابة ١٧٩، ١٨٤)، بەڵام ئیبنولحەكەم باسی لە ژمارەیەكی جیاواز كردووە كاتێك وتوویەتی باجی میسر گەیشتووەتە تەنها دوانزە ملیۆن دینار لە سەردەمی عومەر و چواردە ملیۆن دینار لە سەردەمی عوسمان (فتوح مصر والمغرب ٦٤ـ ٧٠ عن الليث بن سعد وبه أخذ المقريزي: الخطط ١: ٧٩) لەوانەشە ئەوەی بیلازەریی باسی كردووە مەبەستی لە باج بێتو ئەوەی ئیبنوعەبدولحەكەم باسی كردووە مەبەستی سەرانە بووە.

٢) مەبەست لەوانە عەرەبە سارانشینەكان بوو كە روویان كردە بەسرەو كوفە، نەك ئەوانەی خاوەنی پێشەنگ بوون لە جیهاددا، وا دەردەكەوێت كراون بە چوار بەشەوە بە پێی مێژووی پێگەیشتنیان بە جیهاد، بەشی یەكەمو دووەم و سێیەمو چوارەم (تأريخ الطبري ٤: ٤٩، ٢٧٩) زۆرترین موچەیش وەریان دەگرت دەگەشتە پێنج سەد درهەم، كەمترینیش دەگەیشتە

سەرەتاکانی بەرهەڵستیی لە کووفەو بەصرەو میصر، لە نێوەندی هۆزەکان سەری هەڵدا،[1] ئەو کەسەش ڕۆڵی هاندانی گرتە ئەستۆ عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء بوو، پیاوێکی جوولەکە بوو لە صەنعا ئیسلام بوونی خۆی پیشان دا لە سەردەمی خیلافەتی عوسمان، هەروەها هەڵدەسا بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی زۆر کە ڕەخنەی دەگرت لە شەرعیەتی خەلیفەو شێوازی هەڵسوڕاندنی بۆ کارەکانو جەختی لەسەر مافداریێتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەکردو گوایە ئەوانەی پێش ئەو خەلیفە بوون مافی ئەویان پێشێل و زەوت کردووە، ئەمە جگە لەوەی هەندێ سیفەتی خوایەتی دەدایە پاڵ عەلی (ڕەزای خوای لێبێت).

مشتومڕێکی زۆریش ڕوویداوە دەربارەی کەسایەتی ئیبنوسەبەء لە مێژوودا، بەڵام هەمەجۆری سەرچاوەی هەواڵەکان کە هەندێکیان سوننەیەو هەندێکیان شیعەیە وا دەکات ئەستەم بێت بەو بۆچوونە ڕازیی بین کە نکوڵی لە بوونی مێژووی ئەو کەسایەتیە دەکات.

بەرهەڵستکاران بەهانەکانیان لە کردارەکانی خەلیفە عوسمانەوە بۆ دروست بوو، لەوەشدا کورت نەدەبوویەوە کە ناڕەزای دەبڕێت بەرانبەر سیاسەتی ئابووریی عوسمان کە ڕێگەی دا بە ئاڵوگۆڕکردنی زەویو زار لە نێوان عێراقو حیجازدا کە ڕێگەی بۆ دەوڵەمەندەکانی حیجاز هەموار کرد کە ببنە خاوەن ڕووبەرێکی فراوان لە زەوی (سواد)، تەنانەت نەلە نارەزای دەربڕین لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە ڕێگەی پشتبەستنی عوسمان بە خزمە لێهاتووەکانی و لابردنی بۆ هەندێك لە هاوەڵان کە فەرمانڕەوا بوون، بەڵکو ناڕەزایان درێژبوویەوە تا لایەنە چاکەکانیشی گرتەوە، وەکو کۆکردنەوەی قورئان کە کتێبی نەتەوەی ئیسلامی یەکخستو پاراستی کاتێك نەیارەکان ناڕەزایان لە سووتاندنی قورئانەکانی تر دەربڕی.

بەرهەڵستکاران لە هەندێ شارو شوێنەوە هاتنە مەدینەو چل ڕۆژ تیایدا مانەوە، هەندێ گلەیان هەبوو لە عوسمانو ئەویش ڕازی کردن سەبارەت بە داواکاری یەکانیان، دواتر گەڕانەوە شارەکانی خۆیان، بەڵام ئەوان پێش گەیشتنیان بە شوێنەکانی خۆیان، جارێکی تر گەڕانەوە بۆ شاری مەدینەو

---

دووسەد درهەم (تأريخ الطبري٣: ٦١٤) ئەمە لە کاتێکدا مووچەی بەشداربوانی جەنگی بەدرو موهاجیرەکانی قورەیش و عەرەبەکانی تر پێنج هەزار درهەمو ئەنصارەکان چوار هەزار درهەم بوو (إبن سعد: لبطبقات الكبرى٣: ٣٠٤ بسند حسن).

١) ژمارەیان گەیشتە (١٨٠٠) پیاو (٦٠٠) بۆ هەریەکێ لەو شوێنانە بە پێی تەبەری (تأريخ ٤: ٣٤٨ـ ٣٤٩، ٣٦٩) و لەم ژمارەش کەمتر بە پێی مێژوونووسی بیلازەریی (أنساب الاشراف ٥: ٥٩، ٦١).

بۆ ماوەی چل ڕۆژ ئابڵوقەی ماڵی عوسمانیان دا بە مەبەستی ناچار کردنی بۆ وەڵامدانەوەی خواستەکانیان.

دوای ئەوە مەسەلەکە گۆڕاو گەشەی کرد بۆ داواکاریی لادانی عوسمان لە جێنشینیی، کاتێك عوسمان بەوە قایل نەبوو، کوشتیان ـ ناوبراو قەدەغەی کردبوو لەسەر پشتیوانەکانی شەڕ بکەن بۆ بەرگری لێکردنی ـ ئەوەش بووە مایەی قەیرانێکی هەرە گەورە لە ویژدانی موسڵماناندا، دواتریش بووە هۆکاری قڵیشانەوی کۆمەڵگا لەسەر هەندێ بنچینەی بنەمای کە بەڵگەیە لەسەر ئامادەی بۆ سەرخستنی راستییو فیدارکاری لە پێناو بەهاکاندا.

بەم شێوازەش عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) شانسدار نەبوو بە یەکدەنگی لەسەر جێنشینی یەکەی، چونکە کۆمەڵی (أصحاب الجمل) کە بریتیبوون لە عائیشەو زوبێرو تەڵحە خوایان لێ رازیی بێت داوایان لێ کرد تۆڵە لە بکوژەکانی عوسمان بکاتەوە، موعاویەش لەسەر هەمان هۆکار رازیی نەبوو بەیعەتی پێبدات، بۆچوونی عەلی ئەوەبوو کە تۆڵەسەندن دەبێـە مایەی ئاژاوەیەکی بەرفراوان لە نێو ئەو هۆزانەی کە پشتگیریی لێدەکرد، بۆیە پێویستە لەسەر نەیارەکان پەیمان بە خەلیفەی تازە بدەن لە پێناو بەدیهێنانی یەکخستنی میللەتو گوێڕایەڵی بۆ خەلیفەی شەرعی.

بە هۆی ئەم دوو بنەمایە جێبەجێکردنی فەرمانی شەرعو گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای شەرعی، دەیان هەزار لە جەنگاوەرەکانی بەسرەو کوفەو شام دابەشو پەرتەوازە، لە کاتێکدا ئەو شوێنانە قورسی هێزی ئیسلامی لێ پێکدەهاتو گەورەترین سوپاکانی جیهانی پێکدەهێنا لەو سەردەمەدا.[1]

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ (٧٠٠)[2] سەرباز لە شاری مەدینە دەرچوو بەرەو بەسرە بە مەبەستی شەڕکردنی لەگەڵ بەرهەڵستکاران کە دەناسران بە (أصحاب الجمل)، کە ئەوانیش پێپیشتر شاری مەککەیان بەجێهێشتبوو بە نزیکەی هەزار سەربازەوەو دواتریش زۆربەی جەنگاوەرەکانی

١) نزیکەی (٢٠٠) هەزار جەنگاوەر بووە، کووفە تەنها خۆی توانای ئامادەکردنی (٦٠) هەزار جەنگاوەری بووە، جگە لە پیاوانی خزمەتگوزاریی (الطبري: تأريخ ٥: ٧٩ والبلاذري: أنساب د٢، ١ ص ٣٨٤، ٣٨٥) بەصرەش توانای سەربازکردنی (٦٠) هەزار جەنگاوەری هەبوو، میسریش توانای سەربازکردنی (٣٠) هەزار جەنگاوەری هەبوو، شامیش توانای سەربازگری (٨٠) هەزار جەنگاوەری هەبوو.

٢) الطبري: تأريخ ٤: ٤٥٥ من طريق سيف، والبلاذري: أنساب الاشراف ج٢، ١ ص٢٣٣.

بەسرە پەیوەست بوون پیانەوە،[1] ئەمەو عەلی ڕەزای خوای لێبێت پشت ئەستوور بوو بە سەربازەکانی کوفەوە،[2] کە هاریکاریان لەگەڵ کێشەکەی دەکردو هەر بە دڵسۆزی مانەوە بۆی دەیان ساڵ، هەر ئەوانەیش بوونە هۆی بەرهەڵستکاری توند بۆ فەرمانڕەوای ئومەوی، شەڕی جەمەل[3] بیروباوەڕی کۆمەڵگای ئاشکرا کرد بە هەردوو بەشی حکومەتو نەیارەکانەوە و ئاستی کاریگەری بەها ئیسلامی یەکان لە ئاڕاستەکردنیان، هەروەها هەندێ فەرمانی شەرعیی ئاشکرا کرد سەبارەت بە شەڕکردن لەگەڵ زۆردارەکان (البغاة) لە کاتی ئاژاوە ناوخۆی یەکان، هۆزەکانیش دابەش بوونە سەر هەردوو لایەنەکەدا.[4]

جەنگ لە بەرژەوەندیی عەلی تەواو بوو، فەرمانی کرد بە شوێن نەکەوتنی هەڵاتووەکانو هێرش نەبردنە سەر بریندارەکانو حەڵاڵ نەکردنی ماڵو ناموسی نەیارەکان، هاوکات لێبوردنی گشتیی ڕاگەیاند، بەڵاو ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیی لەگەڵ بەرهەڵستکاران کۆتای پێنەهات، چونکە موعاویە هەر لە سەردەمی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمانڕەوای شام بوو، سەرکردایەتی نەیاری یەکی بەهێزتری دەکرد، پشت ئەستوور بوو بە سوپایەکی بەهێزی کەرەستە تەواوی مەشق پێکراو، هەر لەو دەمەی بەرەنگاری سوپاکانی بیزەنتەیان دەکرد بە دەستیان هێنابوو، بەم

---

١) جەنگاوەرەکانی بەصرە دەوری (٦٠) هەزار کەس دەبوون، بەڵام زۆربەیان خۆیان لە شەڕ بە دوور گرت، زۆربەشیان چوونە ریزی ئەصحابولجەمەل، بەڵام (٦) هەزار کەس لە عەشیرەتی عەبدولقەیسی سەر بە بەصرە چوونە ریزی هێزەکانی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) (الطبري: تأريخ ٤: ٤٨٩) ، هەروەها هەندێ لە جەنگاوەرەکانی عەشیرەتی بەکری کوڕی ڕەبیعە کە ژمارەیان بە (٣) هەزار کەس مەزندە دەکرا پەیوەندییان کرد بە عەلییەوە، (البلاذري: أنساب الاشراف ج٢، ١ ص٢٣٧) .

٢) سەربازانی کووفە پتر لە (٤٠) هەزار کەس دەبوون (الطبري: تأريخ ٥: ٧٩ عن طريق أبي مخنف). (٩) هەزار کەسیان پەیوندیان کرد بە عەلی، بە پێی ڕیوایەتی سەیف (الطبري: تأريخ ٤: ٤٨٥، ٤٨٨)، بەلام عومەری کوڕی شەببە دەگێڕێتەوەو کە (١٢) هەزار کەس دەبوون، (إبن حجر: فتح الباري ١٣: ٥٨ بە وەرگرتنی لە (تأريخ البصرة)ی ئیبنوشەببە. ژمارەی سوپای عەلی لە جەنگی جەمەل گەشتە (٢٠) هەزار کەس.. ئەم زانیارییانەش ئەوە دەگەیەنن کە زۆربەی زۆری سوپای ئیسلامیی ئەو کاتە خۆیان لەو جەنگە بە دوورگرت، چونکە ژمارەی سوپای ئیسلامیی لەو سەردەمەدا بە زیاتر لە (٢٠٠) هەزار سەرباز مەزەندە دەکرا.

٣) ژمارەی کوژراوانی هەردوولا بە خەملاندنی ناوەڕاست گەیشتە (٦٥٠٠) کوژراوو بڕوانە: (الارقام في تأريخ الطبري ٤:٢٩، ٥٤٥ وانساب الاشراف ج٢، ١ ص٢٦٤ وخليفة بن خياط، ١: ١٦٦، ١٧١).

٤) دابەشبوونی هۆزەکان لاوازیی دەرمارگیریی بۆ هۆزو نەژاد ئاشکرا دەکات، چونکە پیاوانی یەك هۆز دەبینران لەسەربازگەکانی هەردوولا، بەبێ هیچ گرنگیدانێك بە پەیوەندی یە هۆزایەتی یەکان.

شێوەیەش عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ڕۆیشت بۆ کووفە بە ئامانجی ئامادەکردنی هێزەکانی بۆ جەنگی نەیارەکانی شام، لە ڕاستیدا شەڕی (صففین) شەڕێکی تۆقێنەر بوو، ئەوەندەی نەمابوو جەنگاوەری هۆزەکان پیاوە جوامێرەکانیان لە نێو ببات، ئەگەر مەیلی هەردوو لا نەبوایە بەرەو قایل بوون بە ناوبژی کردن[1] لە پاش بەرزکردنەوەی (٥٠٠) قورئان لە لایەن خەڵکانی شامەوە.[2]

قایل بوونی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بەناوبژیکردن بووە هۆی هەڵگەڕانەوەی چەند هەزار کەسێکی سوپاکەی[3] لە دژیو نارەزای خۆیان بۆ مەسەلەی ناوبژیکردن ڕاگەیاند، چونکە بەلایانەوە ئەوە جۆرێك بوو لە گومانکردن لە شەرعیەتی کارەکەیان،[4] ئەوانەش کەسانێك بوون قورئانیان لەبەر بوو، بەلاّم تێگەیشتنیان بۆ فەرمانەکانی شەریعەت سنووردارو کەم بوو، ئەوانە بڕیاری کافر بوونی عەلی و هاوڕێکانیان ڕاگەیاند، هەڵسان بە پۆلینکردنی خەڵکییو کوشتنی هەرکەسێك کە لەسەر بیروڕای خۆیان نەبێت،[5] هەر بۆیە عەلی کوشتنیانی بەڕەوا زانیو خەریك بوو لە جەنگی نەهرەواندا لە ناویان بەرێت، بەلاّم برینی هۆزەکانیان هەرگیز سارێژ نەبوو و هەر بەردەوامیش بوون لە یارمەتیدانی بزووتنەوەی خەواریجە نەیارەکان، بە درێژای چەند سەدە.

---

١) (١٠٠) هەزار سەرباز کە (٤٠) هەزاری لە کووفەو (٦٠) هەزاری لە بەصرە ڕووبەڕووی هێندەی خۆیان بوونەوە لە خەڵکی شام (ئەمەش بە بنیاتنان لەسەر ئەو زانیارییانەی مێژوونووسەکان باسیان کردووە سەبارەت بە سوپاکان دوای جەنگی صففین، بڕوانە: البلاذري: أنساب الاشراف ٥: ١٣٦)، بەلاّم هێزەکانی میصر لەم ژمارانە کەمتر بوونو بەشداریشیان نەکرد لە شەڕەکانی جەمەلو صففیندا، بێگومان سەرچاوەکان جیاوازییان بووە سەبارەت بە ژمارەکان، بەڵکو لە خودی یەك سەرچاوەدا جاری وا هەیە جیاوازیی تیایە بۆ نموونە بیلازەری لە (أنساب الاشراف ج٢، ١ ص٣٢٢) دەگێڕێتەوە کە سوپای عەلی (٥٠) هەزارو (٧٠) هەزارو (١٠٠) کەس بووە.

٢) الدینوري: الاخبار الطوال ١٨٩، هەروەها بڕوانە: الطبري: تأريخ٥: ٤٨، والبلاذري: انساب الاشراف ج٢، ص٣٢٢.

٣) ئەوانە سەرەتا بە (المحكمة) ناسران، چونکە دادوەریکردنیان ڕەتکردەوەو وتیان: "إن الحكم الا لله"، دواتریش بە (الحرورية) ناسران بە هۆی ڕەچەڵەکیان بۆ لادێی (حروراء)، دواتریش بە (الخوارج) ناسران، بە هۆی دەرچوونیان لە سەر فەرمانی خەلیفەی هەڵبژێرراو، ئەوان داوایان کرد لە عەلی تەوبەکردنی خۆی ڕابگەیەنێت بە ئاشکرا، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لەم بارەیەوە وتوویژی لەگەڵ کردن و زۆربەشیانی بەرەو کووفە گەڕاندەوەو حەروورای پێبەجێهشتن کە سێ هەزار، یان چوار هەزار خاریجی مایەوە لە کۆی دوانزە هەزار، بڕوانە: (الطبري: تأريخ٥: ٦٥ـ ٦٦)، پێنج کەسیان خەڵکی بەصرە بوون.

٤) فەرمانی خوا بریتییە لە شەڕکردن لەگەڵ زۆردارەکان (البغاة) بە پێی وتەی خوای گەورە: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ) (الحجرات: ٩) موعاویەش لەبەرئەوەی لە فەرمانی خەلیفەی شەرعیی دەرچوو بوو پێویست بوو شەڕی لەگەڵ بکرێت.

٥) الطبري: تأريخ ٥: ٨١ـ ٨٢، والبلاذري: أنساب الاشراف ج٢، ١ ص٣٦٨.

مەسەلەی دادوەریکردنیش کە بە لابردنی عەلیو موعاویەو گەڕانەوە بۆ شورا کۆتای پێهات، سەری نەگرتو جێبەجێ نەکرا.[1] هەردوو لایەنیش بەردەوام بوون لەکۆکردنەوەی هێزەکانیانو ئەنجامدانی کاری جەنگییو بەزاندن بۆ لایەنەکان، بەڵام ئەم دوو لایەنە لە پاش جەنگی صففین جارێکی دی بەو قورسی یە رووبەڕووی یەکتر نەبوونەوە. داستانەکانیش کۆتایان پێهات کاتێك یەکێك لە خارجی یەکان هەڵیکوتایە سەر عەلی (رەزای خوای لێبێت) بە شمشێرێکی ژاراوی لە کاتی نوێژی بەیانی لە رەمەزانی ساڵی ٤٠ کۆچی، خەڵکی کوفەیش بەیعەتیان بە حەسەنی کوڕی عەلی دا، ئەویش بە چاکی زانی واز لە خیلافەت بهێنێ بۆ موعاویە، بۆ ئەوەی چیتر خوێنی موسڵمانان نەڕژێتو یەکبوونی ئوممەتی ئیسلام بپارێزرێت، بۆیە ساڵی ٤١ کۆچی بووە ساڵی کۆبوونەوەی موسڵمانانو لاپەڕەی ئاژاوە داخرا.

١) بەڵێنامەکە لە ناوچەی (اذرح) بوو ـ نزیك بەتراء ـ لە موحەڕڕەمی ساڵی ٣٨ ك (البلاذري: أنساب الاشراف ج٢، ١ ص٣٤١) پێش شەڕی نەهرەوان کە لە ٩ی سەفەری ساڵی ٣٨ ك روویدا (البلاذري: أنساب الاشراف: ج٢، ١ ص٣٦٢).

# بەشی دووەم

# خەلیفەکان

## باسی یەکەم:

## ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت)

عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانی کوڕی عامیری کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی تەیمی کوڕی موڕە،[١] لە مەککە لە دایکبووە لە دوای (عام الفیل) بە دووساڵو چەند مانگێك.[٢]

پێغەمبەر ﷺ ستایشی کردووە بە (عتیق من النار) هەر بۆیە نازناوی (العتیق)[٣]ی بەسەرا زاڵ بوو، دەشگێڕنەوە کە ئەو نازناوە بە هۆی جوانیی ڕووخساری بووە،[٤]هەروەها وتراوە کە دایکی منالّی بۆ نەدەمایەوە، جا ڕوویکردە ماڵی خوا (البیت العتیق) و وتی: ئەی خوایە ئەمە لە مردن قوتاری بووە، تکایە بیبەخشە پێم.[٥]لە پاش ڕووداوی (الاسراء والمعراج) پێغەمبەری خوا ﷺ بە (صددیق) ناوی برد، چونکە باوەڕی پێکرد کاتێك موشریکان ئەویان بەدرۆخستەوە.[٦]

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) سپی پێستو لاشە لاواز بوو، موو لەسەر هەردوو گۆنای کەم بوو، چاوەکانی چاڵ بوو بوو، تەوێڵ دیار[٧]و قژ لوول بوو[٨]، مووە سپی یەکانی سەروڕیشی بە خەنە ڕەنگ دەکرد.[٩]

---

١) أبونعیم: معرفة الصحابة ١: ١٤٩، وإبن حجر: الاصابة٤: ١٦٩.

٢) أبونعیم: معرفة الصحابة، فەرموودەی ژمارە (٨٩).

٣) أبونعیم: معرفة الصحابة ١: ١٥٢، فەرموودەی ژمارە (٦١) واخرجە إبن حبان في صحیحە باسناد صحیح (موارد الظّمان ٥٣٢)، والطبراني: المعجم الكبیر ١: ٥.

٤) الطبراني: المعجم الكبیر١: ٥، وقال الهیثمي: رجالە ثقات (معجم الزوائد ٩: ٤١) وأبونعیم: معرفة الصحابة حدیث رقم ٦٣ باسناد حسن.

٥) أبونعیم: معرفة الصحابة ١: ١٥٣ـ ١٥٤، والسیوطي: تأریخ الخلفاء ٢٩.

٦) الحاكم: المستدرك ٣: ٦٢، ٦٣ وقال: هذا حدیث صحیح الاسناد ولم یخرجاە وأقرە الذهبي.

٧) الطبراني: المعجم الكبیر ١: ٩، أبونعیم: معرفة الصحابة ١: ١٦٥، وفیە راوٍ مجهول وبقیة رجال السند ثقات.

٨) الذهبي: تأریخ الاسلام ـ عهد خلفاء الراشدین ـ ١٠٦.

٩) أبوداود: السنن ٤ـ ٤١٧، وإبن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ١٩١ وإسنادە صحیح، وهذا الوصف لە في غزوة ذات السلال.

لە سەردەمی جاهیلی ناوبانگی هەبوو بە ڕەوشتی بەرزو جوانو هاوڕێتی خۆشو مەی نەخواردنەوەو شارەزاییبوونی لە ڕەچەڵەکی عەرەبو باسەکانیان.

لە ئیسلامیشدا بە دێرینی موسڵمان بوون بەناوبانگەو بە هەوڵو کۆششی زۆری لە پێناو بانگەوازەکەی، سەرانی هاوەڵان وەکو عوسمانی کوڕی عەففانو زوبێری کوڕی عەوامو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لەسەر دەستی ئەبوبەکر موسڵمان بوون، هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بوو لە کۆچکردنی بەرەو مەدینە، کە خوای گەورە ئایەتی لەو بارەوە دابەزان (ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ)،[1] واتە: (ماناکەی)

لە هیچ شەڕو ڕووداوێك دوانەکەوتووەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووە،[2] بازرگانی جلو بەرگی دەکردو سەرمایەی لە کاتی موسڵمانبوونی گەیشتبووە چل هەزار درهەم، هەمووی خەرج کرد لە پێناوی بانگەوازی ئیسلامو بەرژەوەندی یەکانی، بە تایبەت بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلە بێدەسەڵاتانەی موسڵمان دەبوون، تەنها پێنج هەزار درهەمی مایەوە ئەویش لە کاتی کۆچ کردندا خستیە ژێر ڕاپەڕاندنی پێغەمبەر ﷺ.[3]

پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری خەرجکردنی دەدا لە پارەی ئەبوبەکر دا، وەکو چۆن کەسێك بڕیار بدات لە پارەی خۆیدا،[4] بۆیە باسی سود وەرگرتنی ئیسلام دەکات لەماڵی ئەبوبەکرو دەفەرموێت: "مانفعني مال قط مانفعني مال أبوبكر".[5] واتە: هیچ ماڵێك بە کەڵکم نەهاتووە ئەوەندەی ماڵی ئەبوبەکر بە کەڵکم هاتووە. بۆیەی پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی پێداوە،[6] دەرگاکەشی بە کراوەی هێشتەوە بۆ مزگەوتو دەرگای هەموو هاوەڵان داخران،[7] لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگیشدا

---

١) التوبة ٤٠.

٢) أبن حجر: الاصابة ٤: ١٦٩.

٣) إبن سعد: الطبقات ٣: ١٧٢، وأبونعيم: معرفة الصحابة ١: ١٨٠، والذهبي: تأريخ الاسلام ـ عهد الخلفاء الراشدين ـ ١٠٧، وإبن حجر: الاصابة ٤: ١٧١ـ ١٧٢، والسيوطي. تأريخ الخلفاء.

٤) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٧٢ من مراسيل سعيد بن المسيب وهي قوية.

٥) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٦٥ باسناد صحيح.

٦) البخاري: الصحيح ٧: ٢٢.

٧) البخاري: الصحيح ٥: ٥٥٨.

پێشەوایەتی خەڵکیی لە نوێژدا بە ئەو سپارد،[1] جێگای متمانەو پرسپێکردنی پێغەمبەر ﷺ بوو، خزمایەتیشی لەگەڵ کرد بەوەی کە عائیشەی کچی لێ مارە کرد (ڕەزای خوای لێبێت)، سەدو چلو دوو فەرموودەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە.[2]

دانایو بوێری ئەبوبەکر ئاشکرا بوو لە کاتی لێقەومانی نەتەوەی ئیسلام بە مردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەروەها کەسایەتیی بەهێزو تێگەیشتنی سیاسی دەرکەوت لە کاتی کۆبوونەوەی سەقیفەدا، کە ئەوپەڕی بێ فیزیی و بێ نیازیی نواند لە وەرگرتنی خیلافەت، چونکە کاتێك دەستنیشان کرا بۆ وەرگرتنی روونی کردەوە کە سالیمی مەولای ئەبوحوزەیفە دیندارترەو عومەری کوڕی خەتتاب بەهێزترە،[3] واتە ئەوانی بە شیاوتر زانی بۆ خیلافەت، کاتێکیش کە خیلافەتی پێ سپێردا توانایەکی لە رادەبەدەری نواند بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوای یەکە دووچاری دووبەرەکی ترسناك بوو بە بۆنەی سەرهەڵدانی پاشگەزبوونەوەکانەوە، یەکڕیزییو ئاسایشی بۆ دەوڵەت گێڕایەوە، تواناکانیشی ئاڕاستەکرد بەرەو جیهادو والاکردنی دەڤەرەکانی عێراقو شام.

وتارو نامەکانیشی بۆ سەرکردەکانی لە عێراقو شام لە خواترسانو دینداریی ئەو دەردەخەن، هەروەها سووربوونی لەسەر بلاوکردنەوەی ئیسلامو بایەخنەدانی بە دونیاو جوانیدەربڕینو ڕەوانبێژیی و دوورکەوتنەوەی لە درێژکردنەوەی قسەو زیادەڕەویی لە لێکدانەوە، بەم شێوەیەش ئەبوبەکر یەکێك بوو لە وتاربێژە سەرکەوتووەکانی نێو هاوەڵان.[4]

بە کۆکردنەوەی قورئانیش بۆ یەکەمجار پرۆژەیەکی مەزنی ئەنجام دا و بوو بە مایەی دروست نەبوونی جیاوازیی تیایدا و یەکڕیزیی ئاینی و ڕۆشنبیریی بۆ موسڵمانان جێبەجێ کرد.[5]

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) وێڕای شارەزای زۆری لە قورئانو سوننەتداو تێگەیشتنی کاریگەری بۆ مەبەستەکانی شەرع و فەرمانەکانی و توانای فتوادان،[6] زۆرجار راوێژی دەکرد بە هاوەڵان،[7]

---

١) البخاري: الصحيح ٢: ١٦٦، ومسلم: الصحيح١: ٣١٦.

٢) بقي بن نخلة ٨٢، سيوطي ١٤٢ فەرموودەی باسکردووە لە (تأريخ الخلفاء ٨٧ـ ٩٤).

٣) إبن سعد: الطبقات ٣: ١٨٥، وأحمد: فضائل الصحابة ١: ١٦٢ باسناد حسن.

٤) السيوطي: تأريخ الخالفاء ٦٠.

٥) إبن سعد: الطبقات٣: ١٩٣، هەروەها بڕوانە: صحيح البخاري (فتح الباری ٩: ١٠).

٦) بڕوانە فتواکانی لە (تأريخ الخلفاء)ی سيوطي ٩٥٤ـ ١٠٥.

٧) السيوطي: تأريخ الخلفاء ٤٣ـ ٥٢.

بەزەیش زاڵ بوو بەسەر راوبۆچوونەکانی، بۆ نموونە بۆچوونی وابوو رزگارانە لە دیلەکانی جەنگی بەدر وەربگیردریت، دەروونیشی پڕ لە هێمنیو دڵنیای بوو، دڵی هاوەڵانی چەسپاند لە رووداوی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، توندو تۆڵی و ویستو خواستپتەو نیشانەی سیاسەتی ئەو بوون، نموونەی ئەوەیش هەڵوێستەکانی لە بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە، چاودێریکردنی موسڵمانان رێبازی ژیانی بوو بە تایبەتی بۆ هەژارو بیماران[1].

ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) کۆچی دوای کرد لە تەمەنی شەستو سێ ساڵی،[2] لە جومادی ئاخیرە لە ساڵی سیانزەی کۆچی، ماوەی خیلافەتەکەی دوو ساڵو نیو بوو.[3]

١) مسلم الصحيح ٤: ٧١٣، ١٨٥٧.

٢) مسلم الصحيح ٤: ١٨٢٦، والترمذي: السنن (تحفة الاحوذي ١٠: ١٣٦).

٣) الطبراني: المعجم الكبير١: ١٤، وقال الهيثمي: رجاله ثقات (مجمع الزوائد ٩: ٦). وأبونعيم: معرفة الصحابة ١: ١٦٩.

### باسی دووەم:

### عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)

عومەری کوڕی خەتتابی کوڕی نوفەیلی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ڕەباح، لە بەنی عەدی کوڕی کەعبە، کە یەکێکە لە هۆزەکانی قوڕەیش، دایکی حەنتەمەی کچی هاشمی مەخزومیە،[1] دوای (عام الفیل) بە سیانزە ساڵ هاتووەتە دنیاوە.[2]

باڵا بەرزو کەتەو تووکن بوو، قژیشی بە هەردوو لای سەریدا دەهاتە خوارەوە، پێستی سوورو سپی بوو، نیشانەی پیریشی بە خەنە ڕەنگ دەکرد، سمێڵێکی پڕی هەبوو، بە هەردوو دەستی وەکو یەك کاری دەکرد.[3]

لە کاتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو،[4] بۆیە زەبروزەنگی بوو دژ بە موسڵمانان،[5] پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا پاڕایەوە ڕێنموونی بکات، ئیدی لە ساڵی شەشەمی[6] ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ، موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند[7] و ئاینی ئیسلامی پێبەرزبوویەوە کە موسڵمان بوونی ئاشکرابوو بتپەرستەکان شەڕیان لەگەڵ کردو شەڕی لەگەڵ کردن.[8] لە سەردەمی نەفامیی بە زمانپاراوی و ئازای دەناسرا، لە ئیسلامیش بە تینو شکۆدارو بە تەنگ دونیاوە نەهاتن

١) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ٢٦٥، وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ١٩٠ ـ ١٩١ مع الحاشية رقم ٣، وابن حجر: الإصابة ٤: ٥٨٨.

٢) ابن حجر: الإصابة ٤: ٥٨٨، وانظر اذكره الواقدي من ان مولده ـ كما ذكر عن نفسه ـ قبل الفجار بأربع سنين (ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٩٦، وابن شبة: تأريخ المدينة ٢: ٦٦١).

٣) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٦٠ـ ٢٦١ بأسانيد ترقي بمجموعها الى الحسن، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣٣٤، والطبراني: المعجم الكبير ١: ١٩، ومسلم: الصحيح ٤: ١٨٢١، والحاكم: المستدرك ٣: ٨١ بإسانيد حسن الى زر بن حبيش، وابن حجر: الغصابة ٤: ٥٨٩ وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٢٠٣، ٢٠٦.

٤) ابن حجر: الاصابة ٤: ٥٨٨.

٥) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٧٨، ٢٧٩.

٦) الترمذي: السنن ٥: ٦١٧، وابن حبان: الاحسان ٩: ١٧.

٧) ابن حجر : فتح الباري ٧: ٢١٦ ـ ٢١٧.

٨) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٨٢.

ناسرا،[1] هەروەها بە دادگەریی‌و بەزەی‌و زانست،[2] کردارو گوفتاری عومەر (رەزای خوای لێبێت) راست‌و ئاراستەکراو بوو،[3] (٥٣٧) فەرمودەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە،[4] قورئانی پیرۆز لە چەندان مەسەلەدا پەسەندایەتی راوبۆچوونەکانی عومەری دەکرد کە پێشبینی دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، لەوانە راگرتنی جێگای ئیبراهیم (علیه السلام) وەکو نوێژگەو پەردە دانان بۆ دایکانی موسڵمانان‌و ئامۆژگاریی بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پێش دابەزینی ئایەتی هەڵبژاردن،[5] هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێداوە بە بەهەشت[6] و شەهیدیی[7] و خێروبێرێك کە لە سەر دەستی ئەو بەدیدێت، جگە لەوانەش پێغەمبەر ﷺ وەسفی کردووە بە بلیمەت "لم أر عبقرياً يفري فريه".[8] واتە: بلیمەتەکانم نەبینیوە کردارەکانی ئەو ئەنجام بدات.

روونیشی کردووەتەوە کە ئەگەر لە نەتەوەی ئیسلام سروشدار بوایە عومەر دەبوو،[9] فەرمانیشی کردووە بە هاوەڵان پەیڕەوی ئەبوبەکرو عومەر بکەن.[10]

عومەر (رەزای خوای لێبێت) زۆر نزیك بوو لە پێغەمبەر ﷺ و راوێژی پێدەکرد، لە کارە گرنگەکاندا، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئامادەی هەموو غەزاکان بوو، خزمایەتیشی لەگەڵ کردووە بەوەی کە حەفصەی دایکی ئیماندارانی لێ مارە کردووە، ئەبوبەکریش (رەزای خوای لێبێت) بە

---

١) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٣٠ الرواية رقم ٤٧١ وابن سعد: الطبقات ٣: ٣٢٧، ٣٢٨، وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٢٢٣.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢: ٤١٠) واحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٣٠ الرواية رقم ٤٧٢ باسناد صحيح و ١: ٣٤٤ الرواية رقم ٤٩٦ باسناد صحيح و ١: ٣٦٢ الرواية رقم ٥٣٠ وأبو داود: السنن ٣: ١٢٧، والهيثمي: مجمع الزوائد ٩: ٦٩، ٧٧.

٣) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٩٨، ٢٤٨، ٢٤٩ بأسانيد صحيحة وحسنة.

٤) بقي بن مخلد ص ٨١.

٥) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١: ٥٠٤و ٨: ١٦٨) ومسلم : الصحيح ٤: ١٨٦٥ وآية التخيير هي الخامسة من سورة التحريم.

٦) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٢٢، ٤٠).

٧) مسلم: الصحيح ٤: ١٨٨ أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٥٥ بسند صحيح.

٨) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٥٥، ٢٥٧، والبخاري: الصحيح ٧: ١٩، ٤١ ومسلم : الصحيح ٤: ١٨٦٢.

٩) البخاري: الصحيح ٧: ٤٢.

١٠) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٣٢، وابن ماجة : السنن ١: ٣٧ كلاهما بإسناد صحيح.

زۆری راوێژی پێدەکرد، هەر ئەویش بوو پێشنیازی کۆکردنەوەی قورئانی بۆ کرد،[1] لە دوای خۆیشی خیلافەتی بۆ بەجێهێشت پاش راوێژکردن بە سەرانی هاوەڵانو رەزامەندیان،[2] بە نازناوی ئەمیرولموئمینین بانگ دەکرا.[3] لە سەردەمی خیلافەتدا لێهاتووی سیاسیو ورەو سازاندنو رێکخستنی بۆ بەرێوەبردنی ئەو ناوچانەی دەکرێنەوەو شەونخوونی لە پێناو بەرژەوەندیی موسڵمانانو راگرتنی دادگەریی لە وڵاتداو بەرفراوانی راوێژ، ئەمانە هەمووی سیمای سەردەمی عومەر بوون. ئەوانەی قورئانیان لەبەر بوو لە کۆڕی عومەر پێشینو جێگای راوێژی بوون، پیر بوایەن یان لاو،[4] هەروەها لێپێچینەوەی دەکرد لەگەڵ "والی" دەقەرەکان[5] بە پی بنەڕەتی: "من أين لك هذا"، واتە: ئەمەت لە کوێ بوو؟ قەدەغەشی کردبوو لەسەریان زیان بە موسڵمانان بگەیەن، دەرگاشی والآ بوو بۆ سکالآی خەڵکیی،[6] هەروەها کاروباری فەرمانڕەوای رێکخست بە شێوزای دانانی تۆمارگە (دیوان) بۆ هەر بوارێك،[7] سەرکردەو دەمسپی بۆ تیرەو هۆزەکان دەست نیشان کرد،[8] کارکردنی داهێنا بە مێژووی کۆچکردن، بە رەوای نەدەزانی لە خەزێنەی موسڵمانان هیچ ببات، جگە لە دوو پۆشاك نەبێت بۆ زستانو هاوین، وشترێکیش بۆ سواربوونی خۆی، خۆراکیشی وەکو خۆراکی کەسێکی حاڵمناوەندی بوو لە موهاجیران.[9]

وتارو نامەکانی بۆ سەرکردەو لێپرسراوەکان ئاماژە دەکەن بە رەوانبێژیی زۆرو ئاخاوتنی روون لەگەڵ کورتکردنەوەی بەسوود و خۆوەدوورگرتن لە درێژدادڕییو نامۆ بەکارهێنانو زیادەڕەوی، هەروەها

١) البخاري: الصحيح ٨: ٣٤٤، ومسلم: الصحيح ٤: ١٩١٣.

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٩٩، والبلاذري: أنساب (الشيخان) ٧٠ـ ٧٣.

٣) وإبن سعد: الطبقات ٤: ٢٨١، والطبراني: المعجم الكبير ١: ١٨، وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٢٢٧، والحاكم: المستدرك ٣: ٨١.

٤) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٥١ باسناد صحيح.

٥) أحمد فضائل الصحابة ١: ٢٩٣.

٦) وإبن سعد: الطبقات ٤: ٢٨١.

٧) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٢٨، وإبن سعد: الطبقات ٣: ٣٠٠ باسناد صحيح، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٢: ٥٨.

٨) هەمان سەرچاوە پێشووەکان.

٩) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٤٠٥، وإبن سعد: الطبقات ٣: ٢٧٥ واسنادهما صحيح.

بە وردیش ئاماژە بە هەستی قووڵی عومەر دەکەن بە بەرپرسیارێتی لە ئاستی ئاینو موسڵمانان، هاوکات لەگەڵ پشت بە خوابەستنو متمانە بە خۆکردن.[1]

دەوڵەتی ئیسلامیی لە سەردەمی عومەر سەرکەوتە سەر فورسو رۆمەکانو دەڤەری هیلالی ئەلخەصیبو میصر ئازادکران، هەر لەو سەردەمەشدا شارەکانی کووفەو بەصرەو ئەلفوستات دامەزران، دەوڵەت لە گەشەکردنیکی بەردەوامدا بوو تا ئەو کاتەی ئەبولوئلوئەی مەجووسی شاگردی موغەیرەی کوڕی شوعبە، هەڵسا بە تیرۆرکردنی عومەری کوڕی خەتتاب لە کاتی بەرنوێژیکردنی بۆ موسڵمانان لە نوێژی بەیانی لە زیلحیجەی ساڵی ٢٣ی کۆچی، پاش دە ساڵ و شەش مانگ[2] خیلافەتو لە تەمەنی شەستو سێ ساڵیدا.[3]

ئەو بۆچوونەش پێشدەخەم کە هۆکاری کوشتنی عومەر دەگەڕێتەوە بۆ پاڵنەرێکی کەسایەتیی لای بکوژە ئاگرپەرستەکەی کە دارتاشێکی عەجەمیی لێزان بوو، عومەریش (رەزای خوای لێبێت) هێنانی عەجەمی پێگەیشتووی جگە لە موسڵمانان قەدەغەکردبوون، بەڵام بەرژەوەندیی خەڵکیی وایدەخواست کە بهێنرێن.[4]

١) محمد حميد الله: مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة ٤٠٦ـ ٥٢٨.

٢) مسلم: صحيح ١ـ ٣٩٦ رقم ٥٦٧، وإبن سعد: الطبقات ٣: ٥٦٣، وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٣٩.

٣) أبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٥٩١.

٤) إبن سعد: الطبقات ٣ـ ٣٤٩ باسيناد صحيح.

## باسی سێیەم:

## عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێبێت)

عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبولعاصی کوڕی ئومەیەی کوڕی عەبدوششەمسی کوڕی عەبدولمەناف، دایکیشی ئەروای کچی کورەیزە کە ئەویش هەر لە تیرەی بەنی عەبدوششەمسە.[1] لە دوای (عام الفیل) بە شەش ساڵ لە دایك بووە لە شاری تائیف.[2]

دەگێڕنەوە باڵای مام ناوەند بووە، روخساری جوان بووە و هەندێ پەڵەی لە نەخۆشی ئاوڵە پێوە مابوو، پێست ناسكو ریش پانو گەنم رەنگو تووکن بووە،[3] دەناسرا بە شەرمی زۆرو زرنگی پەسەند[4] و داوێن پاکییو پەیوەندیی خزمایەتی بەجێهنان[5] و دینداریی[6] و درێژیی شەونوێژ[7] و گریان لە کاتی باسکردنی رۆژی دوای[8] و خۆبەکەم زانین[9] و بەخشندەی، چونکە ئەو بازرگانیی دەکرد پێش ئیسلامو سامانێکی زۆری بەدەستهێنابوو، جا زۆرێکی لەو سامانەی دەبەخشی لە پێناو بەرژەوندی ئیسلامیی لە قۆناغی بانگەوازو فەرمانڕەوایدا، وەکو بەگوێکردنێك بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتێك هانی موسڵمانانی دا بۆ کڕینی بیری روومە و خوای گەورە قەرەبووی بکرەکەی لە بەهەشت[10] بداتەوە، عوسمان (رەزای خوای لێبێت) ئەو بیرەی کڕی کە تاکە بیرێك بوو لە مەدینە ئاوەکەی شیرین بوو،

---

١) إبن سعد: الطبقات ٣: ٥٣، وخليفة" الطبقات ١٠، وإبن عبدالبر: الاستعاب ٣: ٦٩.

٢) الدياربكري: تأريخ الخميس ٢: ٢٥٤.

٣) ابن سعد: الطبقات٣، ٥٨٣ بە دوو سەنەدی لاواز، وأبو نعيم: معرفة الصحابة ١: ٢٣٦، وإبن عبدالبر: الاستعاب ٣: ٧٤.

٤) مسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١٥: ٦٨، ١٦٩، أحمد: فضائل الصحابة ١: ٤٦٥ بسند صحيح.

٥) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٤٥٢ بسند صحيح.

٦) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٤٥٥ بسند صحيح.

٧) إبن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٧٥ـ ٧٦، باسناد حسن.

٨) أحمد: الزهد ٤٢. والترمذي: السنن ٤: ٥٥٣ باسناد حسن.

٩) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٤٥٩ بسند صحيح وإبن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٥٩ بسند صحيح.

١٠) أحمد المسند ١: ٧٤ـ ٧٥، وصححه أحمد شاكر، والترمذي: السنن ٥: ٦٢٥ـ ٦٢٧ بسند جيد، والنسائي: السنن ٦: ٢٣٣، ٢٣٤، ٢٣٥، ٢٣٦ بسند صحيح. والدارقطني: السنن ٤: ١٩٩ بسند صحيح.

کردی بە خێر لە پێناو خوادا، هەروەها پارچە زەوی یەکی کڕی بۆ فراوانکردنی رووبەری مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ کاتێك پێغەمبەر ﷺ هانی موسڵمانانی دا بۆ ئەو مەبەستە.[1]

پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی کرد بۆ ئامادەکردنی سوپای عوسرە کە بە ئاراستەی تەبووك بەرێدەکەوتو ژمارەی سی هەزار کەس بوو،[2] لەو ساتەدا عوسمان (رەزای خوای لێبێت) خەرجیی گەورەو مەزنی دەستەبەرکرد بۆ ئامادەکردنی سوپاکە،[3] کە گەیشتە بڕی هەزار دیناری ئاڵتون، جا ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ما ضر ابن عفان ما عمل بعد اليوم ـ يرددها مراراً ـ"[4] واتە: دوای ئەمڕۆ عوسمان هەرچی کارێك ئەنجام بدات زیانی بۆی نابێت ـ چەندین جار ئەو قسەی دووبارە کردەوە ـ.

عوسمان رەزای خوای لێبێت هەر لە کاتێکی زووەوە موسڵمان بوو لەسەر بانگهێشتی ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لێبێت)،[5] ئەمجا کۆچی کرد بۆ حەبەشە[6] لەگەڵ ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ کە خێزانی بوو، دواتر گەڕایەوە مەککەو جارێکی دی کۆچی کرد بۆ مەدینە.[7]

لە جەنگی بەدر دواکەوت بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بۆ چاودێریکردنی ڕوقیەی خێزانی کە نەخۆش بوو، بەڵێنی پاداشتو بەشی کەسێکیشی پیدا کە ئامادەی شەڕەکە بووبێت،[8] ئامادەی شەڕەکانی

---

١) الترمذي: السنن ٥: ٦٢٧ والنسائي: السنن ٦: ٢٣٤ بسند صحيح.

٢) الواقدي: المغازي ٣: ٩٩٦، وابن سعد: الطبقات ٢: ١٦٦ بەبێ ئیسناد، وابن حجر: فتح الباري ٨: ١١٧.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٥: ٤٠٦ـ ٤٠٧) شێوازی (تعليق) (قال)ە بەکارهێناوە لە مامۆستاکەیەوە کە ئەمە وایکرد ئیبنو حەجەر بە (اجازة) یان (مناولة) یان (عرض) بیژمێرێت (الفتح ٢: ١٥٨).

٤) احمد: المسند ٤: ٧٥و ٥: ٦٣، والحاكم، المستدرك٣: ١٠٢، زەهەبیش وتوویەتی (صحيح)ە.

٥) إبن إسحق: السير والمغازي ١٤٠ بەبێ ئیسناد، واقیدییو بیلازوریی ناکۆکی لەسەر ئەم هەواڵە دەکەن و دەڵێن: ئەبوبەکرو عوسمانیش بە بانگهێشتی راستەوخۆی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوون، (إبن سعد: الطبقات ٣: ٥٥ عن الواقدي، والبلاذري: أنساب الاشراف ٥: ٢) بەم شێوەیەش ریوایەتێکی (صحيح) مان لەبەردەستدا نییە دەربارەی چۆنێتی موسڵمان بوونی، بەڵام ئەوە بێ چەنوچوونە کە لە کاتێکی زۆر زوو موسڵمان بووە.

٦) البخاري: الصحيح (فتح الباري٧: ٥٣، ٥٦، ١٦٣، ١٨٧).

٧) إبن اسحق: السير والمغازي ١٧٤، ١٧٦، وابن سعد: الطبقات الكبرى ١: ٢٣٧ـ ٢٣٨، بسند منقطع فهو ضعيف، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٣: ٢٦٨ بسند موصول الى النبي ﷺـ والحاكم، المستدرك ٢: ٦٢٣ باسناد صحيح الى الزهري، ومراسيل الزهري ضعيفة ٤: ٧٧.

٨) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ٢٧١، ٧: ٦٦، ٦٧، ٤٢١).

تر بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، نێردراوی ئەویش بوو بۆ لای قوڕەیش لە حودەیبی یە، بۆیە ئامادەی (بیعة الرضوان) نەبوو، پێغەمبەریش هەردوو دەستی خۆی لە یەکداو فەرمووی: "هذه عن عثمان"،[١] واتە: ئەمەیش لە جیاتی عوسمان.

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەرانی هاوەڵە نزیکەکان بوو لە پێغەمبەر ﷺ ڕوقیەی کچیشی لێ مارە کرد و خێزانی بوو تا وەفاتی کرد، ئەمجا پێغەمبەر ﷺ دووەم کچی لێ مارە کرد کە (ام کلثوم) بوو، هەر بۆیە نازناوی لێنرا بە (ذي النورين)[٢] لە چەندین بۆنەدا پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی پێداوە،[٣] هەروەها مژدەی ئەوەش کە بە شەهیدی دەمرێت.[٤]

هاوەڵان ئەم پلە و پایەی عوسمانیان دەزانی، بۆیە پیان وابوو لە پاش ئەبوبەکرو عومەر کەسی پیاناگات لە چاکەو رابوردووی پرشنگدار،[٥] سەدو چلو شەش فەرموودەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە.[٦]

لە پاش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای پەروەردگار، عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) نزیك بوو لە ئەبوبەکرو دواتر عومەر، کە راوێژیان پێدەکرد، ئەوکاتەیش عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لیدرا ئەنجومەنی راوێژی پێکهێنا لە شەش کەس لەوانەی شایەتی بەهەشتیان بۆ دراوە، ئەوانیش لە پاش راوێژکردن بەو کەسانەی شایانی راوێژپێکردنن[٧] عوسمانیان لە نێو خۆیان هەڵبژارد، لە یەکی موحەڕەمی ساڵی بیستو چواری کۆچی.[٨]

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري٧: ٤٥).

٢) أبونعيم: معرفة الصحابة١: ٢٤٥، باسناد حسن الى الحسن البصري، لكنه مرسل ضعيف، وله شاهد باسناد ضعيف في تأريخ بغداد للخطيب ٢: ٢٣١.

٣) البخاري: الصحيح (فتخ الباري ٧: ٢٢، ٤٢، ٥٣، ١٠: ٥٩٧، ١٣: ٢٤٠) وأبوداود: السنن الحديث رقم (٤٦٥١)، والترمذي: السنن٥: ٦٢٤.

٤) مسلم: الصحيح (بشرح النووي)١٥: ١٩٠- ١٩١، والترمذي: السنن٥: ٦٢٧ وقال حديث حسن، هەروەها لەم بارەوە بڕوانە: (فتح الباري ٧: ٣٨).

٥) البخاري الصحيح (فتح الباري ٧: ١٦، ٥٤).

٦) بقي بن مخلد: مقدمة المسند ٨٢.

٧) البخاري الصحيح (فتح الباري ٧: ٥٩- ٦٢و ٣: ٢٥٦، ١٣: ١٩٣- ١٩٤) ومسلم: الصحيح١: ٣٩٦، وابن تيمية: منهاج السنة ٣: ١٦٦.

٨) إبن سعد: الطبقات ٣: ٦٤، وخليفة: التاريخ ١٥٦، والطبري: تأريخ ٤: ٢٤٢.

عوسمان لە سەردەمی خیلافەتی خۆی کۆکردنەوەی دووەمی قورئانی ئەنجامدا،[1] بەو کارەشی قورئانی پاراستو جیاوازیی قەدەغە کرد لە شێوازەکانی خوێندنەوەیدا، تەنها بە شێوەی زمانی قوڕەیشی نەبێت، سوورەتەکانیشی ڕێکخست، ئوممەتی ئیسلامیش لە هەموو سەردەمەکاندا یەکدەنگ بوونە لەسەر موصحەفی عوسمان.[2]

هەروەها هەڵسا بە گەورەکردنەوەی هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینە، بونیادی مزگەوتی مەدینە بە خشتو گەڵای دارخورماو ستوونی دار دروست کرابوو، لە ساڵی (٣٠)ی کۆچی گەورەکردنەوەیەکی چاکی بۆ ئەنجامدا لە بەردی نەخشکراو دیوارەکانی ڕازاندەوە، کۆڵەکەکانیشی بە هەمان شێوە لە بەردی نەخشکراو دروست کردو سابینەکانیشی لە داری ساج، شەش دەرگاکەشی وەکو سەردەمی عومەر هێشتەوە.[3]

یەکێ لە چاکسازی یەکانی دیکەش کە لە سەردەمی عوسمان ئەنجام درا هەڵکەنینی روباری (الابلة) بوو بە درێژی (٢٤) کیلۆمەتر، هەروەها روباری (الأساورة) کە هەردووکیان لەشاری بەصرە بوون.[4]

موسڵمانان لە سەردەمی خیلافەتی ئەودا ئەو ناوچانەی لەسەردەمی عومەرو سەرەتای سەردەمی عوسمان لیان داگیرکرابوو گێڕایانەوە، فتوحات لەو سەردەمەدا بڵاوبوویەوەو چەندان دەڤەری تازە کە پێشتر ئازاد نەکرابوو وەکو ئازەربایجان، ئەرمینیا، ئەفریقیا (تونس) و نەوبە، دوورگەی قوبرس، کابول، خوراسان، شیراز، ئیستەخر، سابوور، درابجوردو ئەرجان هەمووی کەوتە ژێر دەستی موسڵمانان.

---

١) قورئان بڕبڕ دادەبەزی، ئەگەر ئایەتێك یان چەند ئایەتێك دابەزیبا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بە نووسەرانی سرووش کە بینوسنەوەو جێگاکەی پێدەوتن لە سوورەتەکە، ئەوانیش ئەو ساتە لەسەر پەڕۆو بەردی سپی تەنك و گەڵای دارخورما دەیاننووسی، جا لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکر فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت کە لەو شوێنانەو لای ئەوانەی لە بەریان بوو کۆی بکاتەوەو ئەویش هەڵسا بەو کارە، لە خیلافەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمانی بە زەید کرد کارەکە دووبارە بکاتەوە پشت بەستن بەوەی کە لە سەردەمی ئەبوبەکر کۆی کردبوویەوە، ئەمجا هەڵسان بە وردبینیو ڕێکخستنی سوورەتەکانو چەند نوسخەیەکیان لەبەر گرتەوەوە دابەشیان کرد بەسەر ناوچەکاندا بۆ ڕێگە گرتن لە دروستبوونی جیاوازی خوێندنەوە.

٢) ابن حجر: فتح الباري ٩: ٢١.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١: ٥٤٠) والطبري: تأريخ ٤: ٢٦٧ وابن حجر: فتح الباري ١: ٥٤٥.

٤) خليفة: التأريخ ١٦٥ـ ١٦٦.

ژیانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریش لەو سەردەمەدا گەشەی کرد بە هۆی فراوانی داهاتەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا، بۆیە عوسمان بەخشینی زیاد کردو خەڵکیش خەرجیان زیاد دەکرد.[1]

دانیشتوانی هەندێ لە دەڤەرەکان بە هاندنی ئیبنو سەبەء دەستیان کرد بە ورتە ورتکردن لەو فەرمانڕەوایانەی عوسمان دایناڕبوون ، بۆیە مونافیقەکان کۆبوونەوەو ئابڵۆقەی ماڵی خەلیفەیان دا، لە پاش هەندێ مشتومڕ هەڵیانکوتایە سەر ماڵەکەی و کوشتیان، کە ئەو کاتە تەمەنی هەشتا ساڵ بوو، لە وساتەی کوژرا بە ڕۆژوو بوو و قورئانی دەخوێند، لە ساڵی (٣٦ك) کە بە ساڵی پشێوی (فیتنە) ناسرا، کوژرانی بوو بە مایەی زنجیرەیەك لە پشێویی و ئاژاوە کە یەکڕیزیی موسڵمانانی تێکدا.

١) عمر بن شبة: تأريخ المدينة ٣: ١٠٢٣ ـ ١٠٢٤، بسند صحيح.

## باسی چوارەم:
## عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رەزای خوای لێبێت)

عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی قوصەی، ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ، دایکیشی فاتیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشمە.[١]

پێش رەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە دایك بوو، کاتێك موسڵمان بوو تەمەنی پێنج ساڵ،[٢] یان هەشت ساڵ[٣] ، یان دە ساڵ بوو[٤]، بە پێی جیاوازیی بەهێزترین ریوایەتەکان، دەشگێڕنەوە کە ئەو کاتە تەمەنی پانزە یان شانزە ساڵ بووە.[٥]

عەلی (رەزای خوای لێبێت) بە ئازایو وتاربێژیو رەوانبێژی دەناسرا، هەروەها بە لێهاتووی و دادوەری، بۆیە عومەر (رەزای خوای لێبێت) دەیفەرموو: "اقضانا علي" دادوەرترینمان عەلی یە.[٦]

هەروەها جوداکاریی بوو بە بیروباوەڕی بەهێزو فیقهی وردو توانای لەسەر کاریگەریی و قەناعەت پێکردن، وەك تێبینی دەکرێت کە هەمەدان هەمووی لە یەك رۆژدا موسڵمان بوون لەسەر دەستی و[٧] پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای بەنی جوزەیمە پاش غەزاکەی خالید بۆ سەر ئەوان بۆ چاککردنی ئەو هەڵەی دروست بوو بوو و توانی چاکسازیی بکات.[٨] لە وەرزی حەجکردن لە ساڵی ٩ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ عەلی نارد بۆ مەککە بۆ راگەیاندنی سەرەتای سورەتی (براءة).[٩] چاکەو جوامێری یەکانی عەلی ناوبانگیان هەیە، پێغەمبەریش ﷺ بە خۆی پلەو پایەی ئەوی روونکردۆتەوە لە

١) إبن هشام: السيرة النبوية ١: ١٦١ـ ١٨٩، ومصعب الزبيري: نسب قريش ٢٤٠ وهشام الكلبي: جمهرة النسب ١: ٣٠.

٢) الطبراني: المعجم الكبير ١: ٥٣ بە ئیسنادێکی (حسن) بۆ موحەممەدی باقر ئەمجا مورسەلیشە چونکە باقر ئەو رووداوەی نەبینیوە خۆی، لەوانەشە قسەیەکی بۆ ماوە بێت لە ناوەندی خێزانەکە بۆیە ریوایەتی تر پێشدەخات، ئەمجا لەگەڵ تەمەنیشی دەگونجێت لە جەنگی بەدر، چونکە ئەوکاتە بیست ساڵان بوو، (الطبراني: المعجم الكبير ١: ٦٤، والحاكم: المستدرك ٣: ١١١ وصححه ووافقه الذهبي).

٣) الطبراني: المعجم الكبير ١: ٥٣.

٤) إبن هشام السير النبوية ١: ٢٦٢ ەبەبێ ئیسناد، ئیبنوحەجەریش هەڵیبژاردووە لە (الاصابة) ٢: ٥٠١.

٥) الطبراني: المعجم الكبير ١: ٥٤ من مراسيل الحسن البصري.

٦) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ١٦٧).

٧) الطبري: تأريخ ٣: ١٣١ـ ١٣٢ باسناد صحيح.

٨) ابن هشام: السيرة ٤: ٧٢ـ ٧٣ مرسل ابن جعفر الباقر.

٩) أحمد: المسند ١: ١٥٦و ٢: ٣٢، وصححه أحمد شاكر، والنسائي: خصائص علي ٩٣ـ ٩٥ باسناد صحيح.

چەندین جێگادا، تەنانەت پێشەوا ئەحمەدو ئیسماعیلی قازییو نەسائیو ئەبوعەلی نەیسابوریی وتویانە: "فەرموودەی دەربارەی هیچ هاوەڵێك بە سەنەدی چاك نەهاتووە ئەوەندە دەربارەی عەلی هاتووە".[1] لەوانە فەرموودەی: "من كنت مولاه فهذا علي مولاه".[2] هەرکێ من سەرگەورەی بم عەلی سەرگەورەی ئەوە. هەروەها فەرموودەی: "أنت مني وأنا منك".[3] واتە تۆ لە منیو من لە تۆم. مەبەستی لە خزمایەتیو زاوایەتیو خۆشەویستیو رابردووی پرشنگدارە.[4]

پێغەمبەر ﷺ شایەتی بۆ عەلی داوە کە بەهەشتی یە و خوای گەورە دڵی تاقیکردۆتەوە لەسەر ئیمان[5] و ئەو کەسێکە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت[6]، ئەوەش کە کەسێك خۆشی ناوێت ئیماندار نابێت، کەسێکیش کینەی نابێت بەرامبەری دووڕوو نەبێت.[7]

عەلی (رەزای خوای لێبێت) لە نێو ماڵی پێغەمبەر ﷺ دا پەروەردە بوو، وەکو هاوکاری یەك بۆ ئەبوتالیبی مامی[8]، لە شەوی کۆچکردنیشیدا عەلی لەسەر جێگای پێغەمبەر ﷺ خەوتو پۆشاکی ئەویشی لەبەر کرد تاکو بتپەرستەکان بە دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ نەزانن،[9] هەر بۆیە سێ رۆژ کۆچکردنی دواکەوت لە پێغەمبەر ﷺ.[10]

---

١) ابن حجر: فتح الباري ٧: ٧١.

٢) أحمد: فضائل الصحابة ٧٠٥ باسناد صحيح والترمذي: السنن (تحفة الاحوذي) ١٠: ٢١٤ـ ٢١٥ وقال: حسن غريب، والنسائي: خصائص علي ٩٦.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٤٩٩).

٤) ابن حجر: فتح الباري ٧: ٥٠٧.

٥) أحمد بن حنبل، المسند١: ١٨٨ وفضائل الصحابة ١١٦ باسناد صحيح وأبوداود: السنن ٤: ٢١١ والترمذي: السنن ٥: ٦٥٢ وقال: حديث حسن.

٦) الترمذي: السنن (تحفة الاحوذي) ١٠: ٢١٧ـ ٢١٨ وقال حسن صحيح غريب، وأبوداود: السنن (مع شرح الخطابي) ٣: ١٤٨، وأحمد: المسند ٣: ٨٢،٣٣ و ٦: ١٠٦، ١٢١، والبزار: المسند ٣: ١١٨ والحديث صحيح بمجموع طرقه.

٧) البخاري: الصحيح ١: (فتح الباري ٧: ٧٠) ومسلم: الصحيح ٤: ١٨٧٢ـ ١٨٧٣.

٨) مسلم: الصحيح ١: ٨٦.

٩) ابن اسحاق: السيرة ١١٨ بدون اسناد.

١٠) أحمد: المسند ٥: ٢٥ـ ٢٧، وقال محققه أحمد شاكر: إسناده صحيح، وإبن هشام: السيرة النبوية٢: ١٢٤، ١٢٦ـ ١٢٧، والحاكم: المستدرك ٣، ٤، وقال الذهبي صحيح.

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لە هەموو غەزاکان بەشداری کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ تەبووک نەبێت، لە جەنگی بەدریشدا هەڵگری ئاڵا بوو کە هێشتا تەمەنی بیستساڵان بوو،[١] ئازایەتیەکی لە ڕادەبەدەریشی دەربڕی لە جەنگی ئوحوددا.[٢] بەرەنگاری عەمری کوڕی ودی عامری بوویەوە کاتێك ویستی خەندەقەکە بشکێنێ لە غەزای ئەحزابو کوشتی، هەروەها یەکێك بوو لە بەناوبانگترین سوارچاکەکانی عەرەب،[٣] هەرئەویش هەڵگری ئاڵا بوو لە کاتی کردنەوەی شاری خەیبەر لە ساڵی (٧)ی کۆچی، خوای گەورەیش سەرکەوتنی لەسەر دەستی هێنا،[٤] یەکێکیش بوو لەوانەی کە جێگای خۆیان بەرنەدا لە موهاجیرو ئەنصارەکان کاتێك خەڵکیی هەڵهاتن،[٥] پێغەمبەریش ﷺ ئەوی بە جێگری خۆی لە مەدینە بە جێهێشت لە کاتی غەزای تەبوکدا،[٦] ئەگەرچی عەلی زۆر ئارەزووی بەشداربوونی ئەو جیهادە بوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پی فەرموو: "ألا ترضى أن تكون مني بمنزلة هارون من موسى ـ غير أنه لا نبي بعدي".[٧] واتە: ئایا ڕازیی نابیت پلە وپایەی تۆ لای من وەکو پلەو پایەی هارون بێت لای موسا، بەڵام پێغەمبەر نایەت دوای من، دوو جاریش بۆ یەمەن ناردوویەتی، جارێك بۆ بانگەوازو غەزا لە ساڵی (٩) ی کۆچی و جارێکیش وەکو دادوەر.[٨]

ئەوکاتەش پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، بەبێ ئەوەی کەسێك دەستنیشان بکات بۆ سەرکردایەتی موسڵمانان[٩]، ئەنصارەکان کۆبوونەوەی سەقیفەیان ئەنجامدا بۆ دانانی خەلیفە، ئەبوبەکرو عومەرو ئەبوعوبەیدە ئامادەی ئەو کۆبوونەوە بوون، جا لە دوای هەندێك وتووێژ ئەوەبوو ئەبوبەکر وەکو

---

١) الحاكم: المستدرك ٣: ١١١ وقال: صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٣٧٢) ومسلم: الصحيح (شرح النووي) ١٢: ١٤٨.

٣) ابن هشام: السيرة النبوية ٣: ٣٢٥ـ ٣٢٦ بدون اسناد والواقدي المغازي ٢، ٤٩٦.

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٧٠) ومسلم : الصحيح ٤: ١٨٧٢ـ ١٨٧٣.

٥) احمد: المسند ٣: ٣٧٦ ورجاله رجال الصحيح، وابن هشام: السيرة ٤: ٨٧ـ ٨٨ بسند صحيح.

٦) مسلم: الصحيح ١: ٨٦.

٧) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ٦٥ـ ٦٩)ـ والفتح الباري ١٢: ٢٩١، ٢٩٣، وأبو داود : السنن٤: ١١ـ ١٢، والنسائي (السنن ٥: ١١٥، والحديث حسن بمجموع طرقه).

٨) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ١٤٢، ١٤٨، ١٣: ٢٠٥ـ ٢٠٦) ومسلم الصحيح: ٣: ١٤٥٤، ١٤٥٥، وأحمد: المسند ١: ١٢٨ باسناد صحيح.

٩) البخاري: الصحيح (فتح الباري٧: ٤٩٣) ومسلم: الصحيح (شرح النووي) ١٢: ٧٦.

خەلیفەی موسڵمانان هەڵبژێردرا، عەلی لەو کۆبوونەوەیە دواکەوت، موسڵمانانیش بەکۆی دەنگ بەیعەتیان دایە ئەبوبەکر، بێئەوەی کەسێك مشتومڕ بکاتو لە ڕۆژی دووەم بەیعەتی گشتیی پێدرا لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ عەلی-ش لەگەڵ موسڵمانان بەیعەتیدا ـ لە ڕیوایەتێکدا [1]ـ بەڵام لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە بەیعەتەکەی دواخست بۆ ماوەی شەش مانگ وەکو نارەزای یەك لەسەر راوێژ پێنەکردنی لە مەسەلەی خیلافەت، چونکە ئەو ئامادەی کۆبوونەوەی سەقیفە نەبوو، دواتریش ناکۆکیی دروست بوو لە نێوان فاتیمەو ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر میراتی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەبوبەکر پەیوەست بوو بەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ : "نحن معاشر الانبياء لا نورث، ماتركناه صدقة". واتە: ئێمەی پێغەمبەران ماڵمان بە میرات ناگیردرێت، ئەوەی کە لێمان بەجێدەمێنێت خێرو صەدەقەیە.[2] جا کاتێك فاتیمە وەفاتی کرد، عەلی بەیعەتی دایە ئەبوبەکر،[3] لە چەندان ڕێگەشەوە ڕیوایەت کراوە لە عەلی کە فەرموویەتی: "خير هذه الامة بعد نبيها أبوبكر ثم عمر"[4] واتە: چاکترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە و ئەمجا عومەر.

لە سەردەمی عومەریش عەلی یەکێ بوو لە ڕاوێژپێکراوە نزیکەکان، باری سووك دەکردەوەو بەخیلی نەدەکرد لە دەربڕینی هیچ بیروڕایەك بۆی، کۆششی دەکرد لەگەڵی بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو کێشانەی کە دەقێکی شەرعیی دەربارەیان نەهاتووە، هەروەها لە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو.[5]

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري٦: ١٩٧، ٧: ٤٩٣) ومسلم: الصحيح ٣: ١٣٨٠.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ١٩٧، ٧: ٤٩٣) ومسلم: الصحيح ٣: ١٣٨٠.

٣) الحاكم: المستدرك: ٣: ٧٦ وقال صحيح على شرط الشيخين، وسكت عنه الذهبي واسناده صحيح والبيهقي: السنن الكبرى ٨: ١١٣ باسناد صحيح.

٤) إبن تيمية: منهاج السنة ١: ٣٠٨و ٦: ١٣٧و ٧: ٥١١ـ ٥١٢ وقال: ان طرقه تبلغ ثمانين طريقاً، وانظر البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٢٠).

٥) عبدالحميد علي ناصر: خلافة علي بن أبي طالب ـ دراسة تقدية للروايات ـ ص ٧٠ وانظر عن امثلة ذلك: أحمد: فضائل الصحابة ٢: ٧٠٧ باسناد صحيح، وأبا داود: السنن (بشرح الخطابي)٤: ٥٨٨ باسناد صحيح.

لە گرنگترین راوێژەکانی رازیبوونی بوو لەسەر بۆچوونی عومەر لەسەر دابەشنەکردنی ئەو زەویانەی کە دەسیان بەسەرا دەگیرا.[1] هەروەها پێشنیازکردنی بۆ دەستپێکردنی مێژووی ئیسلامیی لە سەرەتای کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە.[2]

کاتێك عومەر شەهید کرا عەلی کرد بە یەکێ لە پێکهێنەرانی ئەنجومەنی شورا بە مەبەستی هەڵبژاردنی کەسێك لە نێو خۆیان وەکو خەلیفە، ئیتر بەیعەت درا بە عوسمانو عەلی-ش یەکێك بوو لەوانەی بەیعەتی پێدا، دووەم کەس بوو دوای عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف،[3] نزیکیش بوو لە عوسمانەوە، راوێژی پێدەکرد لە کارە گرنگەکاندا، لە مەزنترین راوێژەکانیشی پەسەندکردنی بوو بۆ مەسەلەی کۆکردنەوەی خەڵکیی لەسەر یەکخوێندنەوە بۆ قورئان بە مەبەستی قەدەغەکردنی جیاوازیی.[4]

جگە لەمانەش عەلی بە پەرۆشبوو بۆ ئامۆژگاریکردنی عوسمانو چاکسازی لە نێوان خەڵکیدا لە کاتی دروستبوونی پشێونە، هەوڵیشیدا بەرگری لە عوسمان بکات، حەسەن و حوسەینی کوڕیشی لە نێو بەشداربوانی پاسەوانیی کردنی ماڵی عوسمان بوون،[5] کە ئاژاوەچی یەکانیش ئاویان لە عوسمان قەدەغە کرد عەلی چەند کوننە ئاوێکی بۆ نارد،[6] بەلاّم کاتێك داوای ئامادەبوونی کرد نەیتوانی بیگاتێ بە هۆی ئابلۆقەدانی ماڵی عوسمان لە لایەن ئەو ئاژاوەگێڕە مەترسیدارانەوە،[7] لەبەر ئەوەش کە ئابلۆقەدەران رواڵەتیان قسەی جوان و خوێندنەوەی قورئانو نوێژکردن بوو، بۆیە کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد هەڵسن بە کوشتنی خەلیفەی موسڵمانان، هەر ئەوانەش پێشەکی یەك بوون بۆ

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ٢٢٤) وابن زنجويه/ الاموال ١: ١٥٨، ٢٢٣، ٢٢٦، ٢٣٠.

٢) البخاري: التأيخ الكبير ١: ٩، والطبري: التأريخ ٤: ٣٨ـ ٣٩ وصححه الحاكم والذهبي كما في المستدرك.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٥٩ؤ ١٣: ١٩٣).

٤) ابن أبي داود: كتاب المصاحف: ٢٩ـ ٣٠ باسناد صحيح وابن حجر: فتح الباري ٩: ١٨، والبيهقي: السنن الكبرى ٢: ٤٢.

٥) خليفة: التأريخ ١٧٤، وابن سعد: الطبقات: ٨: ١٢٨ بسند صحيح.

٦) البلاذري: انساب الاشراف ٥: ٦٧.

٧) ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٨ بسند صحيح، وسعيد بن منصور: السنن ٢: ٣٣٦ بسند صحيح، والخلال: السنة ٣٢٨ باسناد صحيح.

دروستبوونی خەواریج، توندوتیژییو کەللەڕەقی ئەوان لەوە دەرکەوت کە عوسمانیان کوشت بەبێ هیچ حیسابکردنێك بۆ حورمەتی خەلیفەو شاری مەدینەو شەهرولحەرام[1].

لە کاتی شەهیدبوونی عوسمان، عەلی ئازارو بێتاقەتی نواند بەوەی کە وتی: "ولقد طاش عقلي يوم قتل عثمان وانكرت نفسي".[2] واتە: وەخت بوو هۆشم لە دەست بدەم لەو ڕۆژەی عوسمانی تیادا کوژراو خۆمم لەبەرچاو کەوت.

هەموو خەڵکی مەدینە کۆبوونەوە لەسەر بەیعەت پێدانی عەلی، سەرەڕای ئەوەی کە ئارەزووی نەبوو لە وەرگرتنی، بەڵام دواتر ڕازیی بوو بۆ ڕێگرتن لە بشێویی،[3] وێڕای ئەوەی کە دەیزانی کەس نی یە لە ئەو مافدارتر بێت بۆ خەلیفەیی.[4]

لە پاش دانیشتنی لەسەر تەختی خیلافەت سەرقاڵی بەرنگاری نەیارەکان بویەوە و چەندین شەڕی سەختی گێڕا دژیان لە جەمەلو صففینو نەهرەوان، توانایەکی بێسنووری پیشاندا لە کۆکردنەوەی سوپاو سەرکردایەتیی خەڵکییو ڕوونکردنەوەی حوکمەکانی شەرع لە جەنگە ناوخۆی یەکانی نێو موسڵمانان لەوانەش وازهێنان لە هەڵهاتوو و چاکە لەگەڵ دیلو ئازادکردنی لە دوای تەواو بوونی جەنگ، یان وەرگرتنی پەیمان لەو کەسانە جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ شەڕکردن، ماڵو سەروەتی ئەوانەشی بە غەنیمەو دەسکەوت نەئەژمارد تەنها چەكو کەرەستەی شەڕیان نەبێت، هەروەها ژنو منالی ئەوانەشی بە دەستگیر کراو و دیل نە ئەژمارد، هەروەها نەیارەکانی بێبەش نەئەکرد لە دەستکەوتو نوێژکردن لە مزگەوتەکانو دەستپێشخەری جەنگی لەگەڵ نەئەکردن[5]. بەڵام خەریك بوو خۆی ساز دەدا بۆ شەڕێکی تر لەگەڵ موعاویە، هاوکات سستی و لاوازیی سەربازەکانی لە گوێڕایەڵیدا دەبینی، لەو کاتەداو لەسەر دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجیمی خاریجی لە کووفە بە شەهیدیی گەیشت لە سپێدەی بیستو یەکی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچیی[6] لە تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا.[7]

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢: ١٤٤ـ ١٤٥ واحمد: المسند ١: ٣٢٣ باسناد صحيح.
٢) الحاكم: المستدرك ٣: ٩٥ بسند صحيح.
٣) أحمد فضائل الصحابة ٢: ٧٥٣، باسناد حسن، والحاكم: المستدرك: ٣: ٩٥ باسناد حسن.
٤) أحمد: المسند ٢: ٢٨٧ـ ٢٨٨ وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح.
٥) عبدالحميد علي ناصر محمد: خلافة علي بن أبي طالب ـ دراسة نقدية للراوايات ٤٤٦ ـ ٤٤٨.
٦) البخاري: التأريخ الكبير ١: ٨٨ـ ١٠٠ بسند صحيح.
٧) البخاري: التأريخ الصغير ١: ١٠٠، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتأريخ ٣: ٣١٦، والطبري: تأريخ ٥: ١٥١.

## باسی پێنجەم:
## بە بەڵگەبوونی کرداری خەلیفە ڕاشیدەکان

هەندێ کرداری خەلیفە راشیدەکان، هاوەڵان لەسەری رێککەوتوون، ئەوە پێویستە لەسەر نەوەکانی دوای خۆیان پێوەی پابەندبن، هەندێکیشی بواری راوبۆچوونی کەسێتی تیادا نی یە، ئەوەش بە سوننەتی بەرزکراوە دەژمێردرێن، بەڵام هەندێ کرداری تریان زادەی کۆششو هەڵوێستی خۆیان بووە لە نێو هاوەڵاندا کەسانێك نارازیی بوون لەسەری، وێڕای ئەوەش لە قسەیان دەرنەچوونو گوێڕایەڵیان کردووە، چونکە خەلیفەکان (أولوا الأمر) بوون و گوێڕایەڵیان (واجب)ە. زانایان دەربارەی ئەم جۆرە کردارانە جیاوازیان تێدایە، هەندێکیان وتوویانە دەبیتە بەڵگە لەسەر نەوەکانی دوای خۆیان بە مەرجێ ناکۆك نەبێت لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، وتەی پێشەوا ئەحمەدیش لە یەکێ لە دوو ریوایەت ئاماژە بە بەڵگە بوونی دەکات،[1] لە قسەی ئەوان دەرناچێت بۆ قسەی هیچ کەسێکی تر.

پێشەوا شافیعیی وتەی خەلیفە راشیدیەکان پێش دەخاتە سەر هاوەڵاندا، ئەگەر هاوەڵانیش لەسەر مەسەلەیك بوون بە دوو بەشەوە، خەلیفەکان لەگەڵ بەشێکیان بوون، لەو حاڵەتەدا قسەی خەلیفەکان کاری پێدەکرێت، بەڵام لە ریوایەتێکی تر لە شافیعیەوە هاتووە دەڵێت هەر دوو بەشەکە وەکو یەکنو پێشخستنی بۆچوونیك پێویستی بە فاکتەرێکی پێشخستن هەیە.[2]

پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: تاکو قورئان و سوننەت وەستا بن، بەهانە لەسەر گوێگریان بڕاوە بە شوێنکەوتنیان نەبێت، بەڵام ئەگەر وانەبوو، دەچینە سەر بۆچوونی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، یان یەکێك لە نێو ئەوان، ئەگەر مەسەلەی شوێنکەوتنیش بێت ئەوا پێمان خۆشە شوێنی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان بکەوین (رەزای خوایان لێبێت)، ئەمە لە حاڵەتێکدا ئاماژەیەکمان دەستنەکەوت بۆ نزیکترین جیاوازیی لە قورئانو سوننەتەوە، ئەگەرنا کار بەو وتە دەکەین کە بەڵگەدارە، چونکە قسەی خەلیفە ناچارکەرە بۆ ئیش پێکردن.[3]

---

١) الموفق: الروضة الناضر ١: ٣٦٦، والعلائي اجمال الاصابة فى أموال الصحابة ٤٧.

٢) الزركشي: البحر المحيط ٤: ٤٩٠ـ ٤٩٢.

٣) الشافعي: الأم ٧: ٢٦٥، والعلائي: اجمال الاصابة في اقوال الصحابة ٣٨.

(القاضي) له کتێبی (التقريب) وتوویەتی: ئەوانەی کە ڕایان وایە قسەی خەلیفە ڕاشیدەکان پێشدەخرێتە سەر هاوەڵانی تر، دەڵێن: ئەوە بە هۆی چاکەی دێرینیی لە ئیسلامو زۆر هاوڕێ یەتی کردنیانە بۆ پێغەمبەر ﷺ [1].

هاوەڵان لە نێو خۆیاندا جیاوازیی یەکتریان بە ئاسای زانیوە، تەنانەت خەلیفەکانیش نکوڵیان نەکردووە لەو هاوەڵەی ناقایلیان لەگەڵ کردوون، بەڵام فەرموودەی: "اني لا أدري ما بقائي فيكم فاقتدوا باللذين من بعدي أبي بكر وعمر". [2] واتە: من نازانم چەند لە ناوتان دەمێنمەوە، بۆیە لە پاش من پەیڕەوی بکەن لە ئەو دوو کەسەی دوای خۆم: ئەبوبەکرو عومەر. مەبەست لەو پەیڕەویکردنە لە ژیاننامەو دادگەریانە، نەك ئەوەی قسەکانیان بەڵگەیەکی ناچارکەر بن بۆ شوێنکەوتنیان، چونکە ڕێبازی هاوەڵ بەڵگە نی یە لەسەر هاوەڵێکی تر بەیەکدەنگی زانایان، چ جای چوار خەلیفەکان لە نێو خۆیاندا. [3] پێشەوا خەتتابی پەراوێزی نووسیوە لەسەر فەرموودەی: "عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهدين عضوا عليها بالنواجذ". [4] واتە: لەسەرتانە پەیڕەوی بکەن لە سوننەتی منو جێنشینە ڕاشیدە ڕێنموونیکراوەکانم، بە توندی پابەندی بن، فەرموویەتی: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر یەکێ لە چوار خەلیفەکان قسەیەکی کردو جیاوازی بوو لەگەڵ هاوەڵێکی تر، لەو حاڵەتە گوێڕایەڵی قسەی خەلیفەکە لە پێشترە. [5] ئیبنولقەیم وەکو بەداوادچوون لەسەر ئەم فەرموویەدە وتوویوتی: پێغەمبەر ﷺ سوننەتی خۆیو جێنشینەکانی وەك و یەك داناوەو فەرمانی بە پەیڕەوکردنیان کردووە وەکو یەك، زۆریش جەختی کردووە لەسەر ئەوە کاتێك فەرموویەتی (عضوا عليها بالنواجذ) واتە بە ددان قەپیی لێبگرن، ئەمە پەیوەستە بە فەتوای هەموویان یان زۆربەیان، یان هەندێکیان، چونکە ئەو مەسەلەی هەڵواسیووە بە سوننەتی

---

١) الزركشي: البحر المحيط ٤: ٤٩٠ـ ٤٩٢.

٢) الترمذي: السنن ٣٦٢ وصحه الالباني (السلسلة الصحيحة ٣: ٢٣٥).

٣) نقله العلائي (اجمال الاصابة ٦٣).

٤) أخرجه الترمذي: السنن: كتاب العلم، حديث رقم ٢٦٧٦ واللفظ له، وقال هذا حديث حسن صحيح، وصححه الالباني: وصحيح الترمذي ٤: ٣٤٢، واخرجه أبودادود: السنن ٥: ٩٧ وقال: صحيح على شرط الشيخين، وصححه أيضاً الحافظ أبونعيم الاصبهاني وأبو العباس الدغولي وغيرهما، كما نقله العلائي في اجمال الاصابة ٤٩.

٥) الخطابي: شرح سنن أبي داود ٧: ١٢.

خەلیفەكانەوە، ئاشكراشە كە ئەوان هەڵنەساون بە دانانی ئەو سوننەتە لە یەككاتدا، كەواتە ئەوە دەگەڕێتەوە كە هەر یەكێك لە چوار خەلیفەكە لەسەردەمی خۆیدا چی كردبێت سوننەتە.[1]

موحەممەدولئەمینی شەنقیتی لە كۆمەڵێك لە زانایان دەگێڕێتەوە كە مەبەست لە پەیڕەویكردنیان تایبەتە بۆ كەسی (مقلد) ئەگەرنا كەسی زاناو شارەزا بە بەڵگە، فەرمانی پێنەكراوە بە وازهێنان لە بەڵگەی ئاشكرا بۆ وتە هیچ كەسێك.

هەروەها وتوویەتی: دوای لێكۆڵینەوە دەركەوتووە كە دەقی شەرعیی (تخصیص) نابێت بە قسەی هاوەڵ مەگەر قسەكەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕابێتەوە، چونكە دەقەكان تایبەت ناكرێن بە (اجتهاد)ی هیچ كەسێكو بەڵگەشە لەسەر هەر كەسێك ناكۆك بێت لەگەڵی.[2]

گومانیشی تیادا نی یە كە یەكدەنگی هاوەڵان بایەخدارترە لە یەكدەنگی ئەوانەی دوای خۆیان، چونكە پلەو پایەی ئەوان لە فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەو روپامایەنەكردنیان دەخوازێت كە بێدەنگیان بەڵگەیە لەسەر رازیبوونیان، خۆئەگەر بە یەكدەنگیی نەژمێردرێت بەڵگەیەكە خۆی لە خۆیدا.[3] واتە ئەگەر یەكێك لە چوار خەلیفەكە سوننەتێكی دەستنیشان كرد و ئەوان نارەزایان دەرنەبڕی ئەوە سوننەتەكەی بەڵگەیە لەسەر موسڵمانان با یەكدەنگی لەسەر دروست نەبووبێت، چونكە گوێڕایەڵیی پێویستە، سووربوونیشی لەسەر راوێژ گەورەیە، رێگرێكیش نی یە لە گۆڕینی ئەو سوننەتە لەلایەن پێشەوایەكی رێپیشاندەرەوە كە بە راوێژ كار بكات و گوێڕایەڵی پێویست بێت، چونكە عومەر (رەزای خوای لێبێت) لایدا لەو شێوازەی ئەبوبەكر خەڵاتەكانی پی دابەش دەكرد، بە هەمان شێوە عوسمانیش لەگەڵ عومەر، ئەبوبەكر قورئانی كۆدەكردەوە عومەر خەڵكی كۆكردەوە لەسەر تەراویح، ئەم دوو كردارە یەكدەنگیی هاوەڵانی لەسەر بوو، عوسمان قورئانەكانی یەكخست لە كۆكردنەوەی دووەمدا بۆ قورئان، ئەم كردارانەیان پێویستبوو لەسەر موسڵمانان گوێڕایەڵی یان بكەن تیایدا، ئەگەرچی پێویست نەبوو لەسەر خەلیفەكانی دوای خۆیانو موسڵمانان بەوە كار بكەن، مەگەر یەكدەنگیی لەسەر ئەنجام درابێت.

---

١) ابن القيم: أعلام الموقعين ٤: ١٤٠.

٢) محمد أمين الشنقيطي: مذكرة أصول الفقه ١٦٦.

٣) العلائي: اجمال الاصابة فى أقوال الصحابة ٣٢.

دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان سەبارەت بە قسەی هاوەڵ ئەگەر لە کۆشش و بۆچوونی خۆیەوە هاتبێت دەڵێت: "هەندێ لە زانایان پیان وایە کە وتەی هاوەڵ بەڵگەیەکی شەرعی یە، کۆششکار پێویستە بە قسەی هاوەڵ کاربکات، ئەگەر بەڵگەی بەدەستەوە نەبوو لە قورئان و سوننەت و یەکدەنگی، ئەگەر قسەی هاوەڵانیش جیاواز بوو پێویستە بۆچوونی کەسێکیان هەڵبژێرێت، بەڵام هەندێکی تر لە زانایان قسەی هاوەڵانیان بە بەڵگە نەزانیوە، بە پێویستیان نەزانیوە کە (**مجتهد**) بە قسەیان کاربکات، بەڵکو پێویستە بە پی بەڵگەی شەرعی کار بکات، ئەو بۆچوونەش کە ئێمە پێشی دەخەین ئەوەی کە قسەی هاوەڵان بەڵگەیەکی ناچارکەر نی یە کاری پێبکرێت، بەڵام لایەنگری ئەوەین کە قسەیان وەربگیرێت لە کاتی نەبوونی دەق لە قورئان یان لە سوونەت و ئیجماع، لەوکاتەی کە بەڵگەیەکی متمانەپێکراو لەبەردەستدا نەبێت لەو حاڵەتە پێمان وایە وەرگرتنی قسەی هاوەڵان چاکترە".[1]

بەڵام ئەوانەی کە پیان وایە سوننەتی چوار خەلیفەکان بەڵگەیەکی متمانە پێکراوە، بە یەکجار نەیانڕوانیوەتە سوننەتی ئەوان و سونەتی پێغەمبەر ﷺ، بە شێوەیەك ڕێك نەکەون و بەریەککەون و پێویست بە پێشخستنی یەکێکیان بکرێت، عەلائی دەفەرموێت: "سوننەتی خەلیفەکان بەڵگەی ئەوە ناگەیەنێ کە یەکسان بێت لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو دەکرێت فەرمانت پێکرابێت بە پەیڕەویکردنی بە مەرجێك سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە نەبێت، هەروەها پێواندن (قیاس) بەڵگەیەکی شەرعی یە، لە دوای قورئان و سوننەتەوە دێت".[2]

---

١) عبدالكريم زيدان: الوجيز في أصول الفقه ٢٦١ـ ٢٦٢.

٢) العلائي: اجمال الاصابة.

## باسی شەشەم:

## ڕاوێــــژ

ئەو ریوایەتانەی بە ڕێگەیەکی ڕاست پێمان گەیشتوون کە باس لەوە دەکەن پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵان کردووە، جگە لەوەش جێبەجێکردنی چوار خەلیفەکە بۆ دەقەکانی (شورا) ئەوانەن هێمای ڕاوێژکردن دیاری دەکەن لە ئیسلامدا، چونکە قورئان باسی ڕاوێژی کردووە بێ هیچ شیکردنەوەیەك بۆ سنوورو چۆنیەتی و جێبەجێکردنو تا چەند پێویستە کاری پێبکرێت، لەبەرئەوەیش ئەو دوو ئایەتەی هاتووە دەربارەی (شورا) بە شێوەیەکی گشتیی هاتووە و بریتییە لە: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ). (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ)، یەکەمیان کەوتۆتە نێوان وەسفی موسڵمانان بە نوێژ (وأقاموا الصلاة) هەروەها بە زەکات (ومما رزقناهم ينفقون) واتە کەوتووەتە نێو دوو فەرزەوە، ئەگەر مەبەست لە هەواڵیش داڕشتنی داواکاریی بوو بەهێزترە لە فەرمان، ئایەتی دووەم بەشێوەی فەرمان هاتووە، لە قورئانیش پشتگیری یەك نی یە ئەم ئایەتە لە فەرمانەوە دەرکات بۆ (ندب) واتە لە فەرمان کەمتر، لەم حاڵەتە هیچ نامێنیتەوە ئەوە نەبێت لە نێو فەرموودەکان بگەڕین، ئەوەندەیش کە گەڕاوم ـ بە پی توانا ـ لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دەقێکی ڕاستم بەرچاو نەکەوتووە کە فەرمان بە ڕاوێژ لە پلەی فەرمان دابەزێنێت بۆ پلەی (ندب)، بەڵکو دەقێکم نەبینیوە کە لە دەربەستکردن دەری بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحود بە بۆچوونی زۆرینە پابەند بوو، ڕاوێژی سەرانی ئەنصاریشی کرد (سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادەو سەعدی کوڕی ڕەبیعو سەعدی کوڕی خەیسەمە و سەعدی کوڕی مەسعود) سەبارەت بە پێدانی نیوەی خورمای مەدینە بە هۆزی غەتەفان بەرانبەر کشانەوەیان لە جەنگی ئەحزاب، جا کاتێك لەسەر ئەوە پێکهاتن کە بەرگری ئابڵۆقەکە بکەن نەك خورمای مەدینەیان پێبدەن، بە قسەیکردن سەرەڕای ترسناکی زۆر لەسەر مەدینە و بانگەوازی ئیسلام بە گشتیی، بە ڕاوبۆچوونی زۆرینەش کاری کرد لە مەسەلەی ئابڵۆقەی شاری تائیف، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەویست کۆتای بە ئابڵۆقەکە بهێنێت، بەڵام کە بینیی زۆرینەی موسڵمانان ئارەزووی پەلاماردانی تائیفیان هەیە، وازی هێنا تا ڕۆژی دووەم ئەو کاتە ڕازیبوون بە کۆتای هێنان بە ئابڵووقەکە، بەڵام سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی ڕاوبۆچوونی زۆرینە لە غەزای حودەیبیە هۆی ئەوە فەرمانی خوا بوو بۆ

پێغەمبەرەکەی، کە ئیتر بواری راوبۆچوون نامێنێت، قسەی کەسیش نابێت سەر قسەی خوا بکەوێت.[1]

ئەبوهورەیرە دەیفەرموو: "مارأیت احداً قط کان أکثر مشورة لاصحابه من رسول الله ﷺ"[2]، واتە: کەسم نەبینیوە هێندەی پێغەمبەر ﷺ کە راوێژ بە هاورێکانی بکات.

لەبەر ئەوەی بەڵگەیەك نی یە رێگە بگرێت لە وەرگرتنی بۆچوونی زۆرینە لە قورئانو سوننەتدا کەواتە ئەوە کارێکی رەوا بینراوە، بەڵکو دەبێتە (واجب) ئەگەر پەیوەندی هەبوو بە بەرژەوەندی موسڵمانانەوە، یان وازلێهێنانی بووە مایەی دروستبوونی خراپەی گشتیی وەکو زۆرداریی، یان شێوانی ئاسایش بەهۆی پەرتەوازەبوونی راوبۆچوونی خەڵکیی، ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەهلی حەلو عەقد لایان وانەبێت کە بەڵگەکانی واجب بوونو دەربەستکردنی شورا ئەو واتا بگەیەنن..

دژوارە قایل بوون بەو واتایەی کە گوایە راوێژ لەسەر پێغەمبەر ﷺ (واجب) بووە و لەسەر موسڵمانان سوننەتە، چونکە هیچ دەقێك نی یە ئەم تایبەتمەندی یە بگەیەنێت، بگرە وردبوونەوە پێچەوانەی ئەوە دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی پێویستیی پێغەمبەری پارێزراو لە هەڵە کەمترە بەراوێژکردن ـ کە تایبەتە بە هەندێ بەرژەوەندیی دونیاوە ـ تاوەکو موسڵمانان کە پارێزراو نین لە هەڵە، بەڵکو زۆرینە لەسەر ئەوەن کە راوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ جۆرێك بووە لە فێرکردن بۆ ئوممەتەکەی بۆ ئەوەی پێویستیەکی راستەقینەی هەبێت بۆ ئەو راوێژە، چونکە سرووش پشتگیریی لێدەکاتو لە هەڵە دەیپارێزێ..

سەبارەت بە کرداری خەلیفە راشیدەکان، مێژوو سەلماندوویەتی کە خیلافەتی ئەوان بە پی بەیعەتو رەزامەندیی خەڵکیی بووە، هەڵبژاردنی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) لە سەقیفەی بەنی ساعیدە نموونەیەکە بۆ گفتوگۆی ئازاد بە راشکاوی لە نێوان کۆبوونەرەوان، زۆربەشیان لە ئەنصار بوون، وێرای ئەوەش وتووێژەکە بە بەیعەتدان بە ئەبوبەکر کۆتای پێهات کە یەکێك بوو لە موهاجیرەکان، ئەوەش بەیعەتێکی ئازاد بوو چەسپێنرا لە لایەن کەمایەتی موهاجیرەکانەوە لەو کۆبوونەوەیەدا.

---

١) د. همام سعید: عرض الاحادیث النبویة المتعلقة بالشوری ودراستها (بحث ضمن کتاب الشوری في الاسلام ص٨٥ـ ٩٨).

٢) عبدالرزاق: المصنف. حدیث رقم ٢٧٩. وصحیح البخاري مع الفتح، حدیث رقم ٢٧٣١ـ ٢٧٣٢.

خیلافەتی عومەریش (رەزای خوای لێبێت) سەرچاوەی دەگرت لە پالاَوتنی صددیق بۆ ئەو لە پاش راوێژکردن بە سەرانی هاوەلاَن، ئەگەر ئەو پالاَوتنەیش شانسدار نەبوایە بە پشتگیری ئەهلی حەلل‌و عەقدو زۆرینەی موسلاَمانان پاش ئەوان، لەو حالەتە خیلافەت دانەدەمەزرا.

سەبارەت بە خیلافەتی عەلی (رەزای خوای لێبێت) هاوەلاَن بەیعەتیان پێدا پاش زالبوونی نەیارەکانی عوسمان لەسەر شاری مەدینە، شانسداریش نەبوو بە یەکدەنگی بە هۆی قایل نەبوونی ئەصحابولجەمەل لە بەصرەو موعاویە لە شام، بەلاَم زۆربەی موسلاَمانان بەیعەتیان دایە عەلی، کەسیش نکولی لە مافدارێتی ئەو نەکرد بۆ خیلافەت، بەلاَم ناکۆك بوون بە هۆی تۆلەسەندن لە بکوژانی عوسمان.

لە کۆبوونەوەی کۆڕی راوێژکردن کە عومەری کوڕی خەتتاب پێکیهێنا داننرا بە بیروباوەڕی پابەندبوون بە بۆچوونی زۆرینە بەشێوەیەکی ئاشکرا، تەنانەت عەبدوللاَی کوڕی بەشدار کرد کە مافی هەلبژاردنی هەبێت بێ ئەوەی مافی پالاَوتنی هەبێت، ئەویش لە کاتی یەکسانی دەنگەکان لە نێو ئەوانەی تیروپشکیان ئەنجامدا کە شەش کەس بوون، جا حەوتەمین کەس پێشخەر بوو بۆ یەکێ لەو دوو لایەنە، بەم شێوازەش بیرۆکەی هەلبژاردن و زۆرینە سەری هەلدا لە رێکخستنی کۆڕی راوێژکردن هەر لەو سەردەمەوە.

جگە لەو کۆڕەی ئاماژەمان پێ کرد، هیچ کۆڕێکی تر دانەمەزرا ئەندانەمەکانی دیاریی بن نە بە شێوەی هەمیشەی نە بە شێوەی کاتیی، بەلاَم چوار خەلیفەکە ئەگەر مەسەلەیەکیان بەلاوە سەخت بوایە شارەزایانی هاوەلاَنیان کۆدەکردەوەو راوێژیان پێدەکردن، بێگومان راوێژیش نەدەکرا لە بابەتێکدا دەقی قورئان‌و فەرموودەی لەسەر بێت، بەلکو لە شتێکدا دەکرا کە پێویستی بەراوێژ بێت لە بەرژەوندیی خەلکیی‌و کێشەکانی نەتەوەو هەلوێستەکانی دەولەت لە ئاستی شەڕو دابەشکردنی دەسکەوتەکان‌و چۆنێتی رەفتارکردن لەگەل ناوچەکراوەکان.

راوێژکردنی تایبەت لە هەندێ کێشەی تایبەت بە کەسەکانەوە ناچێتە نێو ئەم باسەوە، ئەو بابەتانەش زۆرن، جیاکردنەوەش پێویستە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە راشیدەکان سەبارەت بە مەسەلەی راوێژکردن لەو بابەتانەی چەند ئەگەرێك هەلدەگرن، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی روونکەرەوەی قورئانە، لە رووی ئایەتە گشتیی‌و تایبەت‌و رەهاو کۆتکراو (ناسخ)و (منسوخ)، ئەم بوارانەش پێویستی بە راوێژکردن نی یە، بەلاَم دەگونجێ خەلیفە راشیدەکان ئاگاداری دەقێك

نەبن لە سوننەت یان ئاماژەی دەقێك لە قورئانو سوننەت، بۆیە پێویستیشیان دەبێت بە راوێژ بۆ گەیشتن بە حوکمی شەرع، ئەگەر ئێمە سەیری هەڵویستی چوار خەلیفەکە بکەین لە کێشەکانی راوێژکردن لە مەسەلە گشتی یەکاندا دەبینین بە زۆری راوێژیان کردووە بە زانایانی نێو هاوەڵان، سەرچاوەکان باسی ئەو کەسانەیان کردووە کە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) راوێژی پێکردوون وەکو عومەری کوڕی خەتتاب، عوسمانی کوڕی عەففان، عەلی کوڕی ئەبو تالیب، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، موعازی کوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی سابیت، کە ئەمانە زانایانی ناو هاوەڵان بوونە لەسەردەمی ئەبوبەکر.[1]

مەیموون کوڕی میهران (ت ١١٧ ك) روونیکردووەتەوە کە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) سەرانی موسڵمانانو زانایانی بانگهێشت دەکردو راوێژی پێدەکردن، ئەگەر لەسەر راوبۆچوونێك بگیرسابان ـ لە کاتی نەبوونی دەق لە قورئانو سوننەتدا ـ کاری پێدەکرد، جار جارەیش دەچووە مزگەوتو پرسیاری لە تێکڕای موسڵمانان دەکرد ئایا زانیاریان هەبێت چی سوننەتێك دەربارەی مەسەلەیەکی دیاریکراو هاتووە.[2]

بازنەی راوێژکردن لە خیلافەتی عومەر (رەزای خوای لێبێت) فراوانتر بوو بە هۆی زۆریی داهێنراوو رووداو و بڵاوبونەوەی رووبەری خاکی ئیسلام بۆ شوێنانی خاوەن ژیارو دابونەریتو سیستمی جیا جیا، بۆیە هەندێ گیروگرفتی تازە هاتە کایەوە کە پێویستیان بە کۆششکردنی زۆر بوو لەلایەن زانایانەوە، بۆ نموونە چۆنێتی مامەڵە کردن لەگەڵ شوێنە دەست بەسەراگیراوەکانو رێکخستنی بەخشین بە پی چەند بنەمایەکی نوێ لەبەر زۆریی ئەو ماڵو سەروەتانەی بە لێشاو دەهاتە خەزێنەی دەوڵەتەوە.

بۆیە عومەر زۆرترین ژمارەی لەگەڵ هاوەڵان کۆکردەوە بە مەبەستی راوێژپێکردنیان.[3] وەکو: عوسمانو عەلیو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو موعازی کوڕی جەبەلو ئوبەی کوڕی کەعبو زەیدی

---

١) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٢: ٣٥٠ من طريق الواقدي وهو متروك في الحديث، واما الاخبار التاريخية فله فيها باع طويل. والمتقي الهندي: كنز العمال ٥: ٦٢٧.

٢) إبن سعد: الطبقات الكبرى ٢: ٣٥٠ من ط.

٣) الدارمي: سنن ١: (ط. البغا)، وابن عساكر: تأريخ دمشق ٩: ٣٥٠ أـ ب ٢ والبيهقي: السنن الكبرى ١٠: ١٤ باسناد حسن لكنه مرسل وصحيح اسناده. ابن حجر (فتح الباري ١٣: ٣٤٢) وتعضده اخبار اخرى تؤكد هذا المنحي عند الصحابة: عمر بن الخطاب، عبدالله بن مسعود، زيد بن ثابت، عبدالله بن عباس.

کوڕی سابیت،[1] هەروەها هەندێ لە هاوەڵە لاوەکانیشی کۆکردەوە لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس[2] جارێکیان زوهری بە هەندێ منالّی وت: (خۆتان بەکەم مەزانن لەبەر ئەوەی منالّن، عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت) ئەگەر مەسەلەیەکی دژواری بەسەر بهاتبا گەنجەکانی کۆدەکردەوە لەبەر تیژی بیروهۆشیان).[3] موحەممەدی کوڕی سیرینیش دەیوت: (عومەری کوڕی خەتتاب هێندە راوێژی دەکرد تەنانەت راوێژی بە ئافرەتیش دەکرد بۆ ئەوەی لە قسەکانی شتێکی باشی دەسکەوێت)[4] سەلمێنراوە کە جارێکیان راوێژی کرد بە حەفصە (رەزای خوای لێبێت).[5]

راوێژ پێکراوەکانیش بیروڕای خۆیان بە راشکاوی دەردەبڕی، عومەریش (رەزای خوای لێبێت) کەسی لە ئەوان تۆمەتبار نەدەکرد لە ئەمانەتو دادگەریی.[6]

عومەر (رەزای خوای لێبێت) راوێژی دەکرد لەو مەسەلانەی دەقی دەربارە نەهاتووە لە قورئانو سوننەت، مەبەستی ئەوە بوو، بەڵکو یەکێك لە هاوەڵان فەرموودەیەکی لەبەر بێت، چونکە ئەو کاتە هێشتا فەرموودە نەنووسرابوو، هەندێ لە هاوەڵانیش فەرموودەی لەبەر بوو کە هاوەڵی تر لەبەریان نەبووە، بە هەمان شێوە راوێژیشی دەکرد دەربارەی ئەو دەقانەی کە زیاتر لەیەك واتا هەڵدەگرن بە مەبەستی گەیشتن بەو واتاو روونە هەڵیدەگرن، لەم جۆرە مەسەلانە لەوانەیە بەراوێژکردنی یەك هاوەڵ یان چەند هاوەڵێك دڵنیا بوایە، بەڵام بۆ کارەساتە گشتی یەکان هاوەڵانی کۆدەکردەوە، بازنەی کۆبوونەوەکەش تا بکرایە گەورەی دەکردەوە، وەکو چۆن لە کاتی کەوتنەوەی پەتای رشانەوە (الطاعون) لە وڵاتی شام رویدا، کە ئەو کاتە خودی عومەر (رەزای خوای لێبێت) بەرەو ئەوێ دەچوو، جا کە گەیشتە ناوچەی سەرەغ بە کارساتەکەی زانیی بانگی موهاجیرە

١) ابن القيم: اعلام الموقعين ١: ٩٧.

٢) ابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٣٥، ٥٥، ٧٧.

٣) البلاذري: أنساب الاشراف ٣: ٣٧، والذهبي: سير أعلام النبلاء ٣: ٣٤٥ـ ٣٤٨.

٤) المصدر سابق.

٥) عبدالرزاق: المصنف ٧: ١٥٢، وابن شيبة، تأريخ المدينة ٢: ٧٥٩، والبيهقي: السن اكبرى ٩: ٢٩.

٦) محمد رمضان البوطي: الشورى في عهد الخلفاء الراشدين (ضمن كتاب الشورى في الاسلام) ص١٣٤. دوو حاڵەتی باسکردووە بە جیا لە یەکێکیاندا عومەر کەعبولئەحباری تیا تۆمەتبار کردووە لە بۆچوونیدا، ئەوی تریش کابرایەکی تۆمەتبار کردوە بە هەمان شێوە، ریوایەتی یەکەم لە رێگەی سەیفی کوڕی عەمرەوە هاتووە کە زانایان قسەی وەرناگرن، دووەمیش ئەعمەش (تدلیس)ی تیا کردووە، هەروەها (انقطاع)یشی تیایە لە نێوان نەخەعی و عومەرو ئەڵێ: عومەر ریوایەتی نەکردووە، بڕوانە (تأريخ الطبري ٣: ٦١١، زطبقات ابن سعد ٣: ٣٤٣).

سەرەتاکانی کردو راوێژی پێکردن، بەڵام کۆنەبوونەوە لەسەر بیرورایەك، بانگی ئەنصارەکانی کرد ئەوانیش بە هەمان شێوە، دواتر بانگی ریش سپیانی موهاجیرانی ئامادەبوی فەتحی مەککەی کرد، رایان وابوو بگەڕێتەوە بۆ مەدینەو بە قسەیکردن، ئەمجا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ کرد کە پاڵپشتی ئەو بڕیارە دەکات.[1]

هەروەها راوێژی کرد بە هاوەڵان بۆ مەسەلەی ئەو زەوی یانەی کەوتووەتە ژێر دەستی موسڵمانان، دواتر وازی لەوە هێنا کە دابەشی بکاتە سەر سەربازەکان بە هۆی مافی نەوەکانی دوای ئەوە دێن لەو زەوی یانە، رووی کردە هاوەڵانو فەرمووی: (اجتمعوا لهذا المال فانظروا لمن ترونه) واتە: کۆببنەوە بۆ ئەم دەسکەوتە بزانن بە باشی دەزانن بدرێتە کێ؟ ئەمجا ئەو ئایەتانەی خوێندەوە کە باسی ئەو ماڵە دەکەن لە دوژمنانی ئیسلام دەستدەکەون، دیدی خۆیشی بۆ واتاو ئاراستەی ئایەتەکان خستەڕوو فەرمووی: (والله مامن أحد من المسلمين الا وله حق من هذا المال أعطى منه أم منع).[2] واتە: سوێند بە خوای گەورە، هیچ کەسێك نی یە لە موسڵمانان مافی نەبێت لەم ماڵانە، ئیتر پی بدرێت یان لی قەدەغە بکرێت.

عومەر بە زۆری راوێژی دەکرد لە چۆنێتی خەرج کردنی ماڵە گشتی یەکان[3]، جا ئەو کاتەی کە سەروەتو سامان زۆر بوو راوێژی کردە خەڵکیی بۆ دانانی (دیوان).[4]

عومەر (رەزای خوای لێبێت) کاتێك کە لیدرا، کۆتای بە ژیانی هێنا بە پێکهێنانی ئەنجومەنی راوێژکردن لە شەش کەس لە گەورە هاوەڵان بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە لە دوای خۆی، ئەوانیش: عوسمان و عەلیو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و زوبەیری کوڕی عەووام، عەبدوڵلای کوڕی عومەریش ئامادە دەبێت بێ ئەوەی مافی خۆ هەڵبژاردنی هەبێت، لە پاش گفتوگۆی سەرەتای لە کۆڕەکە مافەکە تەنها بۆ عوسمان و عەلی مایەوە، مەسەلەی

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري) ١٠: ١٧٩ حيث رقم ٥٧٢٩، ومسلم: الصحيح حديث رقم ٢٢١٩.

٢) عبدالرزاق، المصنف ٤: ١٥١، ١٥٢، و ١١: ١٠١، ١٠٢، وابن ابي شيبه: المصنف ٦: ٤٧١، وابن زنجويه: الموال ١: ١٠٨، ١٠٩، ٢: ٤٨٠ واسناده صحيح.

٣) ابن كثير: مسند الفاروق حديث رقم ٦٧٨ (اطروحة دكتوراه، تحقيق مطر أحمد الزهراني، جامعة ام القرى بمكة - ١٤٠٩ ه م والذهبي: سير أعلام النبلاء ٢: ١٩٠).

٤) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٥ وفي اسناده عبدالله بن موهوب مقبول، وانظر طريقاً اخرى منقطعة عند ابي ابي شيبة: المصنف ١٢: ٣١٧ عن محمد الباقر.

راوێژكردنیش بە خەڵكیی سپێردرا بە عەبدورەحمانی كوڕی عەوف، ئەویش شەونخونی كردو سێ رۆژی بەسەربرد لە راوێژكردن لە هاوەڵان، ئەمجا بەیعەتی دایە عوسمان لە مزگەوتی گەورە بە ئامادەبوونی موهاجیرو ئەنصارو سەركردەی دەڤەرەكان كە هاتبوون بۆ ئەنجامدانی فەرزی حەج لەگەڵ عومەر (رەزای خوای لێبێت).[1] ئیدی هەمووو ئامادەبووان بەیعەتیان بە عوسمان دا، بەو شێوەیش خیلافەت بۆ ئەو دامەزرا، دروستكرنی كۆڕەكەش تەنها وەكو پالاوتن بوو نەك زیاتر.

بێگومان خەلیفەی راشید عوسمانی كوڕی عەففان پەیڕەوی لە ڕێبازی پێش خۆی كرد بە ئیشكردن بە بنەمای راوێژكردن، بەڵام سەرچاوەكان ریوایەتیان لەو بارەوە باسنەكردووە، هەندێ ریوایەتو هەواڵی لاواز هاتووە ئەوە دەگەیەنێت كە راوێژی كردوە بە عەلیو هاوەڵانی تر (رەزای خوایان لێبێت)، هەروەها راوێژی كردووە بە سەركردەی شارو شوێنەكان سەبارەت بەو بشێوەنەی كە بە شەهید بوونی خۆی تەواو بوو،[2] جێگیرنەبوونی هەواڵێكیش لەوبارەوە ئەوە ناگەیەنێت كە عوسمان (رەزای خوای لێبێت) راوێژی نەكردووە، چونكە ئاشكرایە كە ریوایەت و هەواڵی راست لە رووی ئیسنادەوە تەنها رووبەرێكی كەم دادەپۆشیت لە مێژوو.

بەیعەت بە عەلی كوڕی ئەبوتالیب درا (رەزای خوای لێبێت) لە پاش ئەو بشێویو ئاژاوەی بوو بە مایەی كوژرانی عوسمان (رەزای خوای لێبێت)، بۆیە زۆربەی ریش سپیو پیاوماقوڵان بەیعەتیان بە عەلی دا، هەندێكیشیان دواكەوتن، دواتر خەڵكی بەیعەتیان پێدا، بەیعەتی گشتیو تایبەت لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامدرا.

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري) ٧: ٥٩ـ ٦٢ و٣: ٢٥٦و ١٣: ١٩٣، ومسلم الصحيح ١: ٣٩٦. ئەوە دەگەیەنێت كە راوێژ لەو شەش كەسەدا بوو پێش لێدانەكە، عومەر تەنها وەبیری خستونەتەوە لە وتارەكەی لە مزگەوت.

٢) البيهقي: السنن ٨: ٦١ في استشارة الصحابة حول قتل عبدالله بن عمر للهرمزان، وفي اسناده مالك بن يحى ابو غسان ضعفه البخاري وابن حبان (ميزان الاعتدال) وان كان ابن حبان اورده ايضاً في كتابة الثقات، وعلي بن عاصم صدوق يخطئ ويصر ورمى بالتشيع هذا فضلاً عن علة الارسال لان الراوي عبدالله بن عبيد بن عمير استشهد سنة ١١٣ ه فلم يدرك الحادثة (ابن حجر: تهذيب التهذيب ٥: ٣٠٨) واما استشارته لعلي وطلحة والزبير ونفر من الصحابة في القضاء مما رواه البيهقي (السنن ١٠: ١٢) فالخبر في اسناده مجاهيل منهم الليث بن هاورن العكلي (ابن سعد ٦: ٤١٤) واما استشارته ولاة الامصار في احداث الفتنة فمن طريق واهية عللها كثيرة (الطبري: تأريخ الطبري ٤: ٣٣٣) واما استشارته نائلة زوجته عن طريق الواقدي وهو متروك الحديث (الطبري: تاريخ ٤: ٣٦١).

سەرچاوەکان هەندێ وێنەیان تۆمارکردووە بۆ راوێژ لە خیلافەتی عەلی (رەزای خوای لێبێت) پەیوەستە بە سیاسەتی ئەو بەرانبەر فەرمانڕەوای دەڤەرەکان و راگرتنی جەنگ لە صففین لە پاش بەرزکردنەوەی خەڵکی شام بۆ قورئانەکان، هەروەها راوێژکردنی بە خەڵکیی بۆ ئەو بیباوەڕانەی موسڵمانیتی پیشان دەدەن،[1] ئەگەرچی ئەو هەواڵانە جێگر نەبوونە لە رێگایەکی دروستەوە، ئەوەیش روونەدانی ناگەیەنێت، بەڵام ناکرێت پشتیان پێببەسترێت بۆ بڕیاردانی چۆنێتی راوێژکردن لەسەردەمی خیلافەتی عەلی (رەزای خوای لێبێت).

بێگومان عەلی شوێنی رێبازی ئەوانەی پێش خۆی کەوتووە لە جێبەجێکردنی حوکمی راوێژکردن کە پێویستە ئەنجام بدرێت لە لایەن پێشەواو دادوەرەوە، هەروەها خیلافەت لەسەر ئەو بنەمایە لە خەلیفەیەکەوە گەیشتووەتە خەلیفەیەکی تر، تا ئەو کاتەی بۆ عەلی بە هەمان شێوە دامەزرا بە بەیعەتی تایبەتیو گشتی.

کۆڕێکی تایبەتیش دانەمەزرا بۆ راوێژکردن لە سەردەمی خیلافەتی راشیدە، بەڵام ئەوانەی راوێژیان پێدەکرا لە سەرانی هاوەڵان بوون کە دەناسران بە زانستو دڵسۆزی، ئەمەیش هەر بەردەوام بو لە سەردەمانی ئومەویکانو عەبباسیکان، بەبێ ئەوەی برەو بدرێت بە دەزگایەکی دەسەڵات ئاشکرا بۆ راوێژکردن جگە لە (أهل الحل والعقد) نەبێت کە خەلیفە هەڵدەسا بە هەڵبژاردنیان بۆ ئەوەی راوێژو ئامۆژگاری پێشکەش بکەن.

---

١) الطبري: تأريخ ٤: ٤٤١، ٥: ٤٩، وابن أبي شيبة ١٠: ١٤٢. واسناد رجال ثقات لكن عبيد بن فسطاس لم يرو عن علي بل ادرك المغيرة بن شعبة وشريحا قاضي علي.

# دەرگەی دووەم

# بەڕێوەبەرایەتی - دادوەریی

## بەشی یەکەم

## بەڕێوەبەرایەتی (فەرمانڕەوایان - فەرمانبەران)

**باسی یەکەم :**

**فەرمانڕەوایانی شارەکان**

سەرەتاکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ تەنها بریتی بوو لە شاری مەدینە، دواتر فراوان بوویەوە تا گەیشتە زۆربەی دوورگەی عەرەب لە کۆتای ئەو سەردەمە، ئەوەیش خوازیاری ڕێکخستنی ناوچەکان بوو بە شێوازی کارگێڕی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بە دانانی فەرمانڕەوا لەسەر یەکە کارگێڕیەکان کە زۆر جاران پێکدەهاتن لە شارە سەرەکیەکان و دەوروبەریان، دەوڵەت لە سەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) دابەش کرابوو بۆ حەوت هەرێم: حیجاز، بەحرێن، عومان، نەجد، یەمەن، حەزرەمەوت، عێراق، شام. مەدینەش بریتی بوو لە پایتەخت کە خەلیفە راستەخۆ هەڵدەسا بە هەڵسوڕانی، لە حاڵەتی دەرچوونیشی بۆ حەج یان لەبەر هەر هۆیەکی تر کەسێکی تری لە جێگای خۆی دادەنا بۆ بەڕێوەبردنی،[1] فەرمانڕەوای مەککە عەتتابی کوڕی ئوسەید بوو،[2] شاری جوودەیش سەر بە مەککە بوو و حارسی کوڕی نەوفەلی لەسەر بوو،[3] بەڵام شاری تائیف خۆی لە خۆیدا یەکەیەکی کارگێڕیی پێکدەهێنا عوسمانی کوڕی ئەبولعاصی سەقەفی لەسەر بوو،[4] فەرمانڕەوای سەنعا لە یەمەن کەسێك بوو بە ناوی بازام لە ساڵی دەی کۆچی موسڵمان بوو، پێغەمبەر ﷺ لەسەر فەرمانڕەوای ئەوێ هێشتیەوە، کاتێك لەو ساڵەدا کۆچی دوای کرد لە پاش حەجی ماڵئاوای شەهری کوڕی لە جێگای خۆی دانا، یەمەنیشی دابەشکرد بۆ چەند بەشێك، عامیری کوڕی شەهر لەسەر هەمەدان بوو، تاهیری کوڕی ئەبو هالە

---

١) خليفة : التاريخ ١٠١.

٢) ابن هشام: السيرة النبوية ٤: ٥٠٠ وخليفة: التأريخ ٩٧، ١٢٧ والبلاذري انساب الاشراف ١: ٥٢٩.

٣) ابن سعد: الطبقات ٤: ٥٧، وابن عبدالبر: الاستعاب ١: ٢٩٧، وابن حجر: الاصابة ١: ٢٩٢.

٤) إبن سعد: الطبقات ٥: ٥٠٩، خليفة: التاريخ ١٢٣، والبلاذري: انساب الاشراف ١: ٥٢٩، والطبراني: تأريخ ٣: ٤٢٧.

لەسەر عەك بوو، ئەبوموسای ئەشعەری لەسەر مەئریب بوو، یەعلای کوڕی ئومەیەش لەسەر جەنەد بوو، فەرمانڕەوای یەمەن هەمیشە گۆڕانکاریان بەسەر دەهات، سەرچاوە مێژووی یەکان ئاماژە دەکەن کە خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بوو بە فەرمانڕەوای سەنعا، لە دوای ئەویش موهاجیری کوڕی ئەبوئومەیە، هەروەها موعازی کوڕی جەبەل فەرماندەی جەنەد بوو، ئەبوموسای ئەشعەریش بووە والی زەبیدو رەمەعو سەواحیل، فەروەی کوڕی مەسیکی مورادی لەسەر مورادو زەبیدو مەزحەج بووە، ئەم گۆڕانکاریانەش لەوە دەچێت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ یان لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکر روویدا بێت.

تێبینی دەکرێت کە زۆربەی فەرمانڕەواکان خەڵکی یەمەن بوون، ئەوەیش رای کردنێکە پێکهاتەی دانیشتوان و هێزی قەوارە هۆزایەتی یەکانی بەرچاو گرتووە لەو قۆناغەدا، گرنگترین ئامانجەکانی دەوڵەتیش بایەخدان بوو بە بڵاوکردنەوەی ئیسلامو قوڵکردنەوەی بنەماکانی لە نێو دانیشتواندا، موعازی کوڕی جەبەلیش وەکو مامۆستا دامەزراو جێگای دەگۆڕی لە نێوان یەمەنو حەزرەمەوت[1] سەلیتی کوڕی قەیسیش فەرمانەڕوای یەمامە بوو،[2] "بەحرێن بریتی بوو لە دوو بەشی کارگێڕی: هەجەرو خەت کە لای قەتیف بوو". عەلای کوڕی حەزرەمیش فەرمانڕەوای هەجەر بوو، ئەبانی کوڕی سەعیدیش لەسەر خەت بوو،[3] سەبارەت بە عومان جەیفەرو عەببادی کوڕانی جەلەندی لەسەر بوون، عەمری کوڕی عاسیش بەهاوئاهەنگی نێردرا بۆ ئەوێ.

فەرمانڕەوای عەلا لەسەر بەحرێن بەردەوام بوو تا ساڵی (١٥)ی کۆچی، ئیتر عومەری کوڕی خەتتاب هەڵسا بە دانانی عوسمانی کوڕی ئەبولعاص لەسەر بەحرێنو عومان، خۆی لە عومان دادەنیشتو حەکەمی ئەبولعاصی براشی لەسەر بەحرێن دانابوو وەکو نوێنەری خۆی، فەرمانڕەوای ئەو تا خیلافەتی عوسمان بەردەوام بوو، دوای ئەوە بەحرێن کرا بە پاشکۆی بەصرە،[4] بەڵام وا

---

١) صالح العلي: الدولة في عهد الرسول ﷺ ٤٦٢.

٢) خليفة: التاريخ ١٢٣.

٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ٢٦٠، وابن حبيب: المحبر ١٢٦، والبكري: معجم ما استعجم ١٢١١، والبلاذري: أنساب الاشراف ١: ٣٩، وصالح العلي: الدولة في عهد الرسول ﷺ ص٥٧٠.

٤) صالح العلي: الدولة في عهد الرسول ﷺ ٥٨٢.

دەردەکەوێت کە فەرمانڕەوای جەلەندی یەکان جارێکی تر گەڕایەوە بۆ سەر عومان، چونکە فەرمانڕەوایان دەکرد لەوێ تاکو خیلافەتی یەزیدی کوڕی موعاویە.[1]

سەبارەت بە ناوچەکانی حیجاز لە دەرەوەی شارە سەرەکیەکان و تەپەی نەجد، هەندێ هۆزی گەورەو بچووکی فەرمانڕەوایان دەکرد لە رێگای سەرکردەکەیانەوە، جا کاتێك هاتنە ئاینی ئیسلامەوە پێغەمبەر ﷺ لاینەبردنو لەسەر کارەکانیان دایانەوە، ئەوەیش مایەی رازیبوونی سەرکردەو هۆزەکانیان بوو، هەروەها دەسەلاتی دەولەتی بەهێز دەکرد لەسەر جێگا دوورەکان لە پایتەختی خیلافەت.

ئەو ناوچانەش کە لە سەر ئاینە ئاسمانی یە کۆنەکانی خۆیان مانەوە ملکەچ بوون بۆ دەولەتی ئیسلامی، بە گرێبەستی دەستبەری وەکو گاورەکانی نەجرانو گاورەکانی ئیلەو جوولەکەکانی تەیما.

ئاشکراشە سەردەمی خیلافەتی راشیدە ئەو بارودۆخە کارگێڕی یەی لە چەرخی پێغەمبەرایەتی یەوە بۆ بە جێماوە، بەلام بزووتنەوەی فتوحات رووبەرێکی فراوانی تازەی زیاد کرد ئەویش هیلالوخەصیب و ئێرانو میصر بوو، ئەوەش وایکرد کە ناوچە تازەکان رێکبخرێن و ببەسرێنەوە بە دەولەتەوە.

بەردەوام بوونی فەتحی ئیسلامی کاریگەری سەرەکی هەبوو لە دەستنیشان کردنی بەشە کارگێڕی یەکان، چونکە وێڕای دابەشکردنیان بۆ چەند ولایەتێك لە ژێر کاریگەری جوگرافیی و ستراتیجی و کولتووریی بەڕێوەبردن تیایدا جارجارەش بە پێی بلاوبوونەوەی هۆزەکان، لەگەلٚ ئەوەشدا ئەو شوینانەی کە فەتح دەکران لە رێگەی ئەو هێزانەی رەوانە دەکران بە سەرکردایەتی سەرکردەیەکەوە دەبون بە یەکەیەکی کارگێڕی سەربەخۆ، زۆربەی داهاتەکانیشی دەگەڕایەوە بۆ خۆیان.

سەبارەت بە ئەو فتوحاتانەی ئەنجامدرا لەسەر دەستی سەربازەکان شارێك لە شارەکان دوای ئەوە، شوێنە تازەکان دەبوونە پاشکۆ بۆ ئەو شارانە، بۆ نموونە: ولاتی شام لەسەر دەستی چەند سوپایەك فەتحکرا کە لە مەدینەوە نێردرا بوون، دابەش کرا بۆ پێنج یەکەی کارگێڕی کە بریتی بوون لە یەکەکانی دیمەشقو فەلەستینو ئوردونو حیمصو قەنسەرین، داهاتی هەموو شوێنێکیش لەو شوێنانە تایبەت دەکرا بۆ ئەو سەربازانەی کە فەتحیان کردووە، بۆ نموونە: دوورگەی فوراتی لە لایەن هێزەکانی قەنسەرین و حیمصەوە فەتح کرا بۆیە بە پاشکۆ ژمێردرا، تا ئەو کاتەی ناوچەی

١) الطبراني: التاريخ ٢: ١٩٤٩، وصالح العلي: الدولة في عهد الرسول ﷺ ٥٨٨.

قەنسەرین دابڕا لە ناوچەی حمیص لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە ئیتر کرایە سەر بە قەنسەرین.

لە عێراق بە هۆی تێشکانی هەوڵی داگیرکردنی ناوچەی فارس لە لایەن بەحرێنەوە لەبەر هەندێ پێویستی ئیستراتیجی (جەنگ لەگەڵ فارسەکان وای دەخواست ئاوڕ لە ئاڕاستەی فارس بدرێتەوە وێڕای ئاڕاستەی مەدائین) مەڵبەندێك بۆ جەنگاوەرەکان داهێنرا لە لای ناوچەی ئەبوللەوە جگە لەو مەڵبەندەی هەبوو لە کووفە، زۆربەی ناوچەی سەوادیش پاشکۆ بوو بۆ جەنگاوەرانی کووفە، لەوانەی بەشداری جەنگی قادسیەیان کردبوو، سەرتا هیچ شوێنێك سەر بە بەصرە نەبوو، جگە لە رەشەخاك (سەواد) نەبێت، بەڵام دواتر کە ئەهواز و فارسو ئەمجا خۆراسان لە رێگەی سەجستان فەتح کران لەسەر دەستی جەنگاوەرانی بەصرە لە ولایەتی عەبدوڵڵای کوڕی عامر، ئەوانە هەمووی لە رووی ئیداری یەوە کران بە پاشکۆی بەصرە.

سەبارەت بە ناوچە شاخاوی یەکان (رۆژئاوای ئێران) فەتحکران لەلایەن جەنگاوەرانی کوفە بە پلەی یەکەم و زۆربەشیان کرانە سەر کوفە، لەگەڵ ئەوەی کە میصر سەرەتای دەسبەسەراگیرانی لەسەر دەستی ئەو جەنگاوەرە رەوانەکراوانە بوو لە شامەوە، بەڵام ئەو هێزەی میصری داگیر کرد لەشاری مەدینەوە نێردرابوون، بەم شێوەیەش ـ میصر ـ وێڕای کولتووری ئیداریی بوو بە ویلایەتێکی سەربەخۆ، کاتێك هێزەکانیشی دەستیان گرتە سەر بورقە (دواتر جێگای تریش) هەمووی بوو بە پاشکۆی میصر.

فتوحات لە سەردەمی ئەبوبەکر دەستی پێکرد، لە سەردەمی عومەریش گەیشتە چڵەپۆپە، بەڵام لە سەردەمی عوسمان هەندێ سنووردار بوو، عومەر رۆڵی سەرەکیی بینی لە رێکخستنی مامەڵەی شارە دەست بەسەراگیراوەکان.[1]

سیاسەتی شەرعیی وەرگیراو لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ وا دەخوازێ کە گونجاوترین کەس لە سەر ویلایەتەکان بەکاربهێنرێت، ئەگەرچی لە ناو خەڵکدا هەبێت لە ئەو زاناترو ئیماندارتر،[2] قورئان گرنگترین

---

١) الدوري: الجزیرة العربیة في عهد الخلفاء الراشدین ص١٩٢ (توێژینەوەیەکە لە توێژینەوەکانی (ندوة الجزیرة العربیة الملك السعود).

٢) ابن تیمیة: السیاسة الشرعیة ٦، پێغەمبەر ﷺ عوسمانی کوڕی عاصی دانا وەکو فەرمانڕەوا لەسەر (ثقیف)، چونکە بینی ئەو سوورە لەسەر تێگەیشتنی لە ئایینو فێربوونی قورئان، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی دانا وەکو سەرکردە بۆ سوپایەکی گەورە کە ئەبوبەکرو عومەرو گەورە هاوەڵانی تێدا بوو، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بە سەرکردەی سوپایەك کە

دوو خاسیەتی پێسپێرانی کاروباری باسکردووە (ان خیر من استأجرت القوی الامین)،[1] واتە: باشترین کەس بیگری بە کرێ ئەو کەسەیە کە بەهێزو دەست پاك بێت.

هێزیش دەگۆڕێ بە پی جیاوازیی لێپرساوێتی بۆ نموونە لێپرسراوێتی سەربازیی پێویستی هەیە بە نەبەردیی‌و شارەزای لە جەنگ‌و هونەرەکانی، لێپرسراوێتی سیاسیش پێویستی بە زانیاریی، بە دادوەریی و زانینی حوکمەکانی شەرع‌و توانای جێبەجێکردنیان هەیە.[2] کەم جاریش ئازای‌و دەستپاکیی یەکدەگرن لای خەڵکیی، بۆیە پێویستە لەسەر خەلیفە بگەڕێ بە دوای ئەو کەسانە، ئەرکی سەرشانیشێتی گونجاوتر ئەمجا گونجاو دابنێ ئەگەر کەسێکی دەستنەکەوت هەردوو خاسیەکەی تیادا بێت.[3]

ئەوەیش تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە زۆربەی فەرمانڕەواکان لە سەردەمی خەلیفە راشیدەکان لە هاوەڵان بوون، چونکە ئەوان لەلایەکەوە هەندێ خاسیەت‌و تواناییان تیادابوو، لە لایەکی تریشەوە بە هۆی متمانەی خەلیفە بە ئەوان و ڕێزی خەڵکی بۆیان کە دەبێتە مایەی بە گوێکردن‌و پشتگیری کردنیان.

والیانی سەردەمی راشیدی بە دینداریی‌و گوێنەدان بە دونیا دەناسران، وەکو سەعیدی کوڕی عامیری کوڕی جەڕاح، ئەبوموسای ئەشعەریی، هەندێ لەمانەش دووچاری قەرزکردن دەبوون بۆ دابینکردنی پێویستی خواردەمەنی،[4] هەرگیز داوای لێپرساوێتیشیان نەکردووە بە هۆی نەهی شەرعی لە داواکردنی، بەڵکو پۆزشیان دەهێنایەوە لەوەرگرتنی‌و ئومێدیان وابوو قوتاریان بێت لە لێپرسیراوێتی‌و داوای لێبوردنیان دەکرد لە بەردەوام بوون[5].

هاوەڵە دێرینەکانی تیادا بوو لە کاتی فەتحی مەککە... ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی گونجاوترو بە تواناتر پێشدەخرێت ئەگەرچی کەسی باشتریش هەبێت لەوان لە رووی دینداریی‌و زانست‌و ئیمانەوە.

١) القصص ٢٦.

٢) إبن تيمية: السياسة الشرعية ١٤، ١٥.

٣) إبن تيمية: السياسة الشرعية ١٨.

٤) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاة على البلدان ٢: ٥٢ـ ٥٣، والازدي: فتوح الشام ١٢٢ـ ١٢٣.

٥) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاة على البلدان ٢: ٥٤ والبلاذري: فتوح البلدان ٢١٤، والطبري: تأريخ.

خەلیفە راشیدەکانیش شوێنەواری هەموو ئارەزوویەکیان سڕی یەوە لە کاتی دانانی فەرمانڕەواکان، بەڵکو رەچاوی بەرژەوەندی گشتی یان دەکرد، تەنانەت عومەری کوڕی خەتتاب ئەبو مەریەمی حەنەفی دانا لەسەر دادوەری بەصرە، لە کاتێکدا بکوژی زەیدی برای بوو لەشەڕی یەمامەدا، [1]

فەرمانڕەوایش لەسەر هەرێمێك پەیوەست نەبوو بە کاتەوە، بەڵکو پەیوەست بوو بە سەرکەوتنی ئەو فەرمانڕەوایەو بارودۆخی جێگای لێپرسراوێتی، بۆیە هەندێ فەرمانڕەوا ماوەی مانەوەیان درێژخایەن بوو وەکو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، کە گەیشتە بیست ساڵ، هەندێکیشیان لە ساڵێك کورتتر بوو، خەلیفەیش پابەند نەدەبوو بە هێشتنەوەی فەرمانڕەواکانی پێشوو، هەندێکیانی دەهێشتەوەو هەندێکیانی لا دەدا، راسپاردەی عومەریش بۆ خەلیفەی دوای خۆی ئەوەبوو "الا يقر لي عامل أكثر من سنة، واقروا الاشعري اربع سنين". [2] واتە هیچ فەرمانڕەوایەکی من زیاتر لە ساڵێك لەسەر کارەکەی نەمێنێتەوە، بەڵام ئەبوو موسای ئەشعەری با چوار ساڵ بمێنێتەوە، ئەشعەری بۆ چەندین جار ویلایەتی کووفەی وەرگرت تا کۆتای خیلافەتی عوسمان.

ئەو والیانەی کە لادەبران لە کارەکانیان بەردەوام دەبوون تا گەیشتنی والی تازە. دیوانە هەرێمی یەکان کە بەشێك بوون لە دیوانی سەربازی لە ژێر چاودێری راستەوخۆی والی هەرێمدا دەبون، سەرچاوەکانیش لە ژێر ناوی سەرکردەی جەنگ باسیان کردووە. [3]

یەکێ لە ئەرکەکانی والی پاراستنی ویلایەتەکەی بوو لە دوژمنە هاوسنوورەکانی بەبێ چاوەڕوانکردنی رێگەپێدانی خەلیفە، بە پێچەوانەی ئەوەی دەسپێشکەری هێرشی بکردایە، ئەوە پێویستی بوو بە رێگەپێدانی خەلیفە. [4]

ئەرکێکی تر لە ئەرکەکانی قایمکردنی سنوورەکان و دەستەبەرکردنی سەربازانو بەدواداچوونی هەواڵی دوژمنانو راهێنانی هەرزەکاران لەسەر سوارچاکیو مەلەوانیو تیرئەندازی بوو. [5]

---

١) وكيع: أخبار القضاة١: ٢٦٩.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ٣٢٢، والذهبي: سير أعلام النبلاء: ٢: ٣٩١.

٣) السلومي: ديوان الجند ٢٤٥.

٤) بڕوانە: ڕووداوی لابردنی عەلائی کوڕی حەزرەمی لەسەر بەحرێن بە هۆی هێرشکردنی بۆ سەر هەرێمی فارس بەبێ رێگەپێدانی خەلیفە عومەر.

٥) محمد حميد الله: الوثائق السياسية ٤٨٦.

بەهەمان شێوە بەرپرس بوون لە دانانی کاربەدەستانو فەرمانبەران لە هەرێمەکانیانو لێپرسینەوەیان، گرنگیشیان دەدا بە راوێژکردن بە شارەزایانی کاروباری هەرێمەکان لەسەر داواکاری خەلیفە،[1] سەرپەرشتی ئاوەدانکردنەوەی هەرێمەکانیان دەکرد، وەکو کەندنی رووبارەکانو دروستکردنی پردو نەخشەکێشان بۆ شارەکانو خۆشکردنی رێگاوبانو دروستکردنی مزگەوتو بازاڕو دابینکردنی ئاوو تایبەتکردنی زەوی بۆ دروستکردنی خانوو بۆ دانیشتوان، هەروەها زیندووکردنەوەی بیابانەکان بە مەبەستی فراوانکردنی زەوی یە کشتوکاڵی یەکان.[2]

جگە لەمانەش بەرپرس بوو لە کاروباری دارای لە ویلایەتەکەی، چونکە لە سەردەمی عومەر (رەزای خوای لێبێت) (بيت المال) سەری هەڵدا لە شارو شوێنەکان، بەڵام لە هەندێ لە ویلایەتەکاندا عومەر وازی هێنا لەوەو فەرمانبەرێکی تایبەتی دادەنا بۆ (بيت المال)، بۆ نموونە ئەنەسی کوڕی مالیك بەرپرسی دارای بەصرە بوو لەسەردەمی فەرمانڕەوای ئەبوموسای ئەشعەری،[3] هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هەمان کاری پێسپێردرابوو، عوسمانی کوڕی حونەیفیش لە سەر باجو داهات بوو لەویلایەتی عەمماری کوڕی یاسر لەسەر کوفە،[4] بەهەمان شێوە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لێپرسراوی (بيت المال) بوو لە سەردەمی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس لە کوفە،[5] هاوکات هەندێ لە فەرمانڕەواکان لێپرسراوی دارایو سەرانە بوون لە چەند هەرێمێکدا، وەکو شورەحبیلی کوڕی حەسەنە لە ئوردونو موعاویەی کوڕی ئەبوسفیان لە شامو عەمری کوڕی عاص لە میصر.[6]

خەلیفەکان هەڵدەستان بە ئامۆژگاریکردنی فەرمانڕەواکان و ئاراستەکردنیانو بیرخستنەویان بە بەها ئیسلامی یە بڵندەکان و فەرمانڕەوای نەکەنە رێگایەك بۆ دەوڵەمەندی، بەڵکو داببڕێن بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خەڵکیی لە رووی ئاینیو دونیاوە، چونکە فەرمانڕەوای سپاردەیەکی ترسناکەو کەموکوڕی لە هەڵسان بە ئەرکەکانی ناپاکی یە بەرانبەر نەتەوە، لە فەرموودەشدا هاتووە:

---

١) محمد عبدالقادر خريسان: عمر بن الخطاب والولادة، العدد ٢٥، مجلة المؤرخ العربي.

٢) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ٢: ٨٠ـ ٨١ والبلاذري: فتوح البلدان ١٥٥، ٢٧٣، ٣٥١، ٣٥٢.

٣) القاسم بن سلام : الموال ٥١٦.

٤) أبو يوسف: الخراج ٤٠.

٥) خليفة: التاريخ ١٤٩.

٦) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ٢: ٩٥.

"ما من وال يلي رعية من المسلمين فيموت وهو غاش لهم، الا حرم الله عليه الجنة". واتە: هیچ فەرمانڕەوایەك نابێتە فەرمانڕەوای کۆمەڵێك لە موسڵمانان و دوای بمرێت و تەڵەکەی لیان کردبێت، بێجگە لەوەی خوای گەورە بەهەشتی لیٚ قەدەغە دەکات.[1]

کاتەکانی سەردان کردنی والی دەستنیشان نەکرابوو، بەڵکو دەرگای کراوە بوو بۆ خەڵکیی، کاتێکیش سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەرگای دانا بۆ ماڵەکەی، عومەری کوڕی خەتتاب زۆر توڕە بوو و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد و فەرمانی پێکرد دەرگاکە بسوتێنیٚ، چونکە مەترسی ئەوەی بوو ببێتە هۆکارێك بۆ خۆشاردنەوەی لە پێویستی یەکانی خەڵك.[2]

فەرمانڕەواکان ملکەچی چاودێریی‌و لێپرسینەوەی خەلیفەکان بوون، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد وەکو پشکنیار لە سەریان، عوسمانیش ڕەزای خوای لێبێت هەر وایدەکرد، نامەنێری کارێکی بەردەوام بوو لە نێوان خەلیفەکانو فەرمانڕەواکان سەبارەت بە کاروباری کارگێڕیی‌و دادوەریی‌و پلانی سەربازیی، کۆبوونەوەی ساڵانەش لە نێوان خەلیفەکانو فەرمانڕەواکانیان لە وەرزی حەجدا رووی دەدا، خەلیفەکان بە خۆیشیان سەردانی هەندێك لە ویلایەتەکانیان دەکرد، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) چەند جارێك سەردانی شامی کردووە، بەشێوەیەکی کتوپڕ و بیٚ ئاگادارکردنەوە سەردانی فەرمانڕەواکانی دەکرد، نیشازیشی هەبوو سەردانی هەموو ویلایەتەکان بکات بە مەبەستی بەسەرکردنەوەو زانینی پێویستی یەکانیان،[3]

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لێپرسینەوەی فەرمانڕەواکانی دەکرد ئەگەر ستەمیان لە کەسێك لە ژێردەستەکانی خۆیان بکردایە،[4] ڕاشیگەیاند بوو کە زۆر ئاسانە بەلایەوە سەرکردەیەك بە یەکێکی تر بگۆڕێت ئەگەر بەرژەوەندی هەرێمەکە لەوەدا بێت[5] هەندێکیشیانی لابرد لەبەر نەزانینیان بۆ هەندیٚ حوکمەکانی شەرع، یان لەبەر ستەمکردنیان لە یەکێك لە خەڵکیی.[6]

١) البخاري: الصحيح ٨: ١٠٧.
٢) البلاذري: فتوح البلدان ٢٧٧، والطبري: تاريخ ٤.
٣) عمر بن شبة: تأريخ المدينة ٣: ٨٢١.
٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٣: ٨٠٧، ٨٠٨، ٨٠٩، ٨١٣.
٥) هەمان سەرچاوە ٣: ٨٠٥.
٦) القاسم بن سلام: الاموال ٦٣، ٦٤ وعمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨١٨، وابن تيمية: السياسة الشرعية ١٠٥.

عوسمانیش بە هەمان شێوە هەندێ لە فەرمانڕەواکانی لابرد بە هۆی ناحەزی خەڵکی ئەو دەڤەرە بۆ ئەو فەرمانڕەوایانە،[1] یان لەبەر ئەنجامدانیان بۆ گوناهێك کە مایەی جێبەجێکردنی (حد)ی شەرعی بوایە.[2] چونکە ئەوان پێویستە پێشەنگ بن بۆ خەڵکانی تر.

فەرمانڕەواکان ملکەچی چاودێری بوون، لە سەرماڵو سامانەکانیان لە کاتی فەرمانڕەوای و لابردنیان، عومەر نیوەی ماڵی هەریەك لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصو ئەبوهورەیرەو عەمری کوڕی عاصی لێوەرگرتنەوە، چونکە بەلایەوە وابوو ئەو پارانەیان لە ڕێگەی ئیش پێکردنیەوە دەستکەوتووە لە مەڵبەندی فەرمانڕەوای یەکانیان.[3]

## فەرمانڕەواکان لە سەردەمی ئەبوبەکر:

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمانڕەواکانی پێغەمبەر ﷺی هێشتەوە لە شوێنەکانی خۆیان، بەڵام دوای جێگیربوونی بارودۆخ لە یەمەنو زاڵبوون بەسەر مورتەدەکان، هەڵسا بە ئەنجامدانی هەندێ دەستکاری و ڕاستکردنەوە، بۆ نموونەی عوبەیدەی کوڕی سەعدی لەسەر کیندە دانا لە حەزرەمەوت و سەکاسیك،[4] هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلی لەسەر نەجران[5]و عەبدوڵلای کوڕی سەور لەسەر جوروش[6] دامەزراند، لەپاش لەناوبردنی پاشگەزبوونەوەیەکی عومانیش هەڵسا بە دانانی عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهلو دواتریش ئاڕاستەی کرد بۆ جەنگی پاشگەزبووەکانی یەمەنو حوزەیفەی کوڕی موحصینی عەلقانی لەسەر دانا.[7]

بە هۆی فەتحکردنی دەومەتولجەندەلیش هەڵسا بە دانانی عەیازی کوڕی غەنەمی فیهری[8] لەسەری، هەروەها ئەبوبەکر هەڵسا بە چەسپاندنی ئەوانەی کە هەڵدەستان بە کۆکردنەوەی صەدەقە لە

١) وەکو ئەوەی کردی لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص.
٢) وەکو ئەوەی کردی لەگەڵ وەلیدی کوڕی عوقبە.
٣) القاسم بن سلام: الاموال ٣٤٢، وابن عبدالحكم: فتوح مصر ١٤٩، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٣١.
٤) الطبري: تاريخ ٣: ٣٤١، وابن حجر: الاصابة ٢: ٤٥٠.
٥) الطبري: تاريخ ٣: ٤٢٧.
٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٧) خليفة: التاريخ ١٢٣، والطبري: تأريخ ٣: ٣١٤، ٣١٥، وابن عبدالبر: الاستعاب ١: ٢٧٨، ٣: ١٤٩.
٨) الطبري: تاريخ ٣: ٤٢٧.

ویلایەتەو هۆزەکان، لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ[1] سەرکردەی سوپاکان بە هەمان شێوە هەموویان لە هاوەڵان بوون (رەزای خوایان لێبێت)[2] ئەبوبەکر دەیفەرموو: "ما احد أحق بالعمل من عمال الرسول ﷺ".[3] واتە: کەس لەوانەی پێغەمبەر ﷺ داینانون مافدارتر نی یە بۆ کارکردن، بەڵکو لەو سەردەمە هاوەڵ نەبێت کەس بەکارنەدەهێنرا بۆ لێپرسراوێتی.[4]

لیستێك بە ناوی فەرمانڕەواکانی ئەبوبەکر لەسەر شارەکان[5]:

١ـ عەتتابی کوڕی ئوسەید (مەککە).

٢ـ عوسمانی کوڕی ئەبوعاصی سەقەفی (تائیف).

٣ـ عەلائی کوڕی حەزرەمی (بەحرێن).

٤ـ حوزەیفەی کوڕی موحصینی عەلقانی (عومان).

٥ـ سەمورەی کوڕی عەمری عەمبەری (یەمامە).

٦ـ موعازی کوڕی جەبەل (یەمەن ـ سەرپەرشتیاری گشتیی لەسەر فەرمانڕەواکان جگە لە بەڕێوەبردنی ویلایەتی جەنەد).

٧ـ موهاجیری کوڕی ئەبو ئومەیە (سەنعاو دەوروبەری، جار جارەش صەدەفو کیندە).

٨ـ زیادی کوڕی لەبیدی بەیازی (کیندەو حەزرەمەوت).

٩ـ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (نەجران).

١٠ـ فەروەی کوڕی مەسیکی مورادی (موراد مەزحەج).

١١ـ عوکاشەی کوڕی موحصینی ئەسەدی (سەکاسیكو سکون).

١٢ـ خالیدی کوڕی وەلید (عێراق).

١٣ـ موسەننای کوڕی حاریسەی شەیبانی (عێراق).

١٤ـ زوبورقانی کوڕی بەدر (ئەنبار).

١٥ـ عەیازی کوڕی غەنەم (دەومەتولجەندەل).

١) عبدالعزيز بن سليمان المقبل: خلافة أبي بكر الصديق ٩٤ـ ٩٥.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٩٦ـ ٩٧، ١٠٣.

٣) ابن عبدالبر: الاستعاب ١: ٤١٠.

٤) ابن حجر: الاصابة ٢: ٢٢٣، ٢٨٦.

٥) خليفة: التاريخ ١٢٢ـ ١٢٣، والطبري: تاريخ ٣: ٤٤٧.

١٦ـ ئەبوعوبیدەی عامیری کوڕی جەڕاح (سەرکردەی سەرکردەکانی شام لەگەڵ فەرمانڕەوای حیمص بە تایبەت).

١٧ـ ئەبوموسای ئەشعەری (زەبیدو ڕەمەعو عەدەنو ساحیلی و یەمەن).

١٨ـ یەعلای کوڕی ئومەیە (خەوەلان).

١٩ـ سولەیتی کوڕی قەیس (یەمامە).

٢٠ـ عەبدوڵڵای کوڕی سەور (جوروش).[١]

٢١ـ خالیدی کوڕی وەلیدی مەخزومی (سەرکردەی سەرکردەکانی شام).

٢٢ـ عەمری کوڕی عاص (فەلەستین).

٢٣ـ شورەحبیلی کوڕی حەسەنە (ئوردون).

٢٤ـ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان (دیمەشق).

تیبینی دەکرێت لەسەر ئەم لیستەی کە والی شارەکانی عێراقو شام لە ڕاستیدا سەرکردەی سەربازی بوون هەڵدەستان بە بەڕێوەبردنی شوێنە فەتحکراوەکانو بە فەرمانی یەك سەرکردەی گەورە ئیشیان دەکرد لە عێراقو یەکێکی تر لە شام.

**فەرمانڕەوای لە سەردەمی عومەر:**

ئەرکی فەرمانڕەواکان خۆی دەبینی لە بەڕێوەبردنی فەرمانڕەوای یەکە بەپێی فەرمانەکانی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی ئیسلام لە ڕێگەی فێرکردنی خەڵکیو چەسپاندنی دادوەرییو کۆکردنەوەی داهات (فئ)و یارمەتیدانی سوپا بە ناردنی جەنگاوەر، چی لە شەڕەکانی پاشگەزبوونەوە، یان فتوحات،[٢] ڕێکخستنی فەرمانڕەوایو سەرپەرشتی لە سەر دادوەرییو فەرمانبەرەکانی تر، عومەری کوڕی خەتتابیش لە وتارێکی هەینی دا باسی لە ئەرکی فەرمانڕەواکان کردو فەرمووی: "اللهم إني أشهدك على أمراء الامصار اني إنما بعثتهم ليعلموا الناس دينهم وسنة نبيهم وان يفسحوا فيهم فيئهم، وان يعدلوا فان اشكل عليهم شيء رفعوه

---

١) جوروش: شارێکە لە باکووری نەجران لە سەرووی دۆڵی بیشە نزیك خەمیس مەشیت (الاکوع: البلدان اليمانية ٧٥، والبلاذري: بين مكة وحضرموت ٥٢، ٥٣).

٢) البلاذري: فتوح البلدان ١١٥.

الي". [1] واتە: خوایەگیان، تۆ شایەتبە کە من سەرکردەی شارەکان لەبەرئەوە ناردوومن خەڵکیی فێری دینەکەت و سوننەتی پێغەمبەرەکەت بکەن، بۆ ئەوەش کە داهاتەکانیان بەسەردا دابەش بکەن، جا ئەگەر شتێکیان بەلاوە گرفت بوایە بەرزیان دەکردەوە بۆم.

جارێکی تریش لە وتارێکدا فەرمووی: "خەڵکینە، من ئەو فەرمانڕەوایانەم ناردووە بە دروستی هەڵسن بە کارەکانیان، نەمناردوون لە پێستەکانتان بدەن، یان بتانکوژن یان ماڵەکانتان بخۆن، بەڵکو دەیاننێرم بۆ ئەوەی فێری دینو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ تان بکەن، ئەگەر کەسێك جگە لەمانە شتێکی لەئەوان بینی، با ئاگادارم بکاتەوە، ئەگەر کەسێکیش مافێکی هەیە لەلایان با قسە بکات مافەکەی بۆ وەربگرمەوە، من بە چاوی خۆم بینیم پێغەمبەر ﷺ مافی لە خۆی سەندەوە بۆ کەسێك. [2]

کاتێکیش فەرمانڕەواکان لە وەرزی حەج کۆبوونەوە، بە ئامادەبوونی ئەوان وتارێکی داو فەرمووی: خەڵکینە، ئێمە مافێکمان لەسەرتان هەیە ئەویش ئەوەیە ئامۆژگاریمان بکەن دوو بە دوو، هاوکاریشمان بکەن لەسەر چاکە، ئەی بەرپرسان: خەڵکی مافێکیان لەسەرتان هەیە، دڵنیا بن هیچ هێمنیو لەسەرخۆی یەك نی یە خوازراو و سوود فراوان بێت ئەوەندەی هێمنیو لەسەرخۆی کاربەدەستێك، هیچ نەفامی یەکیش لای خوا دزێوو بەدفەساڵ نی یە ئەوەندەی نەفامیی سەرکردەیەك، ئەوە بزانن کە کەسێك داوای سەلامەتی بکات بۆ ئەوانەی لە دەوروبەرین، خوای گەورە لە ئاسمانەوە سەلامەتی بەسەردا دادەبەزێنێ". [3]

عومەر دەیزانی کە بەرپرسیارە لە شێوزای بەڕێوەبردنی فەرمانڕەواکانی، بۆیە ئەوەی ڕووندەکردەوەو دەیفەرموو: "أيما عامل لي ظلم أحداً وبلغتني مظلمته ولم أغيرها فانا ظلمته". [4] واتە: هەر

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٩٣ـ ٢٩٤، واحمد: المسند ١: ٤٨ـ ٤٩. وابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٠٦ـ ٨٠٧، والطبري: تاريخ ٢: ٥٦٧. والاثر صحيح، هەروەها بڕوانە: نامەکەی بۆ خەلکی بەصرە کاتێك ئەبوموسای ئەشعەریی کردە فەرمانڕەوایان (الطبري: تاريخ ٤: ٢٠٧).

٢) الطبري: تاريخ ٤: ٢٠٤، وابن الجوزي: مناقب عمر ٩٤، وابن تيمية: السياسة الشرعية ١٥٠، ومحمد حميد الله: الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة ٤٠٦.

٣) ابن الجوزي: مناقب عمر ٧٩.

٤) المصدر السابق ١١٦.

لێپرساوێك من دامنابێتو ستەم لە کەسێك بکات و من ئاگادار بم لە ستەمەکەیو مافی بۆ وەرنەگرمەوە ئەوە من ستەمم لێ کردووە.

بەپێی ئەم وتارانەش فەرمانڕەوا دەبێت هەڵسێ بە ئەرکە ئاینیو دونیای یەکانی پێکەوە، جگە لەوەش دەسەڵاتی فراوانی هەیە لە نێو فەرمانڕەوایەتی خۆی، ناشگەڕێتەوە بۆ لای خەلیفە تەنها لە گرفتی گەورەو ناهەمواردا نەبێت، بێگومان هەڵسانی فەرمانڕەواکان بە پێشنوێژیی خەڵكو وتارخوێندنەوەی رۆژی هەینی پایە یانی بەهێزتر دەکردو سەرکردایەتی ئاینیو سیاسی تیایدا یەکدەخست، هەروەها هەڵسانیان بە سەرکردایەتی سوپاکانی فەتح رێزو گوێڕایەڵی خەڵکی بۆ دەستەبەر دەکردن، کاتێکیش خەلیفەیەکی تریش تازە بهاتبا، فەرمانڕەواکان بەیعەتیان لە خەڵکی بۆ وەردەگرت، یەکێ تریش لە ئەرکەکانیان ئەوەبوو زەکات کۆبکەنەوەو بۆ هەژاران خەرجی بکەن، ئاسایش بۆ خەڵکی مسۆگەر بکەنو سنووره شەرعی یەکان جێبەجێ بکەن، کاتێکیش فەرمانڕەوا بە لایەکدا برۆشتایە کەسێکی لە جێگای خۆی دادەنا.[1]

پەیوەندیش لە نێوان خەلیفە لە مەدینەو فەرمانڕەوا لە شارەکان لە رێگەی ئاڵوگۆڕی نامەوە ئەنجام دەدرا، جاری واش هەبوو خەلیفە دەینارد بە دوای هەندێ لە فەرمانڕەواکانی بۆ مەیدنە، یان نوێنەرێکی خۆی دەنارد بۆ لایان بۆ ئاگاداربوونی راستەوخۆ لە کاروباری ئەو ویلایەتانە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش هەڵدەستا بە کاری پشکنێری لەسەر فەرمانڕەواکان لە سەردەمی عومەر،[2] هەروەها عومەر بایەخی دەدا بە کۆکردنەوەی فەرمانڕەواکان لە مەکە لە وەرزی حەجدا بە مەبەستی وتووێژکردن لەگەڵیاندا دەربارەی بارودۆخی خەڵکیی،[3] بەڵکو خودی عومەر هەڵسا بە بەسەرکردنەوەی رەورەوەی فەرمانڕەواو سەرکردەکان لە شام کاتێك سەردانی بەیتەلموقدیسی کرد بۆ سپاردنی کلیلەکانیو سووریش بوو لەسەر سەردانکردنیان لە ماڵەکانیان بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێ تا چەند پەیوەندیان لەگەڵ دونیاو پارەدا هەیە، کاتێکیش بینی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح چۆن دەستی لە دونیا هەڵگرتووە و جلوبەرگو خواردنەکەی بینی، دەستی لە ملی کردو فەرمووی:

١) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان في عصر الخلفاء الراشدين ٦٠.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ٢٢١، وابن عبدالحكم: فتوح مصر واخبارها ١٤٦.

٣) أبو يوسف: الخراج ١١٦ وقارن الطبري: تاريخ ٤: ٢٠٤.

"ما من أحد من أصحابي الا وقد نال من الدنيا ونالت منه، غيرك" واته کەسێك نی یە لە هاوڕێکانم دونیا نەیگۆڕیبێت تەنها تۆ نەبێت ئەبوعوبەیدە.[1]

## چاودێری بەرپرسان و فەرمانڕەوایان :

فەرمانڕەوای سەر شارەکان ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبوون هەرکاتێك ماڵو سامانیان زیادی بکردایە بە شێوەیەکی زۆر، لەبەر مەترسی بەگەڕخستنتی دەست ڕۆیشتنیان لەگەشە پێکردینی ماڵەکانیان، با مەبەستیشیان ئەوە نەبێت، بەڵکو خەڵکیی مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ دەکردن لە پێناو پلەوپایەکەیان.

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) جارێك پرسیاری لە ئەبوهورەیرە کرد کە فەرمانڕەوای بەحرێن بوو، چۆن دە هەزار درهەمت کۆکردەوە؟ ئەبوهورەیرە لە وەڵامدا وتی: ماینەکانم زاوزیان کردو خەڵاتم زیادی کردو بەشەکانم بە دوای یەکدا هاتن، ئەو کاتە عومەر فەرمانی کرد هەمووی لێوەرگیرایەوە.[2]

عومەر حیسابی دەکرد بۆ ئەو دیاری یانەی فەرمانڕەواکان دەستیان دەکەوت لە خەڵکیی، هەروەها خۆ نزیککردنەوەی خەڵکیی لە ئەوان لە مامەڵە دارای یەکاندا وەکو کڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو کشتوکاڵ، هەر بۆیە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) نیوەی موڵکی ژمارەیەك لە فەرمانڕەواکانی وەرگرتەوە کە ئەوان خاوەنی چاکەو دینداریی‌و دەستپاکی بوون، لەبەرئەوە مامەڵە تایبەتەی خەڵکیی بۆی دەکردنو تۆمەتبارییانی نەکرد بە ناپاکی.[3]

بەم شێوەیەش لێپرسینەوەی کرد لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید ـ سەرکردەی بەرەی شام ـ لەسەر دەستکاری یکردنی بۆ ماڵی گشتیی و فەرمووی: من داوای لێبوردن ئەکەم لەوەی کە خالید کردی، من فەرمانم پێکردبوو ئەو ماڵو سامانە تەرخان بکات بۆ کەمدەستو هەژاران، بەڵام دابەشی کرد

---

١) الازدي: فتوح الشام ٢٥٥، ٢٥٦.

٢) أبو عبيد: الاموال ٢٨٢ـ ٢٨٣، وابن سعد: الطبقات ٤: ٣٣٥، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٠٥ـ ٦٠٦، والبلاذري: فتوح البلدان ٩٣ـ ٩٤ والاثر صحيح، وانظر روايات ضعيفة في محاسبة سعد بن أبي وقاص وأبي هريرة (إبن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣٠٧ وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٠٤ـ ٦٠٥) ومحاسبة عمرو بن العاص (البلاذري: فتوح البلدان ٢٢٠ـ ٢٢١ من كلام ابن المبارك (ت ١٨١ ه) بدون اسناد.

٣) ابن تيمية: السياسة الشرعية ٦٨ـ ٧٠ بتصرف.

بە دەسەلاَتدارو ناسراو قسەزانەکاندا، بۆیە ئەوم لە فەرمانڕەوای لابردو ئەبوعوبەیدەم لە جێگەی دانا.[1]

وەکو ئاشکرایە چاودێریی دارای بو بە مایەی لابردنی مەزنترین سەرکردە سەربازی یەکانی موسلّمانان، سەرەڕای ئەوەی کە کۆششی کردبوو لە دەستکاری ئەو پارانە بەو شێوەی کە بەرژەوەندیی تیادا دەبینی.

سەلمێنراویشە کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) سزای ئەنەسی کوڕی مالیکی داوە، بەهۆی کەمتەرخەمی لە پاراستنی شەش هەزار درهەم لە ماڵی گشتی بە ئەسپەردە لای دانرابوو، بۆیە پی قەرەبوو کردەوە، لە ریوایەتەکەش ئەوە دەردەکەوێت کە عومەر هەستی بوونی کەمتەرخەمی کرد لە پاراستنیدا نەك ئەنەسی تۆمەتبار کردبێت.[2]

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لێپرسینەوەی لەگەڵ فەرمانڕەواکانی دەکرد دەربارەی سەروەتەکانیان، ئەگەر بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی بکردایە لەوکاتەی دامەزراندبوون نیوەی لێوەردەگرتنەوە،[3] بەبێ ئەوەی تۆمەتباریان بکات بە ناپاکی، بەڵکو لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو فەرمانڕەوای ئەوان لەسەر هەرێمێك ڕێگای گەشەپێکردنی ماڵەکانیان بۆ ئاسان دەکات، فەرمانڕەواکانیش لەسەردەمی عومەر خۆیان لە فەرمانڕەوای لا دەدا، هەندێکیشیان داوایان دەکرد لیانگەڕێت لەو بەرپرسێتی یە.[4]

عومەر پی وابوو فەرمانڕەوا مافی خۆی نی یە خۆشگوزەرانی بکات لە پارەو ماڵی گشتیی بەبێ خەڵکیی، جارێکیشیان تووڕە بوو لە فەرمانڕەوای ئازەربایجان عوتبەی کوڕی فەرقەد، چونکە جۆرێك شیرینی بە دیاری وەرگرتبوو سەربازەکان نەیاندەتوانی بیخۆن، بۆیە عومەر نامەیەکی بۆ نووسی: "انه ليس من كدك ولا من كد أبيك، فاشبع المسلمين فى رحالهم مما تشبع منه في رحلك

---

١)أحمد: المسند ٣: ٤٧٦، والبخاري: التاريخ الكبير ٨: ٥٤، والتاريخ الصغير ١: ٨٢، والطبراني: المعجم الكبير ٢٢: ٢٩٨ـ ٢٩٩، وابو نعيم: معرفة الصحابة ٢: ١٦١ـ ١٦٢.

٢) عبدالرزاق: المصنف ٨: ١٨٢، وابن أبي شيبة: المصنف ٤: ٣٩٨، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٢٨٩ـ ٢٩٠ والاثر صحيح.

٣) البلاذري: فتوجح البلدان ١٢١. ابن تيمية: السياسة الشرعية ٤٦.

٤) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان في عصر الخلفاء الراشدين ٥٤.

وایاکم والتنعم"[1] واتە: ئەوە نەرەنجی خۆتەو نە رەنجی باوکتەو دایکتە، جا ئەوەی کە خۆت تێری لێدەخۆیت لە ماڵەکەتدا، با موسڵمانانیش تێری لێبخۆن لە ماڵەکانیاندا، ئامان دوورکەونەوە لە خۆشگوزەرانی.[2]

هەروەها لێکۆڵینەوەی دەکرد لەو سکالاّیانەی خەڵکی دەیکرد لە دژیان، کاتێکیش کوڕەکەی عەمری کوڕی عاص لە قیبتی یەکەی داو سکالاّکەشی گەیشتە عومەر، ویستی تۆڵە بۆ قیبتی یەکە بسێنێتەوەو رووی کردە عەمر بە قسە بەناوبانگەکەی:

"متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتم أحرارا".[3] واتە: لە کەیەوە خەڵکیتان کردووە بە کۆیلە، کە ئەوان بە ئازادی لە دایکبوون.

بەهەمان شێوە لێکۆڵینەوەی کرد لە سکالاّی یەکێك لە سەربازەکان دژ بە عەمری کوڕی عاص کردبووی کە عەمر ئەوی بە دووڕوو وەسف کردبوو، فەرمانیشی دەرکرد کە داری حەد لە عەمر بدرێت، بەلاّم سەربازەکە لی خۆش بوو.[4]

هەروەها تورەی نواند بەرانبەر بە عەمەر کاتێك حەددی مەی خواردنەوەی لە ماڵی خۆیدا[5] لەسەر عەبدوڕەحمانی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب جێبەجێ کرد، لە کاتێکدا پێویست بوو بە ئاشکرا لەبەرچاوی خەڵکیدا جێبەجی بکردایە، بۆ ئەوەی هەموان بەرانبەر شەریعەتی خوا یەکسان بن.

یەکێك لە رووداوە گرنگەکانیش ئەو لێکۆڵینەوە بوو کە کردی لە مەسەلەی تۆمەتبارکردنی موغیرەی کوڕی شوعبە بە زیناکردن لە کاتی فەرمانڕەوایەتی یەکەی لەسەر بەصرە، بۆیە بانگی کرد بۆ مەدینە لەگەڵ چوار شایەتەکەیدا، دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵ شایەتەکان شایەتی چوارەم پاشەکشەی کرد، ئیتر داری حەددی لەسێ کەسەکە دا، بەلاّم موغیرەشی لەسەر فەرمانڕەوای بەصرە لابرد[6]، ئەبوموسای ئەشعەری لە جێگای دانا، ئەویش بە باشترین شێوە هەڵسا بە ئەرکەکانی، بە

---

١) مسلم: الصحيح ٣: ١٦٤٢.

٢) مسلم: الصحيح ٣: ١٦٤٢، والبيهقي: السنن الكبرى ١٠: ١٢٨.

٣) ابن اعثم الكوفي: الكوفي ٢: ٨٢، وابن الجوزي: مناقب عمر بن الخطاب ٩٩.

٤) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٠٨.

٥) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٤١.

٦) عبدالرزاق: التفسير ٢: ٥٢- ٥٣، وعبد بن حميد: التفسير، وابن المنذر: التفسير (السيوطي: الدرر المنثور ١٨: ١٣١)، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٤١، والطبري: تاريخ ٤: ١٠٦- ٢٠٧، والذهبي: سير أعلام النبلاء ٣: ٢٧، وابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٨٢.

سەرکردایەتی سەربازیش ناسرا بۆ سوپاکانی بەصرە لە جەنگی دژ بە فارسەکان، هەروەها بە لێهاتووی فێرکردنی قورئانو خوێندنەوەی بۆ ئەهلی بەصرە ناسرا، جگە لەوەش بە نامەنێری زۆر لەگەڵ خەلیفە، بەڵام هەموو ئەوانە ڕێگر نەبوون لە وەرگرتنی سکاڵای خەڵکیی دژ بە ئەبوموساو ئەنجامدانی دادپەروەریی بەرانبەر سکاڵاکاراکان،[1] سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصیش قوتاری نەبوو لە سکاڵا لەو کاتەی فەرمانڕەوای کووفە بوو، بۆ نموونە سکاڵای لێکرا کە تەلارێکی هەیەو دەرگایەکی پێوەیە نایەڵێت خەڵکیی پی بگەن، ئیتر عومەر موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد و فەرمانی پێکرد دەرگاکە بسووتێنێ، سووتاندیو بە نامەیەك گەڕایەوە لەلای سەعدەوە کە تیایدا ڕاستی مەسەلەکەی تیا ڕوونکردۆتەوە، عومەریش ڕازی بوو و باوەڕی پێکرد،[2] جارێکی تریش سکاڵا کرایەوە کە سەعد نازانێت نوێژ بکات!!

کاتێك عومەر بە دوای مەسەلەکە ڕۆیشتو ڕاستیی هەڵوێستەکانی بۆ دەرکەوت لە ڕێگەی ناردنی چەند کەسێکەوە بۆ کووفە، بینی خەڵکیی ستایشی سەعد دەکەن، بەڵام کەسێك لە هۆزی عەبس دەیووت: سەعد بە یەکسانی شت دابەش ناکاتو لە کێشەکانیشدا دادگەر نی یە و دەریش ناچێت بۆ سەرکردایەتی هیچ غەزایەك، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) قەناعەتی نەکرد بەو قسانە، بەڵام بۆی دەرکەوت کە گۆبەندو گێچەڵێك بە سەعد لە ئارادایە، بۆیە لایبردو جاڕیدا کە متمانەی لانەچووە لەسەر سەعد و فەرمووی: "إني لم اعزله لعجز ولا خيانة".[3] واتە: من ئەوم لانەبردووە لەبەر بێدەسەڵاتی، یان ناپاکی. بەم شێوەیەش خەڵکی کووفە بە هۆی ئاژاوەی هەندێکیانەوە سەعدیان لە دەست خۆیان دەرکرد.

هەڵبژاردنی فەرمانڕەواکان لە دوای ڕاوێژکردن بە سەرانی هاوەڵان ئەنجام دەدرا، هەروەها دوای ڕازیبوونی کەسی هەڵبژێردراو[4] عومەر کەسیشی لە خزمانی خۆی نەدەکرد بە فەرمانڕەوا، بەڵام عوسمانو عەلی زیانێکیان نەدەبینی لەوەدا، زۆرجاریش عومەر تاقیکردنەوەی بۆ ئەو کەسە ئەنجام دەداو لە کەسایەتیشی دەکۆڵیەوە لە نزیکەوە، خەڵکی بیابانشینی نەدەکرد بە فەرمانڕەوا بەسەر

١) ابن الجوزي: مناقب عمر ٩٥ـ ١٣١.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ٢٧٦، والطبري: تاريخ ٤: ١٢١.

٣) خليفة: التاريخ ١٤٩.

٤) ابن سعد : الطبقات ٤: ٣٦٠، والمتقي الهندي: كنز العمال ٥: ٦٢٠، وابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٣٥، ١٠٧.

شارنشینەکان بە هۆی جیاوازیی سروشتو دابونەریت، لەوانەشە مەبەستی لە دانانی سەلمانی فارسی بەسەر مەدائین ئەوە بووبێت سەرنجی خەڵکیی رابکێشێت بۆ بنەمای یەکسانی لە ئیسلام.[١]

فەرمانڕەوا نووسراوێکی پێدەدرا لە خەلیفەوە فەرمانی دامەزراندنەکەی تیادا بوو لەسەر شوێنی دیاری کراوو ئەو مەرجانەش کە لەسەری دانرابوو، بەشایەتی کەسانێك لە موهاجیرو ئەنصار،[٢] جاری واش بوو هەندێ لە فەرمانڕەواکان دەگوێزرانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە پێی بەرژەوەندی دەوڵەت،[٣] هاوکات هەندێ لە فەرمانڕەوایانیش لەسەر کار لابران بە هۆکاری جیاجیا، بۆ نموونە: عومەر عەلائی حەزرەمی لەسەر کارەکەی لابرد، چونکە لە بەحرێنەوە بە سەربازەکانی یەوە لە دەریا پەڕینەوە بۆ ناوچەی فارس بەبێ رێگەپێدانی خەلیفە، کە ئەوەش بوو بە مایەی زیانێکی زۆر، هەروەها خالیدی کوڕی وەلیدی لابرد لەسەر کارەکەی لە شام، چونکە خەڵکی شەیدا بوو بوون پێوەیو وایاندەزانی ئەو بە لێهاتووی سەربازیی خۆی هۆکاری سەرکەوتنە، لە کاتێکدا دەبوو سەرکەوتن تەنها بدرێتە پاڵ خوای گەورە.[٤]

فەرمانڕەوایش لە هەندێ لە هەرێمە گەورەکان پەنای دەبردە بەر هەندێ فەرمانڕەوای تر کە لەسەر چەند شارێکی سەر بە هەرێمەکەن، وەکو چۆن روویدا لە هەرێمی شام کە حیمصو جەزیرەو ئوردونو فەلەستین سەر بە ئەبو عوبەیدەی فەرمانڕەوای دیمەشق بوون، دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانیش لەسەر شارەکان زیادو کەمی دەکرد، چونکە جاری وابوو ویلایەتێکی بچووك دەخرایە پاڵ ویلایەتێکی تر، یان ویلایەتێکی سەربەخۆ دادەبڕا.

## پاشکۆیەتی ئیداری:

عومەر (رەزای خوای لێبێت) رەچاوی چەند بنەمایەکی کرد لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەواکانی، لەوانە: سوورنەبوونی کەسەکە بۆ وەرگرتنی لێپرسیراوێتی، وەکو شوێنکەوتنێك بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەشیفەرموو: "لايحب الامارة احد فيعدل".[5] واتە کەسێك ئارەزووی لێپرسراوێتی نابێتو دوایش

---

١) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان في عصر الخلفاء الراشدين ١٤٣، وظافر القاسمي: نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الاسلامي ٤٧٣.

٢) الطبري: تاريخ ٤: ٢٠٧.

٣) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان في عصر الخلفاء الراشدين ٥٥.

٤) خليفة: التاريخ ١٢٢.

٥) في الحديث: "أنا لا نولي على هذا العمل من سأله" البخاري: أحكام ٧ ومسلم امارة ١٤.

دادگەری تیادا بکات.[1] هەروەها دەیڕوانیە هەندێ خاسیەت لەو کەسەدا هەبێت وەکو بەهێزیو دەستپاکیو شکۆداریو خۆبەکەم زانینو بەزەی هاتنەوە بە خەڵکییو هێمنیو لەسەر خۆی لەگەڵ ئەو کەسانەی لەژێر دەستیدان[2] و گوێنەدان بە دونیا لە خۆراکو پۆشاك و ماڵو خۆشگوزەرانی،[3] مووچەی فەرمانڕەواکانیش چاك بوو بەشیدەکردن، مووچەی عەمری کوڕی عاصی فەرمانڕەوای میصر دووسەد دینار بوو،[4] مووچەی عەیازی کوڕی غەنەمی فیهریش ـ فەرمانڕەوای حیمص ـ دینارێكو مەڕێكو هەندێ خۆراك بوو رۆژانە.[5]

ئەو گەیەنەرەیش کە نامەکانی دەهێنا لە عومەرەوە بۆ فەرمانڕەواکان بواری دەکردەوە بۆ خەڵکی ئەو شوێنانە کە نامە بنێرن راستەوخۆ بۆ خەلیفە بێئەوەی کەس ئاگای لە ناوەڕۆکەکەی بێت، ئەوەیش بواری بۆ دەرەخساندن سکالاّکانیان بە ئازادی بەرز بکەنەوە.[6]

لیستێك بە ناوی فەرمانڕەواکانی عومەر لە سەر هەرێمەکان:[7]

١ـ زەیدی کوڕی سابیت (مەدینە) لە کاتی دەرچوونی عومەر بۆ حەج و سەردانی شام.

٢ـ موحریزی کوڕی حاریسەی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبدوششەمس (مەککە).

٣ـ قونفوزی کوڕی عومەیری کوڕی جودعانی تەمیمی (مەککە).

٤ـ نافیعی کوڕی عەبدولحاریسی خوزاعی (مەککە).

٥ـ خالیدی کوڕی عاصی هیشامی مەخزومی (مەککە).

٦ـ عوسمانی کوڕی ئەبوعاص (٥١ ك) (تائیفو عومانو بەحرێنو جارجارەش یەمامەو بەحرێن).

٧ـ عوتبەی کوڕی ئەبوسوفیانی کوڕی حەربی ئومەوی ٤٤ ك (تایف).[8]

---

١) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٥٦.

٢) مصطفى محمد مسعد: التنظيم الاداري في الجزيرة العربية في عصر الخلفاء الراشدين ١: ٣٦٩ (لە نێو توێژینەوەکانی "ندوة الجزيرة في عصر الرسول او الخلفاء الراشدين").

٣) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨١٨، ٨٣٢، ٨٥٤.

٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ٢٦١.

٥) ابن سعد: الطبقات ٧: ٣٩٨، وابن الاثير: أسد الغابة ٤: ١٦٦.

٦) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٦١.

٧) خليفة: التاريخ ١٥٣ـ ١٥٤، والطبري: تاريخ ٤: ٢٤١.

٨) ابن عبدالبر: الاستيعاب ٣: ١٢١، وابن الاثير: أسد الغابة ٣: ٣٦١، ئیبنوحەجەر وتوویەتی: موعاویەی برای کردوویەتی بە فەرمانڕەوا (الاصابة ٣: ٧٨).

٨ـ سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی (تائیف).

٩ـ یەعلای کوڕی ئومەیە ـ مونیە ـ ی تەمیمی ٣٨ ك (یەمەن).

١٠ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعەی مەخزومی (جەنەد).

١١ـ عەلای کوڕی حەزرەمی ١٤ ك (بەحرێن).

١٢ـ عوسمانی کوڕی ئەبو سەور (بەحرێن).

١٣ـ قودامەی کوڕی مەزعونی جومەحی (٣٦ك ) (بەحرێن).[1]

١٤ـ ئەبوهورەیرە (بەحرێن) لە دوای کۆچی دوای عەلائی کوڕی حەزرەمی.

١٥ـ عەمری کوڕی عاص (٤٢ ك) (فەلەستینو دواتر میصر).

١٦ـ عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح (صەعید).

١٧ـ ئەبوعوبەیدە، عامیری کوڕی جەڕاح.

١٨ـ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان (شام).

١٩ـ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان (٦٠ك) (شام).

٢٠ـ شورەحبیلی کوڕی حەسەنە (ئوردون).

٢١ـ موعازی کوڕی جەبەل ـ ١٨ ك (ئوردون) لەلایەن ئەبوعوبەیدەوە.

٢٢ـ عەلقەمەی کوڕی عەلاسەی عامیری ـ ٢٠ ك (حۆران).[2]

٢٣ـ عەلقەمەی کوڕی حەکیم (ڕەملە).

٢٤ـ عەلقەمەی کوڕی موجەززیزی مەدلەجی ـ ٢٠ ك (ایلیا ـ بیت المقدس).

٢٥ـ عوبادەی کوڕی صامت (حیمص) لە لایەن ئەبوعوبەیدەوە.

٢٦ـ عەیازی کوڕی غەنەمی فیهری ـ ٢٠ ك (حیمصو جەزیرە) لەلایەن ئەبوعوبەیدەوە.

٢٧ـ سەعیدی کوڕی عامیری کوڕی حزیەم (حیمصو جەزیرە).

٢٨ـ عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری (حیمصو جەزیرە).

٢٩ـ حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فیهری (جەزیرە).

٣٠ـ وەلیدی کوڕی عوقبە (جەزیرە).

١) ابن عبدالبر: الاستيعاب ٣: ٢٥٩، وابن حجر: الاصابة ٣: ٢٢٨.

٢) ابن الاثير: أسد الغابة ٤: ١٣، وابن حجر: فتح الباري ٨: ٦٨، والاصابة ٢: ٥٤.

٣١- موسەننای کوڕی حاریسەی شەیبانی (عێراق).

٣٢- ئەبوعوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی (عێراق).

٣٣- قوتبەی کوڕی قەتادە (بەصرە).

٣٤- شورەیحی کوڕی عامیر (بەصرە).

٣٥- عوتبەی کوڕی غەزوان (بەصرە).

٣٦- سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (عێراق).

٣٧- موغیرەی کوڕی شوعبەی سەقەفی (بەصرە ساڵی ١٨ ك دواتر کووفە).

٣٨- ئەبوموسای ئەشعەری (بەصرە).

٣٩- عەمماری کوڕی یاسر - ٣٧ ك (کووفە).

٤٠- جوبەیری کوڕی مونعیم (کووفە).

٤١- سەلمانی فارسی (مەدائین).

٤٢- حوزەیفەی کوڕی یەمان (ئازەربایجان دواتر مەدائین).

٤٣- عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلەمی (موصڵ دواتر ئازەربایجان).

٤٤- نوعمانی کوڕی موقرینی موزەنی (کەسکەر).

٤٥- بیلالی ئەنصاری (عومان).

**فەرمانڕەواکان لە سەردەمی خیلافەتی عوسمان :**

یەکە کارگێڕیە پێشووەکان هەر بەردەوام بوون وەکو: مەککە، مەدینە، بەحرێن، یەمامە، یەمەن، حەزرەمەوت، کووفە، بەصرەو میصر. لە خیلافەتی عوسمانیش ئەرمینیای خرایە سەر کە بۆ یەکەمجار فەتح کرا لەو سەردەمە،[1]

پەرەسەندنێکی تریش روویدا کاتێك کە عوسمان هەرێمی بەحرێنو عومانی خستە سەر هەرێمی بەصرە، عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی کورەزیشی کرد بە فەرمانڕەوای، ئەمەیش کاریگەری یەکی زۆری هەبوو لەسەر وزەی مرۆی ئەو هەرێمە، کە بووە هۆکارێك بۆ هەڵسان بە ئەرکی

١) خليفة: التاريخ ١٦٣، والبلاذري فتوح البلدان ٢٠١، وابن اعثم الكوفي: الفتوح ٢: ٢٠٨.

فتوحاتە گەورەکان لە هەرێمی فارسو خوراسانو سەجستان،[1] لە راستیدا ئەم فەرمانڕەوا لاوە هەڵسا بە چاکسازی یەکی زۆر لە رێکخستنی ئاودێریو کشتوکاڵو هەڵکەندنی جۆگەو رووبارو رێکوپێك کردنی شاری بەصرەو فراوانکردنی مزگەوتەکەیو زۆرکردنی ئاو لە رێگای حەج بۆ حاجی یەکان. بەصرە لە رووی ئابوری یەوە گەشەی کرد، دەسەڵاتی فەرمانڕەوای یەکەشی فراوان بوو تا گەیشتە عومانو بەحرێن، سەجستان، خوراسان، فارسو ئەهواز، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی عامیر لێپرسراوی لەسەر ئەو شوێنانە دەستنیشان کرد، هەروەها رێزو پلەوپایەی خۆی لای خەڵکی بەصرە پاراست تاکو کۆتای فەرمانڕەوای یەکەی کە ئەوەش دەربڕین دەکات لە توانایەکی زۆر لە سەرکردایەتیو بەڕێوەبردن، سەرەڕای ئەوەی کەتەمەنی بیستو پێنج ساڵ بوو کاتێك بوو بە والی بەصرە.[2]

هەموو فەرمانڕەواکانی عوسمانیش لاو نەبوون، بەڵکو هەندێکیان لە پیرانی هاوەڵان بوون وەکو عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری فەرمانڕەوای حیمصو قەنسەرین کە داوای لە عوسمان کرد وازی لێبێنێت لەبەر گەورەی تەمەنی، بۆیە عوسمان هەرێمەکەی خستە سەر هەرێمی موعاویە،[3] هەروەها سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص کە والی کووفە بوو، کە خۆی دامەزرێنەری ئەو شارە بوو لە سەردەمی عومەر، جا شارەزای سەعد بە دانیشتوانیو بارودۆخی کووفە شیاوێتی پێبەخشی جارێکی تر ببێتە والی لەوێ.

عوسمان (رەزای خوای لێبێت) فەرمانڕەوای شارەکانی هەڵدەبژارد لەوانەی کە لێوەشاوەی بەڕێوەبردنو کارامەی سەربازیان هەیە، مەقریزی دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح کە فەرمانڕەوای عوسمان بوو لە سەر میصر دەڵێت: "لە ماوەی خیلافەتی عوسماندا لەسەر کارەکەی مایەوەو خەڵکیش لی رازی بوون".[4] وەسفیش کراوە بە نەبەردییو بەخشندەیو هێمنیو

١) خليفة: التاريخ ١٦٢، ١٦٣، ١٦٧، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٩٦، ٣٨١، وصالح العلي: التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة في القرن الاولى الهجري ١٤١.

٢) خليفة: التاريخ ١٧٨، والطبري: تاريخ ٥: ٥٤، وابن الاثير: الكامل ٣: ٩٩، وعبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ١: ١٨٩ـ ١٩١.

٣) الطبري: التاريح ٤: ١٨٩.

٤) المقريزى: الخطط ١: ٢٩٩ وقارن بعبارة الذهبـي: سير أعلام النبلاء ٣: ٣٤.

لەسەرخۆی.[1] هاوەڵی مەزنیش ئەبوموسای ئەشعەری لە پاش لابردنی لەسەر ویلایەتی بەصرە و دانانی عەبدوڵلای کوڕی عامیری کوڕی کورەیز. چووە سەر مینبەرو وتی: "وا گەنجێکتان بۆ هات لە خێزانێکی میهرەبانو بەخشندەی قوڕەیشە، پارەتان بەسەرا دەڕژێنێ".[2] ئەمەیش کەسایەتی ئەبوموسا دەردەخات کە چەند پەرۆش بووە لە سەر گوێڕایەڵی و قایمکردنی کارەکە بۆ فەرمانڕەوای دوای خۆی.

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمانڕەواکانی کۆدەکردەوە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی گشتیی وڵات، بەتایبەتی لەسەرەتای بشێونەکە.[3]

هەروەها سکاڵایشی وەردەگرت دژ بە فەرمانڕەواکانی، هەر بۆیە کاتێك خەڵکی بەصرە سکاڵایان لە ئەبوموسای ئەشعەری کرد، لایبردو عەبدوڵلای کوڕی عامیری کوڕی کورەیزی دامەزراند لە جێگاکەی،[4] هەمان کاریشی ئەنجامدا لەگەڵ فەرمانڕەوای کووفە وەلیدی کوڕی عوقبە، ئەمەش سیاسەتێك بوو پێش عوسمان عومەر بەرپای دەکرد.

عوسمان ڕەزای خوای لێبێت پەیوەندی پتەو بوو لەگەڵ فەرمانڕەواکانی، ئاڵوگۆڕی نامەی لەگەڵ دەکردنو تاوتوی بارودۆخی هەرێمەکانی دەکرد، ئامۆژگاری و ڕاوبۆچوونی دەخستە بەرچاوی فەرمانڕەواکان و فەرمانیشی پێدەکردن کە لە کاتی حەج هەموویان ئامادەبن بۆ لێپرسینەوەیانو سەیرکردنی سکاڵای خەڵکیی لە دژیان.[5]

تێبینیش دەکرێت کە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص هەموو کاروباری کووفەی بە دەست بوو دارای نەبێت، کە عوسمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودی لەسەر دانا بوو، کاتێکیش کە جیاوازیان کەوتە نێوان بە هۆی بڕێك پارە کە سەعد بە قەرز لە (بیت المال) وەریگرتبوو و نەیدەتوانی بیداتەوە لە کاتێکی دیاریکراودا، عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەعدی لابردو عەبدوڵلای لە جێگەی خۆی هێشتەوە، هاوکات فەرمانڕەوایەکی تری دامەزراند کە وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبومویعیت بوو، کە پێشتر چەند کارێکی پێ سپێردرابوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەردا.

١) الذهبي: سير أعلام النبلاء ٣: ٢١.

٢) خليفة: التاريخ ١٦١، والذهبي: سير أعلام النبلاء ٣: ١٩.

٣) عمر بن شبة: تأريخ المدينة ٣: ١١٢٠، والبلاذري: الفتوح ٢٢٩، والكندي: ولاة مصر ٣٨.

٤) الطبري: تأريخ ٥: ٥٥، وابن الاثير: الكامل ٣: ٩٩.

٥) الطبري: تأريخ ٤: ٣٩٧ـ ٣٩٨، عن سيف بن عمر.

وەلیدیش توانایەکی کارگێری و سەربازی باشی پیشاندا، شارەزایشی هەبوو لە مامەڵەکردنی خەڵکی کووفە کە ئەویان خۆشدەویست بە هۆی بایەخدانی بە بەرژەوەندی یەکانیانو خۆدانەبڕانی لیان، بەڵام ناکۆکی جارێکی تر دەستی پێکرد لە نێوان خۆیو عەبدوڵڵادا، وەکو چۆن لەگەڵ سەعددا روویدا، لێرەدا عوسمان هەڵسا بە لابردنی عەبدوڵڵاو هێشتنەوەی وەلید، دواتر هەندێ گیروگرفت روویدا لە نێوان وەلیدو کەسانێك لە ئەهلی کووفە، کە وەلید حەددی شەرعی کوشتنەوەی لەسەر هەندێ لە خزمانی ئەوانە جێبەجێکردبوو، ئەوانە هەوڵیان دا لای خەڵك و دواتر لای عوسمان کە وەلید لابدرێت، بەڵام عوسمان قایل نەدەبوو بە لابردنی وەلید لەسەر کووفەو پی وتن: "تعملون بالظنون، وتخطئون فی الاسلام، وتخرجون بغیر اذن، ارجعوا"، واتە: بە گومان کار دەکەنو لە ئیسلام هەڵە دەکەنو بەبێ رێگەپێدان دەردەچن، بگەڕێنەوە. کاتێك گەڕانەوە هەموو ناحەزانی وەلید کۆبوونەوەو پێکهاتن لەسەر یەك را،[1] ئەویش ئەوەبوو هەڵسان بە تۆمەتبارکردنی وەلید بە مەی خواردنەوەو شایەتیشیان لەسەر دا، بۆیە عوسمان حەددی مەی خواردنی لەسەر جێبەجێکرد ـ چل قامچی ـ کە ئەو حەددە سەلمینراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، ئەمجا لاشی برد لەسەر کووفە[2]و سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەیەی دانا لە جێگاکەی، (حافظ)ی (ذهبی) باسی کردووە و وتوویەتی: "کان أمیراً شریفاً جواداً حلیماً ذا حزم وعقل یصلح للخلافة".[3] واتە: فەرمانڕەوایەکی بە ئابڕووی بەخشندەو هێمنو شکۆدارو توندوتۆڵو هۆشیار بوو، لێوەشاوەی تیادا بوو ببێتە خەلیفە.

سەعید زانایان و قورئانخوێنانی لە خۆی نزیك کردەوە، خەڵکی خراپیشی لە خۆ دوورکردەوە، وەکو سەرکردەی هۆزەکان، ئەمەیش بووە مایەی خەشم و قینی ئەوان، بەڵام سەرەڕای بارودۆخی نالەباری کووفە، توانی هەرێمەکە رێك بخاتو کاری سەربازیش بە ئاڕاستەی تەبەریستانو خەزەردا ببات، هەروەها توانی سەرکەوێتە سەر یاخیبووانی ئازەربایجان، بەڵام چالاکیی کارگێڕیی و سەربازیی قوتاری نەکرد لە ئاژاوەگێڕانی سەرکردەی هۆزەکان کە سنووری خۆیان بەزاند و لەناو کۆڕەکەیدا دەستدرێژیان کردە سەر هەندێ لە یارمەتیدەرانی، عوسمان دەربارەی ئەوانە راوێژی کردو فەرمانی

---

١) الطبري: تأريخ ٤: ٢٧٥ عن سیف.

٢) البخاري: الصحیح (فتح الباري ٧: ٥٣) ومسلم : الصحیح ٣: ١٣٣١ رقم ١٧٠٧، وابن حجر: فتح الباري ٧: ٥٦.

٣) الذهبـي: سیر أعلام النبلاء ٤٤٤ـ ٤٤٥.

دەرکرد بە دوورخستنەوەی ئەو کەسانە بۆ شام، ئەوانیش لە شام مانەوە تا هەلی گەڕانەوەیان بۆ ڕەخسا بۆ کووفە، کاتێك کە سەعیدی کوڕی عاص دەرچوو بوو لە کووفە بەرەو مەدینە، بۆیە هەلّسان بە هاندانی خەڵکیی بە بیانووی ئەوەی کە سەعید دەیەوێت خەڵاتەکان کەم بکاتەوە، ئەشتەر توانی نەیارەکان کۆبکاتەوەو ڕێگەیان گرت لە سەعید لە کاتی گەڕانەوەی کە بێتە ناو کووفەوە ـ کە ئەوان هەزار کەس دەبوون ـ بۆیە گەڕایەوە لای عوسمانو پێشنیاریکرد فەرمانڕەوایەکی تریان بۆ دابنێ، عوسمان زانی کە ئەوان حەز لە فەرمانڕەوایەتی ئەبوموسای ئەشعەری دەکەن بۆیە دایمەزراند بۆ دووەمجار لەسەر کووفەو لە کارەکەی مایەوە تا کوژرانی عوسمان.[1]

لە ڕاستیدا کووفە سەقامگیربوونی بەخۆیەوە نەبینی، سەرچاوەیەکیش بوو بۆ ئاژاوەو سکاڵاکردن لەسەر فەرمانڕەواکان کە یەك بە دوای یەك دەهاتن بۆ کووفە، کەس لەوانە قوتاری نەدەبوو لە ئاژاوەو سکاڵاکردنیان، عوسمانیش سووربوو لەسەر ئارامکردنەوەی بارودۆخ لەوێ، بۆیە فەرمانڕەواکانی دەگۆڕێ لە کاتی زیادبوونی ئاژاوە دژیان.

سیاسەتی عوسمان بریتی بوو لە چاودێری بەرپرسانو گوێگرتن لە ڕاوبۆچوونی خەڵکی لە ئەوانو کۆبوونەوەی ساڵانە پیان لە وەرزی حەج بۆ تاوتوێ کردنی کاروباری هەرێمەکان، وەکو درێژەپێدانێکی سیاسەتی عومەر، هەروەها نامەی دەنارد بۆ فەرمانڕەواکانی بە مەبەستی بەشداریکردن لە چارەسەرکردنی گرفتی هەرێمەکان، پشکنەریشی دەنارد بۆ زانینی بارودۆخەکان لە نزیکەوە، نامەشی دەنارد بۆ دانیشتوانی هەرێمەکان، سیاسەتی بەرانبەریان ڕووندەکردەوەو سووربوونیشی لەسەر مافەکانیان و ئامادەی بۆ وەرگرتنی سکاڵاکانیان دژ بە فەرمانڕەواکان ئەگەر لە حاڵەتێکدا ستەمێکیان بکردبا دەردەبڕی، داواشی دەکرد لە ستەم لێکراوان ڕاستەوخۆ داواکانیان بۆ خەلیفە بەرزبکەنەوە لە کاتی حەج.

دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان بەردەوام بوو لەسەرپەرشتی کردنی هەرێمەکانیانو جێبەجێکردنی حوکمە شەرعی یەکانو پاراستنی ئاسایشو ڕێکخستنی ئیداری بۆ سوپا، چونکە بزووتنەوەی فتوحات بەردەوام بوو لە خیلافەتی عوسمان.

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ٣٣٠ـ ٣٣١، ٢٦٩ـ ٢٧١.

تێبینیش دەکرێت کە عوسمان ژمارەی هەرێمەکانی کەم کردەوە بەوەی کە هەندێکانی خستە سەر هەندێکی تریان بە بەڕێوەبەرایەتی یەك فەرمانڕەوا، بۆ نموونە موعاویە فەرمانڕەوای شام‌و جەزیرەو فەلەستین بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عامریش فەرمانڕەوای بەصرە و بەحرێن بوو عوممان‌و یەمامە جگە لەو ناوچە فەتحکراوانەی فارس و خوراسان بوو، بەڵام ئەو فەرمانڕەوایانەی کە ناوچەی زۆریان لە ژێر دەسەڵاتدا بوو یارمەتی فەرمانڕەواکانی تریان دەدا کە ناوچەکانیان لە ژێر دەسەڵاتیاندا نەبوون، هەروەها جێبەجێکردنی پرۆژەی بیناسازی‌و پردو کەناڵ لێدان‌و چاککردنەوەی ڕێگاوبان‌و هاتووچۆو ڕێکخستنی بازاڕەکان، بەفەرمانڕەواکان دەسپێردرا.

لیستێك بە ناوی فەرمانڕەواکان لە خیلافەتی عوسمان[1]

١ـ ئەبولئەعوەری کوڕی سوفیان (حیمص).

٢ـ عەبدوڕەحمانی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید (حیمص).

٣ـ عەلقەمەی کوڕی حەکیمی کینانی (فەلەستین).

٤ـ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (قەرقیساء).

٦ـ موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان (شام).

٧ـ خالیدی کوڕی عاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومی (مەککە).

٨ـ عەبدوڵڵای کوڕی حەزرەمی (مەککە).

٩ـ قاسمی کوڕی ڕەبیعەی سەقەفی (تائیف).

١٠ـ یەعلای کوڕی مونیە (صەنعا).

١١ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە (جەنەد).

١٢ـ عەلی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدولعوزای عەبشەمی (مەککە).

١٣ـ عوسمانی کوڕی ئەبوعاصی سەقەفی (بەحرێن‌و یەمامە).

١٤ـ مەروانی کوڕی حەکەمی کوڕی عاصی ئومەوی (بەحرێن).

١٥ـ عەبدوڵڵای کوڕی سواری عەبدی (بەحرێن).

١٦ـ سەبورەی کوڕی عەمری عەمبەری (یەمامە).

١٧ـ نوسەیر (هەمەدان).

---

١) خليفة: التاريخ: ١٧٨، ١٧٩، ١٨٠، والطبري ٤: ٢٢٦، ٣٣٠، ٤٢١ـ ٤٢٢.

١٨ـ سەعیدی کوڕی قەیس (ڕی).

١٩ـ سائیبی کوڕی ئەقرەع (ئەصفەهان).

٢٠ـ سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهیلی (ئەرمینیا).

٢١ـ حوزەیفەی کوڕی یەمان (ئازەربایجانو ئەرمینیا).

٢٢ـ ئەشعەسی کوڕی قەیس (ئازەربایجان).

٢٣ـ موغیرەی کوڕی شوعبەی سەقەفی (ئازەربایجانو ئەرمینیا).

٢٤ـ عوتەیبەی کوڕی نەهاس (حەلوان).

٢٥ـ عەمری کوڕی عاصی سەهمی (میصرو ئەمجا ئەسکەندەریە بەتەنها).

٢٦ـ عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح (میصر ).

٢٧ـ ئەبوموسای ئەشعەری (بەصرەو دواتر کووفە).

٢٨ـ عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی کورەیز (بەصرە).

٢٩ـ موغیرەی کوڕی شوعبەی سەقەفی (کووفە).

٣٠ـ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (کووفە).

٣١ـ وەلیدی کوڕی عوقبەی ئومەوی (کووفە ٢٥ ـ ٣٠ ك).

٣٢ـ سەعیدی کوڕی عاصی ئومەوی (کووفە).

٣٣ـ مالیکی کوڕی حەبیب (ماە).

٣٤ـ حوبەیش (ماسبەزان).

تەنها حەوت کەس لەم فەرمانڕەوایانە پەیوەندی خزمایەتیان هەبوو لەگەڵ عوسمان، بێگومان ئەوانیش لە قوڕەیش بوون، ئەو دوایان لە قوڕەیشو سەقیف و هەندێ هۆزی تر بوون، هەمووشیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوون، متمانەی دەزگای بەڕێوەبردن لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە لەسەر پیاوانێك بوو لە هاوەڵان بەتایبەتی لە قورەیشو سەقیف، بەشداری کردنی ئەنصارەکانیش بەهێزتر بوو لە سەردەمی خیلافەتی عەلی.

**فەرمانڕەواکان لە سەردەمی عەلی:**

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ئاگادار بوو لە بارودۆخی بشێونە، کە بووە مایەی کوژرانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەو پڕوپاگەندە بەرفراوانەش دەکرا دژ بە خەلیفەو فەرمانڕەواکان هۆکاری

خەشمو قین بوو دژیان، بۆیە عەلی بە پەلە گەورە فەرمانڕەواکانی عوسمانی لابرد، زۆربەی ئەوانەش لە هەرێمەکانیان نەمابوون، بەڵکو بەجیان هێشتبوو لە کاتی بشێوەنەکە، موحەممەدی کوڕی ئەبوحوزەیفەش بە درێژای ساڵێك دەستی گرتە سەر میهردا تا ئەو کاتەی لە کۆتای ساڵی (٣٦ك) لەسەر دەستی عوسمانی یەکان کوژرا، چونکە فەرمانڕەواکەی ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو سەرح ـ بەجی هێشتبوو لەو کاتەدا،[١] عەبدوڵلای کوڕی ئومەیەیش یەمەنی بەجێهێشت کە بیستی عوسمان کوژراوە، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عامیریش بەصرەی بەجێهێشت لەبەر هەمان هۆکار.[٢]

بێگومان گرنگترین پەرەسەندنەکانی سەردەمی خیلافەتی عەلی دەرچوونی بوو لە مەدینەوە بۆ کووفە، بەم شێوەیەش مەدینە بوو بە ویلایەتێك لە ویلایەتەکان و سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاریشی کرد بە فەرمانڕەوای لە کاتێکدا کووفە بوو بە بارەگای خیلافەتو خولگەی ڕووداوەکان.

یەکێ لە پەرەسەندنەکانی تریش ئەوەبوو بەحرێن لە بەصرە دابڕاو بوو بە هەرێمێکی سەربەخۆ، جاری واش بوو دەخرایە سەر فەرمانڕەوای یەمەن عوبەیدوڵڵای کوڕی عەباس فەرمانڕەوای بوو.

شام بە هیچ شێوەیەك ملکەچی عەلی نەبوو بە درێژای خیلافەتەکەی، بەڵکو موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان بەردەوام لە حوکمڕانی شامو فەرمانەکەی عەلی جێبەجێنەکرد سەبارەت بە لابردنی، بەڵام داوای تۆڵەی عوسمانی کرد پێش هەموو شتێك.

سەبارەت بە جەزیرەش کە دەکەوتە نێوان عێراقو شام، جاری وابوو دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی عەلیو جارجارەش دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی موعاویە.

میصریش تا ساڵی (٣٨ك) سەر بە عەلی بوو (ڕەزای خوای لێبێت)، چەند فەرمانڕەوایەکیشی بەخۆیەوە بینی دێرینترینیان قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەیە کە زاڵبوو بەسەر ڕێکخستنی کاروبارەکانی بە ڕێکخستنی باجو پۆلیس، لەگەڵ نەیارەکانیشدا ڕێگای ڕازیکردنی گرتە بەر بێ دەرخستنی لاوازی، بۆیە پێکدادانی نەکرد لەگەڵ ئەوانەی داوای تۆڵەی عوسمانیان دەکرد لە

١) ابن سعد: الطبقات ٧: ٥٠٤، ابن يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٢٥٤، وعبدالرزاق: المصنف ٥: ٤٥٨ بسند صحيح الى الزهري مرسلاً، والبخاري: التاريخ الكبير ٥: ٢٩، والكندي: ولاة مصر ٢١، والمقريزي: المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار ١: ٣٠٠.

٢) عبدالحميد علي ناصر فقيه: خلافة علي ١٠٤، وخليفة : التاريخ ١٧٨، ٢٠١. ٢٠٢.

هەوادارانی موعاویە تا ئاشتیخواز بن‌و شمشێر لە رووی بەرزنەکەنەوە و ئاژاوە نەگێڕن دژی، مووچەکانیشی پێدەدان وەکو سەربازەکانی خۆی، بەلاّم ئەم هەلّویستە ژیرانە نەیارەکانی کووفەی وروژاندو وتیان دیارە لەگەلّ موعاویەیە بۆیە لەسەر کار لابرا.

بەلاّم فەرمانڕەوای تازە کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بوو شێوازێکی توندو تیژی گرتەبەر لەگەلّ نەیارەکاندا لە میصر ـ کە بە دە هەزار جەنگاوەر مەزەندە دەکران ـ ئەوەیش بووە مایەی هەلّگیرسانی شەڕ لە نێوان هەردوولا، هەروەها دەرچوونی نەیارەکان بەرەو شام و گەڕانەوەیان لەگەلّ هێزەکانی شام بۆ دەستبەسەراگرتنی میصر، لە دوای چەند شەڕێکی توند لەگەلّ فەرمانڕەواکەی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر کە بە کوژرانی تەواو بوو، میصریش بەم شێوەیە کەوتە ژێر دەسەلاّتی موعاویە لە سالّی (٣٨ك).

بەلاّم بەصرە عەلی هەلّسا بە دانانی عەبدوللاّی کوڕی عەباس لەسەری، کە هاوەلّێك بوو بە زانستی زۆر لە فیقه و تەفسیردا دەناسرا، لێهاتووی بەڕێوەبردنی خۆی سەلماند بە بەرقەرارکردنی ئاسایش لە سەجستان کە سەر بە هەرێمی بەصرە بوو، هەروەها لە هەرێمی فارس کە هەلّسا بە دانانی زیادی کوڕی ئەبوسوفیان وەکو فەرمانڕەوا لەسەری، هەروەها لە جێگەی خۆیشی دایدەنا کە لە بەصرە لە کاتی دەرچوونی بۆ کۆنترۆلّ کردنی ئارامی.

عەبدوللاّی کوڕی عەباس بە گرنگترین پیاوانی عەلی دەژمێردرێت، کە لە رووداوە ترسناکەکاندا هاوڕێتی دەکردو ئامۆژگاری بۆ دەردەبڕی و مشتومڕی لەسەر دەکرد، هەروەها عەلی متمانەی پیبوو راوێژیشی پێدەکرد، فەرمانڕەوایەتی ئیبنوعەباس لەسەر بەصرە بەردەوام بوو تاکو سالّی (٩٣ك)، لێپرسراوی پۆلیس‌و باجیش هاوکاریان دەکرد.

سەبارەت بە کووفەیش عەلی ئەبوموسای لەسەر هێشتەوە کاتێك کە زانی خەلّکەکە پی رازین، بۆیە دووبارە بەیعەتی لە دانیشتوان بۆ وەرگرتەوە،[1] ئەبوموسایش هەلّوێستێکی بێلایەنانەی وەرگرت لە شەڕەکانی جەمەل‌و صففین، ئامۆژگاری خەلّکی کووفەیشی کرد بە بەشدارینەکردن لە بشێونەی ناوخۆی. ئەبوموسا لابرا ئەو کاتەی کە عەلی کووفەی کرد بە مەلّبەندی خیلافەت لە پاش شەڕی جەمەل.

١) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ٣٦ب .

سەبارەت بە هەرێمی فارس ـ کە سەر بە بەصرە بوو لە رووی بەرێوەبردن ـ فەرمانڕەواکەی سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاری بوو کە رووبەڕووی یاخیبوونێك بوویەوە لەو هەرێمە، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس فەرمانڕەوایەکی تازەی بۆ نارد ئەویش زیادی کوڕی ئەبوسوفیان بوو کە توانی کۆنترۆڵی ئەو ناوچەیە بکات، هەروەها هەڵدەستا بە دامەزراندنی فەرمانڕەوا لەسەر شارە گرنگەکانی هەرێمی ئیستەخرو ئەصفەهان.

خۆراسانیش هەر سەر بە بەصرە بوو، لەسەردەمی عەلی، عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزاو جەعدەی کوڕی هوبەیرەی کوڕی ئەبووەهب فەرمانڕەوای بوون، جەعدە رووبەڕووی یاخیبوونی خەڵکەکە بوویەوەو سەرکوتی کردن.

سەجستانی هاوسنووری خوراسانیش هەر سەر بە بەصرە بوو، فەرمانڕەوای بەصرە هەڵدەسا بە دانانی فەرمانڕەواو بۆ ئەو شوێنانە.

ئازەربایجانیش لە ژێر فەرمانڕەوای ئەشعەسدا بوو لە سەردەمی عوسمانو عەلی، هەر ئەویش بوو شاری ئەردەبیلی دامەزراندو مزگەوتەکەی دروستکردو ئیسلامی تیادا بلاوکردەوە.

بەڵام ئەهواز خورەیتی کوڕی راشید فەرمانڕەوای عەلی بوو لەسەریو دواترو لەپاش شەڕی صففین لە عەلی ترازاو و لابردنی عەلی راگەیاند، بۆیە عەلی هەڵسا بە ناردنی سوپایەكو سەرکوتی کرد، هەروەها میسقەلەی کوڕی هوبەیرەی شەیبانی رۆیشتە سەر فەرمانڕەوای ئەهواز، بەڵام ئەویش خۆی دایە پاڵ موعاویە.

عەلی (رەزای خوای لێبێت) رووبەڕووی زۆر گیروگرفت دەبوویەوە لە ئەو ولایەتانە، وەکو دەرچوونی هەندێکیان لە ژێر دەسەڵاتی لەوانە: یەمەنو حیجازو میصر، هەروەها بلاوبوونەوەی بزووتنەوەی خاریجی و چالاکی یەکانیان لە عێراقو فارس، جگە لە شۆڕشی دانیشتووە رەسەنەکان، خۆدانەپاڵ هەندێ ولایەت بۆ لای موعاویە.

عەلی (رەزای خوای لێبێت) چاودێریو لێپرسینەوەی دەکرد لەگەڵ فەرمانڕەواکانی دەربارەی سیاسەتیان لە ئاستی دەوڵەتو خەڵکی، دەرگاشی کراوە بوو بۆ سکالای خەڵکی دژ بە فەرمانڕەواکان، دەشیووت: "اللهم اني لم آمرهم ان يظلموا خلقك او يتركوا حقك..".[١] واتە: خوایە من فەرمانم پێنەکردوون ستەم لە بەندەکانت بکەن، یان مافەکانی تۆ بە فیڕۆ بدەن.

---

١) ابن تيمية: السياسة الشرعية ٣٢، والنويري: نهاية الارب ٢٠: ٢١٩، ٢٢٠.

ئینجا عەلی پەیدەبرد بە گرنگی بوونی دەسەڵات لە وڵاتی ئیسلامدا "فەرمانڕەوای پێویستە بۆ خەڵکی چاکەکار بێت یان خراپەکار، وتیان ئەی سەرکردەی ئیمانداران چاکەکارمان زانی، ئەی خراپەکار چۆن؟ فەرمووی: سنووری پێ جێبەجێدەکرێتو ڕێگاکانی پێ ئارام دەکرێتەوەو شەڕی دوژمنی پێدەکرێتو دەستکەوتەکانی پێ دابەشدەکرێت".

بۆیە دەسەڵات لە دیدی عەلی یەوە ئەگەر بەرز نەبێتەوە بۆ ئاستێکی بڵند لە وابەستەبوون بە چاکەو چاکسازیو لێبڕان بۆ ڕاستیو دادگەری، کە ئەوانە لە فەرمانڕەوایەتی چاکەکاردا هەیە، ئەوە بە سوود دەبێت لە حاڵەتی لاوازی وابەستەبوونو بیروباوەڕی ـ کە بەخراپەکاری ناوزەدی کردووە ـ چونکە هەڵدەستێت بە بەرقەرارکردنی ئاسایشو جێبەجێکردنی حوکمە شەرعی یەکانو دابەشکردنی دادگەرانە بۆ سەروەتو سامانو بەرپاکردنی جیهاد.

لە ڕاستیدا نووسەرە هاوچەرخەکان تاوتوی چەند کێشەیەکیان کردووە تایبەت بە فەرمانڕەواکان لەهەردوو خیلافەتی عوسمانو عەلی دا، لەوانە: دانانی خزمان بۆ فەرمانڕەوای، چونکە عوسمان هەندێك لە خزمەکانی خۆی دامەزراند بۆ فەرمانڕەوای بەصرە و کووفەو شامو میصر وەکو موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان (شام) کە ئەو پێشتر لە لایەن عومەرەوە دانرابوو، عوسمانیش جێگیری کرد لە سەر کارەکەی، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی کورەیز (بەصرە) وەلیدی کوڕی عوقبە (کووفە)و سەعیدی کوڕی عاص (کووفە)و عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح (میصر)، هەروەها عەلی هەڵسا بە دانانی چوار لە ئامۆزاکانی لە کوڕانی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لەسەر هەندێ لە هەرێمە گرنگەکان (بەصرەو یەمەنو حیجاز) ئەوانەش: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەباسو قووصەی کوری عەباسو تەمامی کوڕی عەباس.

بە لێکۆڵینەوەش دەرکەوتووە کە عوسمانو عەلی خەڵکی لێهاتوویان داناوە لە خزمەکانیان.[1] بیریش بۆ ئەوە ناچێت کە ئەو کەسانەیان دانابێت تەنها لەبەر خزمایەتی، لە ڕاستیشدا ئەو بارودۆخەی لەو سەردەمەی ئەوان هەبوو لە هەرێمەکان ئەوەی دەخواست کە ئەوان زۆر ورد بن لە مەسەلەی دانانی فەرمانڕەوا لە ڕووی بەهێزیو دەسپاکی یەوە، چونکە فتوحات لەو هەرێمانە بەردەوام نائارام بوو، ئەمە جگە لەو کێشەو تەگەرانەی خواریجەکان دروستیان دەکردو کێشەکانی هۆزایەتی لەناو هەرێمەکانو گرانی کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگاو دەوڵەت.

١) ابن تيمية: منهاج السنة ٣: ١٧٣، ١٧٦.

ئەوەی ڕاستیش بێت عوسمان و عەلی کۆششیان کرد بۆ نەتەوەی ئیسلام بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی یە دینیو دونیای یەکان، ئیتر ئەگەر پێکابێتیان یان نەیانپێکابێت، ئەوانیش لەهەردوو حاڵەتەکەدا هەر پاداشتیان هەیە ڕەوایش نی یە گومان بە نیازەکان ببرێت یان هاندەرەکانیان بە شێوەیەکی خراپ لێکبدرێتەوە بەبێ بەڵگەیەکی دروست.

یەکێکی تر لەو کێشانەی نووسەرە هاوچەرخەکان وروژاندیان کێشەی لابردنی عەلی بوو بۆ فەرمانڕەواکانی عوسمان، چونکە زۆر لە پێنووسەکان زیادەڕەویان کرد لە ڕاڤەکردنی ئەو مەسەلەیە، هەندێکیان بە توندوتۆڵی عەلی لە هەڤپەروەریدا لێکیان دایەوە کە ئەو سەرزەنشتی عوسمانی دەکرد لە دانانی خزمانی، هەندێکیشیان بە لاوازیی شارەزای عەلی لە سیاسەت لە قەڵەمیان دا، چونکە ـ بە بۆچوونی ئەوان ـ دەبوایە فەرمانڕەوا دێرینەکان بەتایبەت موعاویە لانەبرایە، تاکو بارودۆخ دەگیرسایەوەو بەیعەت بۆ عەلی لە هەموو شارەکان وەردەگیرا، ئەم ڕاڤەکردنانەش بنیاتنراوە لەسەر ڕیوایەتێکی لاواز دەربارەی موغیرە کە دوو ڕاوبۆچوونی دژ بەیەك دەربڕیوە سەبارەت بە هەڵوێست لە فەرمانڕەواکان.[1]

بەڵام دوای لێکۆڵینەوە ئاشکرا دەبێت کە عەلی بەهرەیەکی هەبوو لە سەرکردایەتی و ناسینی کەسەکانو ئەو بارودۆخەی کە ڕووی دابوو، ئینجا ئەو فەرمانڕەواکانی لابرد بۆ ئەوەی کەسانێکی تر هەڵبژێرێت بەپێی ئەوەی کە بە گونجاوی دەبینی بۆ ئەنجامدانی گونجاندنی کارگێڕیو سیاسی لە نێوان خەلیفەو لایەنگرانی، هەروەها کەسایەتی و ڕەوشتی ڕێگەی پێنادات شێوازی فێڵو تەڵەکەبازی بەکاربهێنێت بۆ بەکارهێنانی دەسەڵات.

ئینجا ئەگەر وردبینەوە لە نەژادی فەرمانڕەواکانی عەلی، دەبینین یانزە کەسیان لە ئەنصارن لە کۆی سیو شەش فەرمانڕەوا، حەوت کەسیشیان لە قوڕەیش بوون، کە چواریان لە کوڕانی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوون، ئیبنو عەباسی تەرجومانی قورئان و براکانی.

بە تێڕامان لەسەرجەم ڕاسپاردەکانی عەلی بۆ فەرمانڕەواکانی، پەیدەبرێت بە تێڕوانینی قووڵی ئەو بۆ مەبەستەکانی شەریعەتو بنیاتنانی کۆمەڵگای مرۆی پێکەوە،[2] لە هەموو ئەو مەسەلانەش پشتی دەبەست بە دیدێکی ئیسلامی هۆشیارو ڕێکوپێك.

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ٤٣٨ـ ٤٣٩.

٢) الطبري: تاريخ ٥: ١٤٧ـ ١٤٨، والنويري: نهاية الارب ٦: ١٩.

لیستێك بەناوی فەرمانڕەواكان لە خیلافەتی عەلی:[1]

١ـ سەهلی كوڕی حونەیفی ئەنصاری (مەدینە).

٢ـ تەممامی كوڕی عەباسی كوڕی عەبدولموتەلیب (مەدینە).

٣ـ ئەبوئەیوبی ئەنصاری (مەدینە).

٤ـ ئەبوقەتادەی ئەنصاری (مەككە).

٥ـ قەسەمی كوڕی عەباسی كوڕی عەبدولموتەلیب (مەككەو تائیف).

٦ـ عومەری كوڕی ئەبوسەلەمە (بەحرێن).

٧ـ قودامەی كوڕی عەجلانی ئەنصاری (بەحرێن).

٨ـ نوعمانی كوڕی عەجلانی ئەنصاری (بەحرێن).

٩ـ عوبەیدوڵڵای كوڕی عەباس (یەمەنو بەحرێن).

١٠ـ سەعیدی كوڕی سەعدی كوڕی عوبادەی ئەنصاری (جەنەد)

١١ـ مالیكی ئەشتەر (جەزیرەو میصر).

١٢ـ شەبیبی كوڕی عامیر (جەزیرە).

١٣ـ كومەیلی كوڕی زیادی نەخەعی (جەزیرە).

١٤ـ موحەممەدی كوڕی ئەبوحوزەیفەی كوڕی عوتبە (میصر).

١٥ـ قەیسی كوڕی عوبادەی ئەنصاری (میصر).

١٦ـ موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكری صددیق (میصر).

١٧ـ عوسمانی كوڕی حونەیفی ئەنصاری (بەصرە).

١٨ـ عەبدوڵڵای كوڕی عەباس (بەصرە).

١٩ـ ئەبولئەسوەدی دوئەلی (بەصرە).

٢٠ـ هانیئی كوڕی هەوزەی نەخەعی (كووفە).

٢١ـ ئەبوموسای ئەشعەری (كووفە).

٢٢ـ ئەبومەسعودی بەدری (كووفە).

٢٣ـ قەرەزەی كوڕی مەسعودی ئەنصاری (كووفە).

---

١) خليفة: التاريخ: ٩٩ـ ٢٠٢، والطبري: تاريخ ٥: ١٥٥ـ ١٥٦.

٢٤ـ سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاری (فارس).

٢٥ـ زیادی کوڕی ئەبوسوفیان (فارس).

٢٦ـ مونزیری کوڕی جارود (ئیستەخر).

٢٧ـ عومەری کوڕی سەلەمە (ئەصفەهان).

٢٨ـ موحەممەدی کوڕی سەلیم (ئەصفەهان).

٢٩ـ خولەیدی کوڕی قورەی تەمیمی.

٣٠ـ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا (خوراسان).

٣١ـ جەعدەی کوڕی هوبەیرەی کوڕی ئەبو وەهب (خوراسان).

٣٢ـ عەبدوڕەحمانی کوڕی جوزئی تائی (سەجستان).

٣٣ـ ڕەبعی کوڕی کاسولعەنبەری (سەجستان).

٣٤ـ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (هەمەدان).

٣٥ـ ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی (ئازەربایجان).

٣٦ـ سەعیدی کوڕی ساریەی خوزاعی (ئازەربایجان).

٣٧ـ خورەیتی کوڕی راشیدی ناجی (ئەهواز).

٣٨ـ میسقەلەی کوڕی هوەبیەری شەیبانی (ئەهواز).

٣٩ـ یزیدی کوڕی حوجەیبەی تەمیمی (ڕەی).

٤٠ـ سەعیدی کوڕی مەسعودی سەقەفی (مەدائین).

٤١ـ حارسی کوڕی موڕەی عەبدی (سیند).

## باسی دووەم:

## فــەرمــانــبــەران

فەرمانڕەوا پشتی دەبەست بە ژمارەیەك لە فەرمانبەران بۆ بەڕێکردنی کاروباری ولایەتەکەی، وەکو سەرکردەی پۆلیسو بەرپرسانی باجو فەرمانبەرانی (بیت المال) و جاری واش بوو بەرپرسی گەنجینە فەرمانبەرێکی سەربەخۆ دەبوو، بە پەیوندیەکی راستەوخۆ لەگەڵ خەلیفە.

سیستمە کارگێڕی یەکانیش روونبوون، جیاوازی زانرا لە نێوان والیو دادوەرو نووسەری دیوانو فەرمانبەرو بەرپرسانی تر، چی لە پایتەخت یان لە شارەکان لەسەردەمی عومەرەوە، ئەم شێوازی دابەشکردنە هەر بەردەوام بوو لە خیلافەتی عوسمانو عەلیش.

خەلیفەکانو فەرمانڕەوای هەرێمەکان متمانەیان دەکرد بە ژمارەیەك لە فەرمانبەران کە هەڵسان بە کاروباری نووسینو پاراستنو سەرپەرشتی گەنجینەکانو دیوانەکانی داهاتو باج کۆکردنەوەو سەربازی و بەخشینو خەڵاتو رێکخستنی پۆلیس. هەروەها فەرمانێکی تر پەیدابوو ئەویش کۆکردنەوەی غەنیمەو دابەشکردنی لە نێو سەربازەکان، کە سەلمانی کوڕی رەبیعەی باهلی بەرپرسی (الاقسام والاقباض) بوو.

هەروەها فەرمانێکی تر سەری هەڵدا ئەویش کاری بەرپرسانی دەیەك (العُشر) بوو، کە ئەوانە هەڵدەسان بە کۆکردنەوەی دەیەکی بازرگانی لەو بازرگانانەی کە موسڵمان نەبوون، یان دەهاتنە نێو خاکی موسڵمانانەوە، ئینجا رەچاوی سیاسەتی فراوانکردنەوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانی دەکرد، بۆیە ئەوان بەرپرسێتی گەنجینەو باجیان لە ئەستۆ بوو، بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوای عەمری کوڕی عاص بەرپرسێتی کاروباری باج لەلایەن عوسمانەوە درایە دەست عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح لەبەر کەمبوونەوەی داهاتەکانی ئەو هەرێمە بە هۆی ئەوەی کە عەمر کە خەرجی دەکردە سەر چاککردنی پردو ئاوبارەکان[1] جا خەلیفە جەختی دەکردەوە لەسەر سەرپەشتی کردنی فەرمانڕەواکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەسەر گەنجینەو باجەکان.[2]

---

١) البلاذري: فتوح البلدان: ٢٢٥، وابن عبدالحكم: فتوح مصر وأخبارها ١٦١.

٢) المقريزي: الخطط ١: ٣٠٠.

دیوانەکانی باجو داهات لە هەرێمەکان بە زمانی فارسی دەنووسرا لە عێراقو ئێران، لە شام بە بیزەنتی و میصریش بە قیبتی، هەر بۆیە پێویست بوو فەرمانبەرانێك دابنرێن لەسەر ئەو کارانە کە نیشتەجی ئەو هەرێمانەبن.

بەڵام دیوانی سەربازیو بەخشینو خەڵات بە زمانی عەرەبی بوو، بێگومان پێویستیی پەیدا بوو بە وەرگێڕی شارەزا لە عەرەبیو ئەو زمانە ناوخۆیانە، بە مەبەستی حاڵیبوونی فەرمانڕەوای عەرەب لە کاروباری دیوانی کۆکردنەوەی باجو داهات،[1] یەکێك لەوانەش کە بە وەرگێڕان ناسران میهرانی ئەسیری ئەصبەهانی بوو.[2]

بەڵام سیستمی پۆلیس هەر لە سەردەمی عومەر سەری هەڵدا بۆ پاراستنی (بیت المال)و بەندیخانەو ئامادەکردنی ناکۆکان بۆ لای دادوەرو جێبەجێکردنی حوکمەکانی دادگا لەسەر تاوانباران.[3] ئەو کەسەی کە لەبەر دەستی دادوەر کاری دەکرد پی دەوترا (جلواز)،[4] دەوڵەتیش خەڵکانێکی بەکاردەهێنا لەوانەی کە تازە دەهاتنە ئیسلامەوە وەکو سیابجە لەسەردەمی عوسمانو عەلی.[5]

## چاودێری لەسەر بازاڕەکان (الحسبة):

بازرگانیی چالاکی بەخۆیەوە بینی لە دوای دووبارە یەکخستنەوەی دوورگەی عەرەب لە خیلافەتی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) و زاڵبوونی بەسەر بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەدا، ئاسایشو تەبای بەرقەرار بوو، خەڵکیش دڵنیابوون لە سەر ماڵو سامانیان کە شەریعەتی ئیسلام دەیپارێزێ لە دەستدرێژیو زەوتکردن، هەروەها ئازادی بازرگانیو گەشەکردنی بۆ دەستەبەر دەکات.

ئینجا سەرانی هاوەڵان لە بازرگانی کاریان کردووە، هەرسێ خەلیفە راشیدە سەرەتاکانیش بازرگان بوون، بۆیە شارەزایان لە مامەڵە بازرگانی یەکان و کارە بازرگانی یەکانی ئاسان دەکردەوەو هاندەر بوو بۆ هێنانی شتومەك، هەروەها بەربەرەکانی دەبرییەوە بە هۆشیاریو پەیبردن بە بەرژەوەندی یە ئابوری یەکانی دەوڵەتو موسڵمانان.

---

١) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ٣: ١٠٤ ـ ١٠٥.

٢) خليفة: التاريخ ١٦٢.

٣) صالح العلي: التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة في القرن الاول الهجري ١١٢.

٤) وكيع: أخبار القضاة ٢: ٢١٥.

٥) صالح العلي: التنظيمات ١١٢.

لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ چاودێری بازاڕەکان سەری هەڵدا بۆ ڕێگەگرتن لە دروستبوونی تەڵەکەبازی لە کەلوپەلەکاندا،[1] بێگومان ئەو چاودێریە هەر بەردەوام بوو لە سەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، بەڵام فراوان بوونەوەی زۆر کە رووی لە بازرگانی و ڕێکوپێککردنی بازاڕەکان بووە هۆی پێویستی بە چاودێری گشتگیر لەسەر بازرگانیو بازاڕەکان. زۆرجاریش عومەر بە خۆی گەشتی دەکرد بەناو بازارەکانو دەیڕوانی یە شێوازەکانی مامەڵەو قەدەغەکردنی سەرپێچی شەرعی، ئیتر ئایا فێڵکردن بێت لە کەلوپەل، یان فرۆشتنی شمەکی قەدەغەکراو بێت، یان بە زیانگەیاندن بە بفرۆشەکانی تر بەوابەستە نەبوون بەو نرخەی دانراوە، یان بە شتومەك شاردنەوە بۆ گرانی یان بە دەڵاڵی کردن لە ڕێگە چوونە پێشوازیکردن لەبیابانشینەکانو کڕینی ئەو شتانەی پیانە پێش ئەوەی نرخی بازار بزانن، یان بە فرۆشتنی کەلوپەل بەر لەوەی بگاتە دەستی کڕیار..؟ ئەم کارانەش هەمووی جێبەجێکردنە بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا ئەوە سەلمێنراوە کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) سەیری ماڵی روەیشیدی سەقەفی کردووە، کە دوکانێکی فرۆشتنی مەی تیادا بووە، ئەویش فەرمانی کرد بە سوتاندنی،[2] سەمورەی کوڕی جونەیدیش جارێك مەی فرۆشت، تووڕەی و خەشمی دەربڕی بەرانبەری.[3]

جارێکیش بەتەنیشت حاتیبی کوڕی ئەبوبەلتەعەدا تێپەڕی کە مێوژی دەفرۆشت بە نرخێك لە خواری بازاڕەوە، جا پی فەرموو: یان نرخەکەی بەرزبکەرەوە، یان لەبازاڕمان دەربچۆ.[4]

هەروەها قەدەغەی کرد لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا زیو لەگەڵ ئاڵتوون بگۆڕێتەوە بەبێ پێدانو وەرگرتنی ڕاستەوخۆ، چونکە تەڵحە داوای لە خاوەن زیوەکە کردبوو مۆڵەتێکی کەمی بدات "تا ئەوکاتەی خەزندارەکەمان دەگەڕێتەوە لە دارستان"،[5] واتە دەوروبەری مەدینە.

١) صحيح سنن الترمذي للالباني ٢: ٣٣.

٢) ابن زنجوية: الاموال ٢: ٢٧١ـ ٢٧٢ والاثر صحيح.

٣) البخاري: الصحيح ٢: ٢٧، ومسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١١: ٧.

٤) مالك: موطأ ٢: ١٤٨، وعبدالرزاق: المصنف ٨: ٢٠٦ـ ٢٠٨، وعمر بن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٤٩ـ ٧٥٠، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٢٩ والاثر صحيح.

٥) البخاري: الصحيح (مع حاشية السندي) ٢: ٢٠ـ ٢١، ومسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١١: ١٢.

قۆرخکردنیشی قەدەغە کردبوو "کەسێك شمەك بکڕێ بۆ کاتی گران بوونی نرخ لە بازاڕی ئێمە مامەڵە نەکات"،[1] هەروەها مامەڵەشی قەدەغە دەکرد لەسەر کەسێك حوکمەکانی کڕینو فرۆشتن نەزانێت.[2]

دانانی کەسانێك بەناوی عەریفو نەقیب بۆ یارمەتیدان لە گەیاندنی خەڵات بۆ شایستەکان

موسڵمانان هەر لە کاتی بەیعەتی عەقەبەی دووەمەوە ئاشنا بوون بە سیستمی عورەفاو نوقەبا، ئەم سیستمەش جارێکی تر تازە بوویەوە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب، کاتێك کە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە جەنگی قادسیە سەربازەکانی بەو شێوە ڕێکدەخست "سەرکردەی سەربازیو عەریفی دادەنا، لەسەر هەموو دە کەس عەریفێکی دادەنا، خەڵکیشی دابەشکرد بۆ دەیان و سەدانو هەزاران، ئینجا لەسەر دەیان کەسانێکی دەکردە فەرماندە کە هۆکاریان هەبوو لە ئیسلام".[3]

عەریفەکان بەرپرس بوون لەسەر سەربازەکانیان لە بەرانبەر سەعد، ئەمجا ئەم سیستمە شارەکانی تری گرتەوە، تاکو گەیشتە ئەوەی کە عەریفەکان بەرپرس دەبوون لەسەر هۆزەکان بەرانبەر فەرمانڕەوا، واش دەردەکەوێت کە ئەم شێوازە هەندێ گۆڕانکاری بەسەردا هات پاش ماوەیەك لەساڵی (١٧ ك) جارێکی تر پۆلێنکردنی خەڵکی کرایەوە بەشێوەیەك کە ئافرەتان و مناڵانیش بگرێتەوە.

هۆزەکانیش کرانە حەوت حەوت لە جیاتی دە دە، لە هەموو حەوتێکدا کۆمەڵێك هۆز دەخرانە یەك،[4] شێوازی ڕێکخستنی نوێ گەیشتە بەصرەیش، بۆیە خەڵاتەکان دەدرانە دەستی سەرکردەی حەوتەکانو ئاڵا بەرزکەرەوەکان، کە عەرەب بوون، ئەوانیش دەیاندایە عەریفو نەقیبو

---

١) مالك: الموطأ ٢: ١٤٨، وعبدالرزاق: المصنف ٨: ٢٠٦، وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٤٨ـ ٧٤٩، ويعتضد بطرقه الى الحسن، ووردت روايات اخرى ضعيفة في نهيه عن الاحتكار (أحمد: المسند١: ٢١، وابن ماجة: السنن ٢: ٢١٥٥، والبيهقي: دلائل النبوة ٦: ٢٤٦ والازرقي: أخبار مكة ٢: ١٣٥، وابن ابي شبة: المصنف ٤: ٣٤٧، ٣٨٦).

٢) الترمذي: السنن ١: ٣٠٣ـ ٣٠٤، وعبدالرزاق: المصنف ٤: ٤٨٣ وابن أبي شبة المصنف ٥: ١٥ ويعتضد الأثر الى الحسن لغيره.

٣) الطبري: تأريخ ٤: ٤٩.

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤: ٤٨.

ئەمینەکان، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە دەیاندایە شایستەکانی لە نێوماڵەکانیان،[1] ئەم سیستمە بەردەوام بوو لە سەردەمی عوسمان و عەلی-ش،[2] شایانی باسە ئەم سیستمە یارمەتی فەرمانڕەوای دەدا بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵگاو سپاردنی داواکراوەکان بە دادگاو ئامادەکردنی جەنگاوەرەکان و شارەزا بوون لە بیروڕای خەڵکی و نوێنەرایەتی کردنیان بەرامبەر فەرمانڕەوا.

**فەرمانبەران لەسەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکر:**[3]

١ـ حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی ئوسەیدی (نوسەر).

٢ـ عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم (نووسەر).

٣ـ عەبدوڵڵای کوڕی خەلەفی خوزاعی (نووسەر).

٤ـ موعەیقیبی کوڕی ئەبو فاتیمەی دەوسی (نووسەر).

٥ـ ئەبوعوبەیدەی عامیری کوڕی جەڕاح (بیت المال).

٦ـ سەعدولقورەزی مەولای عەممای کوڕی یاسر (بانگدەر).

٧ـ زەیدی کوڕی سابیت (نووسەرو دابەشکاری میراتی).

٨ـ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (سەرکردەی حەج).

٩ـ ئەبو مەسلەمەی ئەنصاری (خارص..).

**بەرپرسانی زەکات:**[4]

١ـ ئەنەسی کوڕی مالیك (بەحرێن).

٢ـ سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (هەوازن).

٣ـ عەمری کوڕی عاص (قەزاعە).

٤ـ وەلیدی کوڕی عوقبە (قەزاعە).

٥ـ سەعدی کوڕی زربابی دەوسی (دەوس).

٦ـ عەدی کوڕی حاتیمی تائی (تەی).

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٤: ٤٩.

٢) أبوعبيد: الأموال ٣٤٥.

٣) خليفة: التاريخ ١٢٣، والطبري: التاريخ ٣: ٣٤٢، و٦: ١٧٩، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٦: ٩٦.

٤) عبدالعزيز المقبل: خلافة ابي بكر ٩٤ـ ٩٥.

٧- زەبورقانی کوڕی بەدری تەمیمی (ڕەبابی کوڕی عەوف و کوڕانی بەنی سەعد لە تەمیم).
٨- قەیسی کوڕی عاسیم (مەقاعسو عەشیرەتەکانی بەنی سەعد لە تەمیم).
٩- صەفوانی کوڕی صەفوان (بەنی عەمر لە تەمیم).
١٠- سەبرەی کوڕی عەمر (خەزەم لە بەنی عەمر لە تەمیم).
١١- سەعیدی کوڕی خەففافی تەمیمی (عەشیرەتەکانی تەمیم).
١٢- هەیسەمی سولەمی (بەنو سەلیم).

**فەرمانبەران لە خیلافەتی عومەر:**[1]

١- زەیدی کوڕی سابیت (نووسەر).
٢- موعەیقیب (نووسەر).
٣- عەبدوڵڵای کوڕی خەلەفی خوزاعی (نووسەری دیوانی بەصرە).
٤- ئەبو جوبەیرەی کوڕی زەححاکی ئەنصاری (نووسەری دیوانی کووفە).
٥- یەرفە (پاسەوان).
٦- یەسار (خەزنەدار).
٧- عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم (بیت المال).
٨- عەرفەجەی کوڕی هەرسەمە - یان عوتبەی کوڕی فەرقەد - (باجی بەصرە).
٩- ئەقرەع (بانگدەر).[2]
١٠- موسلیمی کوڕی موشکەم (نووسەری ئەبو دەردائی قازی دیمەشق).[3]
١١- سولەیمانی کوڕی ئەبو حەسەمەی قوڕەیشی عەدەوی (لێپرسراوی بازاڕی مەدینە).
١٢- عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودی هوزەلی (لێپرسراوی بازاڕی مەدینە).[4]
١٣- عەمری کوڕی عەبسە (لێپرسراوی گەنجینەکانی دانەوێڵەو خۆراك لە ئەهرا (شام)).[5]

---

١) خليفة: التاريخ ١٥٦، والطبري: التاريخ ٤: ٣٩، وابن عبدالبر: الاستعاب ٤: ٤١.

٢) أبوداود: السنن ٤: ٢١٤، رقم ٤٦٥٦، وابن أبي شيبة: المصنف ٢: ٣ والذهبي: تاريخ الاسلام (عهد الخلفاء الراشدين) ٤٧٥.

٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ٧: ٤٥.

٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٥: ٥٨، وابن عبدالبر: الاستعاب٢: ٦٥، ١٠٦، ٣٦٦. ابن حجر: الاصابة ٢: ١٠٦، ٣٤٠.

٥) الطبري: تاريخ ٤: ٦٧.

**فەرمانبەرانی خیلافەتی عوسمان:**[1]

١ـ زەکەریای کوڕی جەهمی کوڕی قەیس (لێپرسراوی پۆلیسی میسر).[2]

٢ـ خاریجەی کوڕی حوزافەی کوڕی غانیمی کوڕی عامیر (لێپرسراوی پۆلیسی میصر).[3]

٣ـ عەبدوڵڵای کوڕی قونفوز (لێپرسراوی "الشرط").

٤ـ حەمرانی کوڕی ئەبان (پاسەوان).

٥ـ عەبدوڵڵای کوری ئەرقەم (بيت المال).

٦ـ مەروانی کوڕی حەکەم (نووسەر).

٧ـ جابری کوڕی عەمری موزەنی (باجی رەشە خاك).

٨ـ سەمماکی ئەنصاری (باجی رەشەخاك).

٩ـ عوقبەی کوڕی عەمر (بيت المال).

١٠ـ چل کەس لە سیابجەکان (پاسەوانێتی (بيت المال)ی بەسرە).[4]

**فەرمانبەران لە خیلافەتی عەلی:**[5]

١ـ مەعقیلی کوڕی قەیسی ریاحی (الشرط)

٢ـ مالکی کوڕی خەبیبی یەربووعی (الشرط)

٣ـ ئیسبەغی کوڕی نوباتەی مەجاشعی (پۆلیسی پێنجشەممە).

٤ـ سەعیدی کوڕی نەمرانی هەمەدانی (نووسەر).

٥ـ عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبورافیع (نووسەر).

٦ـ قەمبەر ـ ئەبو یەزید ـ (پاسەوان).

٧ـ چل کەس لە سیابجە (پاسەوانێتی (بيت المال) لە بەصرە).[6]

---

١) خليفة: التاريخ ١٧٩، والطبري: التاريخ ٤: ٤٢٢.

٢) ابن حجر: تهذيب التهذيب ٣: ٧٤، والكندي: ولاة مصر ٣٣.

٣) الكندي: ولاة مصر ٣٣.

٤) صالح العلي : التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة ١١٢.

٥) خليفة: التاريخ ٢٠٠ـ ٢٠١.

٦) البلاذري: فتوح البلدان ٣٦٩.

# بەشی دووەم

# دادوەری

## دادوەری لە سەردەمی خیلافەتی راشیدە :

داوەر جێگاو کارێکی دیاری کراوی نەبوو لە سەردەمی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت)، بەڵکو زانایانی هاوەڵان هەڵدەسان بەو کارە، خەلیفەش خودی خۆی داوەری لە نێوان خەڵکیدا ئەنجام دەدا لە مەدینە، جارجاریش عومەری خەتتاب (رەزای خوای لێبێت) ئەو کارەی دەکرد بە فەرمانی ئەبوبەکر، فەرمانڕەوایانیش بەرپرسی داوەری بوون لە شارەکان.

بەڵام لە سەردەمی عومەرەوە هەندێ لە هاوەڵانی وەکو دادوەر دانا لە مەدینە، لەوانە: زەیدی کوڕی سابیتو ئەبودەردا،[١] هەروەها ژمارەیەکیشی لە داوەران دەستنیشان کرد بۆ شارەکان وەکو: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بۆ داوەریی کووفەو[٢] شورەیحی کوڕی حارسی کیندی لەسەر داوەریی کووفەو[٣] عوبەیدەتولسەلمانی لەسەر داوەریی کووفە.[٤] بەراستی ژیریی عومەر دەرکەوت لە هەڵبژاردنی ئەو دوو کەسە، چونکە ئەوان خزمەتێکی زۆری خەڵکیان کرد لە بواری داوەریی لە سەردەمی راشیدینو ئومەوی. هەروەها عومەر هەڵسا بە دانانی عوبادەی کوڕی صامت لەسەر داوەریی حیمصو قەنسەرین،[٥] بەم کردارەش عومەر (رەزای خوای لێبێت) دەسەڵاتی داوەریی دابڕی لە دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان ، بەم

شێوەیەش پلە و پایەی ئەو کارە بەهێز دەبوو، پەیوەندیشی راستەوخۆ بە خەلیفەوە بوو.[٦]

بەڵام هەندێك لە فەرمانڕەواکان هەر بە خۆیان هەڵدەسان بە ئەرکی داوەریی لەو ولایەتە ناوخۆیانەی کە جێگیر بوونو فەرمانڕەواکان کاتی پێویستیان بەدەستەوە بوو، بە پێچەوانەی ئەو ولایەتانەی کە

---

١) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٦٩٤، ووكيع: أخبار القضاة ١: ١٠٨.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ٢٦٩ .

٣) وكيع: أخبار القضاة ٢: ١٩٨ ـ ١٩٩.

٤) الذهبي: سير اعلام النبلاء ٤: ٤٠، وابن العماد: شذرات الذهب ١: ٧٨.

٥) البلاذري: فتوح البلدان ١٤٦.

٦) بیردۆزی سەربەخۆیی دەسەڵاتی داوەریی لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە نووسینەکانی مونتسکیو سەری هەڵدا کە رێخۆشکەر بوو بۆ شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩م.

هاوسنوور بوون لەگەڵ دوژمنان، لەو حاڵەتە فەرمانڕەواکان سەرقاڵی ئەرکە سەربازیو ئیداری یەکان دەبوون،[1] ئینجا عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئامۆژگاری فەرمانڕەواکانی دەکرد پیاوچاکان هەڵبژێرن بۆ داوەرییو مووچەی باشیان پێبدەن کە بەشیان بکات.[2]

عوسمانیش (ڕەزای خوای لێبێت) جاری وابوو داوەریی دادەمەزراند لەسەر هەرێمەکان وەکو دانانی کەعبی کوڕی سوور لەسەر داوەری بەصرە، جاری وایش هەبوو ئەو مەسەلەی بۆ فەرمانڕەواکە بەجێدەهێشت، بۆ نموونە داوای کرد لە فەرمانڕەوای بەصرە هەڵسی بە کاری دادوەریی وێڕای ئیشەکەی خۆی، ئەمەش لە پاش لابردنی بوو بۆ کەعبی کوڕی سوور، هەروەها یەعلای کوڕی ئومەیە فەرمانڕەواو داوەری صەنعا بوو.[3]

تێبینی دەکرێت هەندێك لە فەرمانڕەواکان داوەری شارەکانی خۆیانیان بەخۆیان هەڵدەبژارد، ئەوانیش بەرپرس بوون بەرانبەریان، ئەوەش ئاماژە بە فراوانی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایان دەکات لەسەردەمی عوسمان.

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بەخۆی هەڵدەسا بە ئەرکی داوەری لە کووفە، بەڵام سەبارەت بە شارەکان زۆر جاران داوەری لەرێگەی فەرمانڕەواکانەو بۆ دادەنرا،[4] بەڵام عەلی خۆی چەند داوەرێکی ڕاستەوخۆی دامەزراند.[5]

سەرچاوەکانی حوکمکردن لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە بریتی بوون لە قورئانو سوننەتو ئیجماعو کۆششو ڕا.

ئەوانەش کە دەناسران لەسەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە لە زانایانی هاوەڵانو ئەوانەی کە فتوادانیان لە ئەستۆ دەگرت بە زۆری، یان ناوەنجی، بریتیبوون لە ئەبوبەکری صددیقو عومەرو عوسمانو عەلیو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو عائیشەو موعازی کوڕی جەبەلو ئەبوموسای ئەشعەریو

---

١) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ٢: ٩٢.

٢) الذهبي: سير أعلام النبلاء ١: ٤٥٤ـ ٤٥٥، وابن قدامة: المغني ٩: ٣٧ والسمناني: روضة القضاة وطريق النجاة ٨٦.

٣) خليفة: التاريخ ١٧٩.

٤) عبدالعزيز ابراهيم العمري: الولاية على البلدان ٩٣ نقلاً عن عبدالله عثمان علي مقبل: قضاة أمير المؤمنين علي ص٢٩٠ (ماستەرنامەیە لە لقی (السياسة الشرعية بالمعهد العالي للقضاة)).

٥) خليفة بن خياط: التاريخ ٢٠٠.

ئەنەسی کوڕی مالیكو ئەبوهورەیرەو سەلمانی فارسیو ئەبو سەعیدی خودریو عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی عەباسو زەیدی کوڕی سابیت.[1]

## جێبەجێکردنی سنووره شەرعی یەكان:

داوەر لە سەردەمی خیلافەتی راشیدە لە هەموو جۆرە کێشەو ناکۆکی یەکان دادوەری دەکرد، لە هەر بوارێکدا بوایە، قەرەبووی دارای، کاروباری خێزان، سنوورەکانو تۆڵەی کوشتنەوە، هەر جۆرە دەمەقاڵەیەك، هیچ شتێکیش نەهاتووە دەربارەی ئەوەی کە لەم رۆژگارەدا بە تایبەتمەندی داوەری بناسرێت، ئەوە نەبێت کە کاتێك عومەر سائیبی کوڕی یەزیدی بە داوەر داناوە پی وتووە: "رُد عنی الناس فی الدرهم والدرهمین" خەڵکیم لە کۆڵ بکەرەوە لە درهەمو دوو درهەمدا.[2]

ئینجا دەکرێت خەلیفە مەسەلەیەکی دیاریکراو بسپێرێ بە داوەرێكو بە تەواوبوونی کاری تەواو بێت،[3] داوەرەکان حوکمیان دەکرد لە مافەکانی شارستانیو باری کەسێتی، بەڵام سەبارەت بە تۆڵەو سنوورەکان ئەوە تایبەت بوو بە خەلیفەو فەرمانڕەوای شارەکان، حوکم نەدەدرا بەبێ رەزامەندی ئەوان،[4] دواتریش جێبەجێکردنی تۆڵەی کوشتنەوە تەنها تایبەت کرا بە خەلیفەوە، فەرمانڕەواکانیش مافی سەلماندنیان هەبوو لەسەر بڕیارەکانی تۆڵەو سزای جێبەجێکردنی کوشتن.[5]

داوەریی جێگایەکی تایبەتی نەبوو، بەڵکو داوەر بڕیاری دەدا لە ماڵو مزگەوتدا، زیاتریش لە مزگەوت دادەنیشتن بۆ ئەو مەبەستە.[6]

بڕیارەکانیش تۆمارنەدەکران لەبەر کەمیو ئاسانی پاراستنی،[7] داوەریش دەسەڵاتی زیندانیکردنی تۆمەتباری هەبوو بۆ سەرزەنشتو ماف لێوەرگرتنەوە، عومەرو عوسمانو عەلی ئەو کارەیان

---

١) ابن القيم: أعلام الموقعين ١: ١٢ـ ١٣.

٢) ابن عبدالبر: الاستعاب ٢: ١٠٦، وابن حجر: الاصابة ٢ـ ١٣، ومناع القطان: النظام القضائي في العهد النبوي وعهد الخلفاء الراشيدين ١: ٣٩٥ ـ ضمن وقائع ندوة النظم الاسلامية ـ (أبوظبي ١٨ ـ ٢٠ صفر ١٤٠٥ هـ، ١١ـ ١٣ نوفمبر ١٩٨٤م).

٣) مناع القطان: النظام القضائي في العهد النبوي وعهد الخلافة الراشدة ١: ٣٩٦.

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١: ٣٩٦.

٥) محمد حميد الله: الوثائق السياسة ٥٢١.

٦) مناع القطان: النظام القضائي ١: ٣٩٩.

٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١: ٤٠٩.

ئەنجامداوە،[1] بۆیە دەوڵەتیش بەندیخانەی دروستدەکرد لە مەڵبەندی شارەکان، تۆڵەی کوشتنەوەش لە دەرەوەی مزگەوتەکان جێبەجێ دەکرا.[2]

## کەمی دوژمنایەتی و ناکۆکی لە نێو خەڵکیدا:

خەڵکی لە ئاستێکی بەرزدا بوون لە هۆشیاری ئیسلامی، مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر بە پیاوەتیو جوامێری دەکرد بۆیە ناکۆکیان کەم بوو، ئەمەیش باری داوەرەکانی سووك دەکرد.

کاتێك ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە ئەبوعوبەیدە پی وت: "(بيت المال) لەسەر من، عومەریش وتی: داوەری لەسەر من، ئیدی لە ماوەی دووساڵدا دوو کەس نەهاتە لای.[3]

شەقیقی کوڕی مەسلەمە دەڵێت: "سەردانی سەلمانی کوڕی رەبیعەم دەکرد کاتێك بوو بە داوەری کووفە، لە چل رۆژدا کەسێکم نەبینی بێتە لای".[4] سەلمانی کوڕی رەبیعەش یەکەم کەس بوو کە داوای داوەری کرد لە کووفە.[5]

ئینجا دەوڵەت هانی خەڵکی نەدەدا بۆ دانپێدان بە هەڵەو تاوانەکانیان، بەڵکو دەیویست دایانپۆشێو تەوبە بکەن لە نێوان خۆیانو خوادا، شورەحبیلی کوڕی سەمتی کیندیش لە وتارەکەیدا ـ کە ئەو کاتە بەرپرسی چەکدارانی لای مەدائین بوو ـ[6] وتی: خەڵکینە، ئێوە لە خاکێکدان مەی خواردنی تیادا بڵاوە، ئافرەتیشی تیادا زۆرە، ئەگەر کەسێکتان سنوورێکی خوای شکاند با بێتە لامان داری حەددی لێبدەین، چونکە ئەوە پاکبونەوەیەتی، ئەم قسە گەیشتە عومەرو نامەیەکی نارد: رێگات نادەم فەرمان بە خەڵکی بکەیت ئەو پۆشاکە ئەتك بکەن کە پی پۆشیوون".[7] بەڵام ئەگەر کێشەکان بگەشتنایەتە داوەری دەوڵەت سزاکانی جێبەجێدەکرد بەبێ چاوپۆشی.

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١: ٤١٠، والشوكاني: نيل الاوطار ٧: ١٥٩ـ ١٦٠.

٢) ابن حجر: فتح الباري ١٦: ٢٥٠.

٣) الطبري: تاريخ ٣: ٤٢٦.

٤) ابن عبدالبر: الاستعاب ٢: ٦٢ وابن الاثير: أسد الغابة ٢: ٣٢٧.

٥) ابن حجر: الاصابة ٢: ٦١.

٦) جەنگاوەرگەلێك بوون چاودێری دوژمنیان دەکرد لەو سنووەری کە تیایدا جێگیر بوون، نەکو لە پڕ هێرش بکەن، ئەرکی رووبەڕووبوونەوەشیان لە ئەستۆ دەگرت لە جیاتی ئەو دوای موسڵمانان.

٧) عبدالرزاق: المصنف ٥: ١٩٧ـ ١٩٨، والمتقي الهندي ٥: ٥٦٩ـ ٥٧٠ واللفظ له. وناصر بن عقيل الطريفي: القضاء فی خلافة عمر بن الخطاب ٢: ٨٦٢. هەروەها بڕوانە هەندێ بڕیاری داوەرەکان کە پشتگیری لە ئەم بۆچوونە دەکەن: (ابن أبي شيبة : المصنف ١٠: ١٥، وعبدالرزاق: المصنف ٧: ٣٧٠ـ ٣٧١).

سەبارەت بە داپۆشینی تاوانەکان، دەگێڕنەوە کە ئافرەتێك بوو داوێن پیسی کردبوو، مامی هاتە لای عومەری کوڕی خەتتاب لە مەدینە، عومەر پیوت: "ئەگەر تاوانەکەت باسکردایە سزام دەدای، ئەگەر پیاوێکی چاك هاتە خوازبێنی لی مارە بکە".[1]
جارێکی تریش لە حاڵەتێکی هاوشێوە دا فەرمووی: "بیدە بە شوو وەکو هەر کچێکی داوێنپاکی موسڵمان".[2]

## خەلیفەکان خۆیان ملکەچی بڕیارەکانی داوەری دەکرد:

خەلیفە راشیدەکان یەکسان بوون لەگەڵ خەڵکیدا لە مەسەلەی بەجێهێنانی داوەری، بەڵکو پلەوپایەی داوەرەکانیان بەهێزو رێزدار دەکرد کاتێك داوایان لێدەکردن بەهەموو شێوەیەك پەیڕەوی بکەن لە دادەری‌و یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا چی فەرمانڕەوا بن یان فەرمانپێکراو. سەرکردەی ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت) ناکۆکی یەکی بوو لەگەڵ هاوەڵی مەزن ئوبەی کوڕی کەعب لەسەر خاوەندارێتی باخێك، بۆیە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو مەسەلەیە چوونە لای زەیدی کوڕی سابیت لە ماڵەکەیدا، کاتێك کە چوونە ژوورێ عومەر پی وت: هاتووینەتە لات داوەری لە نێوانماندا بکەیت، زەید خۆی لاداو سەرووی ژوورەکەی بۆ چۆڵ کردو وتی: ئا لێرە دانیشە ئەی سەرکردەی بڕواداران، عومەر فەرمووی: ئەی زەید لە یەکەم داوەریتدا ستەمت کرد، بەڵکو لەگەڵ ئوبەی دامنیشێنە، ئوبەی داوای کردو عومەر نکوڵی کرد، زەید وتی: ئەی ئوبەی با ئەمیرولموئمنین سوێند نەخوات، سوێند بە خوا ئەم داوام لەبەر هیچ کەسێکی تر نەدەکرد، ئەمجا عومەر سوێندی خوارد، دوایش جارێکی تر سوێندی خواردو فەرمووی: زەید بە پلەی داوەری ناگات تا عومەر و هەرکەسێکی تری بەلاوە یەکسان نەبێت".[3]
جارێکیش عومەر مامەڵەی ئەسپێکی کرد بیکڕێت، ئەمجا سواری بوو بۆ تاقیکردنەوەی‌و لەو کاتەدا ئەسپەکە شتێکی بەسەردا هات، پی وت بگرە ئەسپەکەت، کابرایش رازی نەبوو، بۆیە چوونە لای شورەیح، جا شورەیح بە عومەری وت: ئەی سەرگەورەی ئیمانداران یان ئەسپەکە ببە، یان چۆن پی داوی وا بیگەڕێنەوە. عومەر فەرموی: داوەری وا دەبێت. دواتر شورەیحی نارد بۆ

---

١) الشافعي: الأم ٥: ١٣٢، والطبري: تفسير ٦: ٦٧.
٢) ابن قدامة المقدسيي: المغني ٧: ٣٦٨، ٤٣٣.
٣) وكيع: اخبار القضاة ١: ١٠٨ـ ١٠٩، والبيهقي: السنن ١٠: ١٣٦، ١٤٤، ١٤٥.

کووفە وەکو داوەرێك.[1] بەردەوامیش نامەی دەنارد کە تیایدا ئاڕاستەی دادوەری و ڕێگەکانی دەکرد.[2]

تاوانو سزاکان:[3]

١ـ ساختەکردنی مۆری (بيت المال) لە کووفە لە لایەن مەعنی کوڕی زائید، لە سەردەمی عومەر، سزاکەی: سەد قامچی.[4]

٢ـ پیاوێك دزی کردبوو لە (بيت المال) لە کووفە لە سەردەمی خیلافەتی عومەر.

سزاکەی: لێدانی بە قامچی لەگەڵ جێبەجی نەکردنی سزای دەستبڕین، چونکە بەشی هەیە لە (بيت المال).[5]

٣ـ دزینی چەند خزمەتکارێکی حاتیب بۆ وشترێك و خواردنی گۆشتەکەی (لە خیلافەتی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێنەکردنی سزای دەستبڕین لەسەریان لەبەر ناچاریو هەڕەشەکردن لە خاوەنەکەیان کە برسیان نەکاتو بژاردنی دوو بەرانبەر، نرخی وشترەکەیش (٨٠٠ درهەم).[6]

٤ـ ئافرەتێکی شێت زینای کرد (لە سەردەمی عومەر).

سزاکەی: بە هۆی شێتی سزای لەسەر جێبەجێنەکرا.[7]

٥ـ یەکیك لە (أهل الذمة) بە تۆپزی زینای کرد لەگەڵ ئافرەتێکی موسڵمان (لەسەردەمی عومەر).

---

١) إبن سعد: الطبقات الكبرى ٦: ١٣٢، ووكيع: أخبار القضاة ٢: ١٨٩.

٢) وكيع: أخبار القضاة ٢: ١٨٩، ١٩٢.

٣) ئەم لیستە ئامادەکراوە بە پشتبەستن بە دوو سەرچاوە:

١ـ صبحي محمد حصاني: تراث الخلفاء الراشدين في الفقه والقضاء، نشر دار العلم للملايين.

٢ـ ناصر بن عقيل الطريفي: القضاء في عهد عمر بن الخطاب "مجلدان" نشر دار المدني، جدة.

٤) مسلم: الصحيح (بشرح النووي) ٥: ١٢٦، و١١: ٢٢١ـ ٢٢٢، وأبوداود السنن ٤: حديث رقم ٤٤٩١، والعيني: عمدة القارئ ٢٤: ٢٣.

٥) الشافعي: الام ٧: ٢١٦، ٣٣١، وابن قدامة: المغني ١٠: ٢١٦، ٢٧٦ـ ٢٨٧، وابن حزم: المحلى ١١رقم ٢٢٦٤، والسرخسي: المبسوط ٩: ٥٣ و ١٦: ١٥٣.

٦) مالك: الموطأ (بشرح السيوطي ٢: ١٢٤)، وابن القيم: أعلام الموقعين ٣: ٧ـ ٨، ٢٩ـ ٣٣، والشافعي: الأم ٧: ٢١٥، وابن قدامة: المغني ١٠: ٢٧٣ـ ٢٨٩، وابن حزم: المحلى ١١: ٣٤٣ رقم ٢٢٧٧، والسرخسي: المبسوط ٩: ٥٣ء ١٦: ١٥٣.

٧) ابن حجر: فتح الباري ٩: ٣٤٤ و ١٢: ٤٠٧، والعيني: عمدة القارئ ٢٠: ٢٥١ـ ٢٣: ٢٩٢، واحمد: المسند ١: ١٥٤ـ ١٥٥، والشافعي: الأم ٧: ١٦٨، وابن قدامة: المغني ١٠: ١١٩، ١٦٩.

سزاکەی: لە خاچدان، چونکە سەرپێچی مەرجەکانی کردووە.[1]

٦ـ زۆرلێکردنی چەند ئافرەتێك بۆ داوێنپیسی (لە خیلافەتی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێنەکردنی سزای زینا لەسەریان بە هۆی زۆرلێکردنەوە.[2]

٧ـ چەند کەسێك داوێنپیسی یان ئەنجامدابوو بێ ئەوەی بزانن کە حەرامە (لە خیلافەتی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێنەکردنی حەددی زینا لەسەر هەموو کەسێك کە نازانێ حەرامە.[3]

٨ـ ئافرەتێك شوو دەکات لە ماوەی عیددەکەیدا، بەڵام نە خۆی و نەپیاوەکەشی نازانن کە ئەوە حەرامە ( لە خیلافەتی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێنەکردنی سزا لەسەر ئافرەتەکە و قامچی لێدانی پیاوەکە وەکو تەعزیر لەگەڵ جیاکردنەوەشیان.[4]

٩ـ شووکردنی ئافرەتێکی مێرددار بێ ئەوەی باسی مێردەکەی بکات (لە سەردەمی عومەر).

سزاکەی: بەردبارانکردنی ژنەکە (رجم)و لێدانی سەد قامچی لە پیاوەکە، بەردەباران نەکرا، چونکە نەیزانیوە.[5]

١٠ـ ژنێکی ئەعجەمی زینای کردو بە حەرامی ئەو کردارەی نەزانی.

سزاکەی: لابردنی سزاکە لەسەری.[6]

١١ـ شایەتیدانی سێ کەس لەسەر موغیرە بە زیناکردنو کشانەوەی شایەتی چوارەم (لە خیلافەتی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێکردنی سزای بوختان لەسەر سێ شایەتەکە[7]، هەشتا قامچی، (بوختان تۆمەتبارکردنی کەسێك دەگرێتەوە بە زینا یان نکوڵی کردن لە رەچەڵەکی مێردەکەی بە بوختان ،

---

١) ابن قدامة: المغني ١٠: ٦٠٩، ٦٣٤، والسرخسي ٩: ٥٧.

٢) وكيع: اخبار القضاة ١: ١٠١ـ ١٠٢، وابن رشد: بداية المجتهد ٢ـ ٣٦٥، وابن قدامة: المغني ١٠: ١٥٩ـ ١٨٥.

٣) الشافعي: الأم ٧: ٣١٥، وابن حزم: المحلى ١١: رقم ٢١٩٤، ٢٢٠٦، والسرخسي: المبسوط ٩: ٥٣، وابن قدامة: المغني ١٠: ١٢٠، ١٥٤ـ ١٥٦، ١٨٤، والقرطبي: تفسير ١٢: ١٠٧، وابن حجر: فتح الباري ٤: ٣٨٤، والشوكاني: نيل الأوطار ٧: ٨٨.

٤) سەرچاوەکانی پێشوو.

٥) سەرچاوەکانی پێشوو.

٦) سەرچاوەکانی پێشوو.

٧) مسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١١: ١٩٥، والشيرازي: المهذب ٢: ٣٤٢، والسرخسي: المبسوط ٩: ٣٨، ٩٣.

جۆرەکانی تری جنێو ناگرێتەوە)[1].

١٢ـ ژنێك مێردەکەی خۆی تۆمەتبارکرد بە زیناکردن لەگەڵ کەنیزەکەکەی دواتر دانی بەوەدا نا کە پی بەخشیوە (لە سەردەمی عومەر).

سزاکەی: جێبەجێکردنی سزای بوختان لەسەر ژنەکە ـ هەشتا قامچی ـ[2]

١٣ـ چەند کۆیلەیەك زینایان کردبوو ـ لە کۆیلەکانی فەرمانڕەوایەتی ـ.

سزاکەی: پەنجا قامچی.[3]

١٤ـ پیاوێك مەی خواردبوو لە ڕەمەزان (لە سەردەمی عەلی).

سزاکەی: هەشتا قامچی لەگەڵ بیست قامچی تر وەکو تەعزیر لەبەر حورمەتی ڕەمەزان.[4]

١٥ـ هەندێ هاوەڵ مەیان خواردبوو (زیرار ئەبوجەندەل) بە (تأویل) کردن (لەسەردەمی عومەر).

سزاکەی: هەشتا قامچی (وێڕای داواکردنی تۆبەکردنیانو دانپێدنانیان کە مەی خواردن حەڕامە ئەگەر نا دەکوژرێن ئەگەر بڵێن مەی خواردن حەڵاڵە).[5]

١٦ـ کەسێك لە ئیسلام پاشگەزبووبایەتەوە (لە سەردەمی هەر چوار خەلیفەکە).

سزاکەی: سێ جار داوای گەڕانەوەی لێدەکرا بە پێچەوانەوە دەکوژرا.[6]

١٧ـ ئومولقەرەفە لە ئیسلام پاشگەزبوویەوەو کوڕەکانیشی دژ بە موسڵمانان هان دەدا (لە خیلافەتی ئەبوبەکر).

سزاکەی: سزا درا بە کوشتن.[7]

١٨ـ پاشگەزبوونەوەی بەنی حەنیفە (لە خیلافەتی ئەبوبەکر).

---

١) صبحي محمصاني: تراث الخلفاء الراشدين في الفقه والقضاء ٢٣٥.

٢) الشافعي: الأم ٧: ١٦٩، وابن حزم: المحلى ١١: ٢٢٣٩، وابن قدامة المقدسي: المغني ١٠: ٢٠٨ـ ٢١٥.

٣) الموطأ: ٢: ٨٢٧.

٤) القرطبي: تفسير ١٢: ١٦٥، والسرخسي: المبسوط ٢٤: ٣٣.

٥) القرطبي: تفسير ٦: ٢٩٩، والطبري: تاريخ ٤: ٢٢٢.

٦) مالك: الموطأ (بشرح السيوطي) ٢: ١١٧، وابن حزم: المحلى ١١: رقم ٢١٧٠، ٢١٩٥، والشيرازي: المهذب ٢: ٢٣٨، والسرخسي: المبسوط ١٠: ٩٩، وابن رشد: بداية المجتهد ٢: ٣٨٠، وابن قدامة: المغني ١٠: ٧٢ـ ٨٠، ١٠٠.

٧) مسلم، الصحيح (بشرح النووي) ١٢: ٢٠٩، والشافعي: الأم ٦: ١٠٦، وابن قدامة: المغني ١٠: ٧٤، ٧٨، ١٠١، وابن حجر: فتح الباري ١٢: ٢٣٦، والعيني: عمدة القاري ٢٤: ٨٠، والسرخسي: المبسوط ١٠: ١٠٩ـ ١١١.

هەموو لادێ یەك کە دەستی موسڵمانان کەوتووە دەستنیشان نەکراوە،[1] ئەوا غەزای (القریة والعرض) لە خێڵی بەنو حەنیفە ـ پێش ئەنجامدانی صوڵحەکە ـ کۆیلەیەکی زۆری تیا بەدەستهات، چونکە خالیدی کوڕی وەلید پێنج سەدی لەوانە نارد بۆ مەدینە،[2] شتێکی سەیریش نی یە ئەو هەموو دەسکەوتە لە یەمامە بە دەست بێت، چونکە مەڵبەندێکی بازرگانی و ئابووری گرنگە لە رووی کشتوکاڵ، جگە لەوەی کە چڕی دانیشتوانەکەی تیایە بەرێژەیەکی بەرز.[3]

بەڵام عەلائی حەزرەمی ئاشتیی کرد لەگەڵ خەڵکی بەحرێندا لەسەر سێ یەکی ماڵەکانیان لەناو شارەکانیان، بەڵام ئەوانەی لە دەرەوەی شارەکە بوون دەستی بەسەر هەموویدا گرت، ماڵێکی زۆریشی بۆ مەدینە نارد،[4] بەشی یەك سوار لە دورگەی دارین گەیشتە شەش هەزار درهەم و بەشی پیادەش گەیشتە دوو هەزار درهەم.[5] ئەو ماڵانەش لە پاشگەزبووەکان دەستی موسڵمانان کەوت لە عومان (دەبا) گەیشتە (٤٠٠٠) سەر لە وشتر کە بەشی دەوڵەت (٨٠٠) سەر بوو، نرخەکەشی نزیکەی (٢٠٠٠٠٠) درهەم[6] دەبوو، جگە لە وشتریش (٣٥٠٠) دیلو ئافرەتو منداڵیان کەوتە ژێر دەست بەشی دەوڵەت لەوانە (٧٠٠) بوو (٣٠٠ دیلو ٤٠٠ لە ژنانو منداڵان) لە حاڵەتێکدا گریمان دابەشکردنی ئەوانە بە ڕێژەی چوار لە پێنج بێت بۆ جەنگاوەرەکان.[7] ئەم ژمارە زۆرەی دیلو ژن و

---

١) الطبري: تاريخ ٣: ٢٩٨ عن طريق سيف و٣: ٢٩٧ـ ٢٩٨ لە ڕێگەی ئیبنوئیسحاق، بەڵام دەڵێت: دەستبەسەراگرتنەکە تەنها بۆ چواریەکی کۆیلەکان بووە، خليفه: تاريخ ١١٠، والبلاذري: فتوح البلدان ١٢٣، بەڵام دەڵێت: چواریەکی کۆیلەکان و نیوەی ئاڵتوونو زیوەکان بووە، وابن اعثم: الفتوح ١: ٤٠ باس لە سێیەکی ئەسپو چواریەکی کۆیلە دەکات.

٢) ابن أعثم: الفتوح ١: ١٥ـ ١٦.

٣) چل هەزار جەنگاوەریان پڕ چەك کردبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان بەسەرکردایەتی موسەیلەمە.

٤) الكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٢٠١.

٥) الطبري: تاريخ ٣: ٣١١ عن سيف.

٦) ئەم وادانانە ئەوە ئەسەپێنێ کە نرخی یەك وشتر پەنجا درهەم بووە، ئینجا ئەگەر دوو ریوایەتی لاواز هەیە وەربیگرین، نرخی شەش وشتری تازەپێگەیشتوو بەرانبەر (٤٠٠) درهەم بووە لە خیلافەتی عومەر، چونکە یەك وشتری تازەپێگەیشتوو یەکسان بوو بە (٦٦) درهەم، لەگەڵ زانیاری ئەوەی کە نرخی وشتر بەرزبوویەوە لەسەردەمی عومەر زیاتر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و خیلافەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت). (عبدالرزاق: المصنف ٧: ٢٧٨، ٢٧٩، وأبوعبيد: الاموال ١٤٧، ١٤٨، وابن زنجويه: الموال ١: ٣٥٠، ٣٥١، والبيهقي: السنن ٩: ٧٤، والخبران باسنادين ضعيفين).

٧) دەربارەی دابەشکردنی کۆیلەکان پاش تەواوبوونی شەڕ لە نێوان جەنگاوەرەکان بڕوانە: عبدالرزاق: المصنف ٥: ١٩٤، والدارقطني: السنن ٤: ١١٤، والبيهقي: السنن ٩: ١١٢، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٥٠٦، وسعيد بن منصور: السنن ٢: ٢٨٨.

منالێش مەزندە دەکرێت بە (١,٤٠٠,٠٠٠) درهەم کە (٢٨٠,٠٠٠)ی بەر دەوڵەت دەکەوێت. ئەمە ئەگەر ئەو بۆچوونەمان وەرگرت کە رزگارانەی دیل دەگاتە (٤٠٠) دەرهەم، وەکو چۆن لە رزگارکردنی دیلەکانی نەیجەر روویدا لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکر[١]، ژمارەی کۆیلەکانی نەیجەر هەزار ئافرەت لە ماڵی رەملەی کچی حارسدا بوون، رزگارانەکەیان دەکاتە (٤٠٠٠٠٠) درهەم، ئەمانە جگە لە ماڵی زیندە.[٢]

هەروەها موسڵمانان لە شەڕی موهرە دژ بە پاشگەزبووەکان (٢٠٠)[٣] وشتری جۆری نەجیبەیان دەستکەوت، کە نرخیان دەگاتە (٢٠٠٠٠٠) درهەم لە حاڵەتێکدا کە نرخی نەجیبەمان بە (١٠٠)[٤] درهەم ژمارد، لە کاتێکدا کە وشتری ئاسای هەر بە (٥٠) درهەمە.

بە هۆی دارای دەوڵەتیش بۆ وشترو ئەسپو ماینو مەڕو ماڵات لە رێگەی زەکاتو دەستکەوتەکانەوە، پێویستی دروستبوو بۆ تایبەتکردنی لەوەڕگە بۆیان، بۆیە لەوەڕگەی (نقیع الخضمات)ی نزیك مەدینە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)[٥] تایبەت کرا بۆ ئەسپو ماین، ئەم کارەیش درێژەی بوو لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لێبێت)،[٦] بە هەمان شێوە لەوەڕگەی رەبەزە تەرخانکرا بۆ وشترەکانی زەکات.[٧]

ئەم ماڵانەش بە هیچ ناژمێردرێن بەرانبەر دەستکەوتەکانی فتوحات لە دەڤەری (الهلال الخصیب) و میصر، ئەمەو سەرچاوەکان ئاماژە ناکەن بە چەندێتی دەستکەوتەکان لە فەتحی عێراقو شام، تەنها باس لەوە دەکەن چەكو ولاغو کەلوپەلو ئافرەتو منالٚ کەوتوونەتە دەستی سوپای ئیسلامی،[٨] بەلاّم

---

١) البلاذري: فتوح البلدان ١٤٥، والكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٢٤٠.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٣١٧ عن سيف، والبلاذري: فتوح البلدان ١٤٥، والكلاعي : الاكتفا ٢٤٠.

٣) الطبري: تاريخ ٣: ٣١٧ عن سيف.

٤) وشترێكی خوراسانی عومەر بە (٣٠٠) درهەم دانرا (احمد: المسند ٢: ١٤٥).

٥) أحمد: المسند ٢: ٩١، ١٥٥، ١٥٧، باسناد صحيح، وابوعبيد: الاموال ٣٠٩، وابوداود : السنن ٣: ٤٦١ـ ٤٦٢ بسند حسن.

٦) ابن سعد: الطبقات ٥: ١١ عن الواقدي.

٧) الطبري: تاريخ ٣: ١٤٨ عن سيف.

٨) خليفة: التاريخ ١١٧، ١١٨، ١١٩، والطبري: تاريخ ٣: ٣٥١ عن سيف، ٣٥٤، ٣٨٢، عن سيف، ٤٠٧، ٤١٠، عن سيف، وابو يوسف: الخراج ٤٢، ١٤٦، ١٤٧، عن ابن اسحق والازدي: فتوح الشام: ٤٠، ٧٦، ٧٧، ٨٢، والبلاذري: فتوح البلدان ١٥٢، ١٥٤.

بەشی سواریان لەشەڕی (ذات السلاسل والثني) بە دوو هەزار درهەم و پیادە بەسێ یەکی ئەو بڕە دەستنیشان کردووە، هەروەها ئاماژەیان کردووە بۆ دەوڵەمەندی ئەبوللە بەرادەیەك سەگەکانیان لە کاسەی ئاڵتوونو زیو خواردنیان پێدراوە.[1] لە لایەکی تریشەوە بەشی سواریان لە شەڕی ئەمغیشیا بە هەزارو پێنج سەد درهەم مەزەندە کردووە، جگە لە خەڵات بۆ نەبەردەکان.[2]

ئینجا ئەبویوسف بڕی دەستکەوتەکانی فتوحاتی عێراق لەسەردەمی سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید کورتدەکاتەوەو بە هەزار یان پێنج هەزار سەر،[3] بێگومان هەموو جەنگەکانیش لە هەندێ شارو لادی بچووك روو دەدا لەسەر فورات، هیچ کاتێکیش فتوحات ئەنجام نەدەدرا بێ ئەوەی ئەو ناوچانە چەندین جار نەوەستن دژ بە سوپای ئیسلامیی، ئەمەیش کەمی دەستکەوتەکان روون دەکاتەوە لە ناوچە فەتحکراوەکان لەسەردەمی خیلافەتی صدیق دا (رەزای خوای لێبێت).

بەڵام سەبارەت بە خیلافەتی عومەر (رەزای خوای لێبێت)، دەستکەوتەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیان کرد، بەهۆی فراوانبوونی ناوچە فەتحکراوەکان و ئەو گەشە کردنە ئابووری یەی کە بە خۆیانەوە دەیانبینی، سەرکردەکانی فارسو رووم بە ئەوپەڕی جوانی یەوە دەهاتنە مەیدانی شەڕ، ئیتر هەرچی دەستکەوتەکانیان هەیە دەکەوتە دەستی موسڵمانان، جاری وابوو دەگەشتە (١٥٠٠٠)[4] درهەم یان (٣٠٠٠٠) درهەم[5].

ئینجا شارە گەورەکان فەتحکراو وەکو مەدائینو جەلەولاو هەمەدانو رەی و ئیستەخرو شوێنانی تر، لە رێگەشیانەوە موسڵمانان دەستکەوتی مەزنیان دەستکەوت، وەکو مافووری کیسرا، کە (٣٦٠٠) باڵی چوارگۆشە بوو، رووبەرەکەی یەکپارچە لە ئاڵتوونو بەردی زیو رازابوویەوە و وێنەی بەروبوومی لەسەر کرابوو بە گەوهەر و گەڵاکانی بە ئاوریشم، هەروەها ئاوی رێکردووی بەسەر کرابوو بە

١) خلیفة: التاریخ ١١٧.

٢) الطبري: تاریخ ٣: ٣٥٨ ـ ٣٥٩.

٣) الخراج ١٤٧.

٤) کەوتە دەستی ئەبوقەتادەی ئەنصاری (ابن زنجویة: الاموال ٢: ٦٨٩، ٦٩٠ بسند ضعیف).

٥) دەستی بەرائی کوڕی مالیك کەوت لە میرزەبانی زارە کە کوشتی لە بەحرێن (عبدالرزاق: المصنف ٥: ٢٣٣و سعید بن منصور: السنن ٢: ٢٦٣، وابن ابي شیبة: المصنف ٦: ٤٧٩، وابن زنجویه: الاموال ٢: ٦٨٩، والبیهقي: السنن ٦: ٣١٠ـ ٣١١ والخبر صحیح).

ئالتوون، پارچەیەکی بچووکی لێفرۆشرا بە بیست هەزار درهەم (٢٠٠٠٠).[١] بە هەمان شێوە لە شەڕی جەلەولاو نەهاوەند[٢] موسڵمانان ئاڵتوون و زیو و گەوهەری زۆریان دەستکەوت، چونکە پێنج یەکی جەلەولا گەیشتە شەش ملیۆن درهەم،[٣] گەورەترین دەستکەوتەکانیش لە ناوچەی سەواد بوو کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) تەرخانی کرد بۆ دەوڵەت، هەروەها زەوی یەکانی صەوافی کە خاوەنەکانیان کوژران، یان هەڵهاتن و موڵکەکانی کیسراو خێزانەکەی، بەرهەمی ئەوانە هەمووی بۆ دەوڵەت تەرخانکرا، دەشگێڕنەوە کە داهاتەکانیان ـ دواتر ـ گەیشتە حەوت ملیۆن درهەم.[٤]

بەڵام بە داخەوە سەرچاوەکان ئەوەندە ژمارە ناگێڕنەوە لە دەستکەوتەکانی فەتح کە دەرامەتی دەوڵەت و جەنگاوەرەکان بخەمڵێنرێت، تەنها ئەوەندە دەزانرێت کە یەکجار زۆر بووەو بووەتە مایەی دەوڵەمەندیی خەڵکیی و دەوڵەتیش، ئاستی گوزەرانیش بەرزبوویەوە و شوێنەوارەکانی بە چاکی لەسەردەمی خیلافەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) دەرکەوتن، فتوحاتیش لە نیوەی یەکەمی سەردەمی عوسماندا فراوانبوویەوە بەرەو خۆراسان لە ڕۆژهەڵات و ئەفریقا (تونس) لە خۆرئاوا،[٥] بەشی جەنگاوەر لە تونس گەیشتە هەزار دینار[٦] و سێ هەزار دینار،[٧] پێنج یەکی دەستکەوتەکانی ئەفریقاش گەیشتە پانزە هەزار درهەم لەو کاتەی مەڕوانی کوڕی حەکەم غەزای کرد،[٨] بەمشێوەیەش دەستکەوتی ئەو غەزا گەیشتە (٧٥٠٠) درهەم بۆ دەوڵەت و کۆی دەستکەوتەکانیش گەیشتنە (٣٧٥٠٠٠) درهەم.

---

١) الطبري: تاريخ ٢: ٤٦٧ عن سيف.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٦٧ بسند حسن (ط. بيروت) وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٨٠ـ ٥٨٢، والبلاذري: فتوح البلدان ٣٠٢ والطبري: تاريخ ٢: ٥١٨ ـ ٥٢٠ بسند ضعيف.

٣) ابن ابي شيبة: المصنف ١٢: ٣١٨، وابوعبيد: الاموال ٢٢٤ وفي السند مجالد ليس بالقوي ثم هو مرسل الشعبي.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٧٣، وابن زنجويه: الموال ٢: ٦٣١، وابن حجر: المطالب العالية ٢: ١٨٢ نقلاً عن الحارث بن ابي أسامة، والبيهقي: السنن ٩: ١٣٤.

٥) الطبري: تاريخ ٤: ١٨٢، ٢٥٣ـ ٢٥٤ عن سيف.

٦) ابن عبدالحكم: فتوح مصر واخبارها ١٢٥.

٧) ابوزرعة الدمشقي: تاريخ ١: ١٨٤ـ ١٨٥، وخليفة: التاريخ ١٦٠، وابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ١٠٢٢.

٨) أبوهيلال العسكري: الاوئل ١: ٢٧٢ بسند صعيف.

زۆری پارەیش بوو بە هۆی گرانی ئابووریانە لە کەلوپەلە دەگمەنو زۆر چاکەکان، بۆ نموونە نرخی جلێکی ئاوریشم گەیشتە (٢٠٠) درهەمو عەبایەکی یەمانی گەیشتە (١٠) درهەم[1] و ئەسپێك بە (٥٠٠٠٠) درهەم[2]و بە (١٠٠٠٠٠)یش فرۆشرا، دارخورمایەکیش بەهای گەیشتە (١٠٠٠) درهەم.[3]

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٥٨ هەردوو نرخەکەش لە رێگەی واقیدیەوە هاتووە کە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا متمانەی لەسەر نی یە، بەڵام لە بواری مێژوویدا زانیاری زۆری هەیەو ناکرێت پشتگوێ بخرێت.

٢) ابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ١٠٢٣ بسند مرسل.

٣) ابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ١٠٢١، بسند منقطع قبل السعدي، والطبراني: المعجم الكبير ١: ١٥٨ـ ١٥٩ بسند مرسل، والحاكم: المستدرك ٣: ٥٩٧ ونقد الذهبي متنه.

**باسی چوارەم:**

**زەکات**

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی خیلافەتی صدیق دا بە کۆکردنەوەی پارەی زەکات دروست بوو لە ڕێگەی ناردنی کۆکەرەوانی زەکات بۆ سەرانسەری دوورگەی عەرەب، بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەش کۆسپی دروست دەکرد لە ڕێگای ئەو کارانە لە زۆربەی ناوچەکان، بێجگە لە حیجازو جەواسا ـ لادێ یەك بوو لە بەحرێن ـ و ئەو هۆزانەی کە لەسەر ئیسلامەتی و پشتگیریی بۆ دەوڵەت مانەوە، سوپاکانی خیلافەتیش جەنگی لەگەڵ مورتەدەکان کرد بۆ ماوەی یەك ساڵو چەند مانگێك، تا توانی بیانگێڕێتەوە بۆ ئیسلامو گوێڕایەڵی، هەڵوێستی دووربینانەی ئەبوبەکریش هۆکارێك بوو بۆ یەکخستنەوەی دەوڵەتو جێبەجێکردنی شەریعەت لە سەر خەڵکی، هەندێ لە هاوەڵانیش بۆچوونیان وابوو شەڕ نەکرێت لەگەڵ پاشگەزبووەکان، یەکێ لەوانەش عومەر بوو، بەڵگەشیان فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : "امرت أن اقاتل الناس حتى يقولوا لااله الا الله فمن قالها، فقد عصم مني ماله و نفسه إلا بحقه وحسابه على الله". واتە: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکی جەنگ بکەم تاکو بڵێن "لا اله الا الله"، جا هەرکەسێك کە ئەوەی وت خۆیوماڵی لەسەر من قەدەغە دەبێت، مەگەر بەمافی خۆی نەبێت لێپرسینەوەش لەلای خوایە. ئەبوبەکر تێگەیشتنی ڕاستی بۆ ڕوونکردنەوەی بۆ فەرموودەکان بە کۆکردنەوە لە نێوانیاندا بوو، فەرمووی: سوێند بە خوا جەنگ دەکەم لەگەڵ هەر کەسێکدا جیاوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکات، چونکە زەکات مافی بەیتولماڵە، سوێند بە پەروەردگار ئەگەر کارەمیەکیان (لە ریوایەتێکدا گوریسێك) دەدایە پێغەمبەر (ئێستا نکوڵی لێبکەن لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا هەرکە بینیم خوای گەورە دڵی ئەبوبەکری ئاراستەی جەنگکردن کرد، زانیم کە ئەوە ڕەوایە،[1] هەموو هاوەڵانیش هاتنە سەر بۆچوونی ئەبوبەکر.[2] ئەوان ڕەخنەگرتنیان لەسەر شەڕکردن لەگەڵ قەدەغەکەرانی زەکات بە بۆنەی ئەم ئایەتەوە بوو: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ)[3]. دەیانوت: زەکات وەرگرتن تایبەت بوو بە پێغەمبەر ﷺ، چونکە کەسی تر جگە لە

١) البخاري: الصحيح ٢: ١٣١، ١٤٧، و٩: ١٩، ١١٥، ومسلم: الصحيح ١: ٥١.

٢) الكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٣٨، وسعيد بن منصور: السنن ٢: ٣٢٢، والبيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٧٧.

٣) (التوبة : ١٠٣ )

خۆی ناتوانێت پاکیان بکاتەوەو دوعایەکیان بۆ بکات، ببێتە مایەی سوکنای، ئەوان نکوڵیان لە زەکات نەدەکرد وەکو دانپیانەنانو ئینکار، بۆیە تەئویل کردن لە ئیسلام دەریاننەکات، ئەبوبەکریش شەڕی لەگەڵ نەکردن تاکو بانگی کردن بۆ زەکاتدان، جا کە سووربوون لە سەر نەدانی زەکات ئەو کاتە جەنگی لەگەڵ کردن، بەڵام سەبارەت بەو کەسانەی دانیان بەزەکات نەدەنا وەکو فەرزێك ئەوانە بێبەری دەبن لە ئیسلام، چونکە زەکات روکنێکی سەرەکی یە تیایدا، هاوەڵانیش رەخنەیان لەسەر شەڕکردن نەبوو لەسەر ئەم جۆرە کەسانە، یان لەگەڵ شوێنکەوتووانی موسەیلەمەو ئەوانی تر کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی یان دەکرد.[1]

بێگومان ساڵی یەکەم لە خیلافەتی ئەبوبەکر سەرچاوەکانی زەکات بەشێوەیەکی بەرچاو کەمی کرد، هەندێ لە هۆزەکانی تەمیم وەکو رەبابی کوڕی عەوفو کوڕانی سەعدی کوڕی تەمیم، زەکاتیان هێنا کە حەوت سەد وشتر بوو نرخەکەی دەیکردە نزیکەی سیو پێنج هەزار درهەم (٣٥٠٠٠)[2] هەروەها هۆزی تەی زەکاتیان هێنا بریتی بوو لە پانزە هەزار وشتر، بای نزیکەی (١٥٠٠٠) درهەم دەبوو،[3]

ئەو هۆزانەی لەسەر ئیسلام مانەوە زەکاتیان دەدا، سەرچاوەکان بە راشکاوی ناوی هەندێکیانیان بردووە، وەکو: مەقاعیسو بەشەکانی بەنی سەعد لە هۆزی تەمیمو بەنی مالیك لە بەنی یەربوع لە تەمیمو خێڵی هەیسەمی سولەمیو کۆمەڵانێك لە موهرەی کوڕی حەیدانو ئەسلەمو غیفارو موزەینەو جوهەینەو ئەشجەع.[4] ئینجا سەرچاوەکان باسی جێگیربوونی هۆزانی تریان کردووە لەسەر ئیسلام بێئەوەی ئاماژە بکەن بە راشکاوی کە زەکاتیان دەدا، بەڵام گومان نی یە لەوەی کە زەکاتیان داوە، ئەوانەش: سەقیف، هوزەیل، دەیل، کینانە، ئەهلوسەرات، بوجەیلە، خەسعەم، هەوازین، جوشەم، سەعدی کوڕی بەکر، عەبدولقەیس (لەتوجیب) و مەزحەج ـ جگە لە بەنو زەید نەبێت ـ و هەمەدانو ئەبنا.[5]

١) ابن حجر: فتح الباري ١٢: ٢٧٦، ٢٧٧، و٣: ٣٦٦.

٢) ابن قتيبة: المعارف ٣٠٢.

٣) الكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٤٥، ٤٧، ٤٩، ٥١. والدياربكري: تاريخ الخميس ٢: ٢٠٣.

٤) الطبري: تاريخ ٣: ٢٦٨، عن سيف، ٢٧٦، وابن ابي الدنيا: الإشراف في منازل الأشراف ٢٠٥، وابن حجر: الاصابة ٣:٦١٥، ٦٣٦، وقدامة بن جعفر: الخراج ٢٧٧، والكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٤٤٧، والدياربكري: تاريخ الخميس ٢:٢٠٣.

٥) العيني: عمدة القاري ٧: ١٧١، عن كتاب الردة للواقدي.

پێویستە ئاماژەش بکرێت بۆ ئەوەی شەڕەکانی ریددە خەرجێکی زۆری پێویست بوو لەلایەن دەوڵەتەوە کە تەنها پشتی دەبەست بە سەرچاوەکانی غەنیمە لە لایەك‌و لەلایەکی تریشەوەی لەسەر زەکات کە بە شێوەیەکی بەرچاو کەم بوویەوە.

بەهەمان شێوە پێویستە ئاماژەیش بکرێت بۆ ئەوەی کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) زەکاتی لە ماڵی دیارو نادیاریش وەردەگرت، پرسیاریشی لەو کەسە دەکرد کە بەخشین‌و خەڵاتی پێدەدا، کە ئایا ماڵی هەیە زەکاتی لەسەر بێت؟ ئەگەر بیوتبا بەڵێ زەکاتەکەی لێدەبڕی.[1]

عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەردەمی خۆیدا، بەردەوام بوو لەسەر هەمان ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەناردنی کۆکەرەوانی زەکات بۆ سەرتاسەری دەوڵەتی ئیسلامی، زۆریش لە دانیشتوانی ناوچە فەتحکراوەکان موسڵمان بوون، سەرمایەی موسڵمانانیش پەرەی سەند لە ئاکامی دەستکەوتەکانی فەتح‌و بازرگانی ئازاد لە سایەی ئاسایش‌و هێزی دەوڵەتی ئیسلامی، بێگومان ئەم هۆکارانە بوو بە مایەی زیادبوونێکی زۆر لە بڕەکانی زەکاتدا، دادگەریش لە کۆکرنەوەدا روون بوو بێ گەیاندنی هیچ زیانێك لە (بيت المال)، کاتی کۆکردنەوەی زەکاتیش هەمان کاتی پێدانی مووچەو بەخشین نەبوو، چونکە لەو کاتانە ساڵ بەسەر ماڵی هاووڵاتیاندا تێپەڕنەدەبوو، هەربۆیە دەوڵەت زەکاتی لە مووچەکان وەرنەدەگرت.[2] سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی یەکێك بوو لەو کۆکەرەوانە، جا هەموو سەرە مەڕەکانی دەژمارد تەنانەت بەچکەکانیش، بەڵام زەکاتی لێوەرنەدەگرت، ئیتر خاوەن مەڕەکان مشتومڕیان لەگەڵ کرد، ئیتر پرسیاری کرد لە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەویش ڕێنمونی کرد کە لە مەڕە مامناوەندەکان وەربگرێت واتە نە لە زۆر چاك‌و نە لە زۆر خراپەکان.[3]

ئەمەیش لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەگونجێت: "واياك وكرائم اموالهم".[4] واتە: نەکەی چاکترینی ماڵەکانیان وەکو زەکات وەربگریت، عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) جارێکیان نکۆڵی کرد لەسەر بەرپرسێك مەڕێکی شیرزۆری گوان گەورەی وەرگرتبوو لە زەکات و فەرمووی: "مااعطى

١) مالك: الموطأ ١: ٢٤٥ وفيه انقطاع نبه عليه ابن حجر (كنز العمال ٦: ٥٣٠).

٢) أبوعبيد: الاموال ٤١٧، وابن زنجويه: الاموال ٣: ٩٢٠، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٤٠٧ والاثر صحيح.

٣) مالك: الموطأ ١: ٢٥٤، وعبدالرزاق : المصنف ٤: ١٠، ١١، ١٤، ١٥، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٨٥٧، والبيهقي: السنن ٤: ١٠٠ـ ١٠٣ والاثر صحيح.

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٣: ٢٦١).

هذه أهلها وهم طائعون، لاتفتنوا الناس"، واتە: وانازانم خاوەنی ئەم مەڕە رازی بێت لەسەر ئەم کارە، خەڵکی لە خشتە مەبەن.[1]

ئینجا کۆیلەو ئەسپ لای موسڵمانان زۆر بوو، بۆیە هاوەڵان پیشنیاریان کرد زەکاتیان بخرێتە سەر، ئیتر عومەر (رەزای خوای لێبێت) ئەو ماڵانەی بە ماڵی بازرگانی ژمارد[2]و لەسەر کۆیلەکان دینارێکی دەستنیشان کرد (١٠ درهەم) و لەسەر ئەسپی عەرەبی دە درهەمو بیرزەون (ماینی نارەسەن) پێنج درهەم، هەروەها زەکاتی نەخستە سەر کۆیلەی خزمەتگوزاریو ئەسپی ئامادەکراو بۆ جیهاد، چونکە ئەوانە ماڵی بازرگانی نین، ئەو کەسانەش زەکاتی ئەوانەیان دەرکردبوو، عومەر قەرەبووی کردنەوە مانگانە بە نزیکەی (٢٠٩) کیلۆگرام لە گەنم کە لە بڕی زەکاتەکە زۆرترە،[3] چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "ليس على المسلم في فرسه ولا عبده صدقة".[4] واتە: لەسەر ئەسپو کۆیلە زەکات نی یە.

هەروەها زەکات وەردەگیرا لە ریکاز واتە ماڵی نێژراو کە بدۆزرێتەوە، بە رێژەی پێنج یەك،[5] سووریش بوو لەسەر دەستاو دەستکردنی پارە و بەکارخستنی، تاکو زەکات تەواوی نەکاتو بەدرێژای ساڵان، پارەی هەتیوێکی لابوو دایە حەکەمی کوڕی عاص بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بکات،[6] چونکە عومەر کاتی بازرگانی نەبوو بەهۆی سەرقاڵی خیلافەتەوە، کاتێك قازانجەکەشی بەرزوبوویەوە بە دەهەزار درهەمەوە بۆ سەد هەزار درهەم، گومانی برد لە شێوەی بەدەستهێنانی، جا کە بۆی دەرکەوت بازرگانەکە سوودی لە خزمایەتی هەتیوەکە لە عومەر وەرگرتووە، هەموو قازانجەکەی رەتکردەوەوە سەرمایەکەی گێڕایەوە، قازانجەکەشی بە پارەیەکی پیس ناوبرد،[7] چونکە

١) مالك: الموطأ ١: ٢٥٦، وابن أبي شيبة: المصنف ٢: ٣٦٢، وابن زنجويه: الاموال٣: ٨٨٥ـ ٨٨٦، والبيهقي: السنن ٤: ١٥٨، والاثر حسن.

٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى ١: ١٥٢، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٣٨١، باسناد صحيح، وابوعبيد: الاموال ٢٦١، ٢٦٢، ٤٦٨، ٤٦٩، وابن زنجويه: الاموال ٣: ١٠٢٦ والاثر صحيح.

٣) ابن زنجويه: الاموال ٣: ١٠٢٤، والطبري: تهذيب الاثار ٢١٢، والاثر صحيح.

٤) صحيح الترمذي ١: ١٩٦ وقال الترمذي: والعمل عليه عند أهل العلم.

٥) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٢٢٦، ٢٢٧، وابن أبي شيبة: المصنف ٢: ٤٣٦، و ٦: ٤٣٤، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٧٤٩، ٧٥٠، وتتعاضد الطرق لتقوية الاثر الى الحسن.

٦) ابن زنجويه: الاموال ٣: ٩٩٠ والاثر صحيح.

٧) عبدالرزاق: المصنف ٤: ٦٧، ٦٨، وابوعبيد: الاموال ٤٥٥ والاثر صحيح.

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) کاریدەکرد بە بنەمایەك کە سەپاندبوویە سەر فەرمانڕەواکانی ئەویش قەدەغەکردنی سوود بینینە لە پلەوپایەکانی لێپرسراوێتی لە دەوڵەت، ئا لێرەشەوە مۆڵکی فەرمانڕەواکانی کرد بە دوو بەشەوە لەگەڵیاندا، چونکە بە بازرگانی گەشەی کرد لە ڕێگای کارەکانیانەوە.

ئینجا عومەر دەیەکی وەردەگرت لە زەکاتی ئەو ڕووەکانەی بە باران و ڕووبارەکان ئاودێری دەکران، نیوەی دەیەکیشی وەردەگرت بۆ ئەو ڕووەکانەی بە ئامێر ئاو دەدەران.[1] ئەو کارەشی هەماهەنگ بوو لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ [2] ڕاسپاردەشی دەکرد بە بەزەی بن لەگەڵ خاوەن باخەکان لە کاتی خەملاندنی بەروبوومەکانی خورما،[3] زەکاتی دەیەکیشی وەردەگرت لە هەنگوێن، چونکە دەوڵەت دۆڵی مێشەنگەکانی تەرخان کردبوو و دەیپاراست بۆ بەرهەمهێنەرەکانی،[4] ئینجا گەنم لە سەردەمی عومەر زیادی کرد، بۆیە ڕێگای هەموار کرد بۆ دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە لە گەنم بە نیوەی ئەو ئەندازەی پێش ئەو دەردەکرا لە جۆ یان خورما یان مێووژ.[5] ئەمەش ئاسانکاری بوو لە سەر خەڵکی، قبوڵکردنیشە بۆ ماڵی چاکتر لە زەکاتدا ئەگەرچی جۆرەکانیان جیاواز بێت.[6]

هەندێ لە سەرچاوەکان باسی ژمارەیەك لەو کەسانەیان کردووە کە هەڵدەستان بە کۆکردنەوەی

---

١) عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٣٤، ١٣٥ والاثر صحيح.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٣: ٣٤٧).

٣) عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٢٩، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٤١٤ والاثر صحيح.

٤) ابوداود: السنن ٢: ١٠٩، والنسائي: السنن ٥: ٤٦، والدارقطني: السنن ٤: ٢٣٨، والبيهقي: السنن ٤: ١٢٦ والاثر حسن. وانظر أثراً آخر في عبدالرزاق: المصنف ٤: ٦٢، وابن أبي شيبة: المصنف ٢: ٣٧٣، وهو أثر حسن أيضاً، ويقوى الاثران الى الصحيح لغيره في فرض الزكاة العشرية على العسل الذي تحميه الدولة للمستثمر.

٥) ابن زنجويه: الاموال ٣: ١٢٤٣، والاثر حسن، وانظر مارواه أبوداود: السنن ٢: ١١٢، حيث نسب ذلك الى عمر من طريق مولاه نافع، في حين ان سبعة من أصحاب نافع نسبوه الى معاوية (مسلم: التمييز ٢١١، ٢١٢) وراجع البخاري: الصحيح (فتح الباري ٣: ٣٧٢) في نسبته الى معاوية.

٦) ابن حجر: فتح الباري ٣: ٣١٣.

**زەکات لە خیلافەتی عومەر رەزای خوا لێبێت:**

١ـ ئەنەسی کوڕی مالیك.[1]

٢ـ سەعیدی کوڕی ئەبی زوباب، بەسەر سەرات.[2]

٣ـ حاریسەی کوڕی مەزریبی عەبدی.[3]

٤ـ عەبدوڵڵای کوڕی ساعیدی.[4]

٥ـ سەهلی کوڕی ئەبوحەسەمە.[5]

٦ـ مەسلەمەی کوڕی موخللەدی ئەنصاری.[6]

٧ـ موعازی کوڕی جەبەل، لەسەر بەنی کیلاب.[7]

٨ـ سەعدی ئەعرەج، لەسەر یەمەن.[8]

٩ـ سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفی، فەرمانڕەوا بوو لەسەر تایفو زەکاتەکانیشی کۆدەکردەوە.[9]

بەڵام لە سەردەمی عوسمان (رەزای خوای لێبێت) دەستکاری یەك کرا لەم مەسەلەیە، ئەویش ئەوەبوو بواردرایە خەڵکیی خۆیان زەکاتی ماڵە دیارەکانیان دەربکەن (ئاڵتوونو زیو) بێ ئەوەی بیدەن بە دەوڵەت،[10] پاساوی ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ویستوویەتی ناڕەحەتی لادات لەسەر

١) عمر بن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٥٤، ٨٥٥، والاثر صحيح، وابوعبيد: الاموال: ٤٢٧، وابن زنجويه: الاموال ٣: ٩٣٤ والاثر حسن.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف٢: ٣٧٣، وابن زنجويه: الاموال ٢: ١٠٩١، والبزار: المسند ١: ٤١٥ـ ٤١٦.

٣) ابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٣٩٤ والاثر صحيح.

٤) مسلم: الصحيح ٢: ٧٢٣، والنسائي: السنن ٥: ١٠٣ـ ١٠٥.

٥) عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٢٩، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٤١٤، والبيهقي: السنن ٢: ١٢٤ والاثر صحيح.

٦) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣١٣، وابن زنجويه: الاموال ٣: ١١٩٢ والاثر ضعيف.

٧) أبوعبيد: الاموال ٥٨٩، ٥٩٠ والاثر ضعيف.

٨) عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٣، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٣٦٨، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٨٧٣، ٨٧٦ والاثر ضعيف.

٩) مالك: الموطأ ١: ٢٥٤، وعبدالرزاق: المصنف ٤: ١٠، ١١، ١٤، ١٥، وابن ابي شيبة: المصنف ٢: ٣٦٨، والبلاذري: فتوح البلدان ٩٦.

١٠) ابوعبيد: الاموال ٥٣٤ بسند صحيح.

خەڵکیی‌و بێزار نەبن لە پشکنێرە خراپەکان، بۆیە سەرپشکی کردن لە دەرکردنی،[1] بەڵام سەبارەت بە زەکاتی مەڕو ماڵات و دارخورما دەوڵەت خۆی بەردەوام بوو لە کۆکردنەوەی.

بێگومان ئەم کردارەش سەرچاوەکانی (بیت المال)ی لە زەکات کەمکردەوە، بەڵام کاریگەری بوو لەسەر هاوبەرپرسیاری کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵکیی، چونکە زەکات فەرزێکی ئاینی یە، کۆمەڵگایش هۆشیاری زۆری هەبوو بە ئیسلام و ئارەزووی راستەقینەشی هەبوو لە جێبەجێکردنی رێنمای یەکانی.

١) السرخسي: المبسوط ٢: ١٦٩، وانظر: أبا عبيد: الاموال ٥٠٩ رقم ١٨١٧.

## باسی پێنجەم:
## دەیەکی بازرگانی

بازرگانی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خیلافەتی ئەبوبەکر دەیەکی لەسەرنەبوو، بەڵکو عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ یەکەمین[1] جار دەیەکی سەپاندە سەر بازرگانە بێگانەکان کاتێك کەلوپەلیان دەهێنایە نێو وڵاتی موسڵمانانەوە، چونکە دەوڵەتەکانیان باجی دەیەکی لە بازرگانە موسڵمانەکان وەردەگرت، بۆیە ئەمیش سیاسەتی هاوشێوەی لەگەڵیان بەرپا کرد، دەیەك یەکجار لە بازرگان وەردەگیراو پسولەیەکی دەدرایە بەرانبەر ئەو پارەیە بۆ ئەوەی دووبارە لی وەرنەگیردرێتەوە، کاتێك لە سنوور تێپەڕ دەبێت، ئینجا عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئاگاداری ئاڕاستەی لێپرساوی دەیەکەکان کرد کە زیادی کوڕی صودەیر بوو "لەساڵێکدا یەك دەیەك زیاتر وەرنەگیرێت" "دەیەکی وەردەگرت لەهەرکەسێك بڕۆشتایە یان بهاتبایە"[2] بڕی باجی دەیەکیش بریتی بوو لە یەك درهەم لە هەموو درهەمێك.[3] ئەمەیش بازرگانە نەبتیەکانی دەگرتەوە، بەڵام دواتر سووك کرایەوە لەسەریان کاتێك گەنم و زەیتیان دەهێنا نیوەی دەیەکیان لێوەردەگیرا لەبەر پێویستی خەڵکی بەو شتومەکانە، بەڵام کاتێك نیسك و نۆك و لۆبیاو شتی لەو جۆرەیان دەهێنا کە خەڵکی زۆر پێویستیان پێی نی یە بە هۆی بەدەستکەوتنیان لە بازاڕە ناوخۆی یەکان لەو کاتە دەیەکیان لێوەردەگیرا.[4] جاری واش بوو دەیەك دەدرایە لێپرساوی بازاڕ، ئەوسەردەمەش عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە لەسەر بازاڕی مەدینە بوو، بە هاوکاری سائیبی کوڕی یەزید، جا ئەوان دەیەکیان لە نەبتیەکان وەردەگرت.[5]

بەهەمان شێوە نیوەی دەیەك وەردەگیرا لە بازرگانەکانی ئەهلی زیمە، بێجگە لە بەنی تەغلیب کە عەرەب بوون و دەیەکیان لێوەردەگیرا.[6]

---

١) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٢٩ والاثر صحيح.

٢) أبوعبيد: الاموال ٥٣٠ والاثر صحيح.

٣) عبدالرزاق: المصنف ٤: ٨٨و ٦: ٩٠، وابوعبيد: الاموال ٥٣٠، والبيهقي: السنن الكبرى ٩: ٢٠٩ـ ٢١٠ والاثر صحيح.

٤) مالك: الموطأ ١: ٢٦٦، وعبدالرزاق: المصنف ٦: ٩٩ـ ١٠٠و ١٠: ٣٣٥، وابوعبيد: الاموال ٥٣١، وابن ابى شيبه: المصنف ٢: ٤١٧، والبيهقي: السنن ٩: ٢١٠ والاثر صحيح.

٥) مالك: الموطأ ١: ٢٦٦، وابوعبيد: الاموال ٥٣١ والاثر صحيح.

٦) عبدالرزاق: المصنف ٦: ٩٥، و٤: ٨٨، وابوعبيد: الاموال ٣٤، ٥٣٠ـ ٥٣١، وابن زنجويه: الاموال: ١: ١٣١ـ ١٣٢ والاثر حسن مداره على ابراهيم بن المهاجر وهو صدوق لين الحديث، وقد اختلف عليه الرواة، فرو الحكم بن عتيبة وسفيان

بەڵام بازرگانە موسڵمانەکان جگە لە زەکات کە چواریەکی دەیەکە هیچیان نەدەدا، ئەژمارێکیش لەبەردەستدا نی یە سەرچاوەکانی (بيت المال) لە دەیەك روون بکاتەوە لەسەردەمانی خیلافەتی راشیدە.

---

الثوري فذكرا فرض العشر على بني تغلب وهما ثقتان، ورواه اسرائيل وشريك عنه فذكرا فرض نصف العشر، واسرائيل ثقة وشريك صدوق يخطئ كثيراً وروايتهما مخالفة فهي شاذة.

## بەشی دووەم:

# خەرجی یە گشتی یەکان

### باسی یەکەم

### ئەو کەسانەی زەکاتیان پێدەشێت

ئەو کەسانەی زەکاتیان پێدەدرێت قورئان دەستنیشانی کردووە بە هەشت جۆر (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).[١] بێ ئەوەی مەرج دابنێت لە نێوان ئەو هەشت بەشەدا، بەڵکو دابەش دەکرێت بەپێی بەرژەوەندی و پێویستی،[٢]ئینجا بە هۆی باردۆخی بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە لە سەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) خەرجکردن لەسەر بەشی حەوتەم (وَفِي سَبِيلِ اللّهِ) فراوان بوویەوە لە زەکاتی هۆزەکانی ئەسلەم و غیفارو موزەینەو جوهەینە،[٣] پێش دەچێت هەندێ لە ماڵەکانی زەکات لەسەر هەڵمەتەکانی فەتح خەرج کرابێت لە عێراقو شام. هەروەها ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لە بەشی چوارەم (وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ) سی وشتری دایە عەدی کوڕی حاتیم لە وشترەکانی زەکات.[٤] بە هەمان شێوە بەشی زوبورقانی کوڕی بەدری داوە.[٥] ئەمەش دەگونجا لەگەڵ بارودۆخی دەوڵەت لە کاتی پاشگەزبوونەوەو پێویستی بۆ ڕاکێشانی دڵەکان، ئەگەرچی ئەم دوو شوێنەوارە لاوازن.

بەڵام وێڕای ئاڕاستەی ئەم شێوە خەرجکردنە، بەشەکانی تریش پشکی خۆیانیان وەرگرت لە ماڵەکانی زەکاتو جاری واش بوو خەلیفە بە خۆی سەرپەرشتی دەکردە سەر دابەشکردنیان بەسەر هەژاراندا.[٦]

---

١) (التوبه : ٦٠ ).

٢) ابن تيميه: الفتاوى ١٩: ٢٥٧ـ ٢٥٩.

٣) الكلاعي: الاكتفا (حروب الردة) ٤٤.

٤) حماد بن اسحق: تركة النبي ﷺ ص ٩٠ دون اسناد، والبيهقي: السنن الكبرى ٧: ١٩ـ ٢٠، والكلاعي: (حروب الردة) ٥٢.

٥) ابن قدامة: المغني ٦: ١٢٧.

٦) البيهقي: السنن الكبرى ٨: ٤٩ والاثر حسن.

لە گرنگترین ئەو گۆڕانكاریانەی دروست بوون لە دابەشكردنی زەكات لە سەردەمی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لابردنی بەشی (الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ)[1] بوو، چونكە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێت)[2] بە پارە دڵی كەسانێكیان رادەگرت، بەڵام لە خیلافەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) كە ئیسلام بەهێز بوو و نیازێك نەما بە خەرجكردنی پارەی زەكات لەسەر ئەو جۆرە كەسانەی كە باسكراون لە نێو هەشت بەشەكەدا.[3]

ڕوایەتگەلێكی لاوازیش هەن ئاماژە بەوە دەكەن كە عومەر موجاهیدانی دەخستەڕێ بە چوار هەزار ئەسپ[4] و سی هەزار وشتر.[5]

بێ چەنووچوونیشە كە موجاهیدان یەكێكن لە هەشت بەشەكە كە زەكاتیان پێدەشێت تەنانەت ئەگەر دەوڵەمەندیش بن. ئاساییشە بوترێت كە زۆریی ماڵو سامان لە دەرئەنجامی فتوحات یارمەتی ئەوەیدا كە خەرجكردن فراوان بكرێت لەسەر هاوبەرپرسیارێتی كۆمەڵایەتی، ئەوەیش بووە مایەی بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی لە كۆمەڵگا.

١) هەندێ ریوایەتی لاواز هەیە پێكەوە باس لە ئەم لابردنە دەكەن (أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٩٢، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٢٣، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٣: ٣٧٢ـ ٣٧٣، والبيهقي: السنن ٧: ٢٠).

٢) مسلم: الصحيح (بشرح النووي) ٧: ١٥٦، وصحيح الترمذي للالباني ١: ٢٠٤، وابن كثير: التفسير ٢: ٣٦٥.

٣) ابن كثير: التفسير ٢: ٣٦٥.

٤) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠٦، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٧٥، والطبري: تاريخ ٢: ٥٧١، والاثر ضعيف للانقطاع بين نافع مولى ابن عمر وعمر، ولتدليس الحجاج بن ارطأة وقد عنعنه.

٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠٥ـ ٣٠٦، والاثر ضعيف للانقطاع بين الراوي وعمر رضي الله عنه.

## باسی دووەم:

## ئەوانەی کە غەنیمەو فەیئیان پێدەشێت

مەبەست لە (الغنائم) ئەو ماڵانەیە کە موسڵمانان دەستیان کەوتووە لە رێگەی هێزەوە، بەڵام (الفئ) بریتی یە لەو ماڵانەی بەبێ بەکارهێنانی هێز دەستکەوتووە. ئینجا قورئان ئەوەی روونکردۆتەوەو کە پێنج یەکی دەستکەوتەکانی غەنیمە پشکی دەوڵەتە، بەڵام شێوازی خەرجکردنی ئەو پێنج یەکەشی روون کردۆتەوە بە هەمان شێوە: (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ).[1] سەبارەت بە ئەوەی دوای کە دەمێنێتەوە دابەشدەکرێتە سەر ئەو جەنگاوەرانەی ئامادەی جەنگەکە بوون، بەم شێوەیەش زۆربەی دەستکەوتەکانی غەنیمە بەر کەسەکان دەکەوێتو ئاستی بژێویان بەرز دەکاتەوە.

بەڵام مەسەلەی (فیئ) قورئان شێوازی خەرجکردنی دیاری کردووە: (مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ)[2] وەکو دەردەکەوێت هەموو ئەو ماڵانەی لەم رێگاوە بەدەستدێت بۆ دەوڵەت دەبێت، ئەویش خەرجیدەکات لە هاوبەرپرسیاری کۆمەڵایەتیو نزیککردنەوەی نێوان چینەکانی کۆمەڵگا لە رووی ئابووری یەوە. ئەوکاتەیش ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) کرایە خەلیفە پشکی پێغەمبەر ﷺ لە پێنج یەك خستە سەر (في سبيل الله).[3] بەڵام پشکی (ذوي القربى) کە نەوەی هاشمو عەبدولموتەلیب دەگرێتەوە، سپاردی بە عەلی (رەزای خوای لێبێت) هەڵسێت بە دابەشکردنی،[4] هەندێ ریوایەتی لاوازیش هاتووە کە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) "ئەوەی

---

١) (الأنفال : ٤١ )

٢) (الحشر : ٧ )

٣) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٢٣٨، وابن ابي شيبة: المصنف ١٢: ٤٧١، مختصراً، والبلاذري: أنساب الاشراف ١: ٥١٦، والطبري: جامع البيان ١٠: ٧ من مرسل ابراهيم وقتادة، والنسائي: السنن ٧: ١٣٣، من مرسل الحسن بن محمد بن الحنفية، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٢.

٤) أحمد: المسند ١: ٨٤ـ ٨٥، وابن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٤٧٠، وفي اسناده حسين بن ميمون الخندقي لين الحديث، وابوداود : السنن ٣: ١٤٧، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٣، والاثر يرقى بطرقه الى الحسن لغيره.

پێغەمبەر ﷺ دەیدایە خزمانی ئەبوبەکر پیانی نەدەدا".[1] یان ئەوەی کە بەشی خزمانی هەر لابردووەو خستوویەتە بەشی جیهادەوە.[2]

ئینجا کێشەی میراتی پێغەمبەر ﷺ سەریهەڵدا، کە ئەو لە ژیانی خۆیدا ماڵەکانی فەیئی رادەپەڕاند بە پی ئاڕاستەکردنی قورئان، جا کاتێك وەفاتی کرد، فاتیمەی کچی داوای پشکی خۆی کرد لە بەشەکانی خەیبەرو فەدەكو زەکاتەکانی مەدینە،[3] کە ئەوانە ماڵو سامانێکی زۆر بوون، ئینجا ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) روونیکردەوە کە ئەو ماڵانە بە میراتی ناگیردرێن بە پی راسپاردەی پێغەمبەر ﷺ: " لانورث ما ترکناه صدقة".[4] و "لا يقتسم ورثتي ديناراً، ماتركنا بعد نفقة نسائي ومؤنة عاملي فهو صدقة".[5] ئەم دوو فەرمودەیەیش وەکو دەردەکەوێت بە راشکاوی ئەو ماڵانەی دوای پێغەمبەر ﷺ بەجێدەمێنێت رێگەنادات بەمیراتی بگیردرێت.

لە راستیشدا ئەو ماڵانە موڵکێکی تایبەت نەبوو بە پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەو لەو رێگانە خەرجیدەکرد کە قورئان دیاری کردبوو، هەڵیشدەسا بە دابەشکردنی وەکو سەرۆکی دەوڵەت لە بوارە گشتی یەکاندا بۆ جێبەجێکردنی هاوبەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی لە نێو موسڵماناندا، ئا لێرەشەوە ئەو ماڵانەی دوای پێغەمبەر ﷺ بەجێدەمێنێت دەگەرێتەوە بۆ خەلیفە یان جێگرەکەی، هەربۆیە ئەبوبەکر بە فاتیمەی فەرموو (رەزای خوای لێبێت): "من كان رسول الله يعوله فانا أعوله، ومن كان رسول الله يتفق عليه فأنا انفق عليه".[6] واتە: هەرکەسێك پێغەمبەر ﷺ بەرێوەی دەبرد من بەرێوەی دەبەم، هەرکەس پێغەمبەر ﷺ خەرجی پێدەدا من خەرجی پێدەدەم. ئیتر ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) خەرجی دەدایە خزمو کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکانی (فیئ) هەرچیش دەمایەوە دەیخستە

---

١) أبي داود: السنن ٣: ١٤٥، واحمد: المسند ٤: ٨٣، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٢ واسناده صحيح، ولكن العبارة المقتبسة اعلاه مرسل الزهري ادرجت في كلام عثمان بن عفان وجبير بن مطعم (ابن حجر (فتح الباري ٦: ٢٤٥) فلا تثبت).

٢) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٢٣٨، ٢٣٩، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٧٣٠، والحاكم: المستدرك ٣: ١٣٨، واسناد الاثر ضعيف، والطبري: تفسير ١٠: ٧ وفي الاسناد على ابن ابي طلحة لم يسمع من ابن عباس وعبدالله بن صالح كاتب الليث صدوق كثير الغلط وفيه غفلة، لكنه ثبت في كتابه (ابن حجر: تهذيب التهذيب ٧: ٣٣٩).

٣) پێنج باخچە بوو موخەیریق پێی بەخشی.

٤) البخاري: الصحيح ٤: ٩٦ ومسلم : الصحيح ٣: ١٣٨١.

٥) البخاري: الصحيح ٤: ٩٩ ومسلم : الصحيح ٣: ١٣٨٢. قال ابوداود : "ومؤنة عاملي يعني اكرة الارض". السنن ٣: ١٤٤ (ط: محمد محي الدين عبدالحميد).

٦) ابن حجر: فتح الباری ٦: ٢٠٣.

نێوبەرژەوەندی یەکانی تر.[1] خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ داوای میراتی خۆیانیان نەکرد، دوای ئەوەی کە عائیشە یادی خستنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "لانورث ما ترکناه صدقة".[2]

ئەم مەسەلەیەش مێژوونووسانی سەرقاڵکرد و کتێبەکانیان پڕکرد لە ریوایەتی لاواز لەم بارەیەوە.[3]

لە سەردەمی عومەریش پێشنیار کرایە سەر بەنی هاشم و موتەلیب کە لە پێنج یەکی خزمان (ذوي القربى) خەرج بکرێتە سەریان لەچەند بوارێکی دیاریکراو "بێوەژنیان بەشوو بدرێتو قەرز بۆ قەرزاریان ببژێردرێت، ئەوانیش ئەوەیان رەتکردەوەو داوای هەموو پێنج یەکیان کرد بیاندرێتێ، عومەریش رازی نەبوو".[4]

لە لایەکی تریشەوە عومەر (رەزای خوای لێبێت) جوولەکەکانی خەیبەری دوورخستەوە بۆ ناوچەی تەیمائو ئەریحا،[5] وەکو جێبەجێکردن بۆ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: "لا تجتمع في جزيرة العرب دينان".[6] واتە: دوو ئاین لە دورگەی عەرەب کۆنابنەوە. لە سەردەمیشیدا کرێکار زۆربوو لەلای موسڵمانانو تواناکانیان زیادی کرد بۆ ئیشکردن لە زەوی یەکانیان[7] و پێویستی یەك نەما بۆ بەردەوام بوون لە گرێبەستی کشتیاری لەگەڵیاندا، بۆیە جوولەکەی خەیبەری دوورخستەوەو ئەو زەویانەی بە دەستیانەوە بوو دابەشی کرد بە سەر ئەوانەی ئامادەی خەیبەر بوون لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ،[8]

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢) البخاري: الصحيح٥: ١١٥ و ٨: ١٨٧، ومسلم: الصحيح ٣ : ١٣٧٩.

٣) ابن سعد: الطبقات ٨: ٢٩، وحماد بن اسحق: تركة النبي ٨٦، وابن شبة: تاريخ المدينة ١: ١٩٩ـ ٢٠٠، والبلاذري: أنساب الاشراف (الشيخان) ٥٧ والبيهقي: السنن الكبرى ٤: ٢٩.

٤) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٢٣٨، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٥١٦، ٥١٧، واحمد: المسند ١: ٣٢٠، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٧٣٥، ٧٣٦، وابو يعلى: المسند ٤: ٤٢٣، ٤٢٤و ٥: ٤١، وابو عوانة: المسند ٤: ٣٠، ٣٣١، وابن حبان: الاحسان ٧: ١٥٧ والاثر صحيح.

٥) البخاري: الصحيح ٢: ٤٨ ومسلم: الصحيح ١٠: ٢١٢، وعبدالرزاق: المصنف ٦: ٥٥و ٨: ٩٨، ١٠: ٣٥٩ وابن زنجويه: الاموال ٣: ١٠٦٧، ١٠٦٨، وابن الجارود: المنتقى ١٦٦، ١٦٧، ٢٧٨ والبيهقي: دلائل النبوة ٤: ٢٧٤، والسنن ٦: ١١٤، ١٣٥. عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٢٥، ١٢٦، ٦: ٥٦، والبزار: المسند ٢: ٩٤، ٩٥، والبيهقي: السنن الكبرى ٩: ٢٠٨ والحديث صحيح.

٦) عبدالرزاق: المصنف ٤: ١٢٥، ١٢٦، ٦: ٥٦، والبزار: المسند ٢: ٩٤، ٩٥، والبيهقي: السنن الكبرى ٩: ٢٠٨ والحديث صحيح.

٧) ابوعبيد: الاموال ٦١، ٦٢، وابن شبة: تاريخ المدينة ١: ١٨٨، والبلاذري: ٣٨، ٣٩ والاثر اسناده ضعيف.

٨) البلاذري: فتوح البلدان ٢٧، وابن حبان: الاحسان ١١: ٦٠٩، والبيهقي: السنن ٦: ١١٤ والاثر حسن.

ئینجا چونکە پێغەمبەر ﷺ بەشی خێزانەکانی لە پێنج یەکی خەیبەر دیاریدەکرد بە هەشتا کۆڵ خورماو بیستیش جۆ، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئازادی دەکردن لە هەڵبژاردن نێوان ئەوەی بەشێکیان لە زەوی یەکە بداتێ یان سەد کۆڵ خورماو جۆیان بداتێ، ئیدی عائیشە و حەفصە زەوی یەکەیان هەڵبژارد.[1]

هەروەها عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسا بە ڕاگرتنی ئەو ماڵانەی پێغەمبەر تەرخانی کردبوو بۆ بەڵا کتوپڕو پێویستی یەکان لە بەشی خەیبەرو پشکی خۆی لە پێنج یەکی خەیبەر، ڕاپەڕاندنی ئەو بەشە ماڵانەی گێڕایەوە بۆ سەر گەورەی موسڵمانان.[2]

بە هەمان شێوە هەڵسا بە دوورخستنەوەی جولەکەکانی فەدەك، دوای ئەوەی قەرەبووی کردن لە بری زەوی یەکانیان‌و خستی یە ژێردەسەڵاتی خەلیفەوە، کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ داهاتەکانی تەرخان کرابوو بۆ (أبناء السبيل).[3]

سەبارەت بە داهاتەکانی (فیئ) لە زەوی یەکانی (بنو النضير) پێغەمبەر ﷺ خەرجی ساڵێکی خێزانەکانی لێدەردەکردو ئەوەی دەمایەوە خەرجیدەکرد بۆ بەرژەوەندی یەکانی دەوڵەت. ئەبوبەکریش لەسەرهەمان سیاسەت بەردەوام بوو، عومەریش بۆ ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بوو لە پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە، بەڵام دواتر سپاردی بە عەباس‌و عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) بە مەرجێك درێژە بدەنە سیاسەتی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە[4]، ئەمەیش بریکاری دانان بوو، نەك بەخشین بۆ ئەو زەویانە.

---

١) البخاري: الصحيح ٢: ٤٦، ومسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١٠: ٢٠٩، ٢١٢، وابن شبة: تاريخ المدينة ١: ١٧٨، ١٨٤، ١٨٦، والبلاذري: انساب الاشراف ٤١، ٤٢، وابن الجارود: المنتقى ١٦٦، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ١١٤ ـ ١١٦، ٣٤٠.

٢) البخاري: الصحيح ٢: ١٨٥ـ ١٨٦، ومسلم: الصحيح (بشرح النووي) ١٢: ٧٦، ٨٠، ٨١.

٣) صحيح سنن أبي داود للالباني ٢: ٥٧٤.

٤) البخاري: الصحيح ٢: ١٨٦ـ ١٨٨، ومسلم: الصحيح ١٢: ٧١ـ ٧٦.

## باسی سێیەم:

## مووچە (العطاء)

موسڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ (بيت المال)یان نەبوو، "بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکانی فەیئی بۆ بهاتبا هەر لە هەمان ڕۆژدا دابەشی دەکرد، دوو پشکی دەدایە خێزاندارو یەك پشك بۆ ڕەبەن.[1] ماڵیشی دەبەخشی بۆ هۆگربوونی دڵەکان تەنانەت "کەسی وابوو موسڵمان دەبوو تەنها لەبەر پارە، بەڵام پاش ماوەیەك ئیسلامی لا خۆشەویستر دەبوو لە دونیاو ئەوەش لە دونیادا هەیە".[2]

موچەیەکی دیارکراویشی دا نەنابوو بۆ جەنگاوەرەکان ئەوەنەبێت کە پاشماوەی پێنج یەکی غەنیمەت دابەشدەکرایە سەریان بە پێچەوانەی بەرپرسانی زەکاتو فەرمانڕەوای شارەکان کە مووچەی دیاریکراویان بوو،[3] کە جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەری بۆ دەستەبەر دەکردن "هەر کەسێك خەریکی هەڵسوڕانی کاری ئێمەیە با ژن بهێنێو ئەگەر خزمەتکاری نی یە با خزمەتکارێك بگرێت، ئەگەریش ماڵی نی یە با ماڵێك بکرێت، ئەبوبەکر فەرمووی: پێم وتراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەر کەسێك جگە لەوانە بۆ خۆی بکات یان دزە یان (غالی)ە واتە دزی لە دەستکەوتی موسڵمانان کردووە".[4]

ئینجا ئەبوبەکر لە سەرەتای خیلافەتی خۆی پەیڕەوی هەمان ڕێبازی دەکرد لە دابەشکردنی ماڵەکان و هەڵنەگردنی، واقیدیش دەگەڕێتەوە کە دواتر لی هەڵدەگرت لە ماڵی خۆیان بەبێ پاسەوان، دواتریش گواستی یەوە بۆ تەنیشت مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ.[5]

ئینجا هاوەڵان مووچەی ئەبوبەکریان دیاری کرد بە دوو هەزار درهەم، بەڵام ئەبوبەکر فەرمووی: "زیاتری بکەن بۆم، چونکە منالم هەیە، ڕێگەیشم نادەن بازرگانی بکەم، ئەوانیش پێنج سەدی تریان بۆ زیاد کرد، گێڕەرەوەکەش گومانی بووە ئەگەری ئەوەی خستووەتە ڕوو کە مووچەکەی هەر

---

١) صحيح سنن أبی داود للالبانی٢: ٥٧٠.

٢) مسلم: الصحيح (بشرح النووی) ١٥: ٧٢.

٣) صحيح سنن أبی داود للالبانی ٢: ٥٦٨.

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢١٢، ٢١٣.

لە بنەڕەتەوە دوو هەزار و پێنج سەد درهەم بووەو بە زیادەکەوە بووە بە سێ هەزار".[1] واشدەردەکەوێت کە ئەوە مووچەیەکی سالآنە بووەو شەش هەزار درهەمی لە دەوڵەت وەرگرتووە لە ماوەی خیلافەتی خۆی واتە مووچەی مانگانەی نزیکەی (٢٥٠) درهەم بووە،[2] بێجگە لەوەش ڕۆژی مەڕێکی بۆ تەرخانکرابوو بۆ میوانەکانی، سەروپێکەشی بۆ منالەکانی،[3] لەگەڵ هەندێ ڕۆن و شیردا.[4]

بەلاَم سەبارەت بە مووچەی فەرمانڕەواکان (الولاة) ریوایەتەکان بە راشکاوی باسیان نەکردووە، بەلاَم وادەردەکەوێت کە بەشیانی نەکردووە و داوایان کردووە زیاد بکرێت بۆیان "مووچەکانمان بۆ زیاد بکە ئەگەرنا کەسانێکی تر بنێرە ئەم کارە هەڵسوڕێنن" ئیتر ئەبوبەکر راوێژی کرد بە هاوەڵان و ئەوانیش رازی بوون لەسەر زیادکردنەکە.[5]

ئینجا دەوڵەت مووچەی دیاریکراوی دەدایە خەڵکیی لە ژێر ناوی (العطاء)دا، ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) یەکسانیی ڕەچاوکرد لە پێدانی ئەو مووچانەو جیاوازی نەکرد لە نێوانیاندا لەسەر بناغەی رابردووو جیهادیان، پاساویشی بۆ ئەو کارە هێناوەتەوەو فەرموویەتی: "ئەم مووچەیە پێشەنگ تیایدا باشترە لە خۆکامی" فەرمانڕەواکانیش هەر بەم یەکسانی یە کاریان کرد. مووچەکانیش منالۆ گەورەو ئازادو کۆیلە و نێرو می دەگرتەوە.[6]

ریوایەتێکی لاوازیش هەیە بڕی موچە لە ساڵی یەکەمی خیلافەتی ئەبوبەکر دیاری کات بە دە درهەم، لە ساڵی دووەمیشدا بە بیست درهەم،[7] مووچەکانیش تەنها خەڵکی شارەکانی دەگرتەوەو نەك بیابانئنشینەکان.[8]

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٨٥، وفيه انقطاع لان ميمون الجزري لم يدرك خلافه ابي بكر (أبن حجر: تلخيص الحبير ٤: ٢١٣) وانظر: أحمد: فضائل الصحابة ١: ١٦٢ وفيه: الفان وخمسمائة) فقط.

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٩٣ والبلاذري: الشيخان ٥٦، وابوعبيد: الاموال ٢٨١، من مرسل سعيد بن المسيب ومراسيله قوية.

٣) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٨٥، من رواية ميمون الجزري ولم يدرك خلافة الصديق.

٤) أبو عبيد: الاموال ٢٨٠، وابن سعد: الطبقات ٣: ١٩٣، والبلاذري: الشيخان ٥٥ والاثر صحيح.

٥) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٢٩٢، من مرسل نافع مولى ابن عمر.

٦) أبو يوسف: الخراج ٤٢ من مراسل عبدالله بن ابن نجيح وهو ثقة، وصحيح سنن ابي داود للالباني ٢: ٥٧٠.

٧) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٩٣ باسناد فيه اسامة بن زيد بن اسلم (ضعيف).

٨) ابوعبيد: الاموال ٢٤٠، ٢٤٣.

لە سەردەمی عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) ماڵو سامان بە لێشاو دەڕژایە سەر دەوڵەتدا، لە هەمان کاتدا خەرجی یەکانی دەوڵەتیش زۆر زیادی کرد، بۆیە پێویستی دروست بوو بۆ ڕێکخستنی داهاتو خەرجی یەکانیو هەروەها گلدانەوەی زیادەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ، ئینجا عومەر هەڵسا بە ڕاگرتنی (بیت المال)[1] یەکێك لەوانەیش هەڵسوڕاندنیان گرتە دەست عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاری بوو (تابعی بوو چاوی بە پێغەمبەر ﷺ نەکەوتبوو)[2]، هەروەها عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەمی زوهری[3] (هاوەڵ)و موعەیقیبی کوڕی ئەبو فاتیمە (هاوەڵ).[4]

بە هەمان شێوە لە شارەکاندا خەزێنە (بیت المال) داهێنرا بۆ سپاردنی پارەکانی ئەو شارە تیایدا، عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش لێپرسراوی (بیت المال) ی کووفە بوو،[5]

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پەلەی دەکرد لە دابەشکردنی ئەو ماڵانەی دەگەشتنە (بیت المال) لە سەرەتای خیلافەتی خۆی،[6] بەڵام دواتر دیوانی دروستکرد و بەشەکانی دەستنیشانکردو دەمسپییشی لەسەر هۆزەکان ناوزەد کرد.[7]

تەبەری مێژووی دانانی یەکەم دیوان دەگێڕێتەوە بۆ ساڵی پانزەی کۆچی،[8] بەڵام (البلاذري) دەیگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی بیستی کۆچی، ڕیوایەتە ڕاستەکانیش ئاماژە دەکەن کە دروستکردنی دیوانەکان لە پاش گەیشتنی پێنج یەکی دەستکەوتەکانی عێراق بوو کە ئەبوهورەیرەی سەدوسی

١) ابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٥٧ـ ٨٥٨ بسند مقطوع.

٢) البيهقي: السنن الكبرى ٢: ١٤٣ باسناد حسن.

٣) خليفة: تاريخ ١٥٦، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٥٥٦ ـ ٥٥٧، واحمد: الزهد ١٤٣ـ ١٤٤، وابن شبه: تاريخ المدينة ٦٩٩، وابن حجر: المطالب العالية ٣: ٧٣٢ نقلاً عن مسند اسحق بن راهوية، والاثر اسناده حسن.

٤) ابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٠٢، والخبر صحيح، وابن حجر: التقريب ٢: ٢٦٨.

٥) عبدالرزاق: المصنف ٦: ١٠٠ـ ١٠١، و١٠: ٣٣٣، وابن سعد: الطبقات ٨: ٦، واحمد: المسند ١: ١٥٩، وفضائل الصحابة ٢: ٨٤٢، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٤٩٩. والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٥٤ وهو يعتضد بطرقه الى الحسن.

٦) عبدالرزاق: المصنف١١: ١٠٠، واحمد: المسند ١: ١٦، ٩٤ والبزار: المسند ٤: ٢٥٣.

٧) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٢٨، وابن أبي شيبة: المصنف ٥: ٣٤٣، و٦: ٤٤٥ (ط: بيروت) والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٦٠، و٨: ١٠٨ والاثر صحيح.

٨) الطبري: تاريخ ١: ٤٠٢.

هێنای،[1] دوای فەرمانڕەوای ئەبوموسای ئەشعەری لەسەر بەصرە، کە بە هەشتا هەزار درهەم مەزەندە دەکرا،[2] فەرمانڕەوایەتیشی هەر لە ساڵی حەڤدەی کۆچی یەوە بوو، هەروەها دەستکەوتەکانی مەدائینو جەلەولا ـ کە لە ساڵی شانزە فەتحکراون ـ[3] هاوکات لەگەڵ ئەو پێنج یەکانەی ئەبوموسا گەیشتن، دەستکەوتەکانی جەلەولا بە شەش ملیۆن درهەم مەزندە کران،[4] بۆیە پێدەچێت دانانی دیوانەکان لە دەوروبەری ساڵی (١٧)ی کۆچی بووبێت.

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ویستی ئەو ماڵانە دابەش بکات، ئیدی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) پیان فەرموو: ئەو کردارە مەکە ئەی ئەمیری ئیمانداران، خەڵکی دێنە ئیسلامەوەو پارەیش هەر زیا دەکات، بەڵکو لەسەر نووسراو ماڵیان پێ بدە.[5] بێگومان دروستکردنی لیست بە ناوی جەنگاوەرەکان و دیاریکردنی موچەو بژێوی یەکانیان کارێکی درێژەخایەن بووەو بە تەواویش ئەنجام نەدراوە پێش ساڵی بیستی کۆچی، کاتێك بارودۆخ جێگیر بوو، دەرەنجامەکانی فەتحیش ئاشکرا بوو، سەربازگە تازەکانیش دامەزرا وەکو کووفەو بەصرە، هەروەها سەربازەکانیش جیابوونەوە (سەربازانی شامو حیمصو قەنسەرین)، سەرچاوەکانی دارای دەوڵەتیش روونبوویەوە بەشێوەیەك کە دەکرێت سەرژمێریو وردبینی پێویست ئەنجام بدرێت بۆ تۆمارگەو دیوانەکان.[6]

چەند ریوایەتێکی لاوازیش ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە بیرۆکەی دیوان لە لایەن هەندێ لە هاوەڵانەوە پێشنیار کرا، لە رۆشنای ئەوەی کە چاویان پێکەوتبوو لە وڵاتی فارسەکانو شام،[7] یان

١) بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان دەگێڕنەوە کە هاتنی ئەبوهورەیرە لە بەحرێنەوە بوو کە ئەو فەرمانڕەوا بوو لەوێ لە ساڵی بیستی کۆچی (البلاذري: فتوح البلدان ٤٣٩، وابويوسف: الخراج ١٠٥، والبيهقي: السنن ٦: ٣٥٠، وقد اضطربت في مقدار الخمس).

٢) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٥ـ ٤٦٧، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٧، والبيهقي: السنن ٦: ٣٦٤ والاثر صحيح.

٣) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٩٦، ٢٩٧، عن الواقدي والبلاذري: فتوح البلدان.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١٢: ٣١٨ (ط: السلفية) وابوعبيد: الاموال ٢٢٤.

٥) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٥ـ ٤٦٧، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٧، والبيهقي: السنن ٦: ٣٦٤ والاثر صحيح.

٦) عبدالعزيز بن عبدالله السلومي: ديوان الجند ١٠١.

٧) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠٠ وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٢، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٤، والبيهقي: السنن ٦: ٣٤٩، والاثر فيه ضعف مداره على محمد بن عمرو بن علقمة الليثي صدوق له أوهام (ابن حجر: التقريب ٢: ١٩٦).

ئەوەی کە بیرۆکەی دانانی دیوان لە لایەن هورموزان ـ کە دیلێك بوو لە توستورەوە سالّی ١٧ ك ـ[١] پێشنیار کراوە. بەلاّم ئەوەی کە گومانی تێدا نی یە ئەوەیە دیوانی کارگێڕیو دارای شتێکی بەناوبانگ بوو لە دەزگاکانی هەردوو دەوڵەتی مەزنی رۆژهەلاّت کە هەمیشە لە ململانێدا بوون پێش سەرهەڵدانی ئیسلام.[٢]

بێگومان دانانی دیوانەکان وەکو سەرژمێری یەك بوو بۆ ژمارەی جەنگاوەرە موسڵمانەکان، بەڵکو بۆ ئەوانەی تریش، کە مووچەیان وەردەگرت، یەکەمین سەرژمێریش لە ئیسلامدا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەئەنجام گەیشتبوو "بنووسە بۆم ناوی هەموو کەسێك وشەی ئیسلامی بەسەر زاردا هاتووە" ئیتر ناوی هەزارو پێنج سەد کەسی بۆ نووسرا.[٣] ئیتر سەرچاوەکان ئاماژەیان نەکردووە بۆ هیچ سەرژمێری یەکی دیکە تا کاتی دانانی دیوانەکان. بەلاّم سەبارەت بە رێکخستنی دیوانەکان، لە خزمانی[٤] پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرا وەکو حەسەنو حوسەین[٥]، ئیتر نزیك و نزیکتر، پشك دانرا بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمجا موهاجیرانی دێرین خرانە پێشو لە ئەهلی بەدرەوە دەستپێکراو پاش ئەوان ئەهلی ئوحود، پاساویشی بۆ ئەو کردارە هێناوەتەوە: "من دەستپێدەکەم لە هاوەڵە موهاجیرە دێرینەکانەوە، چونکە ئێمە بە ستەم و دەستدرێژی لە ماڵەکانمان دەرکراین ـ ئینجا پشکەکانی ئەهلی بەدرو ئوحودی دیاریکرد ـ و وتی: هەرکەسێکیش زووتر کۆچی کردبێت مووچەی بۆ دەبڕینەوە، هەرکەسێکیش دواکەوتبێت دوای دەخەین، کەسیش گلەی نەکات لە شوێن راوەستانی ولاّخەکەی نەبێت".[٦]

---

١) الجهشياري: الوزراء والكتاب ١٧، والصولي: أدب الكتاب ١٩٠، والماوردي: الاحكام السلطانية ١٩٩، والعسكري: الاوائل ١٣٤.

٢) الجهشياري: الوزراء والكتاب ٢، ٣، وابن خرداذبة: المسالك والممالك ١١١ـ ١١٢، والبلاذري: فتوح البلدان ٥٦٠، والماوردي: الاحكام السلطانية ١٩٩، والمقريزي: الخطط: ١: ١٤٨، والسلومي: ديوان الجند ٩١.

٣) البخاري: الصحيح ٤: ٨٧.

٤) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٦ باسناد صحيح رجاله ثقات.

٥) عبدالرزاق: المصنف ١١: ١٠٠ باسناد صحيح رجاله ثقات.

٦) ابن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٧، واحمد: المسند ٣: ٤٧٥ باسناد حسن. ويعقوب بن سفيان: المعرفتو والتاريخ ١: ٤٦٣ باسناد صحيح.

ئەگەر لێرەدا تەنها باسی ئەو مووچانە بکەین کە بە ریوایەتی راست پێمان گەیشتووە، دەڵێن خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دە هەزار درهەمیان وەردەگرت ساڵانە، تەنها جوەیریەو صەفیەو مەیموونە نەبێت کە کەمتری بۆ دیاریکردن، بەڵام دواتر بۆی زیادکردن تا گەیشتە دوانزە هەزار درهەم، صەفیەو جوەیریەش مووچەیان لە شەش هەزار تێنەپەڕی، تا ئەو کاتەی عائیشە داوایکرد یەکسانی بکرێت لە مووچەی دایکانی موسڵماناندا، ئیتر عومەر رازی بوو.[1]

مووچەی موهاجیرو ئەنصارەکانیش ساڵانە چوار هەزار درهەم بوو،[2] تەنها عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب نەبێت سێ هەزارو پێنج سەد درهەمی بۆ دانرا لەبەرئەوەی باوکی کۆچی پێکردووە واتە ئەو وەکو کەسێك نی یە کە خۆی کۆچی کردبێت،[3] چونکە عەبدوڵڵا منداڵ بوو لە کاتی هیجرەتدا، دواتر هەزاری زیاد کرد بۆ موهاجیرانو مووچەکەیان بوو بە پێنج هەزار درهەم بۆ هەموو ساڵێك،[4] واشدەردەکەوێت ئەو زیادەیە تەنها بۆ ئامادەبوانی بەدر بووە لە موهاجیرانو ئەنصارەکان.[5]

بەڵام سەبارەت بەو کەسانەی ئامادەی صولحی حودەیبیە بوو بوون، مووچەیان ساڵانە سێ هەزار درهەم بوو[6].

هەروەها سەد درهەم دیاریکرا بۆ هەموو منداڵێك لە شیر برابێتەوە، دواتر دیاریکرا بۆ هەموو منداڵێك لە کاتی لەدایکبوونی یەوە نەوەکو پێشوەخت لە شیر بیانبڕنەوە.[7]

بەڵام مەوالی یەکان کە عەرەب نەبوون، مووچە تەنها بۆ مەزنەکانیان دانرا وەکو هورموزان کاتێك موسڵمان بوو دو هەزار درهەمی بۆ دیاریکرا.[1] جگە لە مووچەی ساڵانەیش عومەر (رەزای خوای

١) عبدالرزاق: المصنف ١١: ١٠٠، وأحمد: المسند ٣: ٤٧٥، ٤٧٦، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٣، ٤٦٤، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٣٦، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٩.

٢) البخاري: الصحيح ٢: ٣٣٥.

٣) البخاري: الصحيح ٢: ٣٣٥.

٤) عبدالرزاق: المصنف ١١: ١٠٠ والاثر صحيح.

٥) أحمد: المسند ٣: ٤٧٥ـ ٤٧٦، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٣، والبيهقي: السنن ٦: ٣٤٩ والاثر صحيح.

٦) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٣ـ ٤٦٤، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٩ والاثر صحيح.

٧) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٣١١، وابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠١، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٢٥٨، والاثر صحيح، وابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٦، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٢٥٧، ئەم شوێنەوارە راستە، بەڵام تایبەتە بە مووچەی زەیدی کوڕەزای عومەرەوە، لە عومەریش ناوەشێتەوە کە ئەو تایبەتمەندییەی تەنها دابێتە ئەو، بەدەر لە کوڕی موسڵمانان.

لێبێت) خەڵاتی هەمەجۆری دابەش دەکرد. بۆ نموونە: جارێکیان سەبەتەیەکی نارد بۆ عائیشە (رەزای خوای لێبێت) وەکو جێگە بۆ خشڵو گوڵاو، دوای ئەوەی مۆڵەتی لە هاوەڵان خواست،[2] وشترێکیشی بە بارێك خۆراكو خەرجیو جلوبەرگ دایە کچی خەففافی کوڕی ئیمادی غیفاری لەبەر پلەو پایەی باوکی و براکەی لە جیهاددا،[3] هەندێك جلو بەرگی خوریو ئاوریشمی دابەشکرد لە نێو ژنانی مەدینەدا، جلێکی چاکیشی دایە ئومو سولەیت، چونکە لە شەڕی ئوحود کوننە ئاوەکانی پڕ دەکرد بۆ موجاهیدان.[4] جاری واش بوو پارەی دەدایە هەندێ لە هاوەڵان بۆ ئەوەی دابەشی بکەن بەسەر هەژاراندا، وەکو چۆن لەگەڵ عوسمانو ئیبنوعەباس وایکرد.[5]

جارێکیش بە یەکسانی هەندێ پارەی دابەشکرد، بەڵام باری کۆمەڵایەتیانی بەرچاو گرت، نیو دینار بۆ کەسی بێ خێزان، دینارێکیش بۆ خێزاندار.[6]

ئینجا گرنگە بۆچوونی عومەر بزانین دەربارەی ڕەچاونەکردنی یەکسانی لە دابەشکردنی مووچەدا بەسەر موسڵماناندا، هەروەها پشتگیری ئاشکرای بۆ خزمانی پێغەمبەر ﷺ و گەورە هاوەڵان لە موهاجیرو ئەنصارەکانو بایەخدانی بە رابردوو لە ئیسلامو هەڵوێست لە جیهاددا، بێگومان ئەو کۆمەڵەی کە پارەی زۆریان دەستکەوت هەر ئەوان بوون کە کۆشکی ئیسلام لەسەر ئەستۆیان بەرزبوویەوە، هەروەها ئەوان شارەزاترو پابەندتر بوون بەشەرعو مەبەستەکانی یەوە، دیندارترو چاکتریش بوون لە مامەڵە لەگەڵماڵو ساماندا و بەگەڕخستنی بۆ جێبەجێکردنی مەبەستە کۆمەڵایەتی یەکان لە ڕێگەی پارە خەرجکردنەوە، جا کۆمەکی کردن لە ئەو کۆمەڵە لە رووی ئابووریەوە دەستڕۆینی ئەوان لە کۆمەڵگا بەهێز دەکاتو زیاتر ڕێگایان بۆ هەموار دەکات بۆ فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە، مەبەستیش جێبەجێدەکات لەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە

---

١) ابن ابي شيبة: المصنف ٣: ٧و ٦: ٥١١، وابن زنجويه: الاموال ١: ٣٠٥ـ ٣٠٦، والطبري: تاريخ ٢: ٤٨١ والاثر صحيح.

٢) أحمد: فضائل الصحابة ٢: ٨٧٥، والحاكم: المستدرك ٤: ٨، وابن حجر: المطالب العالية ٢: ١٨٩ نقلاً عن أبي يعلي الموصلي، والاثر حسن.

٣) البخاري: الصحيح ٣: ٤٣.

٤) البخاري: الصحيح ٢: ١٥٠.

٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٨٨، والبزار: المسند ٤: ٢٥٥ـ ٢٥٦. ويعقوب بن سفيان : المعرفة والتاريخ ١: ٥٢١ـ ٥٢٢، والاثر صحيح.

٦) ابن ابي شيبة: المصنف ٦: ٤٩٣ وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٣٩ والاثر حسن.

دەفەرمویێت: "اليد العليا خير من اليد السُفلى". واتە: دەستی بەخشندە لە دەستی داواکەر چاکترە، یان دەسەڵاتدار لە بێدەسەڵات باشترە.

ئەوەش تێبینی دەکرێت کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ویستی وازبهێنێ لە سیاسەتی یەکسانی نەکردن لە دابەشکردنی مووچە، بەڵام پێدەچێت ئەو سیاسەتەی ئامانجەکانی پێکابێت، هەروەها زۆریی ماڵو سامان بوار دەدات کە مووچەکان لە کەمەوە بەرز بکاتەوە بۆ بەرزتر، خۆیشی لە کۆتای خیلافەتیدا فەرموویەتی: "لئن بقيت الى قابل، لألحقن آخر الناس بأولهم، ولأجعلنهم بياناً واحداً".[1] واتە: ئەگەر ژیام تاکو ساڵی ئاینده، دواین کەس دەگەیەنم بەیەکەم کەسدا و هەموویان وەکو یەك لێدەکەم.

ئینجا سەبارەت بە دیدی عومەر بۆ ماڵە گشتی یەکان لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت: "ان الله جعلني خازناً لهذا المال وقاسماً له، ثم قال: بل الله يقسمه".[2] واتە: خوای گەورە منی کردووەتە پارێزەرو دابەشکەر بۆ ئەم ماڵە، دوای فەرمووی: بەڵکو خوای گەورە خۆی دابەشی دەکات.

ئینجا کاتێك ئەو هەموو ماڵو سامانەی بینی لە فتوحاتی فارسەوە دەهێنرا بۆ (بيت المال)، دەستی کرد بە گریان، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بیری خستەوە کە ئەمە ڕۆژی سوپاسی خواو دەربڕینی خۆشیو شادیە، عومەر فەرموی: "نەخێر کەسانێك نی یە ئەمەیان پێبدرێت تاکو کینەو دوژمنایەتیان نەکەوێتە نێوانەوە".[3]

هەروەها کاتێك چاوی کەوت بە دەستکەوتەکانی جەلەولا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ).[4] ئەمجا فەرمووی: خوایە گیان ئەوەندەمان پێدەکرێت دڵخۆشبین بەوەی کە بۆت ڕازاندوینەتەوە جا خوایە گیان پشتیوانم بە بۆ ئەوەی لە

---

١) إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٤، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٧٦، والاثر صحيح.

٢) سعيد بن منصور: السنن ٢: ١٢٤، ١٢٥، واحمد: المسند ٣: ٤٧٥، ٤٧٦، إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٧، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٤٩٩، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٣ـ ٤٦٤، والحاكم: المستدرك ٣: ٢٧٢، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٢١٠، ٣٤٩، والاثر صحيح.

٣) إبن المبارك: الزهد ٢٦٥، وعبدالرزاق: المصنف ١١: ١٠٠، واحمد: المسند ١: ١٦ والزهد ١٤٣، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٠٠ـ ٥٠١، والطبري: التاريخ ٢: ٤٧١، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٥٧ والاثر صحيح.

٤) (آل عمران : ١٤)

جێگای شیاوی خۆیدا خەرجی بکەم، پەنایشت پێدەگرم لە خراپی یەکانی.[1]

سەبارەت بە دینداری عومەریش بەرانبەر بە ماڵی گشتی، دەفەرموێت: "ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی کە بە رەوای دەزانم بۆ خۆم لە ماڵی خوا، دوو جلو بەرگ بۆ زستانو هاوین، وڵاخێکیش بتوانم حەجو عومرەی پێبکەم، خۆراکی خێزانەکەیشم وەکو کەسێك لە قوڕەیش نە دەوڵەمەند بێتو نەهەژار، من کەسێکم لە موسڵمانان حاڵم حاڵی ئەوانە".[2]

هەروەها دەیفەرموو: ئەی پەروەردگار، تۆ ئاگاداریت ژەمەکەی خۆم نەبێت ناخۆمو جلەکەی خۆم نەبێت ناپۆشمو پشکەکەی خۆیشم نەبێت وەرناگرم..".[3]

ئینجا دەیفەرموو: "سەبارەت بە خۆم ماڵی خوا وەکو ماڵی هەتیو دادەنێم، ئەگەر کەسێك دەوڵەمەند بێت با خۆی لێ بەدوور بگرێت، ئەگەر کەسێکیش هەژارە با بەشی خۆی زیاتر نەخوات".[4]

لە ساڵی رەمادەدا ئەوپەڕی نموونەی نواند، کاتێك خواردنی ڕۆنی لەسەر خۆی قەدەغە کردو تەنها لەسەر زەیتو جۆ دەژیا وەکو هەماهەنگی لەگەڵ خەڵکی، تاکو ئەو گرانی یە لا دەچێت.[5] هەروەها لە سەرەتای خیلافەتدا خۆی پاراست لە خواردنی ڕۆنو ماست بە هۆی بەرزبوونەوەی نرخەکانی، چونکە نرخی خواردنێکی دیاریکراو کە لە خورماو کەشكو ماست دروستدەکرا بەرز بووەوە بۆ چل درهەم.[6]

## خۆراكو پێبژی:

بێجگە لە مووچەی ساڵانە، دەوڵەت ئازووقەو پێبژی دابەشدەکردە سەر هەندێ فەرمانبەرو خەڵکی دیاردا، عومەر (رەزای خوای لێبێت) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی ناردە کووفە وەکو فەرمانڕەواو بەرپرسی گەنجینە، عوسمانی کوڕی حونەیفیشی لەسەر پێوانەی زەویو عەمماری کوڕی یاسریش بۆ

١) إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٥٥٦ـ ٥٥٧، واحمد: الزهد ١٤٣ ـ ١٤٤، وابن شبة: تاريخ المدينة ٦٩٩ وهو أثر حسن.

٢) عبدالرزاق: المصنف ١١: ١٠٤ـ ١٠٥، وابن سعد: الطبقات ٣: ٣٧٥ـ ٣٧٦، إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٥٩ـ ٤٦٠، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٠٠ـ ٦٠١، وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٦٩٨، والاثر صحيح.

٣) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٠٢، وعمر بن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٦٩٨ والاثر صحيح.

٤) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٧٦، إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٦٠ وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٠١ والاثر حسن لغيره.

٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣١٣، وعبدالرزاق: المصنف ١١: ٢٢٣ والاثر صحيح.

٦) الطبري: تاريخ ٢: ٥٠٨ عن سيف، وهو عمدة في التاريخ ومتروك في الحديث.

پێش نوێژیو كاروباری جەنگ، رۆژانە بۆهەریەك لەوانە مەڕێكی تەرخان كرد، نیوەی بۆ عەمارو چواریەكی بۆ عوسمانو ئەو دوای بۆ عەبدوڵڵا.[١] ئینجا ئەو كاتەی سەردانی شامی كرد داوای لەسەركردەی سەربازەكان كرد مانگانە بۆ هەموو پیاوێك لە موسڵمانان نزیكەی سیو شەش كیلۆگرام گەنمو دوو بڕ زەیتو سركە[٢] دەستەبەر بكەن بۆیان، دوای ئەوەی لە رێگەی لێكۆڵینەوە بۆی دەركەوت كە ئەو بڕە ئازووقەیە بەشی یەك كەس دەكات بۆ ماوەی مانگێك، چونكە ئەو بڕە خۆراكە درا بە سی كەس بینرا تێریان دەكات.[٣]

هەروەها عومەر (رەزای خوای لێبێت) سەروپێو زافەرانی[٤] دەنارد بۆ خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا فەرمانی دەكرد جلوبەرگی چاك دروست بكرێت بۆ یارو یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ، كە نرخی ئەو جۆرە جلانە (بوردەی یەمەنی) لە نێوان (١٠٠٠- ١٥٠٠) درهەمدا بوو، بەڵكو هەندێ جار نرخەكەی دەگەیشتە (١٥٠٠) درهەم،[٥] تەنانەت هاوەڵی بەڕێز موعازی كوڕی عەفرا پۆشاكەكەی خۆی فرۆشت بە (١٥٠٠) درهەمو پێنج كۆیلەی پێ ئازاد كرد، هەربۆ زانیاریش پۆشاكێكی ئەستووری ئاسای تەنها بە سەد درهەم بوو.[٦]

زۆرترین ئازووقەیش كە دەوڵەت دابەشی كرد لە ساڵی رەمادە بوو، چونكە لە ئەو ساڵەدا گرانیەك بۆ ماوەی نۆ مانگ باڵی كێشا بە سەر نەجدو حیجازدا، زەوی لەبەر بێبارانی رەش بوویەوە، واقیدی[٧] لە بارەی ئەو گرانیو وشكەساڵی یەوە زۆری باسكردووە، چۆن عەرەبە بیاباننشینەكان شوێنەكانی خۆیان بەجێدەهێشت بەرەو مەدینە، ژمارەی ئەو كەسانەش كە دەوڵەت بە خۆراك

---

١) عبدالرزاق: المصنف ٦: ١٠٠- ١٠١، ١٠: ٣٣٣، وابن سعد: الطبقات ٨: ٦، واحمد: المسند ١: ١٥٩ وفضائل الصحابة ٢: ٨٤٢، وابن زنجويه: الاموال ١: ٢٠٦، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٥٤، والخطيب: تاريخ بغداد: ١: ١٠، ١١، والاثر حسن لغيره.

٢) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٤٤، ٤٥٧، والاثران صحيحان.

٣) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٤٥- ٥٤٦، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٤٦٤- ٤٦٥، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤٦ والاثر حسن لغيره.

٤) ابن سعد : الطبقات ٣: ٣٠٢- ٣٠٣ وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٤٠، والاثر صحيح، وأبوعبيد: الاموال ٢٥٤- ٢٥٥ والاثر صحيح.

٥) عبدالرزاق: المصنف ١: ٣٨٣- ٣٨٤، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٥٤- ٥٥٥، والحاكم: المستدرك ٤: ١٨٧ والاثر صحيح.

٦) ابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٨١- ٧٨٢ والاثر صحيح.

٧) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣١٠.

یارمەتی دەدان گەیشتە شەست هەزار، هەندێکیان بە هەزاران سفرەیان بۆ رادەخرا، هەندێکیشیان خۆراکیان بۆ دەگەیەنرایە ماڵی خۆی، ئینجا خەلیفە داوای لە فەرمانڕەواکانی لەسەر شارەکان کرد، خۆراك و پۆشاکی بۆ بنێرنو ئەوانیش دەیاننارد، لە پاش ئەوە عومەرو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نوێژەبارانەیان کردو بارانیان بۆ باریو زەوی دووبارە زیندووبوویەوەو بیابانشینەکان جارێکی تر گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، عومەریش پاش ئەم رووداوە سەختانە فەرمووی: "سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگارمان، سوێند بە خوا ئەگەر ئەم کارەساتە لانەچووبا، هیچ ماڵێکی دەوڵەمەندی بەجێنەدەهێشت تاکو چەندین ئەوەندەی خۆیانی هەژار تێنەکردایە". [١]

## خەرجی یە کتوپڕەکان:

بۆ نموونە: عومەر (رەزای خوای لێبێت) خەرجی منداڵێکی دۆزراوەی خستە سەر خەزێنەی موسڵمانان، [٢] بە هەمان شێوەی خوێنبای پیاوێك کە لە نێو کەعبەدا کوژرا خستیە سەر ماڵی گشتی. [٣]

١) البخاري: الادب المفرد ٨٣، وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٣٨ـ ٨٣٩، والاثر صحيح.

٢) عبدالرزاق: المصنف ٧: ٤٥٠، إبن أبي شيبة: المصنف ٦: ٢٩٥ والاثر صحيح.

٣) عبدارزاق: المصنف ١٠: ٥١ والاثر صحيح.

## باسی چوارەم

## چاکسازیەکان

### ١ـ تەرخانکردن:

ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) بەردەوام بوو لە جێبەجێکردنی سیاسەتی پێغەمبەرایەتی لە تەرخانکردنی زەوی بۆ خەڵکی بە مەبەستی بەرهەمهێنانی، بۆ نموونە پارچە زەوی یەکی بێکەڵکی لە نێوان جورفو قەناتدا تەرخان کرد بۆ زوبێری کوڕی عەوام،[١] هەروەها لادێ یەکی لە دەڤەری یەمامەی[٢] دایە مەجاعەی کوڕی مەرارەی حەنەفی، دەشیویست پارچە زەوی یەك بداتە زوبروقانی کوڕی بەدر، بەڵام پاشگەزبوویەوە لەبەر ناڕەزای عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێت). بەهەمان شێوە نیازی هەبوو زەوی یەکی بێکەڵك بداتە عویەینی کوڕی حیصنی فەزاریو ئەقرەعی کوڕی حابیس بەمەبەستی هۆگربوونیان بەئیسلامەوە، بەڵام هاتە سەر بۆچوونی عومەر (رەزای خوای لێبێت) کە پی فەرموون: "پێغەمبەری خوا ﷺماڵی پێدەدان لە کاتێکدا ئیسلام لاواز بوو، بەڵام وا دەبینن دینی خوا سەربەرز بووەو ئیتر ئێوەش بچن هەوڵی خۆتان بدەن".[٣] ئاشکرایشە کە عومەر (رەزای خوای لێبێت) نارازی نەبوو لەسەر خودی تەرخانکردن، بەڵکو لەسەر کەسانێکی دیاریکراو بە پێویستی نەدەزانی بە پارە رابگیردرێن.

ئینجا عومەر (رەزای خوای لێبێت) بەشێوەیەکی فراوان زەوی تەرخان دەکرد بە مەبەستی بەرهەمهێنانی وەکو درێژەپێدانێك لەسەر سیاسەتی پێغەمبەر ﷺ، تاکو گەیشتە ئەوەی کە رایگەیاند: "خەڵکینە هەرکەسێك زەوی یەکی زیندووکردەوە دەبێتە ماڵی خۆی".[٤]

١) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ١٠٤، والاثر صحيح. إبن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٣٥٤، والبلاذري: فتوح البلدان ٣١، والبيهقي: السينن الكبرى ٦: ١٤٤.

٢) البخاري: التاريخ الكبير ١: ٣٧٦ والتاريخ الصغير ١: ١١٩ وفي الاسناد هشام بن اسماعيل مجهول الحال، وابن حجر: الاصابة ٣: ٥٢١، وفي الاسناد هلال بن سراج الحنفي المقبول، فالاسناد ضعيف لانه متابعة هشام لا تعضده.

٣) إبن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٣٥٦، والبخاري: التاريخ الصغير ١: ٨١، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٣: ٣٧٣، والبيهقي: السنن الكبرى ٧: ٢٠، والاثر أسانيده مرسلة، فعبيدة السلماني لم يسمع من أبي بكر أو عمر رضي الله عنهما (الاصابة ١: ٧٣) حيث ينتقل رأى ابن المديني. وابو عبيد: الاموال ٢٩٠ من مرسل عبدالرحمن بن يزيد بن جابر الازدي باسناد حسن. والمتقي الهندي: كنز العمال ١: ٣١٥ عن عبدالرزاق من مرسل طاووس، والمراسيل الثلاثة تعتضد لتقوية الخبر.

٤) مالك: الموطأ ٢: ٢١٧، ويحى بن آدم: الخراج ٨٧، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٥١ والاثر صحيح.

هەندێ ریوایەتی لاوازیش یەکدەگرنو ئەوە دووپات دەکەنەوە کە عومەر (رەزای خوای لێبێت) خاوەنێتی هەندێ لەو زەویە تەرخانکراوانەی لە خاوەنەکانیان وەرگرتووەتەوە، چونکە هەڵنەساون بە بەرهەمهێنانیان[1]، ریوایەتێکی لاوازی تریش هەیە ئەو کاتە بە سێ ساڵ دیاریدەکات لە کاتی تەرخانکردنەکەوە،[2] جێگیریش بووە کە عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێت) پارچە زەوی یەکی بێکەڵکی تەرخان کرد بۆ خەواتی کوڕی جوبەیر[3]، هەروەها هەموو زەویەکانی عەقیق بۆ زوبێری کوڕی عەوام،[4] زەوی یەنبوعیشی تەرخان کرد بۆ عەلیو ئاوی زۆری تیاهەڵقولا، ئینجا عەلی (رەزای خوای لێبێت) کردی بە صەدەقە بۆ هەژاران،[5] هەندێ شوێنەواری تریش هەیە لەسەر ئەوەی چەند زەوی یەکی تری داوەتە یارو یاوەران،[6] ئینجا عومەر (رەزای خوای لێبێت) رازی نەبوو کە زەویەکانی بەحرێن بداتە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ئەمیش بووە هۆی تورەبوونی عەباس، چونکە شایەتێك زیاتری نەبوو لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی تەرخان کردووە.[7]

کاتێك عوسمانیش (رەزای خوای لێبێت) بوو بە خەلیفە تەرخانکردنی زۆر کردەوە، بە تایبەت لە ناوچە فەتحکراوەکاندا، چونکە ژمارەیەك لە دەرەبەگەکان زەویو زارەکانیان بەجێهێشت و هەڵهاتن، بۆیە دەکەوتە دەستی دەوڵەت بۆ بەرمهێنانیان، ئیتر عوسمان هەندێ لە ئەو زەویانەی تەرخان دەکرد

---

١) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٤٥.

٢) ويحى بن آدم: الخراج ٨٨، وعبدالرزاق: المصنف ٩: ١١، ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٤٤. والبيهقي: السنن ٦: ١٤٨.

٣) والبلاذري: فتوح البلدان: ٢٦ والاثر حسن.

٤) ابن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٧٢، ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٢٦، والبلاذري: فتوح البلدان ٣٤ والاثر صحيح.

٥) ابن أبي شيبة: المصنف ٦: ٤٧٢، وابن شبة: تاريخ المدينة ١: ٢٢٠ـ ٢٢١، والبلاذري: فتوح البلدان: ٢٦ـ ٢٧، والبيهقي: السنن ٦: ١٤٤، ١٦٠ـ ١٦١، والاثر يرقى بطرقه الى الحسن.

٦) ئەوانەش: عوسمانی کوڕی ئەبوعاص (وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٢٦)و مەجاعەی کوڕی مەرارەی سولەمی (وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٢٠ـ ٦٢١، والبلاذري: فتوح البلدان ١٠٢) و خەواتی کوڕی جوبەیر (ابن شبة: تاريخ المدينة ١: ١٥١، البلاذري: فتوح البلدان ٢٦) و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصو عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو خەبابی کوڕی ئەرەتو ئوسامەی کوڕی زەیدو زوبێری کوڕی عەووام (يحى بن آدم: الخراج ٧٦) و عەبدوڵلای کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعی (الطبري: تاريخ ٢: ٥٥٤ عن علي بن مجاهد متروك) و تەمیمی داری کە گوایە لێی قەدەغەشکردبێت بیفرۆشێ (أبوعبيد: الاموال ٢٨٨).

٧) إبن سعد: الطبقات ٤: ٢٢ـ ٢٣ والاثر حسن.

بۆ کەسانێك لەبەر مەترسی بە کەڵك نەمانیان،[1] پێشەوا ئەحمەدیش وای بۆ دەچێت کە عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەندێ لە زەوی یەکانی سەوادیشی دابەشکردووە،[2] بێگومان ئەو زەویانەی کە خاوەنەکانیان هەڵدەهاتنو تایبەت دەکران بە خەلیفەوە دەستکاری کردنی زۆریان دەکەوتە سەوادەوەو هەرچۆنێکیش بێت دابەشکردن لەو زەویانە داهاتەکانی بەرزدەکردەوە لە نۆهەزار درهەم لەسەردەمی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ پەنجا ملیۆن درهەم لەسەردەمی عوسمان[3] (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ سیاسەتی سەرکەوتووی لە بەڕێوەبردنی ئەو جۆرە زەویانەی کە بە (صوافی) ناو دەبران.

سەرچاوەکان لیستێك دێننەوە بەناوی ئەو کەسانەی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) زەوی بۆ تەرخانکردن، زۆربەشیان لە هۆزی قوڕەیش نین، زۆربەی ئەو ریوایەتانەش لاوازن و بەسەریەکەوە باس لەوە دەکەن کە عوسمان زەوی زۆر دابەشکردووە، ئەمەیش ناوی هەندێکە لەو کەسانەی زەویان بۆ تەرخانکراوە لە لایەن عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێبێت):

١ـ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی هوزەلی (زەوی یەك لە نێوان هەردوو رووباری بیلو بین لە سەواد).

٢ـ عەمماری کوڕی یاسری عەنسی (ئەستینیا).

٣ـ خەبابی کوڕی ئەرەتی تەمیمی (صەعنەبی ـ لادێ یەکە لە سەواد).

٤ـ عەدی کوڕی حاتمی تائی (رەوحا ـ لادێ یەکە لە لادێکانی بەغدا لەسەر رووباری عیسا).

٥ـ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی زوهری قوڕەیشی (لادی هورموز لە دەشتی فارس).[4]

٦ـ زوبەیری کوڕی عەووام.

٧ـ ئوسامەی کوڕی زەیدی کەلبی.

٨ـ سەعیدی کوڕی زەیدی عەدەوی قوڕەیشی.

٩ـ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی (زەوی یەك لەسەر رۆخی فورات).

١٠ـ ئیبنو هەببار.

١) أبوعبيد: الاموال ٢٦١، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٧٣، وابن قدامة: الخراج وصناعة الكتابة ٢١٧، والماوردي: الاحكام السلطانية ١٩٣.

٢) إبن رجب: الاستخراج في أحكام الخراج ٤٢٨ـ ٤٣٠.

٣) الماردي: الأحكام السلطانية ١٩٣.

٤) محمد بن محمد علي العواجي: خلافة عثمان بن عفان ١٨٠ـ ١٨٢ هەموویشی ریوایەتی لاوازەو زۆربەشی ئیسنادی نییە.

١١- تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵای تەیمی قوڕەیشی (نەشاستج - لە کووفە).
١٢- وائیلی کوڕی حیجری حەزرەمی (زەوی یەك لە دوای لادی زورارە لە کووفە).
١٣- خالیدی کوڕی عەرفەتەی قوزاعی (زەوی یەك لای حەمام (أعین) لە کووفە).
١٤- ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی ( تیزناباد - جێگایەکە لە نێوان کووفەو قادسیە).
١٥- ئەبومیربەدی حەنەفی (زەوی یەك لە ئەهواز لەسەر روباری تیری).
١٦- نافیعی کوڕی حاریسی کوڕی کیلدەی سەقەفی(زەوی یەك لای رۆخی عوسمان لە بەصرە).
١٧- ئەبوموسای ئەشعەری (پارچەیەك لە حەمام عەترە).[1]
١٨- عوسمانی کوڕی ئەبوعاصی سەقەفی (شط عثمان - لەبەصرە).

واشدەردەکەوێت کە دوورکەوتنەوەی خاوەنی ئەم زەویانە بووەتە هۆی بێکەڵکبوونیان، بۆیە عوسمان (رەزای خوای لێبێت) داوێتی بە کەسانێك بۆ بەرهەمهێنیان، وادیارە موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانیش هەندێ زەوی تری لە ئەنتاکیە دابەشکردووە بە فەرمانی عوسمان[2] و هەندێکی تریشی لە رۆخەکانی شام تەرخانکردووە بۆ کەسانێك بۆ چاککردنو ئامادەکردنیان بۆ بەرنگاری رۆمەکان،[3] جگە لە هەندێ پارچەی تر لە بەقالیقلا[4] و بڕێك لەو زەویانەی مافی دەستکاریکردنیان دەگەڕایەوە بۆ خەلیفە لە شام.[5] بەڵام سەبارەت بە پێدانی فەدەك بە مەراونی کوڕی حەکەم ئەوە شتێکی زانراو نی یە لە رێگەیەکی راستەوە،[6] دەشگێڕنەوە کە فەدەك لە لایەن موعاویەوە دراوەتە مەروان.[7]

---

١) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٣٥.
٢) البلاذري: فتوح البلدان ١٣٣.
٣) البلاذري: فتوح البلدان ١٥٣، وياقوت الحموي: معجم البلدان ٤: ٢٩٩.
٤) البلاذري: فتوح البلدان ٢٠٠- ٢٠١.
٥) إبن عساكر: تاريخ دمشق ١: ١٧٢- ١٨٣.
٦) أبوداود : السنن ٣: ١٤٣ رقم ٢٩٧٢، بسند ضعيف (ضعيف سنن أبي داود للالباني ٢٩٣ رقم ٦٣٧ فيه عبدالله بن الخراج التميمي صدوق يخطيئ والمغيرة بن مقسم يدلس) ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٥٨٧، بسند فيه سليمان بن أرقم ضعيف جداً، وهشام بن عمار صدوق كبر فصار يتلقن، لكنه هذا من قديم حديثه، ولا يعتضد الخبران لشدة ضعف سليمان بن ارقم.
٧) البلاذري: فتوح البلدان ٤٥- ٤٦ بسند فيه ابن برقان مجهول.

## ٢ـ لەوەڕگەکان:

بریتی بوون لە زەویگەلێك تەرخانکرابوون بۆ لەوەڕگەی حوشترو ئەسپەکانی دەوڵەت، دۆڵی نەقیع بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکرابوو، بە درێژای خیلافەتی ئەبوبەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت)، چونکە پێشتر پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو مەبەستە تایبەتی کردبوو،[١] ئەم لەوەڕگە درێژای هەشتا کیلۆمەتر بوو، بە چل کیلۆمەتر لە باشوری مەدینەوە دەستی پێدەکرد.[٢]

ئینجا لەوەڕگەکان لەسەردەمی عومەردا فراوانتر بوونەوە، بە هۆی زۆربوونی دارای دەوڵەت بۆ حوشترو ئەسپی ئامادەکراو بۆ جیهاد، لەوانە لەوەڕگەی ڕەبەزەی تایبەت بە ولاخەکانی زەکات،[٣] کە بەکرێگرتەیەکی خۆی لەسەر دانابوو به ناوی هەننیو ڕاسپاردەشی پێکردبوو کە ڕێگە بدات بەخاوەن وشترە کەمەکان سوود لەو لەوەڕگەیە وەربگرن، بەڵام ئەو بوارە بۆ دەوڵەمەندەکان نەکاتەوە.[٤] زەوی یەکی تریشی تەرخانکرد لە ناوچەی بەنی سەعلەبە وەکو لەوەڕگە بۆ ولاخەکانی دەوڵەت، سەرەڕای ناڕەزای بوونی ئەو خێڵە و وەڵامدانەوە: "وڵات وڵاتی خوایەو بۆ مەڕو ماڵاتی خوا تەرخان دەکەین".[٥] دەوترێت کە زەوی یەکی تریشی بەهەمان شێوە کردبوو بە لەوەڕگە بە شەرەف دەناسرا.[٦]

## ٣ـ خەرجکردنی لەسەر ساختمان:

### دروست کردنی مزگەوت:

دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەدا هەڵدەسا بە خەرجکردن لە سەر دەزگا گشتی یەکان، بۆ نموونە ساپیتەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺو کۆڵەکەکانی لەسەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) نوێکرایەوە، بەڵام لە نوێکردنەوەدا جگە لە دارخورما و گەڵاکانی هیچ

---

١) أحمد: المسند ٨: ٤٠و ٩: ١٧١ـ ١٧٢، ١٧٩ بتحقيق أحمد شاكر وقال: اسناده صحيح وصحيح سنن أبي داود للالباني ٢: ٥٩٥.

٢) البلاذري: معجم المعالم الجغرافية في السيرة النبوية ٣٢٠.

٣) ابن أبى شيبة: المصنف ٥: ٦ باسناد صحيح، وأحمد: الزهد ١٤٤ باسناد حسن.

٤) ابن حجر: فتح الباري ٦: ١٧٦، والاصابة ٣: ٦٢٠ عن الواقدي.

٥) إبن سعد: الطبقات ٣: ٣٢٦ وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٦٨ـ ٦٦٩ وابن شبة: تاريخ المدينة ٣: ٨٨٩ والاثر صحيح.

٦) البخاري: الصحيح ٢: ٥٣ تعليقاً، والتعليقات لا تأخذ حكم الصحيح، وابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠٥، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٦٦، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ١٤٦ والاثر ضعيف لانه من مراسيل الزهري.

بەکارنەهێنرا.[١] هەروەها مزگەوتەکەشی گەورە نەکرایەوە.[٢] بەڵام عومەر (رەزای خوای لێبێت) لە خیلافەتی خۆیدا رووبەری مزگەوتەکەی گەورە کردەوەو ماڵەکەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی دایە دەمی یەوە،[٣]
گەورەکردنەکە دە باڵی بەلای قیبلەو بیست باڵی بەلای رۆژئاواداو حەفتا باڵی بەلای باکووردا گرتەوە،[٤] دووبارە درووستی کردەوە بە خشتو گەڵای دارخورما، کۆڵەکەکانیشی لە دار دروستکرد،[٥] ساپیتەکەشی بە گەڵای دارخورما گرتو داشیپۆشی بۆ پاراستنی خەڵکی لە باران، قەدەغەشی کرد کە بڕازێنرێتەوە بە هیچ سووریو زەردی یەك تاکو خەڵکی لە نوێژەکانیاندا شەیدا نەکەن،[٦] زەوی یەکەشی چەوڕێژکرد بە چەوێك کە لە ناوچەی عەقیق هێنرا.[٧]
هەروەها عومەر (رەزای خوای لێبێت) هەندێ دەستکاری کەمی کرد لە (المسجد الحرام) لە مەککە، جێپێی ئیبراهیم کە لکابوو بە کەعبەوە گواستی یەوە بۆ ئەو جێگەی ئەمڕۆ تیایدایە بەمەبەستی ئاسانکاری لەسەر ئەوانەی تەوافو نوێژ دەکەن،[٨] ژوورچگەکەشی لەسەر دروستکرد،[٩] بۆ یەکەمین جاریش دیوارێکی کورتی بە دەوری ماڵی خوادا دروستکرد،[١٠] لە پارەی (بیت المال)یش پۆشاکێکی بۆ کەعبە دروستکرد کە قوباتی پێدەوترا،[١١] کە بریتی بوو لە بەرگێکی میصری سپی تەنك.
ئینجا هەر لە خیلافەتی عومەردا (رەزای خوای لێبێت) مزگەوت لە شارە تازەکاندا دروست دەکرا، بۆ نموونە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص مزگەوتی گەورەی دروستکرد لە کووفە، عوتبەی کوڕی

---

١) أبوداود: السنن ١: ١٢٣ باسناد ضعيف لأن عطية العوفي مدلس.
٢) البخاري: الصحيح ١: ١٢١، وأحمد: المسند ٢: ١٣٠، أبوداود: السنن ١: ١٢٣.
٣) ابن سعد: الطبقات ٤: ٢١، ٢٢، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٥١٢، والحاكم: المستدرك ٣: ٣٣١ـ ٣٣٢.
٤) غالي محمد الامين الشنقيطي: الدر الثمين في معالم دار الرسول الامين ٨٣.
٥) البخاري: الصحيح ١: ٨٩.
٦) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٤: ٩٨).
٧) أحمد: فضائل الصحابة ١: ٣٢٥، وابن سعد: الطبقات ٣: ٢٨٤، والبيهقي: السنن ٢: ١٤٤، وتعتضد طرقه الى الحسن.
٨) عبدالرزاق: المصنف ٥: ٤٧ـ ٤٨، والفاكهي: تاريخ مكة ١: ٤٥٤ـ ٤٥٦، ويعتضد بطرقه الى الحسن وانظر ابن حجر: فتح الباري ٨: ١٦٩.
٩) ابن حجر: فتح الباري ٨: ١٦٩.
١٠) البخاري: الصحيح ٢: ٣١٧.
١١) الازرقي: أخبار مكة ١: ٢٥٣، وعبدالرزاق: المصنف ٥: ٨٩ باسناد ضعيف.

غەزوانیش مزگەوتی گەورەی لە بەصرە دروستکرد، عەمری کوڕی عاصیش مزگەوتی گەورەی لە فوستات دروستکرد، ئەم مزگەوتانەش بوونە جێگای نوێژکردنی موسڵمانانو یەکترناسینو وانەخوێندنو داوەریو وەرگرتنی فەرمانەکانی خەلیفەو فەرمانڕەواکان.

**دروستکردنی شارەکان:**

بێگومان هێڵەکانی گواستنەوە لە نێوان مەدینەی منەوەرە کە پایتەختی خیلافەتی راشیدە بوو دوورکەوتەوە لەگەڵ گۆڕەپانی جەنگ لە عێراقو ئێرانو شامو میصرو ئەفریقا، بۆیە پێویست بوو بنکەی سەربازی دروستبکرێت لە سنووری ناوچە فەتحکراوەکاندا، کە شیاو بێت بۆ نیشتەجێبوونی جەنگاوەرەکان، هەروەها خزمەتگوزاری یەکانیان بۆ دابین بکات، سەبارەت بە جێگای شارە تازەکانیش بە راوێژ هەڵبژێردرا لە نێوان عومەری کوڕی خەتابو سەرکردە مەیدانی یەکان.

ئینجا عومەر (رەزای خوای لێبێت) سەرکردەکانی بێدار کردەوە کە شارەکان پێویستە نزیکی ئاوو لەوەڕگە بنو موسڵمانانی تیادا کۆببنەوە، جا سەرکردەکان شارەکانیان دروستکرد، بەصرە لە لایەن عوتبەی کوڕی غەزوان (١٤ـ ١٦ ك)و کووفە لە لایەن سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە لە ساڵی (١٧ك)،[1] فوستاتیش لەلایەن عەمری کوڕی عاصەوە دروستکران.

لە هەڵبژاردنی شارەکان ئەوە تێبینی دەکرا کە هەر سێ شارەکە بەربەستی سروشتی وەکو رووبارو چیا لە بیابان دایاننابڕێت، بۆ ئەوەی لە کاتی ناچاری بە ئاسانی کشانەوە بکرێت بۆ بیابان.[2]

بۆ دروستکردنی مزگەوتەکەشی لە ناوەڕاستی بەصرە، بە زۆری ژاژیان بەکاردەهێنا، لە نزیك مزگەوتەکەش عوتبە هەڵسا بە دروستکردنی سەرکردایەتیو بەندینخانەو دیوانیش بە تەنیشتیانەوە، جا موسڵمانان لە سەردەمی یەکەمدا کە دەرچووبان بۆ جیهاد لە ئەو ژاژەیان هەڵدەکەندو دەیانکردە گورزە، کە دەشگەڕانەوە جارێکی تر دروستیان دەکردەوە.

ئینجا کاتێ ئەبوموسای ئەشعەری فەرمانڕەوایەتی بەصرەی گرتە دەست، سەرکردایەتی دروستکرد لە خشتو قوڕ، ساپیتەکەشی بە گژوگیا گرت، رووبەری مزگەوتەکەشی فراوانکردەوە، دوای ئەوە خەڵکی دەستیان کردە دروستکردنی خانوو بە خشت بە تایبەتی پاش ئاگر کەوتنەوەی بەصرە.[1]

---

١) الطبري: تاريخ ٢: ٤٧٧.

٢) چەندین ریوایەتی لاواز ئەوە دووپاتدەکەنەوە کە ئەوە بە ئاراستەکردنی عومەری کوڕی خەتتاب بووە (رەزای خوای لێبێت) (إبن عبدالحكم: فتوح مصر ٩١).

بەلاّم دروستکردنی کووفە لە سالّی (١٧ك) بوو، موسلّمانان ئەو کاتە لە مەدائین جێگیربوون و مزگەوتیان تیادا دروستکردبوو، بەلاّم کەشوهەوای ئەو شوێنەیان بەلاوە ناخۆش بوو، بۆیە لەم بارییەوە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص نوسراوی نارد بۆ عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێت)، ئەویش فەرمانی هاتە سەر ئەوەی شارێك دروستبکرێت، جا ئەبولهەیاجی سولەمی هەلّسا بە نەخشەکێشانی کووفە بەپی ئاراستەکردنی گشتی خەلیفە، بۆ نموونە پانیی جادە سەرەکی یەکانی کرد بە چل گەزو جادەکانی تری کرد بە سی گەزو هەندێکێشیان بیست گەز، پانی کۆلاّنەکانیش بە حەوت گەز دانراو نابێت رێگایەك پانی لەوە کەمتر بێت.

رێگە سەرەکی یەکان بە سنووری جیاکەرەوە دانران لە نێوان خێوەتگای هۆزەکان کە دەکەوتنە ئەمبەرو ئەوبەری رێگاکانەوە، پێش هەموو شتێك دەسکرا بە دروستکردنی مزگەوتی گەورە لە ناوەڕاستی شاردا، ئەمجا بۆشایەکان وەکو گۆرەپان بەدەوریدا بەجێهێشت، ئینجا دەستکرا بە دروستکردنی تەلاری سەرکردایەتیو خانووەکانی تایبەت بە خەزێنە بە تەنیشت مزگەوتەکەوە، مالّی سەعدیش دووسەد گەز لە مزگەوتەکەوە دووربوو، لە ئەودیو بۆشای یەکەشەوە کەندەرێك دروستکرا بۆ ئەوەی خانووی خەلّکی نەگاتە ئەوێ، رێگەش درا بازاڕ دابنرێت لە بۆشای دەوروبەری مزگەوتەکەدا، بەلاّم بەبێ دروستکردنی دوکان، جێگاکانیش دەبنە هی ئەو کەسەی یەکەم جار تیادادەنیشێ لە فرۆشیارەکان، ئینجا لە دەوروبەری گۆڕەپانی مزگەوتەکە جێگا بۆ هەریەك لە هۆزەکان دیاریکرا کە تایبەت بوو بە خۆیانەوە.[٢]

سەبارەت بە فوستاتیش عەمری کوڕی عاص هەلّسا بە دروستکردنی، مزگەوتی گەورە و تەلاری سەرکردایەتی و جێگای هۆزەکانیش لە دەوریدا.

---

١) صالح العلي: خطط البصرة ومنطقتها ٤٦، وانظر البلاذري: فتوح البلدان ٣٤١ـ ٣٤٢، وياقوت: معجم البلدان ٢: ٣٦٣، والطبري: تاريخ ٢: ٤٧٩.

٢) ماسينيون: خطط الكوفتو وشرح خريطتها..

**هەڵکەندنی ڕووبارو کەنداو و ڕاگرتنی بەنداوو دەزگاکانی تر:**

دەوڵەتی ئیسلامی خەرجی کردە سەر چەند پرۆژەیەکدا، هەندێکیان بۆ چاککردنەوەی گواستنەوەی دەریای بوو، وەکو کەنداوی (أمیر المؤمنین) لە میصر، کە عەمری کوڕی عاص هەڵسا بە هەڵکەندنی لە نێوان نیلو کەنداودا، بەم شێوەیەش کەشتیەی میصری یەکان دەریای سووریان دەبڕیو کەلوپەلو خواردەمەنیان دەگواستەوە بۆ بەندەری مەدینە،[1] هەروەها هەڵسا بە هەڵکەندنی ڕێرەوێکی ئاوی بە درێژای سێ فەرسەخ لە خوورەوە بۆ بەصرە بۆ مەبەستی گەیاندنی ئاوی دیجلە بۆبەصرە.[2]

لە سەردەمی عومەریشدا لافاو لە کەعبەی داو جێپی ئیبراهیمی (علیه السلام) ڕامالی، بۆیە دوو بەنداو دروستکرا، یەکێکیان لە تاوێری گەورە بوو.[3]

ئینجا عومەر خانوویەکی بە چوار سەد دینار کڕی لە مەککەو کردی بە بەندیخانە،[4] هەروەها بەندیخانەیەکی تر لە کووفە دروستکرا بە قامیش،[5] بە هەمان شێوە و لە خیلافەتی عومەردا لە ڕێگەی نێوان مەککەو مەدینەدا چەندین جێگای حەسانەوە دروستکرا کە ئاوو سێبەری تیادا دابین بوو بۆ حاجیان.[6] ئەمانەو عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) خانوویەکی تەرخان کردبوو وەکو کۆگا بۆ کۆکردنەوەی ئاردو خورماو مێوژ و شتی تر بۆ کاتی پێویست.[7]

---

١) ابن عبدالحكم: فتوح مصر ١٦٣ـ ١٦٦ وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٤٥، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٥٥، والطبري: تاريخ ٢: ٥٠٩، هەموو ئەم ڕیوایەتانەش ـ کە لاوازن ـ یەکدەگرن بۆ جەختکردنە سەر ڕاستی مێژوویی زیندووکردنەوەی ئەم ڕێڕەوە ئاوی یە لە نێوان نیلو دەریای سووردا.

٢) البلاذري: أنساب الاشراف ٣٥٠ عن الكلبي وجماعة من اهل العلم.

٣) الازرقي: أخبار مكة ٢: ١٦٧ والسند مرسل، والبلاذري: أنساب الاشراف ٦٥ عن هشام الكلبي.

٤) البخاري تعليقاً (فتح الباري ٥: ٧٦)، وعبدالرزاق: المصنف ٥: ١٤٨، والازرقي: أخبار مكة ٢: ١٦٥، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٤ والاثر ضعيف. وانظر ابن القيم: الطرق الحكمية ١٠٢، ١٠٣.

٥) أبو هلال العسكري: الاوائل ١٢٠.

٦) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٢٨٣، ٣٠٦ عن الواقدي.

٧) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٨٣ بدون اسناد.

**٤ ـ پرۆژەی ئازادکردنی کۆیلە :**

کێشەی کۆیلایەتی هەر لە سەرەتاوە رووبەرووی ئیسلام بوویەوە، بێگومان ئەوەیش وەکو سیستمێکی جیهانی لە توانای ئیسلامدا نەبوو یەکسەر پووچەڵی بکاتەوە، هیچ رێکخراوێکی جیهانیش نی یە دان بنێ بە ئازادکردنی گشتی کۆیلەکاندا، ئینجا ئەگەر بێتو دەوڵەتی ئیسلامیی لە یەکلاوە کۆیلایەتی پوچەڵ کردبا، ئەوا نەیدەتوانی دیلەکانی خۆی ئازاد بکات کاتێك بە دەستی دەوڵەتێکی تر بکەوتبایە، لە رێگەی ئاڵوگۆڕکردنیان لەگەڵ ئەو دیلانەی موسڵمان نین، بەڵام ئەمانە رێگیر نەبوون لە پێش دەوڵەتی ئیسلامی کە بەرنامەیەك دارێژێت بۆ ئازادکردنی کۆیلە لەناو کۆمەڵگای ئیسلامی لە رێگەی کەفارەتو موکاتەبەو هاندانی ئازادکردنی کۆیلەکان لەبەر رەزامەندی خوای گەورەو رۆژی دوای.

ژمارەی ئەوە کۆیلانەش موکاتەبەیان دەکرد لەسەردەمی عومەردا لە زیادبووندا بوون، چونکە ئەوان یارمەتی دەدران لەبەر خوای گەورە، هەروەها دەوڵەتیش یارمەتیدەدان لە دەستکەوتو موچەکان بۆ ئەوەی پارەی خۆیانیان هەبێت و قازانجی لێبکەنو خۆیان ئازاد کەن لە کۆیلایەتی. هەروەها خاوەنەکانیان ناچار کرابوون ئازادیان بکەن هەرکاتێك ئەو برە پارەی لە موکاتەبەکە بەڵێنیان داوە بیدەن، ئەو برە پارەیەش دەگۆڕا بە پی کارامەی کۆیلەکە، جاری وا بوو دەگەشتە چل هەزار درهەم.

کاتێکیش داهاتەکانی (بيت المال) زۆر بوویەوە لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا (رەزای خوای لێبێت)، لە وەسیەتنامەکەیدا نووسیبووی کە هەموو کۆیلە موسڵمانەکان ئازاد بکرێن، بەڵام سەرچاوەکان باسی ئەوە ناکەن کە ئەم وەسیەتنامە جێبەجێکرابێت لەسەردەمی خیلافەتی راشیدەدا، لەوانەشە بارودۆخی بشێوی کە بە دوای خیلافەتی عومەردا روویدا رێگر بوویێت لە جێبەجێکردنی ئەو راسپاردەیە.[١] ئەم دەستپێشخەری یە عومەرانەیش کۆنترین هەوڵدانە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بۆ ئازادکردنی کۆیلە بەشێوەیەکی گشتیی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی زلهێزدا.

١) عبدالرزاق: المصنف ٨: ٣٨١، ٣٨٢، ٩: ١٦٧، ١٦٨، وابن سعد: الطبقات ٣: ٣٥٩ والخبر صحيح الاسناد.

**٥ـ دراو:**

دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) ئەو درهەمە زیوی یانەی بینی کە لە بازاڕە جۆراوجۆرەکان دەستاو دەستیان پێدەکرێت کێشەکانیان جیاوازن، هەندێکیان جۆری بەغلی یە هەشت دانەقە[1]و هەندێکیان تەبەری یەو چوار دانەقە، مەغریبیش هەیە سێ دانەقە، بەڵام جۆری یەمەنی یەك دانەقە، تێبینیشی کرد کە ئەوانەی زیاتر دەستاو دەستیان پێدەکرێت دوو جۆرن، تەبەری و بەغلی یە، جا هەردووکیانی کۆکردەوە بینی دوانزە دانەقن، نیوەی وەرگرت کردیە شەش دانەق، درهەمی ئیسلامی کرد بە شەش دانەق، هەروەها دەشگێڕنەوە کە ویستوویەتی درهەمەکان لە پێستی وشتر دروست بکات، بەڵام دواتر وازیهێنا لەو بیرۆکەیە.

ئینجا دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خیلافەتی راشیدەدا دیناری بیزەنتیو درهەمی ساسانی بەکاردەهێنا، دیناری بیزەنتی کێشی یەك مسقاڵ ئاڵتوون، یان هەشت دانەق، یان بیست قیرات بوو،[2] جێگریشە کە هەندێ سکەی ئیسلامی لێدراوە لە وڵاتی فارس لە دەوروبەری ساڵی بیستی کۆچیو سیو نۆی کۆچی، هەندێ وشەی عەرەبی و فارسی هاوبەشی لەسەرە، هەندێکیشی لە مۆزەخانەی عێراقی یە.[3]

ئینجا عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) چاودێری دراوەکانی دەکرد، بۆیە فرۆشتنی دراوی ساختەی قەدەغە کردبوو لەگەڵ دراوی چاکدا کە لە کێشەکەی خۆی کەمتر بێت، بەڵام وای بە باشدەزانی کە گڕ بدرێن تاکو مسەکەی یان ئاسنەکەی دەڕوات و زیوەکەی تەنها دەمێنێتەوەو ئەمجا بە کێشی خۆی بفرۆشرێت،[4] ئەمەش لەبەر مەترسی ڕوودانی تەڵەکەو فریودانی خەڵکی.

١) دانەق کۆدەکرێتەوە لە زمانی عەرەبی بە (دوانق)و (دوانیق) شەش یەکێکی درهەمی فارسییە (وەرگێڕ).

٢) عبدالقديم زلوم: الاموال في دولة الخلافة ٢٠٢.

٣) نووسەر باسی پێش ڕووخانی بەغدا دەکات لە نیسانی ٢٠٠٣، ئەگەرنا مۆزەخانەی عێراقی زۆربەی تالان کرا لە پاش ڕووخان (وەرگێڕ).

٤) وداد علي القزاز: الدراهم المضروبة على الطراز الساساني للخلفاء الراشدين في المتحف العراقي ١٣، ١٥.

**قەرزی باش:**

قەرزی باش کە هیچ سوودێکی بە دواوە نەبێت، باو بوو بە نیازی پاداشتی دوارۆژ، مەرجیشی ئەوە بوو کە هیچ سوودێك رانەکێشێ بۆ خاوەن پارەکە، بەڵام ئەگەر قەرزدارەکە درهەمی لەوانەی خۆی باشتر بۆ گێڕایەوە خاوەن ماڵەکە دەتوانێت وەریبگرێت،[1] جاری واش بوو قەرزدارەکە قەرزەکەی پێنەدەدرایەوە، لەم حاڵەتەدا داوا لە خاوەن قەرز نەدەکرا واز لە مافی خۆی بهێنێ، بەڵکو لە ماڵی قەرزدارە کە بۆی وەردەگیرایەوە [2] ئەگەر کەسێکیش خودی ماڵەکەی خۆی لای قەرزدارێکەوە بەدی بکردبا خۆی وەبەرتر بوو بەو ماڵە وەریبگرێتەوە لە ئەو دوای خاوەن قەرزەکان.[3] جاری واش بوو قەرزدەر وازی لە هەندێ پارەی خۆی دەهێنا لای قەرزدارەکە.[4] ئینجا (بيت المال) لە مەدینەو شارەکانی تر هەندێ قەرزی دەدایە خەلیفەو فەرمانڕەواکان.

**توانای کڕینی دراوەکان:**

دەکرێ ئەو توانایە دیاری بکەین ئەگەر بڕوانینە ئەو بڕە پارەی کە خێزانێك لە ماوەی ساڵێکدا خەرجی دەکرد، هەروەها لە ڕێگەی تێڕوانین لە نرخی شتومەکە جیاجیاکاندا، واشدەردەکەوێت کە خێزانێکی گەورە لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکردا پێویستی بە دوو هەزار و پێنج سەد درهەم بوو لە ساڵێکدا، بە بەڵگەی ئەوەی کە سەرانی هاوەڵان مووچەی ئەبوبەکریان دیاری کرد بە دوو هەزار درهەم، ئەویش وتی: زیادی بکەن بۆم، چونکە توانای بازرگانیم نەماوەو منالم هەیە، ئەوانیش پێنج سەدیان بۆ زیاد کرد، هەروەها مەڕێکیان بۆ تەرخان کرد هەموو رۆژێك بیدات بە موسڵمانان، ئەویش وتی: گەردنم ئازاد بکەن لەوەی سەروپێکەی بدەم بە منالەکانم، ئیتر ئەوانیش رازیبوون.[5]

هەروەها تێڕوانین لە مووچەی ساڵانە ئاستی بژێوی و توانای کڕینی دراو ڕووندەکاتەوە، چونکە ئەو مووچانە ژیانێکی سەربەرزانەی بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکرد، بەڵکو وادەردەکەوێت لە پێویستی کەسەکان زیاتریش بوو.

١) البخاري: الصحيح ٣: ٨٦.
٢) البخاري: الصحيح ٣: ٨٦ـ ٨٧.
٣) البخاري: الصحيح ٣: ٨٧.
٤) البخاري: الصحيح ٣: ٩٠.
٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٨٥، وأحمد بن حنبل: فضائل الصحابة ١: ١٦٢ باسناد حسن.

سەبارەت بە نرخی شتومەکە جیاجیاکان بەم شێوەی خوارەوە بوو:
- کراسێك (چوار درهەم).[1]
- عەبایەکی ئاوریشم بە دەزووی ئاڵتوون دورابوو - لە دەستکەوتەکانی جەلەولا لە خیلافەتی عومەردا - (٣٠٠ درهەم).[2]
- خوێنبای ئافرەتێك (٦٠٠٠ درهەم) دوو هەزاری تریشی دەخرێتە سەر ئەگەر لە حەرەمو لە کاتی تەواف بکوژرێت، لەبەر گەورەی تاوانکردن لە حەرەمەدا.[3]
- خوێنبای منداڵێك لە سکی دایکیدا (٥٠٠ درهەم، کە دەکاتە بەرانبەر کۆیلەیەك پیاوبێت یان ژن، یان ئەسپێك، یان سەدو بیست مەڕ).[4]
- نرخی وشترێك (٤٠٠ درهەم).[5]

**چاودێری دارای:**

ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) زۆر دیندار و وریا بوو لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دارای گشتیدا، لە کاتی سەرەمەرگیشیدا بانگی عائیشەی کچی کردو دوا وەسیەتنامەی خۆی پێ راگەیاند: "سوێند بە خوای گەورە بە پەرۆش بووم دەستکەوتی موسڵمانان پاشەکەوت بکەم، بەڵام هەندێ گۆشت و ماستم لیان خواردبوو، جا بڕوانە چەند بووەو عومەر ئاگادار بکەرەوە".

ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) نە دینارو نە درهەمی نەبوو، تەنیا خزمەتکارێكو وشترێك نەبێت، لە پاش مردنو ناشتنی عائیشە ناردنی بۆ عومەر (رەزای خوای لێبێت) ئەویش فەرموی: "بەراستی ئەبوبەکر خەلیفەی پاشی خۆی تەواو ماندوو کردووە".[6]

---

١) ابن عساكر: تاريخ دمشق ١٢: ٣٧٥ ـ مخطوطة الظاهرية ـ نقلاً عن كتاب الزهد للامام أحمد، وابن كثير: البداية والنهاية ٨: ٤.
٢) إبن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٥٧٩.
٣) ابن قدامه: المغنى ٧: ٧٧٣.
٤) ابن حجر: الاصابة ٤: ٧٠٨ وقال اسناده صحيح.
٥) بەسەرهاتی خوڵامەکانی حاتیب.
٦) أحمد: الزهد ١٣٨، وابن أبي شيبة: المصنف ٤: ٤٦٦، و٦: ٤٥٩، وأبوعبيد: الاموال ٢٨٠ـ ٢٨١، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٩٨ـ ٥٩٩، والطبراني: المعجم الكبير ٦: ١، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ٣٥٣ والاثر صحيح.

ئینجا عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پارێزگاری زۆری دەکرد لە مامەڵەکردنی لەگەڵ دارای گشتیدا (بیت المال) جگە لەو مووچەیش کە هاوەڵان بۆیان دیاریکردبوو هیچی تری بۆ خۆی نەدەبرد، پۆشاکی چاکی رازاوە بە ئاوریشمی دەدایە هاوەڵان بێ ئەوەی شتێك لەوانە ببات.[1]

وشترێك لە دارای گشتی جارێکیان تووش بوو، ئیتر عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) سەری بڕیو هەندێکی دابەشکردە سەر دایکانی موسڵماناناو خواردنێکی لێدروستکرد بۆ یارو یاوەران، ئەمجا عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) پێشنیاری کرد هەموو ڕۆژێك کارێکی وابکات بۆ ئەوەی کۆببنەوە لایو گفتوگۆ بکەن پێکەوە، عومەر فەرمووی: جارێکی تر کاری وا ناکەم، دوو هاوەڵی پێش خۆم کارێکیان کردو ڕێگایەکیان گرتە بەر، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوان کار بکەم ڕێگایەکی ترم پێدەگریت جیاواز لە ڕێگاکەی ئەوان".[2]

دیدی عومەر بۆ پارە لەم نزایەیدا دەردەکەوێت: "خوایەگیان هیچمان پێناکرێت ئەوە نەبێت دڵخۆش بین بەوەی کە بۆت ڕازاندینەتەوە، جا پەروەردگارم کۆمەکم بکە بۆ ئەوەی لە پێناوتدا خەرجی بکەم، پەنایشت پێدەگرم لە خراپی یەکانی".[3]

هەروەها هەستی ناسك بوو، بەرانبەر بە ماڵی گشتیی و تایبەتیش هەستی بە لێپرسراوێتی مەزن بوو، دەیفەرموو: " ئەگەر وشترێك لە ڕۆخی فورات ونبێت، دەترسم خوای گەورە لێم بپرسێتەوە دەربارەی".[4]

ئینجا پرسیاریشی دەکرد لە زانایانی هاوەڵان دەربارەی سیاسەتی خۆی، جارێکیان پرسیاری کرد لە حوزەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خوای لێبێت) و فەرمووی: داوات لێدەکەم بە گەورەی خواو مافی فەرمانڕەوایم لەسەرت، چۆن من دەبینی؟ حوزەیفە وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەگەر ماڵی خوات کۆکردەوەو دابەشت کرد لە پێناو خوادا، ئەوا چاکی، ئەگەرنا نەخێر.[5]

---

١) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٥٥٨ باسناد حسن.

٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٢٨٨ـ ٢٨٩، وابن حجر: المطالب ٤: ٤٠ نقلاً عن مسند مسدد، والاثر صحيح.

٣) اسناده صحيح.

٤) ابن حجر: المطالب العالية ٤: ٤١، عن مسدد، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣٠٥، وابن أبي شيبة: المصنف ٧: ٩٩، والطبري: تاريخ ٢: ٥٦٦ والاثر حسن لغيره.

٥) ابن زنجويه: الاموال ٢: ٦٠٢، وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٧٧، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٢: ٧٦٩ والاثر صحيح.

بۆیە سەیر نی یە کە بەشێوەیەکی ورد چاودێری دارای گشتیی بکات، هەر لە خۆیو خێزانو فەرمانڕەواکانیو گەلەکەی..

**چاودێری عومەر بۆ کەسوکاری:**

عومەر (رەزای خوای لێبێت) لەسەر کەسوکاری قەدەغە کردبوو کە سوودمەند بن بەبۆنەی نزیکیان لە ئەوەوە، دوو ڕوداو لەم بارەوە جێگیر بووە، یەکەم لەگەڵ عاسیمی کوڕی، دووەم لەگەڵ عەبدوڵلاو عوبەیدوڵلای کوڕی، سەبارەت بە عاسیم، موعەیقیب دەڵێت: "عومەر (رەزای خوای لێبێت) لەگەڵ نیوەڕۆدا ناردی بە دوامدا، بینیم لە ماڵێکداو داوای عاسیمی کوڕی دەکات، پی وتم: ئەزانی ئەو چی کردووە؟ چووە بۆ عێراقو لەوێ وتوویەتی کوڕی منەو داوای خەرجی لێکردوون، ئەوانیش قاپی زیوو کەلوپەلو شمشێرێکی رازاوەیان پێداوە، عاسیم وتی: وام نەکردووە، بەڵکو چوومە لای هەندێ لە خزمەکانمو ئەم شتانەیان پێدام، عومەر فەرمووی: ئەی موعەیقیب شتەکانی لێوەرگرەو بیخەرە (بیت المال)ەوە.[1]

سەبارەت بە عەبدوڵلاو عوبەیدوڵلا، جارێکیان دەرچوون لەگەڵ سوپایەکدا بۆ عێراق، لە گەڕانەوەیاندا لە بەصرە لە لای ئەبوموسای ئەشعەری لایاندا، ئەویش هەندێ پارەی پێدان بۆ ئەوەی بیدەن بە باوکیانو کردی بە قەرز بەسەریانەوە، پێشنیاریشی کرد بۆیان کە هەندێ شتومەکی پێبکڕن لە عێراقو لە مەدینە بیفرۆشن، بۆ ئەوەی قازانجەکەی بخۆنو سەرمایەکەی بدەن بە عومەر، کاتێك قازانجیان کردو پارەکەیان گەڕاندەوە عومەر (رەزای خوای لێبێت) رازی نەبوو قازانجەکەشی لەگەڵ نەگەڕێننەوە، بەڵام دوای قسەکردنی هاوەڵان لە مەسەلەکەدا، کردی بە شەریکی و نیوەی قازانجەکەشی لێوەرگرتنەوەو پێشی وتن: ئایا ئەبوموسا ئەم قەرزەی بەهەموو سوپاکە داوە؟[2] بەم شێوەیەش قۆستنەوەی دەسەڵاتی لەلایەن کوڕەکانی یەوە قەدەغە کرد.

دوو هەڵوێستی تریشی لەگەڵ عاصیمی کوڕیدا هەیە، کاتێك عاصیم منداڵ بوو درهەمێکی دۆزی یەوە لە ژوورێکدا کە هەندێ ماڵی تازەی تیادا بوو، عومەر فەرمانی کردبوو ببرێت بۆ (بیت المال)، جا کە درهەمەکەی بینی بە دەستی کوڕەکەیەوە لی سەندو ناردی بۆ (بیت المال)،[3] کاتێك عاصیم

١) ابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٠٠ـ ٧٠١، والاثر حسن.

٢) مالك: الموطأ ٢: ١٧٣، والدارقطني: السنن ٣: ٦٣، والبيهقي: السنن الكبرى ٦: ١١٠ـ ١١١ والاثر صحيح.

٣) ابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٧٠٢ والاثر صحيح.

گەورە بوو و ژنی هێنا، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) خەرجی دەکردە سەریدا، جارێك هات و داوای پارەی کرد، عومەر پی فەرموو: "من هیچ کاتێك وام نەزانیوە ئەم پارە بۆ من ڕەوایە پێش ئەوی ببم بە جێنشین، بەلاّم دوای ئەوە هیچ لەوە قەدەغەتر نابینم، منیش هەندێ پارەم بۆ دیاریکردوویت لە (بیت المال)و ناتوانم زیادی بکەم، بەلاّم یارمەتیت دەدەم بە هەشت یەکی ماڵەکەم لە عالیە، جا بڕۆ بیژمێرە، ئەمجا بڕۆ بۆ لای یەکێك لە بازرگانەکانی خزمت و هاوبەشی بکەو خەرج بکە سەر خێزانەکەتدا.[1]

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٧٧، وأحمد: الزهد ١٤٤، وابن زنجويه: الاموال ٢: ٥١٦ـ ٥١٧، وابن شبة: تاريخ المدينة ٢: ٩٩ والاثر صحيح.

# دەرگەی چوارەم

# ڕۆشنبیری و فێرکردن

## بەشی یەکەم: نیشانەو بیردۆزو نەریت

### کەلەپوری ڕۆشنبیری پێش ئیسلام

وادیارە ئاسان نی یە قسە بکرێت دەربارەی بزووتنەوەی فێرکردن، لە ڕووی ڕاستی و ئاستو ڕێبازو دەزگاکانی، بە شێوەیەکی وردو گشتگیر بۆ ئەو ناوچە فراوانەی کە ئیسلام حوکمی دەکرد لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و خەلیفە ڕاشیدینەکان، چونکە ئیسلام لە ماوەیەکی کەمدا لە لای خۆراسانی ڕۆژهەلاتەوە درێژبوویەوە بۆ ئەفریقا (تونس)، ئینجا لە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵەوە بۆ دەریای عەرەب، ئەو ناوچانەش کە ڕووبەرەکەیان دەگەنە (٣,٥٠٠,٠٠٠) میلی چوارگۆشە[١]، کە ناوەندی شارستانی یە جیهانە کۆنەکانی دەگرتە خۆ، لە عێراق و میصر، کە لەوێ ژیارە سۆمەری‌و ئاشوری‌و بابلیەکان لە عێراق، ژیاری فیرعەونیش لە میصر هەبوون.

سەرەڕای ئەوەش مێژوو باسی سەرهەڵدانی نووسینمان بۆ دەکات لە عێراق (٣٠٠٠ پێش زاینی)، کتێبخانەی ئاشور پانیبالۆ ئەو کۆمەڵە تەختانەی کە تەنها لە شاری نوففەر دۆزرانەوە، کە سی هەزار نووسراوی تیادایە لە جۆرەکانی زانست[٢]، هەروەها کێلەنووسی حەمورابی‌و دەقە یاسای یەکانی، هەروەها باسی دیاردەکانی تری پێشکەوتنی وێنەیی‌و هونەری جۆراوجۆری بۆمانکردووە لە عێراق.

مێژوو بە هەمان شێوە باسی نووسینی هێرۆگلیفی‌و شوێنەوارە فیرعەونی یەکانی بۆ کردووین، کە ئاماژەی بەهێزی تێدایە بۆ پێشکەوتنی میصری یەکان لە زانستو ژیاردا بە تایبەت لە پزیشکی‌و ئەندازیاری‌و نیگارو شێوەکاری، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە ئەو شارستانی یەتانە لەناوچووبوون پێش سەرهەڵدانی ئیسلام بەماوەیەکی زۆر، بەهەمان شێوە شارستانیەتەکانی مەعین‌و سەبەءو حیمیەر لە یەمەن لەناوچووبوون، لە کاتێکدا نووسین تەشەنەی کردبوو خەتی موسنەدیش دەناسرا.

---

١) محمد حميد الله: الوثائق السياسية (لاحظ الخارطة مقابل : ٥٤٢).

٢) وزارة الثقافة والاعلام العراقية: العراق في التاريخ ٥٦، ٥٩.

ئەو شتانەی کە دەیزانین دەربارەی ناوەندەکانی زانستو ڕۆشنبیری جیهان لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام زۆر کەمن، هێزە جیهانی یە هاوچەرخەکان لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلام خۆیان دەبیننەوە لە هەردوو ئیمپراتۆری یەتی ساسانیو بێزەنتی، ئیسلام یەکەمیانی لەناوبرد، ئەویتریشیانی کوورتکردەوە لە حەوزەی دەریای ناوەڕاستی باشوورو ڕۆژهەڵاتدا کە داگیرکراوە دەوڵەمەندەکانی لەوێ بوون، بەڵام بەردەوام هەر بەرهەڵستکاری دەکردو نەیاری ئاینیو ڕۆشنبیری دەکردو شارەزایی لەگەڵ ئاڵوگۆڕ دەکرد لەڕێگەی پەیوەندی یەکانی شەڕو ئاشتی.

لە ڕێگەی ئەو زانیاریە دەگمەنانەشەوە کە مێژوو پاراستوویەتی بۆمان، ئاشنایمان پەیدا کرد لەگەڵ ناوەندێکی ڕۆشنبیری گرنگ لە زانستەکانی پزیشکیو فەلسەفە، کە خۆی دەبینێتەوە لە کتێبخانەی ئەسکەندەری یەی بەناوبانگ کە ڕۆشنبیری ئەغریقیو کتێبە بابلیەکان کە زانایان سەرقاڵی وەرگێڕانو راڤەکردنیان بوون هەموو ئەوانەی پاراست بۆمان.[1]

ناوەندێکی تریش بەهەمان شێوە لە جوندیسابوور کە کیسرای ئەنەوشیروان هەڵسا بەدامەزراندنی قوتابخانە باڵاکان بۆ فێرکردنی پزیشکی، هەروەها فەرمانی کرد بە گواستنەوەی کتێبە زانستی یەکان لە زمانەکانی سریانی، یۆنانی، سەنسکریتی بۆ زمانی پەهلەوی، کە لەو سەردەمەدا زمانی فارسەکان بوو.[2] چەند ئاماژەیەکیش هەیە بۆ هەندێ چالاکی ئەندێشەی لە کڵێسە مەسیحیەکان یان قوتابخانەی جولەکەکان، بە تایبەت لە ناوچەی روها کە سریانی یەکانی تێدا چالاك بوون، جگە لە چەند ئاماژەیەکی تر بۆ پەرستگا میصریە کۆنەکان کە کتێبی زانا کۆنەکانی میصری پاراستبوو، لەوانە پەرستگای سیرابیس لە ئەسکەندەریەو[3] ، پەرستگای ئەخمیم کە یۆنانیەکان دایانمەزراند لە میسری سەروو، ناویشی لێنرابوو "دار الحكمة لقدماء اليونان".[4] هەروەها هەندێ تێبینی دەخوێنینەوە دەربارەی چەندێتی بایەخدانی نەتەوە دێرینەکان بە زانستە جیاجیاکان لەلای ساعیدی

---

١) ابن النديم: الفهرست ٢٣٩ـ ٢٤٠، القفطي: تأريخ الحكماء ٧١، ٣٥٦.

٢) نابينو: علم الفلك تأريخه عند العرب ١٨٠ـ ١٨١.

٣) المقريزي: خطط ١٣٣.

٤) إبن النديم: الفهرست ٢٣٨ـ ٣٥٢.

ساعیدی ئەندەلوسی (٤٦٢ك) لە کتێبی (طبقات الامم) لەو کتێبەدا باسی گرنگیدانی گەلانێك دەکات بە زانست، وەکو هنوود، کلدان، یۆنان، ڕۆم، خەڵکی میصر، عەرەبو بەنی ئیسرائیل.[١]

بایەخدانی ئەو گەلانە زیاتر لەسەر مێژوو وێژەو فەلسەفەو پزیشکیو گەردوونناسیو ئیسرائیلیات (مێژووی پێغەمبەران). ئاشکرایشە کە هیچ کام لەم زانستە نووسراوانە بە زمانی بیانی شوێنەوارێکی بەجێنەهێشت لەسەر ڕۆشنبیریو فێرکردن لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدینەکان جگە لە ئیسرائیلیات نەبێت کە هەندێ لە یارو یاوەران شارەزایان بوو دەربارەی بە وریای یەکی زۆرەوە. بەڵام بەداخەوە مێژوو ئەوەندەی بۆ نەگێڕاوینەتەوە کە بەشی واقیعی فێرکردن ئاشکرا بکات لەو ناوچە فراوانەی کە ئیسلام حوکمی دەکرد لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان، کە دانیشتووەکانیان هەمەجۆر بوون لە نێوان عەرەبو فارسو سریانیو کوردو ئەرمەنو قیبتدا، هاوکات ڕۆشنبیریو ئاینو بیروباوەڕیشیان هەر جیاواز بووەو بارودۆخی ئازادی ئاینی کە ئیسلام فەراهەمی کردبوو.

ئالێرەشەوە، ئێمە بە تەواوی زانیاریمان نی یە دەربارەی سروشتی دەزگاکانی فێرکردن لە ناوچە فەتحکراوەکان و پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتو کۆمەڵگادا، هەروەها نازانین تاکو چی ڕادەیەك فێرکردن بڵاوبوو، پێوەرەکانی ڕۆشنبیریش چی بوونە، هیچیشمان پێنەگەیشتووە دەربارەی ژمارەی خوێندکارانو ئاستەکانیانو ئاستی مامۆستاکانو سروشتی ئەو زانیاریانەی دەیانگەیاندە خوێندکاران، نە پەیوەندی ناوەندە ڕۆشنبیریو دەزگاکانی فێرکردن لە نێوان خۆیاندا لە نێوان دەوڵەتداو پەیوەندیان لەگەڵ قوتابخانەکانی لە دەوڵەتەکانی تر. ئەمجا دەرەنجامی ئەوانە هەمووی لە پاشی فتوحاتی ئیسلامی؟

مێژوو وەڵامی ئەم پرسیارانە ناداتەوە، لەوانەشە هەتاهەتایە هەر نەیداتەوە، مەگەر هەندێ سەرچاوەی ترمان دەستکەوێت لەژێر خاکدا بن، یان ونبووبێت لە نێوان ئەو هەموو کتێبانەی کە هێشتا زیندانن و کەس هەڵنەساوە بە پێڕست بۆ دانانیانو لێکۆڵینەوەیان، چونکە ئێمە لەم بیست ساڵەی کۆتایدا زانیاریمان زیادی کرد دوای ئەوەی بۆیەکەمجار کۆمەڵێك سەرچاوەی مێژوویی بڵاوکراوەتەوە، کە ئەوەیش دەبێتە مایەی پەیدا کردنی هیوا بۆ ئایندە. سەبارەت بە زانیاریشمان

١) صالح احمد العلي: تأريخ العماء وفهارس المصنفات في المصادر العربية (مجلة المجمع العلمي العراقي، المجلد الرابع والثلاثون١: ٦ـ ٧).

دەربارەی واقیعی فێرکردن لە حیجاز لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان، ئەگەر چی پەرتەوازەیە، بەڵام ڕوونترە، بەهۆی گرنگیدانی مێژوونوسە موسڵمانەکان بە ئەو ماوەیەو نووسینەوەیان بۆ بەسەرهاتو ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺو هەواڵی خەلیفە ڕاشیدەکان بە تێرو تەسەل، لەبەر ئەو گرنگیە ئاینیو وتە شەرعی یەی کە هەیانە.

هەندێ زانیاری پەرتەوازە هەیە دەربارەی چەند کەسێك لە عەرەبی لە حیجاز کە شارەزا بوونە لە خوێندنەوەو نووسینو حیساب، کە پێویستی یەکانی ژیان زانینی ئەوانەی سەپاندبوو، بەتایبەت لە کۆمەڵگای بازرگانی لە مەککە، یان لەلای کەمێتی جوولەکە جێگیربوون لە یەسریبو، هەڵدەستان بە بازرگانیو کشتوکاڵیو کەلە پوری ئاینی خۆیانو نووسینەوەی بەزمانی عیبرانی.

بێگومان ناوی ئەو خوێندکارانەی کە سەرچاوەکان باسیان کردووە بە سەرژمێرێکی ورد دانانرێت، بەڵام نابێت زیادەڕۆیی بکرێت لە بۆچوونی ئەوەی کە فێرکردن لەوە زیاتر بڵاوبووە، چونکە لە بنچینەوە کەچی ژمارەی قوتابی یەکان وایکردووە مێژوونوسەکان ناویان بنووسن.

(البلاذری) دەگێڕێتەوە کە ژمارەی ئەو نووسەرانەی کە هەبوون لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە حەڤدە پیاو بوون.[1]

سەرچاوەکان ناوی هەندێ نووسەریشیان نووسیوە، بۆ نموونە ئومەیەی کوڕی ئەبی سەڵت دەیڕوانی یە کتێبو دەیخوێندەوە لەسەردەمی جاهیلیدا .[2] کردۆسی کوڕی عەمریش "کتێبی دەخوێندەوەو هەندێ ڕستەی وەردەگێڕا لە ئیجیلەوە".[3] قورئانی پیرۆزیش بۆمانی گێڕاوەتەوە کە هەندێ لە جوولەکەکان شارەزایان بووە لە نووسیندا. لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ).[4]

بێگومان هێنانەوەی زاراوەگەلێك وەکو (الکتابة)و ئامرازەکانی لە قورئانی پیرۆزدا وەکو (اللوح و القرطاس و العلم و المداد) بەڵگەن لەسەر ئاستی ئەوانەی ئاڕاستەکراوە هەروەها ئاستی دەربڕینو

١) البلاذري: فتوح البلدان ٦٦٠ـ ٦٦١.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ٥: ٥٠٤.

٣) ابن حجر: الاصابة ١: ٢٥٠.

٤) البقرة ٧٩.

ئەندێشەی قورئانی پیرۆز ئاستی ڕۆشنبیری عەرەب دەردەخات لەکاتی دابەزینیدا، چونکە ڕووەکانی ڕەوانبێژیو واتاکانی داناییو مشتو مڕو پێواندنی عەقڵی هەموو ئەوانە پێویستیان بە ئاستێکی ڕۆشنبیریو توانایەکی زمانەوانیو عەقڵی هەیە لەلایەن ئەوانەی کە بەسەریاندا دابەزیوە. ئینجا قورئان خۆی لە خۆیدا موعجیزەیەکی ڕاگەیاندنە پێش هەموو شتێك ـ ئەگەرچی بە لای هەندێکەوە جۆری تری لە ئیعجاز تیایە ـ خوای گەورە بەرەنگاری عەرەبی پێکرد، چونکە ئەوان بایەخیان دەدایە هونەری قسەکردن، تاکو بووە خولیایان لە هەموو کۆڕوو کۆمەڵەکاندا، بەڵکو لە هەموو ژیاندا.. بەرەنگاریش ناگاتە ئاستی خۆی یان موعجیزە بە هەمان شێوە تاکو نەتەوەیەك دەستەوسان نەبێت بەرانبەر ئەوەی شتێك وەکو قورئان بڵێت.

سەیریش نی یە کە ئاستی ڕۆشنبیری ئەوەندە بەرزبێت وێڕای کەمی ژمارەی نووسەرەکان، بەڵکو لەوانەیە ئەوە هۆکارێك بێت بۆ لەبەرکردنو تیژی هزریو پشتبەستنی بە نەژادی خۆڕسك.. پێویستیشە جیاوازی بکرێت لە نێوان ڕۆشنبیریو فێربوونی نووسین، چونکە زانستو نەریت دەکرێت بگوێزرێنەوە لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر لەڕێگەی بەردەوامی نەوەکان، تەنانەت لەنێو کۆمەڵگا نەخوێندەوارەکاندا خێزانو هۆزیش لەسەر کەلەپوری ڕۆشنبیری لە کۆمەڵگای عەرەب پێش ئیسلام دامەزراوە، گفتوگۆی شەو لە کۆڕی هۆز کە شاعیرو ڕەچەڵەکناسو مێژووناسەکان ئامادەی دەبوون، هەروەها بازاڕە وێژەی یەکان کە هۆزەکان تیایدا کۆدەبوونەوە، هۆنراوەیان تیادا ئاڵو گۆڕ دەکردو شانازیان دەکرد بە نەژادو هەواڵەکانی سەخێتیو مەردایەتی خۆیانەوە، ئەوانە گرنگترین هۆکارەکانی گواستنەوەی کەلەپوور بوون کە گەشەیان دەکرد بەخستنەسەر لەلایەن نەوە داهاتووەکان بۆ نەوە ڕابووردووەکان. ئەم کۆبوونەوانەش هەلێکی گرنگی ڕەخساند بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ڕۆشنبیریو زمانەوانی، هەروەها یەکخستنی پێوەرە ڕەخنەیو زمانپاراوی یەکانو نزیککردنەوەی نێوان زمانەکانی عەرەبو ڕێگاشی خۆشکرد بۆ تێگەیشتنی قورئان کە بەزمانی قوڕەیش دابەزیوە.

## باسی یەکەم: نیشانە گشتی یەکانی فێرکردن

پشتبەستن بە بیرەوەری چاك بۆ گواستنەوەی کەلەپوورو بایەخنەدانی زۆرینەی عەرەب بەفێربوونی نووسینو خوێندنەوەی، بوونە ڕێگرو تەگەرە بۆ سەرهەڵدانی دەزگاکانی فێرکردن، هیچ شتێك لەو بارەوە دروست نەبوو جگە لەو حوجرانەی کە لە بازنەیەکی دیاریکراودا وەکو مەککەو تایفو یەسریب بڵاوبوونەوە، ئیتر فێرکردنێکی گشتی نەبوو، بەڵکو نەخوێندەواری زاڵ بوو، لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە: "إنّا أمة أمية لا نكتب ولا نحسب".[1] واتە: ئیمە نەتەوەیەکی نەخوێندەوارین، نازانین بنووسین یا بژمێرین، بۆیە نەریتێکی گەلاڵە کراو نەبوو بۆ فێرکردن، بەلاّم ئیسلام هەموو مەشخەلانی دیاریکرد، گرنگی زانستی ئاشکرا کردو بەستیشی بە ئاینەوە، بەم شێوەیەش پلەو پایەی زانایانی بەرزکردەوە، نەریتی فێرکردنی بە قوڵیو گشگیری ڕوونکردەوە، بەشێوەیەك بوو بە نموونەیەك سەیر دەکرا بۆ چەندین سەدەی داهاتوو، تاکو ئێستاش توانای هەیە لە بەها ڕۆشنبیریو پەروەدەی یەکانمان پێبەخشێت، چونکە لەوانەیە یەکێك بێت لە بەخشینەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان لە بواری فێرکردندا.

بزووتنەوەی فێرکردن لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان دامەزرا لەسەر ئەستۆی پیاوانێك کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بەلاّم هاندەری بەهێزی ئاینی ـ کەوای کرد ئوممەت ئامانجەکانی دیاریبکاتو هێزەکانی یەکبخات بۆ پێگەیشتنی ـ ناوەندێکی گونجاوی کرد بۆ بڵاوبوونەوەی زانستو فێرکردنی، دوای ماوەیەکی کەمیش شوێنەواری بزووتنەوەی فێرکردنی نوێ لە دەرخستنی وزە شاراوەکاندا سەری هەڵدا، بۆیە بینرا کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵکی بایەخ دەدەنە هزرو زانست، توانای داهێنانیش لە گۆڕەپانە جیا جیاکاندا دەرکەوتو بەشداری کرد لە دروستکردنی تەلاری ڕۆشنبیریو شارستانی نوێ. بێگومان گونجانی بیرو باوەڕو ئەندێشەیو کۆمەڵایەتی، هەروەها ڕوونبونەوەی دید بەدیاریکردنی ئامانجە گشتی یەکانی دەوڵەتو کۆمەڵگا، هەموو ئەمانە بزووتنەوەی فێرکردنیان پێشخستو پەرەپێدا، بەڵکو بزووتنەوەی ڕۆشنبیری بەگشتی، بووە هاوشانی پێشکەوتنی سەربازیو سیاسیو چارەسەرکردنی گرفتە نوێ یەکان لە دەوڵەتی فراواندا. دیاریکردنی ئاڕاستەی فێرکردنو ئامانجەکانی بۆ یەکەمجار یەکێك بوو لە بەخشینەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان، ئەم هاندەرە بەهێزو ڕێخەرە

---

[1] ) رواه مسلم: الصحيح ٢: ٧٦١.

تازانەیش بوون بە هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی فێرکردن بە خێرای یەکی لە ئاسا بەدەر، واقوڕمانی مرۆڤ بەرانبەری کەمتر نی یە لە واقوڕمانی بەرانبەر فتوحاتی سەربازی، چونکە گومانی تێدا نی یە کە ئیسلام شۆڕشێکی فێرکردنی بەرپا کرد کە بوو بەمایەی "پێگەیشتنی فیکری لە ناکاودا"و دیاردەیەکی لە ڕادەبەدەری پێکهێنا.

زانای ئەڵمانی مورتز کانتور دەڵێت: "گەلێك کە بۆ چەندین سەدە بە دابڕاوەیی مایەوە دوور لە کاریگەرە شارستانی یەکان کە بە دەورروبەریدا بە درێژایی ئەو مایەوە، لە پڕێکدا هەڵساو بیرو باوەڕ و یاساو زمانی خۆی سەپاند بە سەر نەتەوەکانی تردا بە شێوازێك کە نموونەی نی یە لە مێژوودا، ئەوە دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەرە، هۆکارەکانیشی شایەنی ئەوەن لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت، چونکە ئێمە لەهەمان کاتدا دڵنیاین ئەو پێگەیشتنە ئەندێشەی یە کتوپڕە کە بەخێرای یەك دروست بوو لە خێرای ڕودانی تەقینەوە دەچێت، شتێك نی یە هەروا لە خۆیەوە هاتبێت".[1]

وتەی زانایەکی تریش کە (فلوریان کاجووری)ە یەکدەگرێت لەگەڵ بۆچوونی مورتز کانتور، کاجووری لە کتێبی "تأريخ تدوين الرياضيات"دا دەڵێت: "عەرەب دیاردەیەکی لە ڕادەبەدەر پێکدەهێنن لە مێژووی شارستانی یەتدا، ئەو هۆزە نەفامە دابەشبووانە لە نێوان خۆیاندا لە دوورگەی عەرەب، کە هیچ ئاشنایەکی نەبوو بە حوکمڕانیو جەنگ، توانەوە لە پەرۆشی ئاینیدا لە ماوەی دەساڵداو بوون بە نەتەوەیەکی بەهێز، ئینجا لەپاش سەد ساڵ لە فتوحاتی مەزن، بینیمان کە پێش نەتەوەکانی تر کەوتن لە چالاکی هزردا، موسوڵمانانیش بوونە زانایانی هەرەگەورەی سەردەمی خۆیان"[2] ئیسلام دووبارە کەسایەتی مرۆڤی درووستکردووە، وزە شاراوەکانی لە داهێناندا دەرخست لە پێناو زانستو کارکردن بۆ پێکهێنانی شارستانی یەکی مرۆڤایەتی هاوسەنگ، ئینجا بیردۆزەی زانستی ئیسلامی، بەو گشتگیریو تەواویو سازشکردنەی هۆکارێك بوو بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە قەوارەی مرۆڤایەتیو شێوازی کۆمەڵگا، ئەو بیردۆزەی کە قورئان تۆوەکەی چاندو سوننەت دەربڕی لە سەرەتای مێژووی ئیسلامیدا.

---

١) الدکتور سعيد معظم حسين: التعليم الاسلامی ١٢٨،

٢) هەمان سەرچاوە.

دەوڵەتی ئیسلامی تازە پێگەیشتوو هەڵسا بە ئەرکەکانی خۆی لە سەرەتای دروستبوونیدا، سەرکردایەتی یەکەی زۆر هۆشیار بوو بۆ پێویستی فێرکردن، لە کاتێکدا ڕووبەڕووی بەڕێوەبردنی دەوڵەتو پێویستی یە هەمەجۆرەکانی فێرکردن دەبوویەوە.

دەستپێشخەری یەکەمیش لە پێغەمبەرەوە بوو ﷺ، کاتێك فەرمانی کردە ئەوانەی خوێندەواریان هەیە نەخوێندەوارەکان فێربکەن، فەرمانیشی کردە هەندێ لە دیلەکانی جەنگی بەدر لاوەکانی ئەنصار فێری نوسین بکەن بەرانبەر ڕزگارانەی خۆیان، مامۆستایانیشی دەنارد ـ لە بارودۆخێکی ترسناکدا ـ بۆ بیابانەکان بۆ بانگەوازو فێرکردنی خەڵکی بۆ قورئانو تێگەیاندن لە ئاینەکەیان.

بە دەستپێکردنی برووسکەیەکیش لەلایەن دەوڵەتەوە، ئوممەت بە جارێ دەرپەڕی بۆ فراوانکردنەوەی بازنەی فێرکردن بە شێوەیەك کە دەوڵەت توانای ئەوەی نەبوو کە دەزگاکانی لەخۆ بگرێت یان سەرپەرشتی بکات.

بەم شێوەیش بزوتنەوەی فێرکردن وەرچەرخا بۆ حوجرەو بازنەی زانستو کۆڕ لە مزگەوتەکانداو لە ماڵی خودی زانایاندا، هەروەها بناغەی قوتابخانە فیکریە جۆراو جۆرەکان سەریانهەڵدا، وەکو قوتابخانەی ئەبو موسای ئەشعەری بۆ خوێندنەوەی قورئان (قراءات) لە بەصرە، قوتابخانەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە فیقهدا لە کووفە، قوتابخانەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس لە تەفسیر لە مەککە، هەروەها هەردوو قوتابخانەی بەصرەو کووفە لە نەحو.

لەڕاستیدا لێپرسراوێتی دەوڵەت لە فێرکردن لە بازنەیەکی دیاریکراودا بوو، چونکە خەڵکی ئازاد کردبوو لە بواری فێرکردندا وێڕای ئەوەی کە پشتگیری دەکردنو هانی دەدان. گونجانیش لە ئامانجو ئاواتەکان یەکخستنی درووست کرد لە نێوان حکومەتو نەتەوەدا، چونکە بەرفراوانی بزووتنەوەی فێربوون هیچ هەڕەشەیەکی بۆ دەوڵەت دروست نەدکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە هێزو تەبایی بۆ دەستەبەر دەکرد، سەرەڕای زاڵنەبوونی بەسەریدا.

بێگومان ئازادی فێرکردنو دووری لە کۆنترۆڵ کردنی دەوڵەت، وەکو خاسیەتێك لەگەڵیدا هەرمایەوە بە درێژایی سەدەکانی ئایندە، تا ئەوکاتەی قوتابخانەو زانکۆ سەرەتای یەکان سەریان هەڵدا، ئەوانەی کە دەوڵەت بەڕێوەی دەبردن، بەڵام خۆی لە ڕاستیدا لە ژێر سەرپەرشتی دەوڵەت نەبوون تەنها لە ڕووی یارمەتیدان نەبێت لە ڕووی دارایو کۆمەك کردنیان بۆ مانەوەیان، چونکە ئازادی فێرکردن هەر بەردەوام بوو پاش سەرهەڵدانی ئەو دەزگایانە. بنەمای (فێرکردن بە خۆڕایی)و

(فێركردن بۆ هەمووان) لە بەخشینەكانی ئەو سەردەمە بوون، پیرۆزی فێركردنو پەیوەندی بە بیرو باوەڕەوە وایكرد لە سەرانی، ئامانجیان خزمەتكردنی بنەما بێت لە جیاتی سوودوەرگرتنی ماددی، ئەم بنەمایەیش بۆ چەندین سەدە بەردەوام بوو، فێركردن تیایدا نەتەوەی‌و ڕەمەكی بوو، بە هەموو واتایەك وشەكە هەڵیبگرێت، دەوڵەمەندو هەژار لێی سودمەند دەبوون، بەڵام بەشی هەژاران زیاتر بوو لە بەشی دەوڵەمەندان، چونكە زیاتر خۆیان بۆ یەكلای دەكردەوەو ناویان دەردەكرد، كورتیش نەكرابویە سەر چینی حوكمڕانو دەوڵەمەند، وەكو سەدەكانی ناوەڕاست لە ئەوروپا ڕوویدەدا.

هەر لە سەرەتا بزووتنەوەی فێركردن لە ئیسلام، زانست هاوشانی كردار بوو، بەدرێژایی سەدەكان بەربەست دروست نەبوو لە نێوان زانستو پێویستی یەكانی واقیعی ژیان، بەدەر لە هەندێ تەوژم كە بریتی بوو لە هەندێ لافلێدانی فیكریو ئارەزووی عەقڵی‌و بیردۆزەیی، دیارترینی ئەوانەش قوتابخانەی موعتەزیلە بوو كە نەیتوانی زاڵبێتە سەر گۆڕەپانی فیكریدا، ئەگەرچی بە پاڵپشتی دەسەڵاتو بۆ ماوەیەكی كەم قسەی سوار بوو لە سەردەمی عەباسی یەكاندا.

جووتبونی زانست لەگەڵ كردەوەدا یەكێك بوو لە گرنگترین ئەو بنەمایانەی ڕەنگی فەلسەفەی فێركردنی لە ئیسلامدا كرد بە شێوەیەك كە لە براگماتی هاوچەرخ دەچوو لە شێوەكەیدا، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو لە ڕووی مادیەتو تەنها بۆ قازانج ڕوانینیدا، ئەم مۆركە كرداریەش شوێنەواری پەروەردەیی قوڵی بەجێهێشت، شارستانیەتێكی درەخشانیشی لێكەوتەوە كە بەشداری كرد لە دروستكردنی كۆشكی شارستانی مرۆڤایەتی.

نەریتی فێركردن لەلای موسڵمانان لەو سەردەمە قەرزدارە بۆ بنەمای (بەردەوامی فێركردن) بەم شێوەیش پیاوانێكی زۆر بۆ زانست بەدرێژایی تەمەنیان لە پێگەیشتنەوە تاكو مردن، دەگمەنیشە زانایەك ببینین واز لە فێربوون بهێنێ یان وازبێنێت گەیشتووەتە پلەی تەواوبوونو بێ عەیبی. ئەگەر بێتو ئەو بنەمایە هەتاكو ئەمڕۆ زاڵبووبایە بە سەر ژیانی ڕۆشنبیریاندا، ئەمڕۆ بارودۆخێكی ترمان دەبوو لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیری جیهاندا.

ئینجا ئیسلام گرنگی دا بە فێركردنی گەورەكان "هاوەڵان لە تەمەنی گەورەیدا دەستیان كرد بە فێربوون"، بەڵام بنچینە ئەوەیە كە فێربوون لە منالێیەوە دەست پێبكات، بەڵام ئەو كەسەی لە منالّی بواری فێربوونی بۆ نەڕەخسا بۆ كاتی گەورەیشی دەرگاكە هەر والاتر دەبێت بۆی.

یەکێك لە دیارترین تایبەتمەندیەکانی فێرکردن لەو سەردەمە ئەوە بوو لەسەرکۆششی تاکەکەسەکان بنیات دەنرا، بنەمای"لە خۆوە فێربوون" زاڵبوو بەسەر چالاکی زانایانو قوتابییاندا، بۆ چەندان سەدەیش زانایان بە خۆیان هەڵدەستان بە ئاست بەرزکردنەوەی خۆیان لە رووی زانستەوە، بەبێ پەیوەندی کردن بە دەزگاکانی فێرکردنەوە، یان هیچ هاندەرێك لەلایەن حکومەتەوە، شیاوی باسیشە بنەمای "کەڵەکەبوونی زانست"و "کۆکردنەوەی زانست" یەکێك بوون لە تایبەتمەندیەکانی بزووتنەوەی فیکری لە سەدەکانی سەرەتا، لە ڕێگەی جۆراوجۆرکردنی سەرچاوەکانی وەرگرتن لە مامۆستاکان کە زۆر بوون، یان گەشتوگوزار لە پێناو زانستو کۆکردنەوەی، ئەوەش هەر لەسەردەمی ڕاشیدەکانەوە دەستی پێکردو بازنەکەی فراوان بوویەوە لە سەدەکانی دوایدا. دواتریش بوو بە مایەی هاوشێوەیی بیرکردنەوە و ئاڵوگۆڕی وێژەی و پارێزگاری لە یەکێتی ناسنامەی ڕۆشنبیری. هەروەها ـ دواترـ بوو بە مایەی ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەستن بە شارو دانیشتوانو جوگرافیاو ئەمنسروپۆلۆجیا.

ئەم نیشانە گشتیانە بۆ سەرەتای فێربوون لە ئیسلامدا، دەقە جیاجیاکان پشتگیری لێدەکەن لە سەرچاوەکانی کەلەپوور کە سەرچاوەگەلێکن پێویستیان بە خوێندنەوەیەکی هاوچەرخ هەیە ئاگاداری بەهاکانی فێرکردنو نەریت بێت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانو سەردەمانی مێژووی ئیسلام و دوای ئەوان. هەروەها هەستێت بە دیاریکردنی بوارەکانی بەگەڕخستنیان بۆ مەبەستی بنیاتی ڕۆشنبیریو دەزگاکانی فێرکردنی هاوچەرخ، کە ئەویش پێناسەی ڕۆشنبیری بۆ نەتەوەکەمان دووپات دەکاتەوە، لەهەمان کاتدا کرداری وەرگرتن و بەخشین لە نێوان ئێمە و ڕۆشنبیریە جیاجیاکانداو دەزگاکانی فێرکردنی هاوچەرخی هەمەجۆر.

## باسی دووەم: دیدی ئیسلام بۆ زانست و فێرکردن

ئیسلام پیرۆزیەکی بەخشی بە زانست کاتێك بڕیاریدا: "فێربوونی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك"[١]، چونکە بڕێکی دیاریکراو هەیە لە زانست پێویستە موسڵمان فێری ببێت سەبارەت بە خواپەرستنیو مامەڵەکردنی، بەڵام جۆرەکانی تر مەرج نی یە هەموو کەسێك فێری بێت.

چەندین فەرموودەیش هاتووە هانی فێربوونی زانست دەداتو بڵاوکردنەوەیو باسی چاکەی ئەو کەسە دەکات کە سەرقاڵی وەرگرتنو بەدەستهێنانی دەبێت، فێرخوازانی زانست فریشتەکان باڵیان بۆ ڕادەخەن[٢] هەروەها فریشتەکان دەوریان دەدەنو بەزەیی خواو سوکنایان بەسەردا دادەبەزێت، خوای گەورەیش باسیان دەکات لای ئەو کەسانەی لای خۆین.[٣]

هەوڵدان بۆ وەرگرتنی زانست کارێکە خوا دەیگونجێنێ بۆ مرۆڤ "من يرد الله به خيرا يفقهه فى الدين"[٤]، واتە: کەسێك خوا بیەوێت چاکەی لەگەڵدا بکات لە ئایندا شارەزای دەکات. زانستیش وەکو سەروەتو سامانە، دەشێت بکرێتە صەدەقەو خێر: "من الصدقة ان يتعلم الرجل العلم فيعمل به ثم يعلمه".[٥] بە خێر دەژمێردرێت کەسێك فێری زانست ببێتو کرداری پێبکاتو دوایی خەڵکی فێر بکات.

هەروەها فێربوونی زانست خوا پەرستنە، بۆیە پێویستە پێش هەموو شتێك کارەکەی بۆ خوا بێت: "من تعلم علما مما يبتغي به وجه الله، لا يتعلمه الا ليصيب به عرض الدنيا لم يجد عرف الجنة يوم القيامة" [٦]

واتە: هەرکەسێك فێری زانستێك بێت لەو زانستانەی بۆ خوایە، مەبەستی لێی بەرژەوەندی یەکی دونیای بوو لە ڕۆژی دوایدا بۆنی بەهەشت ناکات.

---

١) اخرجه ابن ماجة: السنن ١: ٨١ حديث رقم ٢٤٤.

٢) اخرجه ابن ماجة: السنن ١: ٨٢ حديث رقم ٢٢٦ وفيه عاصم بن ابي النجود اختلط بآخره.

٣) اخرجه ابن ماجة: السنن ١: ٨٢ حديث رقم ٢٢٥.

٤) اخرجه البخاري (فتح الباري حديث رقم ٧١)، ومسلم: الصحيح ٢: ٧١٨.

٥) ابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ١٢٣.

٦) أخرجه ابو داود: السنن حديث رقم ٣٦٦٤، واحمد: المسند ٢: ٣٣٨.

کرداریش لێپرسراوێتیەکی ئاینی تێدایە کۆنترۆڵی ئاراستەی دەکات بەرەو چاکەو بەختەوەری مرۆڤ، قەدەغەشی لێدەکات کە لە ڕێگە لابداتو هەڕەشە بکات لە یەکسانیو ئاسایشی مرۆڤایەتی، لە قورئانیشدا هاتووە: (إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً).[1]

هەستیارەکانی مرۆڤ بەرپرسن لە ڕووی ئاینی یەوە لە زانست چ بۆ فێربوونی یان جێبەجێکردنی، زانایش پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی زانستەکەی: "لا تزول قدما عبد حتى يسأل عن أربع خصال: عن عمره فيما افناه، وشبابه فيما ابلاه، وعن ماله من أين اكتسبه وفيما أنفقه، وعن علمه ماذا عمل فيه"[2]، واتە: هەموو کەسێك لە بەندەکان لە ڕۆژی دوایدا دەربارەی چوار خەسڵەت پرسیاری لێدەکرێت: دەربارەی تەمەنی لە چیدا لەناوی برد، هەروەها لاوێتی لەچیدا بەسەری برد، ئینجا ماڵەکەی لە کوێ بەدەستی هێناو و لەچیدا خەرجی کرد، هەروەها دەربارەی زانستیو چی پێکردووە.

هەستکردن بە لێپرسراوێتی ئاینی بوو بە مایەی دروستبوونی هەندێ ڕێکخەری ڕەوشتیو بنچینەی لۆجیکی (منطقی)و نەریتی گشتی، کە کاریگەریی خۆی لەسەر بزووتنەوەی فیکری بە جێهێشت، لەوانە پێویستی خۆ رازانەوە بە راسپاردەی زانستی، چونکە زانا لە خۆیەوە قسەناکاتو بەرپرسە لە ڕاستی ئەو زانیاریانەی باسی دەکات: "فان من العلم ان يقول لما لا يعلم"[3]واتە: لە زانستە زانا بەو شتەی نایزانێت بڵێت نازانم. هەروەها زانا چرووك نی یە بە زانستەکەیو ناشیشارێتەوە، چونکە ئەو زانستەی کە هەیەتی دارایەکی تایبەت نی یە بە خۆیەوە بەڵکو "مافی گشتی" تێدایە، لەوانەیە زیاتر بێت لە مافی گشتی لەناو دارایی تاکە کەسدا.

هەر بۆیە لە قورئانو فەرموودەشدا هەڕەشە هاتووە دژ بە ئەو زانایانەی زانست دەشارنەوە، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ).[4] لە فەموودەشدا هاتووە: "من سئل عن علم

---

١) الاسراء ٣٦.

٢) اخرجة الترمذي بلفظ مقارب: الجامع حديث رقم ٢٤١٧ وقال: هذا حديث حسن صحيح.

٣) البخاري: الصحيح، كتاب التفسير: ٣٠، ٣٨، ٤٤، واحمد: المسند ١: ٤٣١.

٤) البقرة ١٥٩، ١٧٤.

نافع فكتمه جاء يوم القيامة ملجما بلجام من نار"[1]، واتە: کەسێك پرسیارێکی لێبکرێت دەربارەی زانستێکی بە سوود وەڵامەکەشی بشارێتەوە لە ڕۆژی دوایدا بە لەغاوێکی ئاگرین لەغاو دەکرێت.

مرۆڤیش بە زانایی لە دایك نابێت، بەڵام توانای بەدەست هێنانی زانستی هەیە بە هەوڵدان، چونکە خۆی لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت، دایكو باوکیشی کاریگەری زۆریان هەیە لە گواستنەوەی هزرو بەهاو بیروباوەڕ بۆی. لە فەرموودەیشدا هاتووە: "إنما العلم بالتعلم"[2]، واتە: زانست بەفێربوونە. مادام فێربوونیش پیرۆزە، هەندێکیشی فەرزە لەسەر یەك بەیەکی کەسەکان، کەواتە دەبێت "فێرکردن بۆ هەموان" بێت، هیچ کەسێکی ماددی یان کۆمەڵایەتی ڕێگای پێنەگرێت، بەم شێوەیش بنەمای "خۆڕایی فێربوون" بڵاوبوویەوە، ڕیوایەتیش هاتووە کە کرێ وەرگرتنی قەدەغە دەکات لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە ئوبەی کوڕی کەعب کە دیاریەك لە یەکێك لە قوتابیەکانی وەربگرێتو فەرموویەتی: "ئەگەر وەرتگرت کەوانێکی ئاگرینت وەرگرتووە"[3]، واشدەردەکەوێت ئەم نەهیە دووبارە بووتەوە لەگەڵ عوبادەی کوڕی سامیتدا ـ ئەگەر گێڕەرەوەی فەرموودەکە هەڵەی نەکردبێت لە ناوەکەـ عوبادە فەرموویەتی: کەسانێکم فێری نووسینو قورئان خوێندن کرد لە ئەهلی سوفە، جا یەکێکیان کەوانێکی بەدیاری هێنا بۆم، منیش وتم: ئەوە پارە نی یە و لە ڕێگای خوا بەکاریدەهێنم ئەبێت بچم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو پرسیاری لێبکەم، چوومە خزمەتیو لێم پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا کەوانێکم بەدیاری بۆ هاتووە لە یەکێ لەوانەی فێرە قورئانو نوسینم دەکردن، پارەیش نی یە، لەپێناو خوادا تیری پێدەهاوێژم فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەیت تەوقێکی ئاگرینت بەدەوردا بدرێت وەریبگرە"[4]، ئینجا دەوڵەت لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا دەستەبەری خەرجی دەکرد بۆ فێربوون هەندێ جار، جاری واشبوو کۆمەڵگا بەو ئەرکە هەڵدەستا، نەزانراوە کە خوێندکار خەرجی فێربوونی دابێت لەو سەردەمە.

لەبەر ئەوەیش کە زانست لە مێشکی زانایاندا دەپارێزرا، بە دەمیش دەگوێزرایەوە، بۆیە زانست پەیوەست بوو بە زانایانەوە، دەما بەمانەوەیان، کەمیشی دەکرد بە مردنیان، ئەمەیش ئاماژەی

---

١) اخرجه ابو داود: السنن حديث رقم ٣٦٥٨، والترمذي: الجامع حديث رقم ٢٦٤٩، وابن ماجة السنن حديث رقم ٢٦٦.

٢) البخاري: الصحيح، كتاب العلم ١٠.

٣) البيهقي: السنن ٦: ١٢٦.

٤) اخرجه ابو داود: السنن، كتاب البيوع، باب فى كسب المعلم حديث رقم ٣٤١٦ وفى اسنادة المغيره بن زياد ابو هاشم الموصلي صدوق له اوهام كما فى تقريب التهذيب لابن حجر.

پێکراوە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: "إنَّ الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من العباد، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء، حتى اذا لم يبق عالما اتخذ الناس رؤوسًا جهالاً فسألوا فأفتوا بغير علم فضلوا وأضلوا".[1] واتە: خوای گەورە زانست بە هەڵکێشان وەرناگرێتەوە لە بەندەکانی، بەڵام وەریدەگرێتەوە بە مردنی زانایان، تا ئەو کاتەی زانایەك نامێنێ خەڵکی سەرانی نەفام ڕادەگرن بۆ خۆیانو پرسیاریان لێدەکەنو ئەوانیش فتوا دەدەن بەبێ زانیاری، گومڕادەبنو گومڕا دەکەن، بۆیە سەیر نی یە ئەگەر مردنی زانایەك بە کەلێنێك لە ئیسلام بژمێردرێت،[2] چونکە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن[3] زانستیان بە میراتگری لێوەرگرتوون، ئەم هەستکردنەش بە ترسناکی کەمبوونەوەی زانست بە هۆی مردنی زانایانەوە، گەورەترین هاندەر بوو بۆ هەڵبژاردنی زانایان بۆ ڕێگەی نووسینەوەی زانست، نەك تەنها لەبەرکردنی، کە ئەم هەڵبژاردنە گرنگی هەرە گەورەی هەبوو لە پاراستنی زانستەکانی ئیسلامدا، هێشتا سەدەی یەکەم ـ کە جیاوازیو مشتومڕی تێکەوت لەسەر نووسینەوەی فەرمودە ـ تێنەپەڕیبوو، سەرەتای دانانی کتێب دەستی پێکرد وەکو بەڵگەیەك لەسەر زاڵبوونی ئاڕاستەی نووسینی زانست. بەڵام لە هەمان کاتدا لەبەرکردنی زانست کۆتایی پێنەهات، بەڵکو جەختکردن لەسەری هەر بەردەوام بوو بۆماوەی چەندین سەدە، تاکو ئەمڕۆیش فێرکردنی ئیسلامی گرنگی لەبەرکردن دووپاتدەکاتەوە.

زانایانیش ـ لەبەر پەیوەست بوونی زانست پیانەوە ـ پلەو پایەو ڕێزی گەورەیان بوو لەو سەردەمەو سەردەمانی دوای ئەوانیش، شەعبی دەفەرموێت: "ئیبنو عەباس وابەستە بوو بە زەیدی کوڕی سابیتەوە، زەید پێی فەرموو: خۆت وابەستە دەکەیت بە منەوەو تۆ ئامۆزای پێغەمبەری ﷺ، ئیبنو عەباس فەرمووی: ئێمە وادەکەین لەگەڵ زانایان"[4] بەهەمان شێوە جارێکیش وایکرد لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعبو پی فەرموو: "زانا دەبێت مەزنو بەرز بێت".[5]

١) البخاري: صحيح (فتح الباري ١: ١٩٤ حديث رقم ١٠٠)

٢) الدارمي: السنن، المقدمة ٣٢.

٣) البخاري: صحيح، كتاب العلم ١٠.

٤) الخطيب: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع ١: ١٨٨، وابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ١: ١٢٨.

٥) الخطيب: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع ١: ١٨٨.

## باسی سێیەم: ڕێو ڕسمو نەریتەکانی فێرکردن

ڕێو ڕسمو نەریتەکانی فێرکردن لای موسڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر ﷺو سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان، سەرەڕای ئەوەی بنچینەکانی گەلآڵە بوو بوو لەگەڵ ڕۆژاندا وەکو لە نووسینە پسپۆڕەکاندا دەردەکەوێت.

یەکێك لە کۆنترین ئەو ڕێو ڕەسمانەی زانراون ئەوەیە کە پەیوەندی بووە بە ڕێکخستنی کۆڕی زانستو بازنەی زانستی، بۆ نموونە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە دانیشتن لە ناوەڕاستی بازنەکەدا،[1] هەروەها قوتابی دانەنیشێ لەنێوان دوو کەسدا بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لیان[2] ڕێگەشی داوە بە کەسێك دانیشێت ئەگەر ڕێگەی پێدرا:"ئەگەر هەر کەسێك لە جێگەی خۆی دانیشتو یەکێك براکەی خۆی بانگ کردو ڕێگەی بۆ کردەوە با بچێت، چونکە ئەوە ڕێزێکە لێی گرتووە، با دانیشێ"،[3] فەرمانیشی کردووە بە پاراستنی مافی هەموو کەسێك لە کۆڕەکەداو فەرموویەتی:"ئەگەر کەسێك لە جێگاکەی خۆی هەڵساو دوایی گەڕایەوە، خۆی مافدارترە پێی"[4] سوننەتیشە ڕێز بگیردرێت لە کۆڕی زانیاریو دەنگ بەرزنەکرێتەوەو ژاوەژاو نەکرێتو هێمنی بپارێزرێت.

ئوسامەی کوڕی شورەیك فەرموویەتی: "أتيت النبي ﷺ واصحابه كانما على رؤوسهم الطير".[5] واتە: هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەناو یارو یاوەرانی دەتووت باڵداریان لەسەر نیشتووەتەوەو دەترسن هەڵفڕێت.

ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیش وەسفی ڕێکخستنی بازنەی زانستی لە کۆڕی هاوەڵ بەرائی کوڕی عازیب دەکاتو دەڵێت: ئێمە لای بەراء دادەنیشتین یەك لەدوای یەك.[6] ئەم دەقەش ئاماژە دەکات بۆ فراوانی بازنەکە.

---

١) اخرجه ابو داود: السنن ٤: ٢٥٨، والترمذي: الجامع حديث رقم ٢٧٥٣ وقال: هذا حديث حسن صحيح. والخطيب: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع ١: ١٧٦.

٢) اخرجه ابو داود: السنن حديث رقم ٤٨٤٤، والخطيب: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع ١: ١٧٨.

٣) اورده الهيثمي: مجمع الزوائد ٨: ٥٩ وقال :"رواه الطبراني واسناده حسن" واخرجه الخطيب: الجامع : ١٧٨.

٤) اخرجه ابو داود: السنن الحديث رقم ٤٨٥٣.

٥) اخرجه ابو داود: السنن رقم ٣٨٥٥ والخطيب: الجامع ١: ١٩٢.

٦) الخطيب الجامع ١: ١٧٤.

یەکێ لە کۆڕە بەنابانگەکانی زانست لەو سەردەمە کە لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دەبەسترا، کۆڕی جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری بوو[1].

زۆربەی ڕێو ڕەسمی قوتابیانی زانست لەگەڵ مامۆستاکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە، وەکو ڕێزگرتنی لە زانا، پێدانەگرتن لە دوای مۆڵەت و زۆر نەچوونە ماڵی زانا، دانبەخۆداگرتن لە کاتی وەرگرتنی وانە، ئارامگرتن لەسەر ناخۆشیەکانی فێربوونی زانست، هەموو ئەو نەریتانە دەتوانین وەریبگرین لە ئەم ڕیوایەتە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێت: "کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد بە یەکێك لە ئەنصارەکانم وت: هەڵسە باپرسیار بکەین لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەمڕۆ ئەوان زۆرن، وتی: سەیرم لە تۆ دێت ئەی ئیبنو عەباس، تۆ وادەزانیت خەڵکی پێویستیان بەتۆ دەبێت، لە کاتێکدا ئەو هەموو یارو یاوەرانەی پێغەمبەر ﷺ یان تێدایە، ئیتر ئەو نەهات هیچ فێربێت، بەڵام من ڕووم کردە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پرسیارم لێ دەکردن دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، جاری وابوو هەواڵم پێدەگەیشت کە فەرموودەیەك لەلای فلانە کەس هەیە، دەهاتمە دەرگاکەی لەکاتی خەوی نیوەڕۆدا، پۆشاکەکەی خۆمم دەخستە ژێر سەرمو لەبەر دەرگاکەی دەمامەوەو باو تۆز دەهاتە سەرمدا، کە دەهاتە دەرەوە دەیووت: ئەی ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ چی تۆی هێناوە؟ ئەی بۆ نەتنارد بەدوامدا خۆم بهاتبام بۆ لات، منیش دەمووت: من پێویستە بێمە خزمەتت، ئەمجا پرسیارم لێدەکرد دەربارەی فەرموودەکە. فەرمووی: ئەو پیاوە ئەنصاریە ئەوەندە ژیا تا دوایی منی بینی خەڵکی دەورەیان دەدام پرسیاریان لێدەکردم، ئەویش ئەیووت: "ئەم کوڕە لە من عاقڵتر بوو"[2].

ڕیوایەتێکی تریش هەیە پەیوەندی نێوان زانا بچووکەکان لەگەڵ زانا گەورەکان ڕووندەکاتەوە لەو سەردەمە، چونکە ڕێزگرتن لە گەورە، بنەمایەکی ئیسلامی گشتیە، شتێکی باویش بوو لە ژیانی زانستدا، سەموورەی کوڕی جووندوب دەفەرموێت: "من لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ گەنج بووم، قسەکانیم لەبەر دەکرد، ئەوەشی ڕێگەی لێدەگرتم قسە بکەم ئەوە بوو کە پیاوی لە من گەورەتری تیا بوو"[3] یەکێکی تر لەخاسیەتەکانی ژیانی موسڵمانان لەو سەردەمە، زوو لە خەوهەڵسانو دوای

١) ابن حجر: الاصابة ١: ٤٣٥.

٢) الخطيب: الجامع ١: ١٥٨ـ ١٥٩.

٣) الخطيب: الجامع ١: ٣١٨.

نوێژی بەیانی نەخەوتن بوو، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێی وابوو مەبەست لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: "اللهم بارك لأمتي في بكورها" واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە کاری ئەوانەی سەرلەبەیانیانی زوو دەستبەکار دەبن. فەرموویەتی مەبەست لێی زوو دەرچوونە بۆ فێربوونی زانستو نوێژ لە ڕیزی یەکەم لە مزگەوتەکان.[1] لەراستیدا موسڵمانان هەر لەو سەردەمەوە وریابوونەوە بۆ گرنگیی زانست وەرگرتن لە منداڵیەوە، پێغەمبەری خوایش ﷺ ڕێنموونی کردن، منداڵان فێری چۆنێتی نوێژ بکەنو پەروەردەیان بکەن لەسەری لە تەمەنی حەوت ساڵاندا.

عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) پەردەی لەسەر لایەنێکی سایکۆلۆجی گرنگ ڕاماڵی کاتێك ئامۆژگاری هاوڵاتیەکانی دەکرد لە منداڵیەوە فێری زانست بنو فەرمووی: "تفقهوا قبل ان تسودوا"،[2] واتە: فێری زانست بن پێش ئەوەی ببن بە سەرگەورە، چونکە کەسی بەساڵاچوو و خاوەن پلەو پایە لە نێو کۆمەڵگا لەوانەیە لە خۆیان نەگرن پرسیار بکەن یان بچنە کۆڕەکانی زانست بە پێچەوانەوەی منداڵ، هەروەها عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) درکی بەوە کردبوو کە تیژی بیرو ئامادەیی بەهێز لەلای منداڵان هەیە، بۆیە بە پەرۆش بوو بۆ پرسیارکردن لیانو سوود وەرگرتن لە ژیریان. بنەمای "فێربوون لە منداڵی" بەردەوام بوو لەژیانی پەروەردەیی موسڵمانان تاکو ئەمڕۆیش، هەروەها فێرکردن لە چوارچێوەی شارستانی ڕۆژئاوادا لەگەڵ فێرکردنی ئیسلامیدا یەکدەگرن لە ڕەچاوکردنی ئەم بنەمایە.

پێغەمبەری خوایش ﷺ جیاوازیی ئامادەیی عەقڵیو توانینی تێگەیشتنی لە نێوان خەڵکیدا ئاشکرا کردووە لەم فەرموودەدا: "نضر الله امرءاً سمع منا حديثاً فحفظه حتى يبلغه غيره، فرب حامل فقه الى من هو افقه منه، ورب حامل فقه ليس بفقيه".[3] واتە: خوای گەورە ئەو کەسە بگەشێنێتەوە کە گوی لە فەرموودەیەکمان دەبێتو لەبەری دەکات تاکو دەیگەیەنێتە کەسێکی تر، ڕەنگە کەسێك زانستێك بگەیەنێتە کەسێك لە خۆی زانا تر بێت، ڕەنگە هەڵگری زانستێك هەبێت کە خۆی زانا نی یە.

---

١) ابن حجر: الاصابة ١: ١٥٠.

٢) البخاري: صحيح (فتح الباري ١: ١٦٥ باب ١٥ باسناد صحيح).

٣) اخرجه الترمذي: الجامع، باب ماجاء في الحث على تبليغ السماع.

هاوەڵانیش ئەوەیان ڕەچاو دەکرد، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێ: پیاوێك باسی فەرموودەیەك دەکات بۆ کەسێك کە عەقڵی توانای تێگەیشتنی ئەو فەرموودەیەی نی یە، بۆیە دەبێتە مایەی سەرلێشێواندنی.[1]

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود درکی کردبوو بە کاریگەری حاڵەتە دەروونیو لاشەیەکان لەسەر مەسەلەی وەرگرتنی زانست، راسپاردەشی کردبوو بە رەچاوکردنی: "دڵەکان ئارەزوو پێشوازیان هەیە، هەروەها لاوازیو پشت هەڵکردنیان هەیە، جا هەل بقۆزنەوە لە کاتی ئارەزوویداو وازی لێبهێنن لەکاتی لاوازیدا".[2]

هەروەها فەرموویەتی: "قسە بۆ خەڵکی بکە تا دڵیان لە لات بوو، ئەگەر دڵیان لە لات نەما ئیتر قسەیان بۆ مەکە، وتیان: نیشانەی ئەوە چی یە؟ فەرمووی: ئەگەر بە چاوەکانیان تەماشاتیان دەکرد، ئەگەر باوێشکیانداو شانیان دایە یەکتریەوە دیارە دڵەکانیان لای تۆ نی یە ئیدی قسەیان بۆ مەکە".[3]

ئیبنو مەسعوود ڕوونی کردوەتەوە کە ڕەچاوکردنی ئەو مەسەلەیە لە سوننەتەوەیە فەرموویەتی: "جاری وا هەیە شوێنەکانتانم پێدەوترێت بەڵام بەجێتان دەهێڵم بۆ ئەوەی بێزارتان نەکەم. پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی دەکردین لە هەڵبژاردنی ڕۆژ لەنێو ڕۆژەکاندا بۆ ئامۆژگاری لە مەترسی ئەوەی بێزار نەبین".[4]

عائیشە (رەزای خوای لێبێت) بە عوبەیدی کوڕی عومەیری وتووە: "ڕاستە دەڵێن دادەنیشیو خەڵکی بەدەورتدا دادەنیشن؟ وتی بەڵێ. وتی: ئامان خەڵکی بێزارو بێهیوا نەکەیت.[5]

ئینجا ڕێزگرتن لە پیتی عەرەبی کە وەحی خوای گەورەی پێنووسراوە جێگیر بوو لە دەروونی خەڵکی ئەو سەردەمەدا، چونکە قسەکانی خوای گەورەو فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ پێنووسراوە، ئەم ڕێزگرتنە بەردەوام بوو لەلای خەڵکی تاکو چەندین سەدە، تا ئێستاش

١) الخطيب: الجامع ٢: ١٠٩.

٢) الخطيب: الجامع ١: ٣٣١.

٣) هەمان سەرچاوە ١: ٣٣٠.

٤) اخرجه البخاري (فتح الباري ١: ١٦٣ حديث رقم ٧٠) ومسلم: الصحيح ٤: ٢١٧٢.

٥) الخطيب الجامع ٢: ١٢٨.

شوێنەوارەکانی هەر ماوەتەوە لە دڵو دەروونی خەڵکیدا، کاتێك دەبینی کە ئامادەنین پیتی عەرەبی فڕێدەنە سەر زەوی.

بە هاوەڵی مەزنی پێغەمبەر ﷺ ئەنەسی کوڕی مالیك وترا (٩٣ك): "مامۆستاکان چۆن بوون لە سەردەمانی پێشەوایان ئەبو بکرو عومەر عوسمانو عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت)؟ ئەنەس فەرمووی: مامۆستا کوپێکی گلێنەی هەبوو، هەموو منالێك لەنۆرەی خۆیدا ئاوێکی دەهێناو تێی دەکرد، بۆ ئەوەی نووسراوی سەر تەختەکانیانی پێ بسڕنەوە. ئەنەس فەرمووی: دوایی چاڵێکیان لە زەوی هەڵدەکەندو ئەو ئاوەیان تێدەکردو وشك دەبویەوە، وتم: ڕات چۆنە بسڕێتەوە؟ فەرمووی: خراپ نی یە، بەڵام بەپێ نابێت، بە دەسەسڕێك یان شتێکی تر، وتم: ئەی ئەو شتانەی خوێندکارەکان لە حوجرە دەینوسن؟ فەرمووی: ئەوەی ناوی خوای تیایە نابێت بە قاچ بسڕێتەوە، بەڵام بۆ شتی تر قەیناکە ئەگەر ئایەتی قورئان نەبێت"[1]، ئەم وێنە شەنگە بەڕاستەقینە دەربڕین دەکات لەوەی کە لە دەروونی ڕۆڵەکانی ئەو سەردەمەدا بووە بەرانبەر بە پیتی عەرەبی کاتێك سروشی خوای گەورەی پێنووسراوە، ئاوی پاکیان هەڵبژاردووە بۆ سڕینەوەی دواتریش ئاوەکەیان کردووەتە ناو چاڵێك بۆ ئەوەی وشك بێتەوە.

هەروەها ئەم ڕیوایەتە بوونی جێگای خوێندنو مامۆستا دەسەلمێنێ لە سەردەمی ڕاشیدەکانو بەکارهێنانیان بۆ تەختە.

لەراستیدا دەرچوونی هاوەڵان لە مەدینە بۆ شارەکانی تر لە سوپاکانی فەتحدا کاریگەری زۆری بەجێهێشت لە بڵاوبوونەوەی زانستو زانایان، هەندێ نەریتی زانستی سەریهەڵدا تاکو چەندین سەدە هەر بەردەوام بوو و شوێنەوارێکی قوڵیشی بەجێهێشت لەبەردەوامی بزووتنەوەی زانستی لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامی، هەروەها لە یەکخستنی ڕێوڕەسمو ڕێبازو نەریتە زانستیەکانو نزیککردنەوەی دیدی زاناکانی تر، هەروەها لە دووبارە کۆکردنەوەی زانستی بڵاوبوو، ئەوەیش بریتی بوو لە گەشتو گوزار لە پێناو بە دەست هێنانی زانستدا. بۆ نموونە جابری کوڕی عەبدوڵڵا ماوەی یەك مانگ ڕێگای بڕی تاکو گەیشتە شام بۆ ئەوەی گوی لەیەك فەرموودە بێت پێشتر نەیبیستبوو، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەس[2] بیستبووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها سەفەری کرد بۆ

---

١) ابن سحنون: آداب المعلمين ٤٠ـ ٤١.

٢) البخاري: الصحيح ١: ٢٩، والخطيب: الجامع ٢: ٢٢٥، وابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ١: ٩٣.

میصر بۆ چاوپێکەوتنی مەسلەمەی کوڕی موخەللەد (ڕەزای خوای لێبێت) بە مەبەستی گوێگرتن لە فەرمودەیەك[1]، هەروەها حاریسی کوڕی موعاویەی کیندی سوار بوو بۆ لای عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پێی فەرموو چۆن هاتی؟ وتی: بۆ پرسیارکردن دەربارەی سێ شت، فەرمووی: ئەوانە چین؟ وتی: جاری واهەیە لەگەڵ ئافرەتێکدا لە ژوورێکدا دەبین‌و کاتی نوێژ دێت، ئەگەر پێکەوە نوێژ بکەین بە تەنیشتمەوە دەبێت، ئەگەریش لە پشتمەوە نوێژبکات لە ژوورەکە دەردەچم، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: پەردەیەك دابنێ لە نێوانتانداو با بەتەنیشتتەوە نوێژ بکات ئەگەر ویستت. وتی: ئەی دەربارەی دووڕکاتەکەی دوای عەصر؟ فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ نەهی لێم کردووە کە بیانکەم، وتی: ئەی دەربارەی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان؟ فەرمووی چۆنت پێخۆشە. وەکو چۆن بڵێی پێی ناخۆش بوو لێی قەدەغە بکات، وتی من پێم خۆشە بەڕاو بۆچوونی تۆ کاربکەم. فەرمووی: دەترسم بەسەرهاتەکان بگێڕیتەوە، خۆت لەوانە بە گەورەتر بزانیت، هەر بگێڕیتەوە تاکو وابزانی لە سەرووی ئەوانەوەی، خوای گەورەیش بتخاتە ژێر پێی ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا.[2]

ئەبو ئەیوبی ئەنصاریش سەفەری کرد بۆ لای عوقبەی کوڕی عامیر لە میصر، بۆ ئەوەی گوێبیستی یەك فەرموودە بێت، ئەویش: "من ستر علی أخیه فی الدنیا، ستر الله علیه فی الآخرة". واتە: هەرکێ ستری برایەکی بکات لە دونیادا خوای گەورە لە قیامەتدا ستری دەکات. ئیتر کۆڵی سەفەرەکەی نەکردەوە تاکو گەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی.[3]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش دەفەرموێت: "ئەگەر بزانیبا کەسێك هەیە لە خۆم شارەزاتر بە قورئان وشتری پێبگەشتایە دەچوومە لای"[4]

ڕێگاکانی وەرگرتنی زانست لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺو سەردەمی ڕاشیدی، بریتی بوون لە (السماع والعرض والمذاکرة والسؤال) واتە: گوێگرتن‌و خستنەڕوو پێداچوونەوەو پرسیارکردن. متمانە کردنیش بە وانەی دەمی بوو، نەك کتێب، کە ئەوە شێوازی متمانە پێکراوی پێغەمبەر بوو ﷺ لە

١) الخطیب: الرحلة فی طلب الحدیث ٥٦.

٢) المتقي الهندي: کنز العمال ٥: ٨٥٥ نقلاً عند مسند احمد وسنن سعید ابن منصور.

٣) ابن عبد البر: جامع بیان العلم وفضله ١: ٩٣ـ ٩٤، والخطیب: الکفایة ٤٠٢، والخطیب: الرحلة فی طلب الحدیث ٥٦، والخطیب: الجامع ٢: ٢٢٦.

٤) الخطیب: الکفایة ٤٠٢.

ڕوونکردنەوەی هێماکانی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی[1] سەبارەت بە نامەی نووسراویش لە بازنەیەکی دیاریکراودا.

هەندێ لە هاوەڵانیش ئەم شێوازەیان بە بەشێك لە سوننەت زانیوە، ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێت: "بۆتان نانووسینو نایەڵین قسەکانمان ببێتە قورئان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوەو ئێمەیش لەبەرمان دەکرد، ئێوەیش قسەکانمان لەبەر بکەن چۆن ئێمە قسەی پێغەمبەرەکەتانمان لەبەر دەکرد"[2]

گوێگرتن بڵاوترین شێوازی زانست فێربوون بوو لەبەر کەمی بابەتە نوسراوەکان، قوتابییەکان لە ڕێگەی بیستنەوە زانیاریەکانیان وەردەگرت لە مامۆستاکەیان دوای ئەوەی ئەو لەبەری کردووە.

وانەوتنەوەیش پێویستە بە شێوەیەکی ڕوونبێت، لەوانەشە مامۆستاکە جەخت بکات لەسەر واتاکە بە دووپاتکردنەوەی بۆ ئەوەی گوێگر بە تەواوی فێری ببێت، ئەمە شێوازی پێغەمبەریش بوو ﷺ لە فێرکردندا.

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) نارەزای دەربڕی بەرانبەر ئەبو هورەیرە کاتێك بینی فەرموودە بە پەلە پەل دەگێڕێتەوە، ئیتر بە عورەوەی خوشکەزای وت: "چاوت لە ئەبو هورەیرەیە!؟ هاتووە نزیك ژوورەکەم دانیشتووە فەرموودە لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوەو بەگوێ منی دەداو من نوێژم دەکرد، پێش ئەوەی نوێژەکەم تەواو بکەم هەڵساو ڕۆیشت، ئەگەر فریای کەوتبام بەرپەرچم دەدایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەم شێوەیە بەپەلە قسەی نەدەکرد"[3]، سەبارەت بە خستنەڕوو (العرض): ئەوەیە کە قوتابی لە نوسخەیەکی نوسراودا بخوێنێتەوە بۆ مامۆستاکەی.

زەیدی کوڕی سابیت دەفەرموێت: "من وەحیم دەنوسی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ... ئەو پڕیدەکردوە بەسەرمداو من دەمنوسی، من تەواو نەدەبووم تا خاودەبوویەوە، کە تەواویش دەبووم دەیفەرموو: بخوێنەرەوە بۆم، ئەگەر هەڵەیەکی تیادا بوایە ڕاستی دەکردەوە، ئەجا دەیبردە دەرەوە"[4].

---

١) صالح العلي: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ١٩.

٢) الخطيب: تقييد العلم ٣٨.

٣) البخاري: الصحيح حديث رقم ٣٥٦٨، والخطيب: الجامع ١: ٢١٤.

٤) ذكره الهيثمي: مجمع الزوائد ١: ١٥٢ وقال: "رواه الطبراني فى الأوسط ورجاله موثوقون". والخطيب: الجامع لأخلاق الراوي وادآب السامع ٢: ١٣٣.

ئەوکاتەش کە بەشیری کوڕی نوهەیك ویستی بڕوات لەلای ئەبو هورەیرە، ئەو نووسراوانەی هێنا کە لە زاری ئەبو هورەیرەوەی نووسیبوو جارێکی تر خوێندنیەوە بەسەریداو وتی: ئەمانەم لە تۆ گوێ لێبووە؟ فەرمووی: بەڵێ"[1].

زانایان ـ دواتر ـ ئەم پێشبینانەیان کرد بە بەڵگە لەسەر پێویستی بەراوردی لەنێوان بەشی نووسراو لەگەڵ ئەو بنچینەی لەسەری نوسراوە. ئینجا لە عەلیەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: "خوێندنەوە بەسەر زانادا وەکو گوێگرتنە لێی[2] لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیشەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: "بخوێننەوە بۆم چونکە خوێندنەوەتان بۆ من وەکو خوێندنەوەی منە بۆ ئێوە"[3].

بەڵام پێداچوونەوە، ئەبو نەزرەی عەبەسی دەربارەی دەفەرموێت: "هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە کۆدەبوونەوە پێکەوە باسی زانستیان دەکردو سورەتێکیان دەخوێندەوە"[4].

هاوەڵی مەزنیش ئەبو سەعیدی خودری ڕاسپاردە دەکات بەپێچەوانەوە بۆ چەسپاندنی زانیاریەکانو دەفەرموێت: "قسە بکەنو بە زانیاریەکانتانا بێنەوە چونکە گفتوگۆ شت بەبیر دەهێنێتەوە"[5]

پێداچوونەوە تەنها لەبواری فەرمووددەدا نەبوو، بەڵکو لە فیقهیشدا بوو، چونکە جارێك ئەبوموسای ئەشعەری هاتە خزمەت عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) دوای نوێژی عیشا بوو، عومەر پێی فەرموو: چی هێناتی لەم کاتەدا؟ وتی: دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم، فەرمووی: لەم کاتەدا؟ وتی: دەربارەی زانستو فیقه، ئیتر عومەر دانیشت بە درێژی پێکەوە گفتوگۆیان کرد، دوای ئەوە ئەبوموسا وتی: نوێژ ئەی ئەمیری بڕواداران. عومەر فەرمووی: ئێمە لە نوێژداین"[6].

سەبارەت بە پرسیارکردنیش، شێوازێکە باوبوو، چونکە هاوەڵان پرسیاریان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو شتانەی دەهاتە ڕێگایانو پێویستیان بە حوکمی ئیسلام بوو تیایدا.

---

١) الخطيب: الجامع ٢: ١٣٤.

٢) الرامهرمزي: المحدث الفاضل ٧٦ب.

٣) الترمذي: الجامع ٢: ٣٣٧.

٤) الخطيب: الجامع ٢: ٦٨.

٥) اورده الهيثمي: مجمع الزوائد ١: ١٦١ وقال: رواه الطبراني فى الاوسط و رجاله رجال الصحيح. واخرجه الخطيب: الجامع ١:٢٣٧.

٦) المتقى الهندي: كنز العمال ١٠: ٢٥٣.

دەشگێڕنەوە لە عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) هانی پرسیارکردنی زانستیداوەو فەرموویەتی: "ئایا کەسێك نی یە پرسیارێك بکاتو سودمەند بێتو سوودبە دانیشتوانیش بگەیەنێت؟". [1]

١) المتقى الهندي: كنز العمال ١٠: ٣٠٢.

## بەشی دووەم:

# جێبەجێکردن و ناوەندو بابەتەکان

### باسی یەکەم: چالاکی فێرکردن.

**پێشەکی:**

**أـ چالاکیی فێرکردن لە مەککە پێش هیجرەت:**

ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەڕقەم جێگای کۆبوونەوەی موسڵمانان بوو لە مەککە، لەو ڕۆژگارانەی کە هێشتا ژمارەیان کەم بوو، بەخشکەیی دەچوونە ئەویێ لە ترسی قوڕەیش، لەوێش بە دیداری پێغەمبەر ﷺ شاد دەبوونو کاروباری ئاینەکەیانی لێوە فێردەبوونو ئەو سوورەتەی کە لە قورئان دابەزیوە وەریانگرت.[1]

ئاشکرایشە کە هەندێك لەوانە لەو سەردەمەدا خوێندەوار بوون، هەر بۆیە هەندێك لە سورەتەکانی قورئان نووسرایەوە، لەم بارەشەوە دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕ خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) چاوی کەوت بە لاپەڕەیەك سەرەتای سورەتی طەهای تیا نووسرابوو، ئیتر کاریگەری تێکردو موسڵمان بوو.

ئەم هەواڵەش ئەوە دەگەیەنێت کە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لەو قۆناغەدا خوێندەواری بووە[2]، هەروەها خەببابی کوڕی ئەرەتیش کە لاپەڕەکەی خوێندەوەتەوە سەر فاتیمەی خوشکی عومەر ڕەزای خوا لە هەموویان بێت، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش یەکەمین کەس بوو کە قورئانی فێری موسڵمانان کرد لە مەککە.[3]

بێگومان بارودۆخی ناڕەحەتی موسڵمانانو ڕووبەڕووبوونەوەی توندیان لەگەڵ قوڕیش، بەربەست بوو لەوەی کە موسڵمانان زۆربەی بایەخیان بە فێرکردن بدەن، چونکە جێگیری و لەسەر خۆبوون یارمەتی بڵاوبوونەوەی دەدات، هەروەها پێویستی کرداری بۆ بانگەوازی ئیسلامی ـ لە سەرەتاوە ـ دیاریکراو بوو.

١) ابن هشام: السيرة ١: ٢٥٣ حاشية (١)، والحاكم: المستدرك ٣: ٥٠٢ـ ٥٠٣.

٢) هەمان سەچاوە ١:٣٦٧ و دوای ئەوەیش.

٣) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٥١

**ب ـ چالاکی فێرکردن لە مەدینە:**

خەڵکیی مەککە لە ئەنصارەکان شانسدارتربوون لە بڵاوبوونەوەی نووسین تیایاندا، ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە کۆمەڵگای بازرگانیدا پێویستی زۆرترە بە نوسین تاکو کۆمەڵگای کشتوکاڵی، واقیدی دەڵێت: "نووسینی عەرەبی لە نێو ئەوس‌و خەزرەجدا کەم بوو، هەندێ لە جوولەکانیش فێری نوسینی عەرەبی بوو بوون، منداڵی مەدینەشیان فێردەکرد لە سەردەمی یەکەمدا" واقیدی ناوی پانزە کەسی بردووە کە شارەزایی نوسینیان هەبووە[1] ئەم ژمارەیەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو هەوڵەی جوولەکەکان داویانە بۆ فێرکردنی نووسین کەم‌و دیاریکراو بووە. ئینجا ئەو کاتەی ئیسلام بڵاودەبوویەوە لەنێو ئەنصارەکاندا، سەرەتاکانی بزوتنەوەی فێرکردنی نوێ دەستی پێکرد. رافیعی کوڕی مالیکی ئەنصاری چوو بۆ مەککەو فێری ئەو سورەتانە بوو کە لە دە ساڵی کۆتایدا دابەزیبوو لە خودی پێغەمبەر ﷺ [2] لە بەیعەتی عەقەبەشدا ئەنصارەکان لە مەککە داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە "کەسێکمان بۆ بنێرە ئاینەکەمان تێبگەیەنێت‌و قورئانمان بۆ بخوێنێتەوە"، ئیتر پێغەمبەر ﷺ موصعەبی کوڕی عومەیری بۆ ناردن.[3]

دوایی کۆچ کرا بۆ مەدینەو دەوڵەتی ئیسلام بەرپا بوو، جا پێویستیەکانی بانگەوازو بەڕێوەبردنی کاروبار وایدەخواست کە هەوڵی زۆر بدرێت بۆ بڵاوبوونەوەی زانست‌و فێربوون.

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی گێڕا، دواتر هەشت مزگەوتی تر بوونە پاڵپشت بۆی[4]، مزگەوتیش موسڵمانان پێنج وەختە تیایدا کۆدەبوونەوە بۆ نوێژ، کۆڕەکانی زانستیشی تیا دەبەستراو وتاری هەینی تیا دەوتراو قورئانی تیا دەخوێندرا، گرنگی مزگەوت تا چەندین سەدەی دوای ئەوانیش هەر بەردەوام بوو.

ئینجا لەلای باکووری مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ جێگای صوففە هەبوو کە هەژارانی موهاجیرو ئەنصارو ئەو نەناسراوانەی هاتبوونە مەدینە تیایدا دەژیان، ئەوانە دابڕابوون بۆ زانست‌و خواپەرستن‌و جیهاد، هەندێ ڕیوایەتی مێژوویش هاتووە ئەوە دەگەیەنێت کە خوێندنەوەو نووسین لە

١) البلاذري: فتوح البلدان ٦٦٣ـ ٦٦٤.

٢) ابن حجر: الاصابة ٢: ١٤٤.

٣) هەمان سەرچاوە ١: ١٢٤.

٤) البلاذري: انساب الاشراف ١: ٢٧٣.

نێو چالاکیە فێرکردنەکانی صرففەدا بووە، یەکێك لەوانەش ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆ گرتووە عوبادەی کوڕی صامیت بووە[1]، عوبادە دەڵێت: "خەڵکانێکم لە ئەهلی صوففە فێری نووسین‌و قورئان خوێندن کرد"[2].

شان بەشانی مزگەوتیش هەندێ ناوەندی تر هەبوو بۆ فێرکردن لە مەدینە وەکو ئیبنو مەسعود ئاماژە دەکات‌و دەفەرموێت: "لەزاری پێغەمبەرەوە ﷺ حەفتا سورەتم وەرگرت، ئەوکاتە زەیدی کوڕی سابیت پەرچەمێکی هەبوو لە حوجرە"،[3] هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك باسی کردووە لە بوونی حوجرەو مامۆستا لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا،[4] ئێمە نازانین ئەو حوجرانەکەی بڵاوبوونەتەوە لەناو مەدینەو درەوەیدا، بەڵام ئاماژەیەك هەیە بۆ حوجرەیەك لە تائیف، کە جەریری کوڕی حەیەی سەقەفی مامۆستایی تیادا دەکرد.[5]

بەهەمان شێوە ئاماژەیەك هەیە بۆ "دار القراء " لە مەدینە، ـ کە هیچ نەبێت ـ بوونی هەبووە دوای جەنگی بەدری گەورە،[6] بەڵام زانیاریمان لە بەردەستدانی یە دەربارەی سرووشتی ئەو جێگایانە، یان ئەو ئەرکانەی پیان سپێردراوە. بەڵام بە ناوەکەی وا دەردەکەوێت کە گرنگی داوە بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز. پێغەمبەری خوایش ﷺ سوودی وەرگرت لە هەندێ دیلەکانی بەدر لەبتپەرستەکان، کە ڕزگارانەی هەر یەکێکیان فێرکردنی نووسینە بۆ دە کەس لە لاوانی ئەنصار، زەیدی کوڕی سابیت یەکێك بوو لەوانەی فێری نووسین بوون لەگەڵ کۆمەڵێك لە لاوان[7].

---

١) ابوداود: السنن ٢: ٢٣٧، وابن ماجة ٢: ٧٣، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی (اهل الصفة) بڕوانە: اكرم العمري: المجتمع المدني ٩٦.

٢) احمد: المسند ٥: ٣١٥.

٣) احمد: االمسند ١: ٣٨٩، والخطيب: الجامع ٢: ٩٢ وفيه "وان زيدا ليختلف الى الكتاب".

٤) ابن سحنون: اداب المعلمين ٤٠ـ ٤١.

٥) ابن حجر: الاصابة ١: ٤٦٢.

٦) الخزاعي: تخريج الدلالات السمعية ٨٠.

٧) احمد: المسند ٤: ٤٧ باسناد صحيح، وقال البناء فى الفتح الرباني: فى اسناده علي بن عاصم فيه كلام و لكن وثقه الامام احمد: وابن سعد الطبقات ٢: ٢٢، وابو عبيد: الاموال ١١٦، والحاكم: المستدرك ٢: ١٤٠، والمقريزي: امتاع الاسماع ١٠١، والخزاعي: تخريج الدلالات السمعية ٧١.

هەندێ ڕیوایەتیش هاتووە دەربارەی پێشڕەوانی فێرکردن لەو سەردەمەدا. بۆ نموونە حەکەمی کوڕی سەعدی کوڕی عاصی ئومەوی نووسەر بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکرد خەڵکی فێری نووسین بکات لە مەدینە...

هەروەها ژێری و قسەی نەستەقی فێری خەڵکی دەکرد.[1]

یەکێکی تریش لەو پێشڕەوانە، عەبدوڵڵای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بوو، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد بوو هەڵسن بە فێرکردنی نووسین لە مەدینە، عەبدوڵڵا نووسەر بوو، لە ڕۆژی بەدردا شەهید بوو.[2]

هەروەها شیفای کچی عەبدوڵڵای عەدەوی قورەیشی یەکێك بوو لە یەکەمین کۆچکردووەکان، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد حەفصەی دایکی ئیمان داران فێری نووسینبکات، ئەمەش کۆنترین ئاماژەیە بۆ فێرکردنی نووسین بۆ ئافرەتانی موسڵمانان.[3]

سەعدی کوڕی عوبادەش سەرکردەی خەزرەجی (بە عەرەبی دەینووسیو شارەزای مەلەوانی و تیرهاوێشتن بوو، جا پێی دەوترا بێ عەیب)[4]، هەروەها (جوهویمی کوڕی صەڵتی مونتەلیبی فێری نووسین بوو بوو لە سەردەمی جاهیلی دا، ئەوکاتە بوو بە موسڵمان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەینوسی)[5]، ئینجا (عومەری کوڕی خەتتابیش نووسەر بوو، هەندێ ئایەتی بەدەستی خۆی نووسیی)[6] ئەبو ڕەیحانەی ئەزدیش هەندێ لاپەڕەی هەبوو ئەو یەکەم کەس بوو کە پەڕاوی پێچایەوەو تیایدا نووسیی.[7]

١) ابن حجر: الاصابة ٢: ١٠٢ـ ١٠٣.

٢) ابن حجر: الاصابة ١: ٣٤٤، وانظر تهذيب تاريخ دمشق لابن عساكر ٧. ٤٣٨ حيث يذكر انه ابن احيحة بن العاص.

٣) ابن حجر: الاصابة ٧: ٧٢٧؛ ٧٢٩، والخزاعى تخريج الدلالات السمعية ٧١، ٧٣.

٤) ابن حجر: الاصابة ٣: ٦٦.

٥) ابن حجر: الاصابة ١: ٥٢٤.

٦) الطبرى: تفسير ٢٤: ١٥.

٧) ابن حجر: الاصابة ٣٥٩، ٣٦١.

لە پێشڕەوە پێشکەوتووەکانی فێرکردن لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە سەعدی کوڕی ڕەبیعی خەزرەجیو بەشیری کوڕی سەعدی کوڕی سەعلەبەو ئەبانی کوڕی سەعدی کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێبێت)[1].

یەکێك لە بەرهەمەکانی سیاسەتی فێر کردن کە پێغەمبەر ﷺ گرتیەبەر پەرەسەندنی ژمارەی نووسەران بوو لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، تا گەیشتە ئەوەی تەنها نووسەرانی پێغەمبەر ﷺ ژمارەیان گەیشتە پەنجا نووسەر، هەندێکیان نووسەری وەحی بوون، وەکو: عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عوسمانی کوڕی عەففان، زەیدی کوڕی سابیت، ئوبەی کوڕی کەعب، عبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح، حەنزەڵەی کوڕی ڕەبیع، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، ئەبانی کوڕی سەعیدو خالیدی کوڕی سەعید (ڕەزای خوایان لێبێت). هەندێکیشیان ماڵی زەکاتیان دەنووسی وەکو زوبێری کوڕی عەووامو جوهەیمی کوڕی صەڵت (ڕەزای خوایان لێبێت)و هەندێکی تریشیان قەرزو گرێبەستەکانیان دەنوسی وەکو عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی زوهریو عەلائی کوڕی عوقبە (ڕەزای خوایان لێبێت).[2]

دەوڵەتیش پاڵپشتی هەوڵەکانی فێرکردنی دەکرد لە مەدینە، بۆ نموونە: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) مووچەی دانا بۆ سێ کەس لەو مامۆستایانەی منداڵیان فێر دەکرد، هەریەکێك لەو سێ مامۆستایە پانزە درهەمی مانگانەیان هەبوو.[3] سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصیش داوای کرد لە پیاوێك بێت بۆ مەدینە لە عێراقەوە بۆ ئەوەی کوڕەکانیان فێر بکاتو موچەی بۆ دیاری بکەن.[4]

فێرکردنیش پیاوانو ئافرەتان دەگرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆڕێکی تایبەتی کردبوو بۆ ئافرەتان لە مزگەوتی خۆی لە مەدینە[5]، لەسەر داوای خۆیان،[1] هەروەها فەرمانیشی دەکردە پیاوان ـ کە

---

١) ابن عبد البر: الاستيعاب ١: ٦٤، و ابن سعد: الطبقات ٣: ٥٣١، وابن حجر: الاصابة ١: ١٠.

٢) الكتاني: التراتيب الادارية ١: ١١٥، ١١٧، والجهشياري: الوزراء والكتاب ١٢ـ ١٣، والخزاعي: تخريج الدلالات السمعية ١٥٩ـ١٧٣.

٣) ابن عساكر: تاريخ دمشق ٨: ق ٩٢ ترجمة صدقة بن موسى الدمشقي، والمتقي الهندي: كنز العمال ٣: ٩٢٤ نقلا عن ابن شيبة والبيهيقي.

٤) ابن سحنون: كتاب أداب المعلمين ٣٧.

٥) البخاري: الصحيح ( فتح الباري ١: ١٩٢ حديث رقم ٩٨).

ئەوان هەلی فێربونیان زیاتر بۆ دەڕەخسا بە هۆی وابەستەبوونیان بە پێغەمبەر ﷺ و ئامادەبوونیان لە کۆڕە گشتیەکاندا ـ فەرمانی پێکردن ژنەکانیان فێربکەن[2]، جارێکیش پێی وتن: "ارجعو الی أهليكم فعلموهم". واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانتان فێریان بکەن.

ئینجا عائیشە ڕەزای خوای لێبێت ستایشی ژنانی ئەنصاری کردووە لەبەر ئەوەی هەوڵی فێربوونی زانستیان داوە.[3] ڕیزی ئافرەتەکان لە مزگەوت لە دوای ڕیزی پیاوانەوە بووە، هەرگیز کۆڕی تێکەڵاو نەدەبەسترا، هەر لەو سەردەمەوە کار کرا بە بنەمای قەدەغەکردنی تێکەڵاوی ژنو پیاو لەکاتی فێربووندا، تاکو ئێشتاش ئەم مۆرکە زاڵە بەسەر ژنانماندا، سەرەڕای ئەوەی کە دەزگاکانی فێرکردنی نوێ کاریگەری تێکراوە سەبارەت بە شێوازی ڕۆژئاوای لە فێرکردنی تێکەڵاودا.

**ج ـ بڵاوبوونەوەی فێرکردنی ئیسلامی لە بیابانو شارە تازەکاندا.**

فێربوون لەتەشەنە کردندابوو لە بیابانە نزیکەکانی مەککەو مەدینە، هەر لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆیەوە کاتێك نێردەی ڕەوانە دەکرد بۆ بیابانەکان، یەکێك لەوانەش نوێنەرانی ڕەجیع بۆ (عضلو قارە) بەمەبەستی فێرکردنیانو ئاشناکردنیان بە ئیسلام، ئەو نێردەیە دە کەس لە هاوەڵانی لە خۆی گرتبوو (ڕەزای خوایان لێبێت)، بەڵام هۆزی بەنو لیحیان ڕێگەیان پێگرتنو هەموویان کوژران بێجگە لەدوانیان کە بەدیل گیرانو فرۆشران بە قوڕەیش ئەوانیش هەڵسان بەکوشتنیان،[4] بەهەمان شێوەی (بئر معونة) کە حەفتا لە قورئانلەبەرانی لە خۆگرتبوو بەرەو نەجد دەڕۆشتنو تووشی دەست درێژیو ستەمی عەرەبە بیابان نیشینەکان بوونو هەموویان کوژران، یەکێکیان نەبێت کە هەواڵەکەی هێنایەوە بۆ مەدینە[5].

ئینجا لەپاش پرۆسەی فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی لە مەککە بەجێهێشت بۆ کاروبارە ئاینیەکانیان فێربکاتو قورئانیان پێبخوێنێت[6]، دواتر وەکو داوەر ڕەوانەی کرد بۆ

١) هەمان سەرچاوە ١: ١٩٠ حديث رقم ٩٧.

٢) هەمان سەرچاوە١: ١٨٣ باب ٢٥.

٣) هەمان سەرچاوە١: ٢٢٨ باب ٥٠.

٤) البخاري. الصحيح (فتح الباري ٧: ٣٨).

٥) هەمان سەرچاوە ٧: ٣٨٦. ٣٨٨.

٦) ابن هيشام السيرة ٢. ٥٠٠، والخزاعي. تخريج الدلالات السمعية ٦٧.

جەنەد لە یەمەن بۆ ئەوەی خەڵکی فێری قورئانو شەریعەتی ئیسلام بکات، هەروەها داوەریی نێوانیشیان بکات.[1] "موعاز مامۆستا بوو جێگۆڕکێی دەکرد لە نێوان یەمەنو حەزرەمەوتدا"[2].

ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد بۆ لای خەڵکی نەجران، لەسەر داواکاری خۆیان کە "کەسێك بنێرن سوننەتو ڕێنمایەکانی ئیسلاممان فێر بکات"،[3] دوای ئەوە عەمری کوڕی حەزم (ڕەزای خوای لێبێت) ناردی بۆ لایان کە هێشتا تەمەنی حەڤدەساڵ بوو، بۆ ئەوەی لە ئاین تیان بگەیەنێتو قورئانیان فێربکاتو زەکاتەکانیشیان کۆبکاتەوە، ئەمەش لەساڵی دەی کۆچی بوو[4].

لەسەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەواڵی نێردە فێرکاریەکان دەبڕێتەوە، لەوانەیە هۆکاری ئەوە بگەڕێتەوە بۆ ڕوداوەکانی بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەی ترسناك، چونکە لەو ماوەیە بیابانەکان ئاسایشی تیادا نەمابوو، بەڵام پاش یەکخستنەوەی دوورگەو فراوان بوونی فتوحات بە خیلافەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) جارێکی تر ئەو نێردانە چالاك بوونەوە.

ئینجا عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) کەسێکی ڕەوانە کرد بۆ بیابانەکانو داوای لێکرد قورئانیان پێ بخوێنێت، هەرکێ ڕازی نەبوو بەقەمچی لێی بدات.[5] مەسەلەی فێرکرنیشی بە بەشێك لە لێپرسراوێتی فەرمانڕەواکان ژمارد لە شارەکان. لە یەکێك لە وتارەکانیدا هاتووە ئەفەرموێ: "خوایەگیان دەتکەم بەشایەت بەسەر فەرمانڕەوای شارەکان، چونکە بۆ ئەوە ناردوومن کە خەڵکی فێری ئاینو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەن[6]. هەمان ئەم واتایەی لە بۆنەیەکی تردا دوپات کردووەتەوە[7].

فەرمانڕەوایانی عومەریش لەسەر شارەکان دەرکیان بە ئەم لێپرسراوێتیە دەکرد، ئەبو موسای ئەشعەری بەڕاشکاوی باسی ئەوەی کرد کاتێك وەکو فەرمانڕەوا گەیشتە بەصرەو فەرمووی:

---

١) ابن سعد: الطبقات ٧: ٣٨٨ وابن عبد البر: الاستيعاب ١: ٢٤٦، والخزاعي: تخريج الدلالات السمعية ٦٧.

٢) الطبري: تاريخ الرسل والملوك ١: ١٨٥٢ـ ١٨٥٣ (ط. ليدن)

٣) احمد: المسند ٣: ٢١٢، وابن سعد: الطبقات ٣: ٤١١ ـ٤١٢.

٤) الطبري: تاريخ الرسل والملوك ١: ١٨٥٢، والخزاعي. تخريج الدلالات السمعية ٧٩.

٥) ابن حجر الاصابة ١: ١٥١.

٦) احمد: المسند ١: ٤٨، وابن سعد. الطبقات ٣: ١، ١٤٩.

٧) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٨١.

"عومەری کوڕی خەتتاب منی ناردووە، ئاینو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ تان فێر بکەم.[1] ئینجا ئەبو موسا قورئانی دەخوێند بۆ قوتابیەکانی دوای ئەوەی کە دای دەنیشاندن بەشێوەی بازنە بازنە، دوو پۆشاکی سپی لەبەردا بوو لەوکاتەدا.[2] ئەبو موسا بایەخێکی زۆری دایە قورئان خوێنەکان لە بەصرە، بۆیە ژمارەیان زیادی کردو پلەو پایەی فیکری و سیاسیان بەهێز بوویەوە، ڕۆڵیشیان هەبوو لە ڕووداوەکانی سەرەتای ئیسلام[3].

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بەوەندە ڕانەوەستا کە فەرمانڕەوای شارەکان هەڵسن بە بڵاوکردنەوەی فێربوونی زانست، بەڵکو پشگیریی دەکردن بەو زانایانەی کە لە مەدینەوە بۆیانی دەناردو ڕاسپاردەی پیا دەناردو... دە کەس لە هاوەڵانی نارد بۆ بەصرە کە عبدوڵڵای کوڕی موغەففەلیان تیادا بوو بۆ فێرکردنی خەڵکیی.[4]

هەروەها عیمرانی کوڕی حوصەینی خوزاعی (ڕەزای خوای لێبێت) نارد بۆ بەصرە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی فێری شەریعەتی ئیسلام بکات، عیمران یەکێك بوو لە زانایانی ناو هاوەڵا ن[5].

قەرەزەی کوڕی کەعب دەگێڕێتەوە، کاتێك ویستی بچێت بۆ کووفە لەگەڵ ژمارەیەك لە یاوەرانی، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بە ڕێکخستن فەرمووی: ئێوە دەچنە شارێك دەنگیان وەکو دەنگی مێشهەنگ دێت لە خوێندنی قورئاندا، بۆیە سەرقاڵیان مەکەن بە گێڕانەوەی فەرموودە، تەنها باسی قورئان بکەن، کەمیش ڕیوایەت بگێڕنەوە لە پێغەمبەر ﷺ"[6].

بە هەمان شێوە عومەر عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی بەڕێخست بۆ کووفە بۆ ئەنجامدانی هەمان مەبەست[7] لە ڕاستیدا پشکی کووفە لە هاوەڵان یەکجار گەورە بوو، چونکە سێ سەد لە کۆمەڵی حودەیبیەو حەفتا لە ئەهلی بەدری تیا دابەزین.[8]

---

١) الدارمي: السنن ١: ١٣٥.

٢) الفاكهي: اخبار مكة ٤: ١٠ باسناد صحيح.

٣) صالح احمد العلي: دراسات في تطور الحركة الفكرية ١٥.

٤) ابن حجر: الاصابة ٤: ٣٤٣.

٥) ابن حجر: الاصابة ٤: ٧٠٥، ٧٠٦.

٦) ابن سعد: الطبقات ٦: ٧ .

٧)ابن حجر: الاصابة ٤: ٢٣٥.

٨) ابن سعد: الطبقات ٦: ٩.

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ـ لەلایەکی ترەوە ـ موعازی کوڕی جەبەلو عوبادەی کوڕی صامیتو ئەبو دەردائی نارد بۆ شام، چونکە خەڵکەکەی پێویستیان بەکەسانێك بوو قورئانی پیرۆزیان فێر بکات[1]. جا عوبادە لەوێ داوەرو مامۆستا بوو[2]. ئەبوو دەردائیش (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسا بە ڕێکخستنی قوتابییەکانی، ئینجا دابەش کردنی لە چەند گرووپێکدا لەبەر زۆریان، چونکە مەحاڵ بوو بیتوانیایە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەموویان فێر بکات، لەکاتی دابەش کردنیاندا ڕەچاوی ئاستی زانستیانی دەکرد، هەر بۆیە ئاستی گرووپەکان جیاواز بوو، سوەیدەی کوڕی عەزیز دەڵێت، ئەبودەرداء (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك نوێژی نیوەڕۆی دەکرد لە مزگەوتێکدا خەڵکی لە دەوری کۆدەبوونەوەو قورئانیان لەسەری دەخوێند، جا ئەویش دەیکردن بە دە کەس دە کەس، لەسەری هەموو دە کەسیش عەریفێکی دیاری دەکرد، خۆیشی لە ناو میحرابەکە تەماشای دەکردن، ئەگەر کەسێك هەڵەیەکی بکردایە دەگەڕایەوە بۆ لای عەریفەکەی، ئەگەر ئەویش نەیزانیبا دەگەڕایەوە بۆ لای ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێبێت)و پرسیاری لێدەکرد، ئیبنو عامیریش یەکێك بوو لە عەریفەکان، کاتێك ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێبێت) وەفاتی کرد ئیبنو عامیر چووە جێگەکەی. موسلیمی کوڕی موشکیم ـ یەکێك بوو لە قوتابیەکانی ئەبوو دەردا ـ دەڵێت ئەو پێی وتم: سەرژمێری ئەوانە بکە کە قورئان دەخوێنن لام، جا سەرژمێریانم کرد زیاتر لە هەزارو شەشسەد کەس بوون، هەموو دە کەسیش یەکێك پێدەخوێندن، ئەبو دەردائیش لەسەریان ڕادەوەستا ئەگەر کەسێکیان تەواو شارەزابوایە دەگەشتە لای ئەبو دەرداء.[3] سەرکردەکانی فەتحیش بایەخیان دایە فێرکردنو خوێندنەوەو نووسین بۆ موسوڵمانان، چونکە داوایان کرد لە دیلەکانی قەیساریە موسڵمانان فێری نووسین بکەن، هەر بۆیە خرانە سەربازگەی جوروف لە فەلەستین بۆ ئەو مەبەستە.[4] ئینجا لە پاش فەتحی شام حوجرە سەریهەڵدا لەوێ، کە منالی فاتحەکان تێدا دەیانخوێند، ئەدهەمی کوڕی موحریزی باهی حمصی دەڵێت: "من یەکەم کەس بووم لە حیمص لە دایکبووم ـ واتە لە

١)ابن عساكر: تاريخ دمشق (تحقيق د. شكرى فيصل وآخرين) ص ٢٣ و ابن حجر الاصابة ٢: ٦٢٦.

٢) ابن عبد البر: الاستيعاب ٢: ٤٢٤.

٣) ابن الجزري: غاية النهاية فى طبقات القراء ١: ٦٠٦ـ ٦٠٧. ويعرض ابن عساكر فى تاريخ دمشق صورا اخرى ١:٣٩٩ـ٤٠٠.

٤) البلازري: فتوح البلدان ١٩٣.

موسڵمانان ـ یەکەم کەسیشم کەبینرام دەچووم بۆ حوجرە بۆ فێربوونی قورئان"[١] یەکێکی تریش لەوانەی زانستیان خوێند لە حوجرەکانی شامدا بە منداڵی، ئیاسی کوڕی موعاویەی موزەنی بوو دادوەری بەناوبانگی بەصرە[٢] ئافرەتیش هەر لە دێرزەمانەوە لە شام بەشداریان کرد لە بڵاوبوونەوەی فێربوونی زانست، عەبدورەببیهی کوڕی سولەیمان دەڵێت: دایکی دەرداء لە تەختەکەمدا بە مەبەستی فێرکردن بۆی نووسیم، (دانایی فێربن بە منداڵی، بەڵکو کاری پێبکەن بە گەورەیی)، هەروەها (هەرکەسێك چی بکێڵێ لەچاکەو خراپە دەیدورێتەوە)[٣] واشدەردەکەوێت کە فێرکردن لە شام مەڵبەندی تر بوو زیاتر لە شارەکانی تر، چونکە عومەر (رەزای خوای لێبێت) "کاتێك شارەکانی فەتح کرد نووسراوی نارد بۆ ئەبوموسای ئەشعەری کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو، فەرمانی پێکرد مزگەوتێکی گەورە دروست بکات، بەڵام لە ڕۆژی هەینی هەموویان حازری جومعەو جەماعەت بن لە مزگەوتی گەورە، هەروەها نووسراوی نارد بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص، کە فەرمانڕەوای کووفە بوو بە واتایەکی لەو شێوە، هەمان واتاشی لە نامەکدا نارد بۆ عەمری کوڕی عاص لە میصر، ئینجا نووسراوی نارد بۆ سەرکردە سەربازیەکانی شام: نەچنە لادێکانو شارەکان بە جێمەهێڵن، لە هەموو شارێکدا یەك مزگەوت دروست بکرێت هەموو هۆزێکیش مزگەوتی خۆیانیان نەبێت وەکو خەڵکی کوفەو بەصرەو میصر. خەڵکیش پەیوەست بوون بە فەرمانەکانو بەڵێنی عومەر"[٤]

١) ابن بدران: تهذيب تاريخ دمشق الكبير لانى عساكر ٢: ٣٦٧.

٢) هەمان سەرچاوە. ٣: ١٨٠.

٣) ابن عساكر: تاريخ دمشق ١٩: ق ٤٠٨. ترجمة هجيمة بنت حيي ام الدرداء.

٤)ابن عساكر: تاريخ دمشق ٢ : ٩٤_ ٩٥(ط. المنجد).

## باسی دووەم: مەڵبەندەکانی بزوتنەوەی ئەندێشەیی

شاری مەدینە بریتی بوو لە گرنگترین ناوەندە ئەندیشەیەکان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان، چونکە بنکەی سوننەتو کۆمەڵگای هاوەڵانی بوو، لەوێشەوە زانست بڵاوبوویەوە بۆ شارو شوێنەکانی تر، لە ڕێگەی دەرچوونی ژمارەیەکی گەورە لە هاوەڵان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ و جێگیر بونیان لە وڵاتە فەتحکراوەکانو بڵاو کردنەوەیان بۆ زانست و ڕیوایەت.

بە تێڕوانینێك بۆ ئەو بەشەی هەر یەك لە خەلیفەی کوڕی خەیات (٢٤٠ك)و موحەمەدی کوڕی سەعید (٢٣٠ك) تەرخانیان کردووە بۆ ژیاننامەی زانایانی مەدینەو هەڵسەنگاندنی لەگەڵ ئەوەی تەرخانیان کردووە بۆ شارەکانی تر، دەبینین مەدینە لە سەروی هەموو شارەکانی ترەوەیە لەو سەردەمە، ئەوەشی ماوە لە شارەکانی حیجاز ڕۆڵیان لاواز بووە ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ مەدینە، لە نێو ئەو شارانەش زیاتر مەککە دیاربوو بە هۆی ئەوەی کە ناوەندی ئاینیی بووەو زانایان لە کاتی حەج لەوێ کۆدەبوونەوە.

بەڵام سەبارەت بە شارە تازەکان لە ڕووی جووڵەی زانستیەوە، کووفە و بەصرە و دیمەشق و فوستات زیاتر ئاشکران، چونکو ژمارەیەك لە یارو یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ تیایاندا جێگر بوون، چونکە لە کووفە قوتابخانەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) سەریهەڵدا، لە بەصرەیش قوتابخانەی ئەبو موسای ئەشعەری بۆ (قراءات) وەدەرکەوت، بەڵام دیمەشق ـ لە ڕووی گرنگی یەوە ـ لە پاش کوفەو بەصرەوە دێت، لە دوای ئەویش فوستان لە میصر، سەبارەت بە ڕۆژهەڵات گرنگی زانست دەرنەکەوت لەم قۆناغە پێشوەختەدا، سەرەڕای ئەوەی کە تۆوی فێرکردنی ئیسلامیی لە دڵی ڕۆڵەکانیدا هەر لەوکاتەوە چێنرابوو، ئەبو نوعەیم دەگێڕێتەوە "پیاوێك بوو لە ئەصفەهان بەنی سولەیمی بوو. هاوەڵی پێغەمبەریش بوو ﷺ یەکێك بوو لە بازرگانەکانو خەڵکیشی فێری شەریعەتو سوننەتەکان دەکرد".[1]

١) ابو نعيم: ذكر اخبار اصبهان ١: ٧٥.

**ئامرازەکانی نووسین :**

پێش بڵاوبوونەوەی کاغەز ـ کە لە جیهانی ئیسلامیدا لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچی پەیدا بوو[1] ئامرازەکانی نووسین بریتی بوون لە بەرد و ئێسك، یان گەڵای دارخورماو پارچە، یان پێستو گەڵای بەردی (قیرتاسی) هەم ئاماژەیەکیش نەکراوە بۆ بەکار هێنانی کاغەز لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان. مەبەست لە (قراطیس)یش تۆی ڕووەکی بەردیە کە لە دەلتای میصر دەڕوێت، لە دوورگەی عەرەبیش هەبوو پێش ئیسلام، یەکێ لە خاسیەتەکانی ئەوەیە لاپەڕەکانی پان بوو، بەڵام تێچونی گران بوو بەرگریشی لە کاغەز کەمتر بوو[2] . ناوی (قرطاس) لە قورئانیشدا هاتووە،[3] ئەو کاتە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ویستی قورئان کۆ بکاتەوە ئەوکاتە هەندێکیشیان لە قیرتاسدا[4] نووسرابوون، چەند نوسخەیەکی قورئانیشمان پێگەیشتووە لە سەر گەڵای بەردی نووسراون، کە ئەمڕۆ لە (دار الكتب المصرية) پارێزراون[5].

ئینجا خالیدی کوڕی وەلید کاتێك پەیمانی صوڵحی لەگەڵ دیمەشقدا بەست، لە سەر قەراتیس نووسرا، هەروەها پسووڵەکانی (الجار) یش هەر لەسەر ئەو گەڵایانە دەنووسرا،[6] لە پاش فەتحی میصریش لەلایەن عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بەکارهێنانی قیرتاس بووە باو لە وڵاتی عەرەبدا.

پێویستیەکانی دەوڵەتیش بۆ قیرتاسو ئامرازەکانی تری نووسین تادەهات زیادی دەکرد، تەنانەت خانوویەك لە نزیکی ماڵی عوسمان تەرخان کرا بۆ پاراستنی قیرتاس [7] سەبارەت بە پێست، عەرەب لەنووسین دا بەکاری دەهێنا، بەڵام لە ژێری ناوی (الرق، الاديم، القضيم) ڕەق بریتی بوو لە پێستی سپی ناسك لە سەری دەنووسرا، ئەدیمیش بریتی بوو لە هەر پێستێك، یان تەنها پێستی سوور، یان

---

١) صالح احمد العلي: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ١٣.
٢) صالح احمد العلي: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ٥٤ـ ٥٥ .
٣) الانعام ٩١٠٧.
٤) السيوطي: الاتقان ١: ٦٠، وصالح: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ٥٤ـ ٥٥ .
٥) صالح العلي: دراسات فى تطور الحركةالفكرية ٥٤ـ ٥٥ .
٦) هەمان سەرچاوە ٥٥. پسووڵەی (الجار) دەوڵەت دروستی دەکردو ئازوقەی خەڵکی تیادا بوو لە داهاتەکانی میصر.(جار) یش بەندەری خەڵکی مەدینە بوو لەسەر دەریای سوور (البكر: معجم مااستجعم ٢: ٣٥٥).
٧) البلاذري: انساب الاشراف ١: ٢٢ .

خۆشەکراوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا بە زۆری بەکار دەهێنرا، خودی قورئانیش هەر لەسەر ئەدیم دەنووسرا، بە هەمان شێوەی نووسراوەکانی پێغەمبەر ﷺ کە دەی نارد بۆ ئەهلی دۆماو مالیکی جوزامیو زوهێری کوڕی قەیسو تەرخانکردنی زەوی بۆ عەباسی کوڕی سەلەمە، هەموو ئەوانە لەسەر ئەدیم دەنوسران هەندێکیان سوور و هەندێکیان خەولانی. سەبارەت بە قەزیم، بریتی یە لە پێستی سپی، دەشگێڕنەوە، مەبەست لەوە لاپەڕەی سپیە. پێغەمبەری خوایش ﷺ لە دونیا دەرچوو و قورئان لەسەر گەڵای دار خورماو قەزیم نووسرابوو.[1] هاوەڵانیش یەکدەنگ بوون لەسەر نووسینی قورئان لەسەر ڕەق لەبەر زۆری بەرگە گرتنی، یان لەبەر ئەوەی تەنها ئەوە دەست دەکەوت.[2]

ئەبو ڕەیحانەی ئەزدیش (ڕەزای خوای لێبێت) هەندێ لاپەڕەی هەبوو، کە ئەو یەکەم کەسە لاپەڕەی لوول کردووە[3]. هەروەها سەعدی کوڕی جوبەیر لە لاپەڕەدا دەی نووسی لەلای ئیبو عەباس (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەگەر لاپەڕەکە تەوا بوایە لەسەر نەعلەکەی دەی نوسی، ئەگەر لەوێش جێگە نەمایە لە ناو دەستی دەینووسی .[4] ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) تەختەی بەکار دەهێنا[5] نووسینەکانیشی گەیشتە باری وشترێك.[6]

کەسانێکی تریش لە ناو دەستیان بە قامیش دەیان نووسی لەلای بەڕائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێبێت)[7] بێگومان نووسین لە ناو دەست هۆکارێك بوو بۆ بیرکەوتنەوەی وەکو سەبوورەی ئەمڕۆ بووە.

زەیدی کوڕی سابیتیش (ڕەزای خوای لێبێت) پشکی نەنکی لە میراتی نووسین لەسەر تەختەیەك لە کۆپارەی بەرز بووی حوشتر دەچوو[8] لاپەڕەکانیش لەبازاڕدا بە دەست دەکەوت، بۆ نموونە: حاریسی

---

١) صالح العلي: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ٥١.

٢) القلقشندي: صبح الاعشى ٢: ٤٢٥، وصالح العلي: دراسات فى تطور الحركة الفكرية ٤٩.

٣) ابن حجر: الاصابة ٣: ٣٥٩، ٣٦١.

٤) احمد بن حنبل: العلل ١: ٤٢، وفؤاد سزكين: تاريخ التراث العربي ١ : ٩٧

٥) ابن سعد: الطبقات ٢: ٣٧١(ط. دار صادر).

٦)هەمان سەرچاوە ٥: ٢٩٣.

٧) احمد بن حمبل: العلل ١: ٤٢، وابن عبدالبر: جامع بيان العلم و فضله ٧٣.

٨) الدار قطنى: سنن ٤: ٩٣ـ ٩٤.

کوڕی ئەعوەر هەندێ لاپەڕەی بە یەك درهەم کڕیو بردی بۆ خزمەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەویش زانستێکی زۆری بۆ نووسی تیایدا.[1]

هەندێکێشیان پەنایان دەبردە بەر (سەبورجە)، بۆیە ئەبانی کوڕی ئەبو عەباسیش شەوانی لە لای ئەنسی کوڕی مالیك لەسەری دەنووسیی.[2]

ئینجا نووسراوی میری هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ بە قوڕ دادەخراو مۆر دەکرا،[3] لەگەڵ فراوان بوونی پەیوەندیە دەرەکیەکانیشدا نووسراوەکان زیاتر پێویستیان بە پاراستن بوو، بۆیە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دیوانی داهێناو ڕێککەوتننامەکان کە لە نێوان خۆیو هەر لایەنێکدا کرابێت لە تابووتێکدا دەیپاراستن.[4]

١)ابن سعد: الطبقات ٢: ٥٨.

٢) الخطيب: الجامع ٢: ٥٨.

٣) الخزاعي. تخريج الدلالات السمعية١٧٣.

٤) المقريزي: الخطط ١: ٢٩٥.

## باسی سێ یەم: بابەتەکانی فێرکردن

فێرکردن لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو خەلیفە ڕاشیدەکان تەنها بریتی نەبوو لە قۆناغە سەرەتایەکانی فێربوونی نووسینو خوێندنەوە، بەڵکو چەند جۆرێکی تری لە خۆگرتبوو لە شێوازی بەرزو پسپۆڕی ورد، زۆر جاریش پەیوەست نەبوو بە شارەزایی لە نووسین، بەڵکو هەر لە ڕێگەی بیستن و قسە کردنەوە ئەنجام دەدرا، چونکە ئەوە هۆکاری یەکەمی پێگەیاندن بوو لەو سەردەمەدا، هەندێکی دیاریکراویش لە هاوەڵان گەشەیان کرد لە چەند هونەرێکی دیاریکراودا، ژمارەیەکیشیان لە چەند هۆنەرێکدا شارەزا بوون.

ئەو زانایانە هەڵسان بە ڕۆڵی خۆیان لە بڵاو کردنەوەی زانست و ئامادەکردنی بیرو هۆشەکان بۆ وەرگرتنیو گەشەپێکردنی خوێندکارەکانو یارمەتیدانی دەوڵەت بە ڕەگەزی سەرکردایەتی پێویست.

بابەتەکانی فێرکردنیش خۆی دەبینیەوە لە قورئانو زانستەکانی: فەرموودە، فیقه، زمانی عەرەبی، مێژوو، هۆنراوە، بەسەرهات، قسەی نەستەق، داستان، ئەستێرەناسی، زمان و ڕۆشنبیریە بیانیەکان.

ئیستاش هەندێ لەو بابەتانەو ئەوانەی تێدا پسپۆڕ بوون لەو سەردەمەدا دەخەینەڕوو بە پێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتووە:

**أ- قورئان و زانستەکانی:**

بێگومان لەبەرکردنی قورئان و بە خەڵکی وتنەوەی و ڕاڤەکردنی، لە پێش هەموو بابەتەکانی ترەوە دەهات، چونکە قورئان تاکە کتێبێك بوو کە بە تەواوی نووسرا بوو لەو سەردەمەدا، موسڵمانان هەر لە کاتی دابەزینیەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ بڕ بڕ دەیان نووسیەوە، دواتر لەم نووسراوە بەشبەشانە نوسخەیەکیان کۆکردەوە لە سەردەمی ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەم ئەرکە زەیدی کوڕی سابیت پێی هەڵسا بە فەرمانی ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، دوای ئەوەی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)، پێشنیازی کۆکردنەوەی کرد، دواتر ئەو نوسخە گەشتە لای عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەردەمی خۆیدا، ئینجا سپێردرا بە دایکی ئیمانداران حەفصەی کچی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت).

ئینجا جارێکی تر لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا (ڕەزای خوای لێبێت) قورئان کۆکرایەوە لەلایەن لیژنەیەکی چوار کەسیەوەکە فەرمانی پێکردن بە پێکهێنانی ئەو ئەرکەی پیان سپێردرابوو،

ئەو لیژنەیە پێك هاتبوون لە زەیدی کوڕی سابیت (ڕەزای خوای لێبێت)و هۆکاری هەڵبژاردنشی لەبەر ئەوەبوو کە گوێبیستی کۆتا خوێندنەوەی پێغەمبەر ﷺ بوو بۆ هەموو قورئان بەدەقی تەواو بێجگە لەو ئایەتەی کە خوێندنەوەی نەسخ کراوە، هەروەها لەبەر ئەوەی خۆی هەڵسا بە کۆکردنەوەی یەکەم لە خیلافەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، جگە لەوەش هەر لە بنچینەوە نووسەری وەحی بووە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

سێ کەسەکەی تریش لە لیژنەکە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو سەعدی کوڕی عاصو عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام بوو، ئەندامانی لیژنە هەموویان قوڕەیشی بوون زەید نەبێت ئەنصاری بوو، عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بناغەی کارکردنی بۆ لیژنەکە دەستنیشان کردو فەرمووی: "ئەگەر لە وشەیەکدا جیاواز بوون لەگەڵ زەیددا ئەوا بەزمانی قوڕەیشی بینووسن، چونکە قورئان بەزمانی ئەوان دابەزیوە، لیژنەکە کاری خۆی بەئەنجام گەیاندو هاوەڵانیش ڕەزامەندیان دەربڕی لە سەرکارەکەی، ئینجا شەش نوسخەی لەبەر گیرایەوەو دابەش کرا بەسەر دەڤەرەکانی مەککەو شام و بەصرە و کووفە، نوسخەی پێنجەم لە مەدینە گلدرایەوە، نوسخەیەك لەلای عوسمان خۆی مایەوە، پاشان هەرچی قورئان هەیە لەبەر نوسخەکەی عوسمان گیرایەوە، کە بە موصحەفی ئیمام دەناسرا، شێوازی نووسینیشی بە ڕەسمی عوسمانی ناوبانگی دەرکرد.

دەقی قورئان لەو سەردەمە نوختەو سەرو ژێری نەبوو، خوێندنەوەی پێویستی بە سەلیقەی زمانەوانی بوو، هەروەها دابەزینیشی لەسەر حەوت پیت، بووە مایەی دروست بوونی هەندێك ناکۆکی لە شێوازی خوێندنەوەیدا، ئەمجا کورتکردنو کشتگیری و ناسخو مەنسوخ تیایدا پێویستی دەکرد بە زانینی هۆی دابەزانی ئایەتەکانو دیاریکردنی خوێندنەوەی ڕاستو لێکدانەوەی ماناکانیو دەرخستنی حوکمە شەرعیەکان، هەموو ئەوانەش پێویستیان بە پسپۆری ورد بوو، جا سەبارەت بە (قراءات) ژمارەیەك لە هاوەڵان تیایدا دیار بوون، لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت)، خۆی قورئانیکی نووسراوی هەبوو لەگەڵ خۆی بردی بۆ کووفە، هەروەها حەفتا سورەتیشی لە زاری پێغەمبەر ﷺ ەوە بیستووە.[1]، هەروەها بە وردی شارەزایی هەبووە لە لێکدانەوەی قورئاندا، مەسروقی قوتابیشی شێوازی فێرکردنی مامۆستاکەی باس دەکاتو دەڵێت: "عەبدوڵڵا

١)ابن سعد: الطبقات ٣: ١٥١، واحمد: المسند ١: ٣٨٩.

سورەتێکی لە قورئان بۆ دەخوێندمەوە، ئەمجا بە درێژایی ڕۆژەکە باسی دەکردو تەفسیری دەکرد"[١].
هەروەها زەیدی کوڕی سابیتو ئوبەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوایان لێبێت) هەڵکەوتنو لەو کەسانە بوون قورئانیان فێری خەڵکی دەکرد[٢].
پێغەمبەریش ﷺ ڕاسپاردەی فەرمووە کە قورئان لە چوار کەسەوە وەربگیردرێت: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، موعازی کوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعبو سالیمی مەولای ئەبو حوزەیفە (ڕەزای خوایان لێبێت).[٣]
عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) قورئانی بە تەواوی لەبەر کرد لە پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ.[٤] فەرموودەی زۆریش هاتووە هاندانی تیادایە بۆ لەبەرکردنی قورئانو خوێندنەوەی و تێگەیشتنیو زانینی مەبەستەکانی، لەوانە: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ "تعلموا القرآن"[٥] واتە: خۆتان فێری قورئان بکەن.
بەڵام مەسەلەی تەفسیر پشتی دەبەست بە لێکدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئایەتەکانی، سەبارەت بە هۆی دابەزینی ئایەتەکانیش زانراوبوو لای شارەزایانی هاوەڵان، چونکە ئەوان لەگەڵ ڕووداوەکاندا دەژیان، ئینجا دەبینین ئیبنو عەباس زۆر پشت دەبەستێ بە هۆنراوەی جاهیلی لەکاتی لێکدانەوەی ئایەتەکان، لەو سەردەمەشدا نیشانەکانی لێکدانەوە بە بۆچوونی کەسێتی دەرنەکەوتبوو جارێ، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) خەڵکی دەترساند لەو جۆرە لێکدانەوەو دەیفەرموو: کام ئاسمان دام دەپۆشێ و کام زەوی هەڵمدەگرێ، ئەگەر لە خۆمەوە دەربارەی قورئان قسە بکەم"[٦] چەند زاراوەیەکیش تێبینی دەکرێت لە قسەکانی ئیبنوعەباسدا پەیوەندیان هەیە بە زانستەکانی قورئان، ئەو واتای (الحکمة)ی لە ئایەتی (ومن یؤت، الحکمة فقد اوتی خیراً کثیراً).[٧]

١) الطبري: تفسير، رقم ٨٤ (ط. احمد شاكر).
٢)البيهقي: السنن ٦: ١٢٦.
٣) الخزاعي. تخريج الدلالات السمعية١٣٣.
٤) المتقي الهيندى: كنز العال ١٣: ١٢٨.
٥) الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة، رقم ٢٥٨.
٦) الخطيب: الجامع ٢: ١٩٣.
٧) البقرة ٢٦٩.

بەوە لێکداوەتەوە "شارەزایی لە قورئان، لە ڕووی ناسخو مەنسوخو موحکەمو لە یەکچووو پێشکەوتوو دواکەوتوو و حەرامو حەلاڵو داستانەکانی"[1].

**ب ـ فەرموودە:**

وێڕای هەبوونی ژمارەیەك لە نووسەران لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەنجامدانیان بۆ نووسینی قورئان، بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەکی گشتگیری و تەواو نەنووسراوە، بەڵکو بە زۆری پشتیان بەست بە لەبەرکردنو بیر، پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمانی پێنەکردن بینووسنەوە، لەوانەیە بەم کارەش مەبەستی پاراستنی توانای لەبەر کردنیان بێت، بە تایبەت بە هۆی ئەوەی فەرموودە دەکرێت واتاکەی باسکرێت لە جیاتی دەقەکەی بە پێچەوانەی قورئانەوە، کە پیتو واتاکانی لە ئاسا بەرن پێکەوە، بۆیە ناکرێت تەنها واتاکەی باسکرێت، ئالێرەشەوە هەوڵی نوسەران تەنها لە چوارچێوەی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز خۆی دەبینیەوە، هەروەها لەبەر مەترسی تێکەڵ بوونی فەرموودە بە قورئانی پیرۆزەوە لە لای موسڵمانان لە حاڵەتی تێکەڵبوونی لاپەڕەکانیان، بە تایبەت لە سەرەتاکانیدا، کە هێشتا دابەزینی قورئان تەواو نەبوو بوو، مسوڵمانانیش هێشتا ڕانەهاتبوون لە سەر شێوازی قورئان.[2]

هەندێ فەرموودەش هاتووە کە نەهی دەکات لە نووسینی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، هەندیکی تریش هەیە ڕێگە دەدات بە نووسین، بەهێزترین ئەو فەرموودانەش کە نەهی لە نووسین دەکەن ئەوەیە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ڕێگەی ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوامان ﷺ ماندووکرد هێندە داوامان لێکرد ڕێگەمان بدات فەرموودەکانی بنووسینەوە بەڵام ڕازی نەبوو"[3].

بەهێزترین فەرموودەکانی چاوپۆشیش لە نووسینی فەرموودە ئەوەیە کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ڕێگەی ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە دەفەرموێت: "لە هاوەڵانی پێغەمبەر

---

١) ابن الجوزي: نواسخ القران ١١٠.

٢) بەسەرهاتێك دەگێڕنەوە لە عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە، کە چەند چامە هۆنراوەیەکی بۆ خێزانەکەی خوێندوەتەوەو ئەویش وای زانیوە قورئانە (الذهبي: سير اعلام النبلاء ١: ٢٣٨ وقد قال ان السند حسن لكنه مرسل).

٣) حديث رقم ٣٢٩٨.

ﷺ کەس نەبوو لە من زیاتر فەرموودەی لەبەربێت، تەنها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نەبێت، چونکە ئەو فەرموودەکانی دەنووسیو من نەم دەنوسی". [١]

هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا فەرمووده‌یەکی تر هاتووە کە پیاوێکی خەڵکی یەمەن داوای لە هاوەڵان کردووە وتارێکی پێغەمبەر ﷺ ی بۆ بنووسن دوای فەتحی مەککە، هاوەڵان داوای ڕێگە پێدانیان کردووە لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرموێتی "اکتبوا لأبی فلان" [٢] واتە: بۆ باوکی فلان کەس بنووسن. فەرمووده‌یەکی تریش هەر لە صحیحی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لە ئەو نەخۆشیەی تیایدا وەفاتی کرد فەرمویەتی: "آتونی بکتاب اکتب لکم کتابا لا تضلوا بعده"، [٣] واتە تێنووسێکم بۆ بهێنن با نووسراوێکتان بۆ بنووسم لە دوای ئەوە هەرگیز گومڕانابن. [٤]

بۆ گونجاندنیش لە نێوان فەرموودەکەی ئەبوسەعیدو ئەم فەرمودەیەدا، ڕامهورموزی دەربارەی فەرموودەکەی ئەبو سەعید وتوێتی: "وا ئەزانم ئەمە کارپێیدەکرا لەسەرەتای کۆچکردندا، لەو کاتەیش کە دەستەبەری ئەوە نەدەکرا لەگەڵ قورئان تێکەڵ نەبێت" [٥]. ئیبنو قوتەیبەی دەینەوەریش لەو زانایانەیە کە بۆ چوونی وابوو ئەم جۆرە فەرمودانە نەسخ کرانەتەوە. [٦]

هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێبێت هەڵوێستیان یەك نەبوو سەبارەت بە نووسینەوەی فەرموودە، هەندێکیان پیان باش نەبووە و هەندێکیان ڕێگەیان داوە، هەندێکیان هەردوو هەڵوێستەکەی لێ ڕیوایەت کراوە.

هەڵوێستی گەورەهاوەڵان لە ڕێگە نەدان بە نووسینی فەرموودە:

١ـ ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) پێنج سەد فەرموودەی کۆکردەوە، بەڵام دواتر هەڵسا بە سووتاندنیان.

٢ـ عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت) ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بنووسرێتەوە، دوای بۆ ماوەی مانگێك هەر ئیستیخارەی دەکرد ئەوجا پاشگەز

١) البخاري: الصحيح ١: ٣٨.

٢) هەمان سەرچاوە ١: ٣٨.

٣) هەمان سەرچاوە: ١: ٢٩، ومسلم: الصحيح حديث رقم ١٢٥٧.

٤) الرامهرمزي: المحدث الفاضل ١٧١.

٥) ابن قتيبة: تأويل مختلف الحديث ٣٦٥.

٦) الذهبـي: تذكرة الحاض ١: ٥.

بوویەوە و فەرمووی: "من دەمویست سوننەتەکان بنووسمەوە، بەڵام دوایی کەسانێکم یاد کەوتەوە پێش ئێوە، کە هەندێ نووسراویان نووسیەوە و خۆیان پێوە سەرقاڵ کردووە و وازیان لە کیتابی خوا هێناوە، بۆیە من هەرگیز قسەی خوای گەورە لەگەڵ هیچی تر تێکەڵ ناکەم".[1]

**٣ـ** عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: "داوا دەکەم لە هەموو کەسێك نووسراوێکی لایە بابیسڕێتەوە، چونکە خەڵکان بەوە تیاچوون دوای قسەی زاناکانیان کەوتوون و قسەی خوایان پشگوێ دەخست".[2]

**٤ـ** لاپەڕەیەکیان هێنایە لای عبدوڵڵای کوڕی مەسعودو فەرموودەیەکی تیادا بوو ئەویش داوای هەندێ ئاوی کردو سڕیەوە فەرمووی، "بەم جۆرە شتانە ئەهلی کیتابی پێش ئێوە لە نێوچوون، کاتێك کە کیتابی خوایان خستە پشتیان وەکو ئەوەی کە نەزانن".[3]

**٥ـ** ڕیوایەتگەلێکی تر هاتووە لەسەر ڕازینەبوونی هاوەڵان لەسەر نووسینی فەرموودە، لەوانە: زەیدی کوڕی سابیت، ئەبو هورەیرە، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، ئەبو سەعیدی خودری، عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبو موسای ئەشعەری، (ڕەزای خوایان لێبێت).

هەموو کەسێکیش لەم هاوەڵانە هۆکاری ناڕەزایبوونی خۆیان ڕوونکردۆتەوە بەوەی کە مەترسیان هەبووە نووسینەوەی فەرموودە خەڵکیی دوور بخاتەوە لە قورئانی پیرۆز.

هەڵوێستی ئەو هاوەڵانەی ڕێگەیان داوە بە نووسینەوەی فەرموودە:

**١ـ** ئەبوبەکری صددیق (ڕەزای خوای لێبێت) هەندێ زانیاری دەربارەی زەکات نووسیی لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت).[4]

**٢ـ** عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) هەندێ سوننەتی نووسی بۆ عوتبەی کوڕی فەرقەد،[5] بە مشتی شمشێرەکەشیەوە لاپەڕەیەك بینرا زەکاتی ئاژەڵی تیادا نووسرابوو.[6]

---

١) الخطیب: تقیید العلم ٥٠، وابن عبد البر. جامع العلم و فضله ١: ٦٤.

٢) ابن عبد البر: جامع بیان العلم وفضله ١: ٦٣.

٣) هەمان سەرچاوە ١: ٦٥.

٤) احمد: المسند ١: ١١.

٥) احمد: المسند ١. ١٦.

٦) لخطیب: الكفایة ١: ٣٥٣

٣ـ لاپەڕەیەك لای عەلی بوو (ڕەزای خوای لێبێت) باسی خوێنبایی کوژراو و ڕزگار کردنی دیل و ئەوەشی تیابوو کە موسڵمان بە کوشتنی کافر ناکوژرێتەوە.[١]

٤ـ کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیویست بچێتە بازار، سەیری نووسراوەکانی خۆی دەکرد لە فەرموودەدا.[٢]

٥ـ لە هەندێ هاوەڵانی تریشەوە ڕێگە پێدان هاتووە بۆ نووسینی فەرموودە وەکو: عائیشە، ئەبو هورەیرە، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، بەرائی کوڕی عازیب، ئەنەسی کوڕی مالیك، حەسەنی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا، (ڕەزای خوایان لێبێت).

هەندێکیشیان لەسەرەتاوە نووسینی فەرمودەیان لاباش نەبووە، بەڵام دواتر ڕێگەیان دا، دژایەتیش نی یە لە بۆچوونەکاندا، چونکە هۆی ڕازی نەبوونیان ترسی تێکەڵ بوونی فەرموودەو قورئان بوو، یان ئەوەی فەرموودە گرنگیدان بە قورئان کەمکاتەوە، بەڵام کە ئەو مەترسیانە نەما ڕێگە درا بە نووسینەوەی فەرموودە، هەر بۆیە لەسەردەمی پەیام و ڕاشیدەکاندا هەندێکیان فەرموودەیان لە لاپەڕەدا دەنووسیەوە... لەوانە:

١ـ لاپەڕەی سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری.

٢ـ لاپەڕەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا.

٣ـ نوسخەی سەمورەی کوڕی جوندوب (٦٠ ك) فەرموودەیەکی زۆری تیا کۆکردبوویەوە.

٤ـ نووسینەکانی ئەبو هورەیرە.

٥ـ لاپەڕەی ئەبو موسای ئەشعەری (٥٠ ك)

٦ـ لاپەڕەی جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (٧٨ ك)

٧ـ لاپەڕەی (الصادقة)ی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (٦٥ ك) پێشەوا ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا هێناویەتیەوە.[٣]

---

١) البخاري : الصحيح ١: ٣٨، وابن سعد: الطبقات - ١. ٤٨٦.

٢) الخطيب: الجامع ٢: ١٤.

٣) اكرم العمري: بحوث في تاريخ السنة المشرفة ٢٢٣.

ئەمانەو چەندین لاپەڕە و نەسخەی تر لەو سەردەمە زووەدا تۆمار کرابوون، یەکێ لە توێژەرەکان ناوی پەنجاو دوو هاوەڵی کۆکردووەتەوە لەوانەی کە فەرموودەیان دەنووسیی لەو سەردەمەدا،[1] ئەمەش وای کرد نەوەکانی دوای ئەوان نووسینەوەی فەرموودەیان فراوان کردووە تاکو شەش کتێبەکەی فەرموودەو کتێبە گەورەکانی تری فەرموودە کۆکرانەوە.

**ج ـ فیقه:**

فیقه بریتیە لە حوکمەکانی خواپەرستنو مامەڵەکردن پێکەوە، بەوشێوەش هەموو چالاکیەکانی تاکو کۆمەڵی لەو سەردەمەدا ڕێك دەخست، سەرچاوەکانیشی بریتین لە: قورئانو سونەت و ئیجماعو قیاس، هەندێ زاناش هەڵکەوتن کە سامانێکی فیقهی زۆریان بەجێهێشت، زانا هاوچەرخەکان سوودیان لێوەر گرت.

ئیبنولقەیم دەگێڕێتەوە کە زیاتر لە سەدو سی لە هاوەڵان فەتواکانیان گەیشتووە پێمان، لە نێوان ئافرەتانو پیاواندا، زۆربەشی لەم حەوت هاوەڵەوە هاتوون: عومەری کوڕی خەتتاب، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، عائیشەی دایکی ئیمان داران، زەیدی کوڕی سابیت، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێت.

هەروەها ئیبنولقەیم لە ئیبنوحەزم دەگێڕێتەوە کە وتوویێتی: "دەکرێت لە فتوای هەریەکە لەوانە کتێبێکی گەورە کۆبکرێتەوە"، دەشگێڕێتەوە کە موحەمەدی کوڕی موسای کوڕی یەعقوب (حافظ) فتواکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسی لە بیست کتێبدا کۆ کردۆتەوە.[2]

ئینجا هەندێ لە توێژەرەوە هاوچەرخەکانیش هەڵساون بە کۆکردنەوەی فیقهی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)و لە چوار بەرگدا دەریانهێناوە.[3] هەروەها یەکێکی تر هەڵساوە بە کۆکردنەوەی فیقهی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە کتێبێکی گەورەدا لە (٥٦٠) لاپەڕەدا.[4]

ئیبنو حەزم ناوی سیانزە کەسی لە هاوەڵان بردووە کە مام ناوەند بوون لە فەتوادانداا، وتویشێتی: دەکرێت لە فەتوای ئەوانە کتێبێکی بچووك کۆبکرێتەوە، ناوی عوسمانی کوڕی عەفانی لە ناو

١) محمد مصطفى الاعظمي: دراسات في الحديث النبوي ٩٢ـ ١٤٢.

٢) ابن القيم: أعلام الموقعين ١: ١٢.

٣) دكتور رويعى بن راجح الرحيلي.

٤) دكتور محمد رواس قلعة جي.

ئەوانەدا بردووە، یەکێ لە توێژەرە هاوچەرخەکان فیقهی عوسمانی کۆکردووەتەوە لە کتێبێکی مام ناوەندا، لە (٣٤٠ لاپەڕەدا).[١]

سەبارەت بەوانەش کە فەتوای کەمیان لێگێڕاوەتەوە، زیاتر لە سەدو بیست هاوەڵن، ئیبنو حەزم دەڵێت: لە پاش بە دواداچوونو گەڕان دەکرێت فەتوای ئەو کەسانە لە کتێبێکی بچوکدا کۆبکرێتەوە.[٢]

شایەنی باسە هەندێ لە زانیاریە فیقهیەکان نووسرابوون لە سەردەمی خودی پێغەمبەردا ﷺ، بۆ نموونە نووسراوی خودی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمری کوڕی حەزمی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی میراتو زەکاتو خوێنبایی.

عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ کەسانی تردا یاداشتی فیقهیان دەکرد، فەرمانیشی دەکرد بە فێربوونی دابەشکرنەکانی میراتو تێگەیشتن لە سوننەت.[٣]

عەلیش (ڕەزای خوای لێبێت) لاپەڕەیەکی هەبوو باسی زەکاتو خوێنبایو حەرەمی مەدینەی تیادا بوو، ئەمەش بە میراتی وەرگرتبوو لە پێغەمبەردا ﷺ لەگەڵ شمشێرەکەی (ذوالفقار) کە بە کێلانەکەیەوە هەڵواسرابوو.

هەروەها لەو سەردەمەدا هەندێك لە داوەریەکانی عەلی تۆمارکرابوو.[٤]

**د- زمانی عەرەبی:**

گرنگی بایەخدان بە زمانی عەرەبی سەریهەڵدا لەبەر پێویستیان بۆ تێگەیشتنی دەقەکانی قورئانو سوننەت، هەروەها لەبەر گرنگی خۆی لە خۆیدا، سەرچاوەکان کۆمەڵێك ڕاسپاردەیان لە عومەر گێڕاوەتەوە (ڕەزای خوای لێبێت)، جەخت لەسەر فێر بوونی زمانی عەرەبیو گێڕانەوەی هۆنراوەکان دەکات، لە نووسراوێکدا بۆ ئەبو موسای ئەشعەری ڕەزای خوی لێبێت هاتووە "فەرمان بکە بەو کەسانەی کە لە لاتن با فێری زمانی عەرەبی بن، چونکە ئەوە ئاماژە بە پاراوی قسان دەکات، هەروەها فەرمانی پێبکە ڕیوایەتی هۆنراوەکان بکەن چونکە ئاماژە دەکات بۆ ڕەوشتە بەرزەکان".[٥]

١) دكتور محمد رواس قلعة جي.

٢) ابن القيم: اعلام الموقعنين ١: ١٢.

٣) المتقي الهندي: كنز العمال ١٠: ٢٥٢.

٤) مسلم: الصحيح، المقدمة ١٣.

٥) المتقي الهندي: كنز العمال١٠: ٣٠٠.

هەروەها فەرموویەتی "زمانی عەرەبی فێربن، چونکە پیاوەتی زیاد دەکات".[١] لە جێگایەکی تردا دەفەرمووێت: "لە سەرتانە شارەزابن لە ئایندا، هەروەها لە عەرەبیداو عەرەبیناسبن"،[٢] هەروەها فەرموویەتی: قورئان عەرەبیەو بە عەرەبی بزانن".[٣]

ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە منداڵەکانی دەدا ئەگەر لە قسە کردندا هەڵەیان بکردایە.[٤]

بێگومان سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ڕاشیدەکان سەرەتایەکی نوێ پێکدەهێنی بۆ گەشە کردنی زمانی عەرەبی، کە هاووڵاتیەکانی شانازیان پێوە دەکردو موسڵمانە تازەکان لە ناوچە فەتحکراوەکاندا فێری دەبوون.

ئەمەش شتێکی نامۆ نی یە، چونکە عەرەبی زمانی ئاینو دەوڵەتی تازەبوو.

**هـ - مێژوو:**

سەبارەت بە زانستی مێژوو بایەخدانی زیاتر ڕوویکردە ژیانی پیغەمبەر ﷺ و هەواڵی پێغەمبەرە پێشووەکان، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەفەرموێت: "ئێمە منداڵەکانمان فێری بەسەر هاتی پێغەمبەر ﷺ دەکرد وەکو چۆن سورەتی قورئانمان فێردەکردن".[٥] بێگومان قورئانی پیرۆزیش پەیڕەوانی ئاڕاستەی ئەوەی کردووە کە گرنگی بە مێژوو بدەن لە ڕووی هێما جۆراو جۆرەکانیو ئەو سودە زۆرانەی لێوەر دەگرین لە بواری ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکانو چەسپاندنی یاسای هۆکارەکە بە تایبەت لە بابەتی دامەزراندنی دەوڵەتەکانو داڕوخانی شارستانیەکاندا.

بەڵام زانیاریە مێژوویەکان زیاتر بەشێوەی زارەکی دەگوێزرانەوە، چونکە نووسینی مێژوو لەم سەردەمەدا هێشتا دەستی پێنەکردبوو، تەنها چەند دیمەنێك نەبێت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە هاوەڵان لە نێو فەرموودەکاندا تۆماریان دەکرد.

ریوایەتێکی کۆنیش هەیە ئاماژەی تیادایە کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب هانی وەهبی کوڕی مونەبیهی داوە کە شارەزایی مێژووی حیمیەریەکان ببێت.[٦]

---

١) الخطيب: الجامع ٢: ٢٥.

٢)المتقي الهيندي: كنز العمال١٠: ٢٥٤.

٣)هەمان سەرچاوە ١٠: ٢٥٢.

٤) الخطيب: الجامع ٢: ٢٩.

٥) ئەم سەرچاوەم لێ ونبووە و نەمتوانی پەیدای بکەم.

٦) ابن هشام: كتاب التيجان ٨٢، وفؤاد سزكين: تاريخ التراث العربي ١: ٤٠٢.

لە ڕاستیدا برێك زانیاریی مێژوویی و بەڵگەنامە نووسرابوون لەو سەردەمە وەکو نامەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ پادشاو سەرۆکی دەوڵەتەکان، هەروەها نامەی خەلیفە ڕاشیدەکان بۆ سەرکردەکان لە گۆرەپانی جەنگ و بۆ فەرمانڕەوای شارەکانیش، بەڵام ئەم بەڵگەنامە میریانە بێگومان لەناو بابەتەکانی فێرکردندا نەبوون، لەوانەش کەسانێکی دیاریکراو چاویان پیان کەوتبێت.

**و ـ ڕەچەڵەکناسی:**

ئەم زانستانە موسڵمانان لەسەردەمی جاهیلیەوە وەریانگرتبوو، بەڵام کۆیان کردەوەو نووسیانەوە، جگە لەوەش زانستێکی بڵاویشبوو لە نێوانیاندا. گرنگی و بایەخدان بەئەم زانستە هەر بەردەوام بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان لەبەر هەندێ پێویستی ئاینی و کۆمەڵایەتی و سەربازیو ئیداری، هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئیسلام ڕەگەزپەرستی هۆزایەتیو شانازیی کردن بە ڕەچەڵەکەوە قەدەغە کرد، بەڵام ئەم زانستە هەر گرنگی خۆی لە دەستنەدا، لەبەر ئەو بایەخەی کە هەیەتی لە جێبەجێکردنی حوکمەکانی باری کەسایەتی وەکو ژنهێنانو شوکردنو میراتی، هەروەها بۆ ناسینی ڕەچەڵەکی فەرموودەناسەکان بۆ جیاکردنەوەی گێڕەرەوانی، بۆ دابەشکردنی موچە، ڕێکخستنی سەربازیی، چونکە هۆز یەکەیەکی جەنگاوەر بوون، جگە لەوەی کە بنچینەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییو کارگێڕی بوو لە شارەکاندا، دەشکرێت دیوانە سەربازیەکان لە خیلافەتی عومەر (رەزای خوای لێبێت) بە یەکەم نووسینەوەی گشتگیریی دابنێین بۆ نەژادو ڕەچەڵەکەکان.

لە فەرموودەی ڕاستیشەوە پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "تعلموا من انسابکم ماتصلون به ارحامکم"،[1] واتە: ئەوەندە لە رەچەڵکەکانتان فێربن کە پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان خۆتاندا بەجێ بهێنن".

(الجاحظ)یش دەگێڕێتەوە کە چواردە نووسەر کتێبیان دەربارەی ڕەچەڵەکناسی داناوە زۆربەیان پێش ئیسلام ژیاون، یان لە سەرەتای ژیانیدا.[2]

ژمارەیەك لە هاوەڵانیش بە شارەزایی لەم بوارەدا ناسرابوون، لەوانە ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لێبێت).[3] عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێبێت)، داوای کردبوو لە سێ کەس لە

---

١) الترمذي: السنن، كتاب البر ٤٩، واحمد: المسند ٢: ٣٧٤، الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة، رقم الحديث ٢٧٦.

٢) الجاحظ: كتاب الحيوان ٣: ٢٠٩ـ ٢٠٠، وفواد سزكين: تاريخ التراث العربى ١: ٤٠٣.

٣) فؤاد سزكين: تاريخ التراث العربي ١: ٤٠٥.

ڕەچەڵکناسانی قوڕەیش کە بریتیبوون لە جوبەیری کوڕی موتعیمو عەقیلی کوڕی ئەبوتالیبو مەخرەمەی کوڕی نەوفل (ڕەزای خوایان لێبێت) کە هەڵسن بە دروستکردنی خشتەیەك بۆ نەژادەکان.[1]

ئینجا عەقیلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت): "زانابوو بە ڕەچەڵەکی قوڕەیش و هەڵوێستە جوانو ناشرینەکانیان، خەڵکیش ئەو زانیاریانەی لە مزگەوتی مەدینە لێ وەردەگرت"،[2] بە هەمان شێوە حەکەمی کوڕی حیزامیش ڕەزای خوای لێبێت لە هەمان بواردا بە کەسێکی شارەزا ناسرابوو.[3]

**ز ـ هۆنراوە:**

زۆرێك لە بەڵگە هۆنراوەیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هۆزەکان گرنگیان داوە بە نووسینی هۆنراوەی شاعیرەکانیان، هەندێ لەو هۆزانەش هەڵدەستان بە نووسینەوەی هەواڵی جەنگەکانیان و ڕۆژە بەناوبانگەکانیانو ئەو شتانەی کە شانازیان پێوە دەکردو پەندو قسە نەستەقەکانیان[4].

ئەوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتیو ڕاشیدەکان سوودیان لە هۆنراوەرگرت بۆ تێگە یشتنی قورئان پیرۆزو لێکدانەوەی ماناکانی، ئیبنو عەباس دەفەرمووێت: "ئەگەر پرسیارم لێدەکەن دەربارەی عەرەبی بوونی قورئان، ئەوا لە هۆنراوە بۆی بگەڕێن، چونکە هۆنراوە تۆمارگەی عەرەبە".[5]

پێغەمبەری خوایش ﷺ بە خۆی گوێی لە هۆنراوە بووە، ستایشی هەندێکیشیانی کردووە، فەرموویەتی: "ان من الشعر حکمه"[6] واتە: هەندێ لەو هۆنراوانە دانایە هەر لە سەردەمی خۆیشیدا هەندێك لە شاعیرانی ئیسلام هەڵکەوتن، وەکو: حەسسانی کوڕی سابیتو کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، (ڕەزای خوایان لێبێت).

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٩٥ـ ٢٩٩، والبلاذري: انساب الاشراف ٤٣٦ـ ٤٣٧، والطبري: تاريخ الرسل والملوك ١: ٢٧٥٠ـ ٢٧٥٢، وفؤاد سزكين: تاريخ التراث العربي ١: ٤٠٤.

٢) ابن حجر: الاصابة: ٥٣٢.

٣) هەمان سەرچاوە ٢: ١١٣.

٤) دكتور نصرالدين الاسد: مصادر الشعر الجاهل ١٠٧ـ ١٢٣، ١٦٥.

٥)الخطيب: الجامع ٢: ١٩٨

٦)البخاري : الصحيح: جديث رقم ٦١٤٥.

ئینجا عومەر ڕەزای خوا لێبێت، جێگایەکی دروست کردبوو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بە بوتەیحا دەناسرا، ئەیفەرمووو، هەرکەسێ دەیەوێ هۆنراوە بڵێت، یان دەنگی بەرز کاتەوە بابچێت بۆ ئەو جێگایە[1] چونکە پێغەمبەرﷺ نەهی کردووە لە وتنەوەی هۆنراوە لەناو مزگەوتدا.[2] ئیبنو ئەفلەحیش دەڵێت: "کۆتا کوڕەکانمان لەگەڵ زەیدی کوڕی سابیت هۆنراوەمان تیادا گێڕایەوە"[3] .

**س ـ چیرۆکو سەرگوزەشتە:**

دەسپێکردنی لە کاتێکی زووەوە بووە، چیرۆکخوانەکان ڕۆڵێکی ئامۆژگاریکردنیان دەگێڕا، ئەسوەدی کوڕی سەریعی سەعدی شاعیر بوو، لە سەرەتای ئیسلامیشەوە چیرۆکخوان بووە، ئەو یەکەم کەسبوو چیرۆك بگێڕێتەوە لە مزگەوتی بەصرە[4]، تەمیمی داریی داوای کرد لە عومەری کوڕی خەتتاب چیرۆك بگێڕێتەوە بەڵام ڕێگەی پێنەدا، عومەری کوڕی زورارەش چیرۆکی بۆ خەڵکی دەخوێندەوە لە مزگەوتی کووفە، لە ژیانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود کە ناڕەزایی خۆی بەرانبەر گێڕانەوەی چیرۆك دەربڕی.[5]

عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش بە هەمان شێوە ناڕازی بوو لە گێڕانەوەی چیرۆك.[6] لەلایەن ئەبویەحیاوە لە مزگەوتی کوفە، چونکە شارەزایی نەبوو لە ناسیخو مەنسوخدا، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە چیرۆك گێڕانەوە هەبوویێت لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و ئەبوبەکرو عەمەرو عوسمان، دەیفەرموو: ئەمە شتێکی داهێنراوە لە پاش کوژرانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت).

**ط ـ پەندو دانایی:**

لە ئیسلامدا بڕێکی زۆر خرایە سەر قسەی نەستەقو پەندی پێشینانی عەرەبی سەردەمی جاهیلی، چونکە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ چەند پەندو داستانێکی لە خۆگرتووە کە دواتر چەندین دانراوی سەربەخۆی لەسەر نووسراوە، بێگومان ئێمە ناتوانین لێکدانەوەی

---

١) الخزاعی. تخریج الدلالات السمعیة ١٣٠.

٢) هەمان سەرچاوە ١٢٩ ئەویش لە تیرمیزیەوە وەریگرتووە.

٣) الخطیب: الجامع ٢: ١٣١.

٤) ابن حجر: الاصابة ١: ٧٤

٥) السیوطي: تحذیر الخواص ٥٩، ٦٠ـ ٦١.

٦) ابن الجوزی: نواسخ القران ١٠٥ـ ١٠٩

ئیبنوخەلدوون بۆ واتای (الحكمة) وەربگرین لە قورئاندا: (يؤتي الحكمة من يشاء)[1] گوایە مەبەست لەو وشەیە فەلسەفە بێت، بەڵکو ئەو وشەیە ئەوە دەگەیێنێت کە عەرەب لیحاڵی بوون، چونکە قورئان بەزمانی ئەوان دابەزیوە، ئەوانیش بەوە لە (الحكمة) تێگەیشتوون، کە بریتیە لە تێگەیەشتنی قورئان و سوننەت پێکانە لە کردارو گفتاردا.[2]

لە ڕاستیدا پەندو دانایی گرنگیەکی زۆری هەیە لە پەروەردا، دەگێڕینەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب فەرموویەتی: (دڵەکانتان بحەسێننەوە بە دانایی‌و قسەی نەستەق، چونکە دڵەکانیش وەکو لاشە بێزار دەبن).[3]

**ی - پزیشکی:**

پزشکیی گرنگیەکی بەرچاوی پێدرا، ڕووداوەکانی جیهادو زۆری برینداربوون هاندەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەو مەسەلەیە، موسڵمانان شارەزایی پزیشکی سەردەمی جاهیلیان وەرگرتبوو، بەناوبانگترین پزیشکەکانی عەرەب کە ژیان تاکو سەرهەڵدانی ئیسلام، حاریسی کوڕی کیلدەی سەقەفی بوو،[4] هەروەها شەمەردەلی کوڕی قویاسی کەعبی نەجرانی،[5] زەمادی کوڕی سەعلەبەی ئەزدیش هەر خەریکی پزیشکی بوو، سەفەری کردووە لەو پێناوەنادا.[6] پێغەمبەری خوایش ﷺ پشتیوانیەکی گەورەی کرد بۆ کەلەپووری پزیشکی جاهیلی وەکو دەردەکەوێت لە کتێبەکانی پزشکی، بێگومان ئەو زانستە گرنگی زیاد کرد لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا بەوەی کە زانیاریەکانی فارسی و ڕۆمانیەکان لە بواری پزیشکیدا خزایە سەری.

**ک - ئەستێرەناسیی:**

هەر لەو سەردەمەوە بۆچوونێکی گوماناوی هەبوو بەرانبەر ئەم زانستە، چونکە خوای گەورە نەبێت کەس غەیب نازانێت، ئینجا جادوو و قەشەیەتی و سەیرکردنی ئەستێرە بە هەندێ مەبەستەوە، کە ئەم شتانە باوبوون لەسەردەمی جاهیلیدا، هەمووی بە کاریگەریی بیروباوەڕی ئیسلام پووچەڵ

١) البقرة ٢٦٩.

٢)الطبري: تفسير ٣: ٨٩ـ ٩٠، وابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ١.

٣)الخطيب: الجامع ٢: ١٢٩ ، وابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ١٠.

٤)ابن حجر: الاصابة ١: ٥٩٥.

٥) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٥٨.

٦) هەمان سەرچاوە ٣: ٤٨٦.

بوویەوە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە "من اقتبس علماً من النجوم اقتبس شعبة من السحر زاد مازاد".[١] واتە: هەر کەسێك زانستێك لە ڕێگەی ئەستێرەوە وەربگرێت، بەشێکی لە جادوو وەرگرتووە چەند زیاتر بکات زیاتر دەبێت. عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت" ئەی ئەبو جاد، کەسانێك هەن سەیری ئەستێرە دەکەنو دەنووسن، ئەبو جاد: ئەوانە بێبەشو هەناسە ساردن".[٢] بێگومان ئەستێرەناسیی جۆرێکە لە بانگەشەکردنی غەیبناسی، ئەوەی کە گوایە گەردوونو خولانەوەی کاریگەریان هەیە لەسەر چارەنووسی خەڵكو پاشەڕۆژیان، هیچ پەیوەندیەکیشی نی یە بە گەردوونناسیەوە، کە موسڵمانان بایەخیان پێدا لە و بوارەدا زۆریان خستە سەر کەلەپووری مرۆڤایەتی.

جیاوازی لە نێوان ئەم دوو زانستە ئاشکرا بوو لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی و ڕاشیدەکانیش، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت" لە ئەستێرەکانەوە فێربن چۆن ڕێگای خۆتان دەدۆزنەوە لە تاریکی زەمینو دەریادا و زیاتر مەڕۆن".[٣]

**ل - ڕۆشنبیریو زمانە بیانیەکان:**

حیجاز گۆشەگیر نەبوو لە جیهانی دەورو بەر لە باکوورو باشووردا، چونکە کۆمەڵگای مەککەی بازرگانی گەشتی هەمیشەیی هەبوو لە زستانو هاویندا بۆ شامو یەمەن، ئەم گەشتانەش شارەزایی پێبەخشین، نەك هەر لە لایەنە ئابووریەکانەوە، بەڵکو لە ڕووی ڕۆشنبیریشەوە، ئینجا کۆمەڵگای مەدینە ئاوارەیەکی زۆری تیادا دەژیا لە هۆزە جوولەکەکان، کە زمانی عیبریان تیادا بڵاوبوو، هەروەها تەوراتو سەرگوزەشتەی ئاینیو میژوویی. هەندێ ئاماژەی لێرەو لەوێش هاتووە کە عەرەبەکان هەندێکیان زمانی عیبریان زانیوە، لە ڕێگەی زاستیشەوە پێمان گەیشتووە کە وەرەقەی کوڕی نەوفەل ئینجیلی بە هەردوو زمانی عەرەبیو عیبری دەنووسیی.[٤]

بەو گوێرەش هیچ ئاماژەیەك لە سەرچاوەکاندا نەهاتووە دەربارەی شارەزایی ئەنصارەکان بە زمانی عیبری، وا دەر دەکەوێت جوولەکەکان بەو زمانە قسەیان نەکردبێت لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، لەوانەشە تەنها زاناکانیان

١) ابن ماجة: السنن ١: ١٢٢٨ حديث رقم ٣٧٢٦ و اسناده يرقى الى الحسن فضيف عبيد الا خنس صدوق يخطيء.

٢) ابن سحنون: كتاب آداب المعلمين ٦٢.

٣) ابن عبد البر: جامع بيان العلم وفضله ٣٨ـ ٣٩.

٤) البخاري: الصحيح: كتاب بد الوحي ٢: ٢١٤، و مسلم: الصحيح، كتاب الايمان ٢٥٢، و الترمذي: الجامع، كتاب الاستئذان و الادب عن رسول الله ﷺ، باب في تعليم السريانية.

عیبریان زانیبێت، بۆیە پێویستیی ئەوە پەیدا بوو کە هەندێك لە موسڵمانان لە شاری مەدینە فێری ئەو زمانە بن، زەیدی کوڕی سابیت (رەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت "کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە پێی وتم: خۆت فێری تەورات بکە، سوێند بە خوا دڵنیایم نی یە لە جوولەکەکان بەرانبەر قورئان، دەڵێت: ئیتر منیش لە کەمتر لە مانگێکدا فێری بووم".[1]

بە هەمان شێوە زەید خۆی فێری سریانی کرد، ئیتر وەڵامی ئەو نوسراوانەی دەدایەوە کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەهات و وەڵامەکەشی دەناردەوە[2] بەو زمانە، جگە لە زەیدیش عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خوای لێبێت) فێری سریانی بوو[3] لە ڕاستیدا تەنها زەید لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ چەند زمانێکی دەزانی، خوزاعی دەگێڕێتەوە کە زەید: "نووسراوەکانی بۆ پاشاکان دەنووسی و وەڵامیشی دەنووسیەوە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ، وەرگێڕی پێغەمبەریش بوو بە فارسیو قیبتیو حەبەشی، ئەم زمانانە لە مەدینە فێریان بوو لەو خەڵکانەوە کە قسە یان پێدەکرد".[4]

سەبارەت بە کەلەپووری نووسراو بەو زمانە، هەندێ نوسخەی تەورات دەستدەکەوێت لە ناوچە فەتحکراوەکاندا.[5]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصیش هەندێ نووسراوی ئەهلی کیتابی لە لابوو، لیشیخوێندەوە.[6] زۆربەشیانی لە جەنگی یەرموکدا بە دەستهێنابوو ئەویش باسی ئەو شتە شاراوانەی دەکرد کە تیایدا دەیخوێندەوە، تەنانەت هەندێك لە هاوڕێکانی پیان دەوت قسەمان بۆ بکە لە زاری پێغەمبەر ﷺ نەك لەو لاپەڕانەوە.[7] ئەبوهورەیرەیش ناوەڕۆکی تەوراتی دەزانی

١) احمد: المسند: ٥: ١٨٦، و ابو داود: السنن ٤ :٦٠ حديث رقم ٣٦٤٥ و الترمذي السنن ١: ٦٧ حديث رقم ٢٧١، وابن سعد: الطبقات ٢: ٣٥٨ والحاكم: المستدرك ١: ٧٥، الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ٢: ١٥٦ حديث رقم ١٨٧، وابن حجر: فتح الباري ١٣: ١٨٥ حديث رقم ٧١٩٥ معلقا.

٢) الترمذي: الجامع كتاب الا ستئذان ٢٢، وابن سعد: الطبقات ٢: ٣٥٨، و الحاكم: المستدرك ٣: ٤٢٢، و ابن حجر: الإصابة ٢: ٥٩٤، وابن عبد البر: الاستيعاب ١: ١٩٤، و الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ٢: ١٥٥.

٣) ابن سعد: الطبقات ٧: ٤٩٥.

٤) الخزاعي تخريج الدلالات السمعية: ٢٠٨

٥) ابن حجر: الاصابة ٣: ٤٩٦.

٦) الذهبي: تذكرة الحفاظ ٤٢، والذهبي: سير أعلام النبلاء ٣: ٥٤، وأحمد بن حنبل: المسند ٢: ١٩٥.

٧) ابن حجر: المسند ٢: ١٩٥.

ئەگەرچی نەیشیخوێندبوویەوە، ئەو لە ڕێگای ئەو کەسانەوە کە خوێندبوویانەوە زانیاریەکانی وەرگرتبوو.[1]

پیاوێکیش لە کووفە کتێبی دانیاڵی دەرکرد، ئیتر خەڵکی نارەزایان دەربڕی کتێبێکی تر لەگەڵ قورئاندا هەبێت.[2]

پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان (ڕەزای خوایان لێبێت) قەڵس دەبوون بەوەی کە قورئانو سوننەت بەربەرەکانی بکرێت بە کەلەپووری ئاینی کۆن، چونکە گرنگیدان ڕووەو ئەوە دەچوو کە بایەخ بە تێگەیەشتنی ئیسلام بدرێت پێش ڕۆشنبیریەکانی تر.

جارێکیان نوسخەیەکی تەوراتیان بۆ عومەری کوری خەتتاب هێنا (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە نوسخەیەکی تەوراتە، ئیتر ئەو بێدەنگ بوو، عومەر بینی ڕوومەتی پێغەمبەر ﷺ دەگۆڕێت، ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی لە باری دایکت بچوبای عومەر، نابینی ڕوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن گۆڕا؟ عومەر وتی: پەنا ئەگرم بە خوا لە تووڕەیی خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەی پەروەردگار تۆ خوامانی، ئیسلام ئاینمانە موحەممەد پێغەمبەرمانە. ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر موسا دەرکەوێت، شوێنی بکەونو من بەجێبهێڵن ڕێگای ڕاست ون دەکەن، ئەگەریش موسا لە ژیاندا بوایە و فریای پێغەمبەرایەتیم بکەوتبا شوێنم دەکەوت".[3]

هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەفەرموویت، کاتێك عومەر تەوراتەکەی هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "امتهوكون انتم كما تهوكت اليهود و النصارى؟" يعني: أمتحيرون أنتم في الإسلام فتلجأون الى الاخذ من سواه؟ ثم قالَ: لقد جئتكم بيها بيضاء نقية، ولو كان موسى حيا ما وسعه الا اتباعي".[4] واتە: ئایا ئێوە سەر لێشێواون وەکو جوولەکەو گاورەکان تاکو پەنا بەرنە بەرشتی تر، ئەمجا فەرمووی: " ئاینێکی سپیو پاکم بۆتان هێناوە، ئەگەر موسایش لە ژیاندا بوایە هیچ ڕێگەچارەیەکی نەبوو ئەوەنەبێت شوێنم بکەوێت.

---

١) المصدر نفسه ٧: ٤٤٠.

٢) الخطيب: تقييد العلم ٥٦ـ ٥٧.

٣) رواه الدارمي: السنن ١ : ١١٥ـ ١١٦، و اخرجه ابن حبان: الصحيح.

٤) رواه احمد: المسند، والبيهقي: شعب الايمان، من طرق يؤيد بعضها بعضًا.

پەیوەندی موسڵمانان زیادی کرد بە سەرچاوەی ڕۆشنبیریە بیانیەکانەوە لە سەردەمی ڕاشیدیەکاندا، چونکە شارە تازەکان لاپەڕە و لەبەر گیراوی زۆری تیادا بوو لە کەلەپووری ئاینی کۆن، بەڵام هەمیشە زۆر وریا بووە، بۆیە بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە لاپەڕەو بیرو باوەڕانە قەدەغە کردبوو، ئامانجی دەوڵەتیش ئەوەبوو کۆمەڵگا فەتحکراوەکان ڕەنگ بکات بە ڕۆشنبیری ئیسلامی و بیروباوەڕیی ئیسلامیی نوێ بێئەوەی چەمکەکانی تێکەڵ یەکتری بن.

خالیدی کوڕی عەرفەتە دەڵێت: لە لای عومەر دانیشتبووم (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك پیاوێکیان لە عەبدولقەیس هێنایە خزمەتی، عومەر پێی فەرموو: تۆ فلانی کوڕی فلانی عەبدی نیت؟ وتی: بەڵێ. ئەوجا بە دارێك لە پیاوەکەی دا، وتی: من چیم کردووە ئەی ئەمیری بڕواداران؟ عومەر پێی فەرموو دانیشە و ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندەوە (بسم الله الرحمن الرحيم. الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ* إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ * نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَـذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ)[1] تا ئایەتی (لمن الغافلين) سێ جار بۆی خوێندەوە سێ جاریش لیدا، پیاوەکە وتی: چیم کردووە ئەی ئەمیری بڕواداران؟ عومەر فەرمووی تۆ لەبەر کتێبی دانیاڵت گرتووەتەوە؟ وتی: هەر فرمانێکم پێدەکەی ملکەچم. فەرمووی بیانسڕەوە بە ئاوی گەرم و خوری سپی، دوایی نە خۆت بیخوێنەوە نە فێری کەسیشی بکە، ئەگەر پێم بگات جارێکی دی خوێندوەتەوە یان بە کەسی ترت وتووە ئەوە بە سزا بە هیلاکت دەبەم. دوای ئەوە عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بەسەر هاتەکەی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ گێڕایەوە کاتێك تەوراتەکەی بردە خزمەتی[2]. پێغەمبەری خوا ﷺ، لە پاش ئەویش خلیفە ڕاشیدەکان (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەرەتای ئیسلامدا ڕێگەیان بە موسڵمانان نەدەدا لە کتێبەکانی تری کەلەپووری ئاینیی هیچ وەربگرن، چونکە ئیسلام بە شەریعەتێکی ڕوونو پاراو لە هەموو شیركو گومانێك بۆیان هاتووە، پارێزراویشە لە گۆڕینو لادان، هیچ پێویستیەکی نیە بە ئاینو بیر باوەڕی تر، ئەم وریایە لە دەستاودەستکردنی کتێبە ئاینیە کۆنەکان کارێکی پێویست بوو بۆ پاراستنی بیرۆکەی ئیسلامیی و جێگیربوونی تێڕوانینی ئیسلامیی. بەڵام کاتێك ئیسلام چەسپا لە ڕووی بیروباوەڕ و شەریعەتو

---

١) (یوسف: ١ـ ٣)

٢) اورده الهيثمي: مجمع الزوائد ١: ١٨٢، وقال: رواه ابو يعلى وفيه عبدالرحمن بن اسحاق الواسطي ضعفه احمد وجماعة واورده البوصيري: اتحاف الخيرة ٢: ١٣٧، وابن حجر: المطالب العالية ٤: ٢٨.

ڕێبازی ژیان، هەروەها پێوەرە ئەندێشەیی و ڕەوشتەکانی ئاشکرا بوو لە بیرو هۆشی خەڵکدا ئەوجا کرانەوە بە رووی ڕۆشنبیریی و ئاینی نەتەوەکانو بیروباوەڕەکانیاندا بە شێوازێکی ڕەخنەگرانەوە هەڵسێنگێنەر لە بیرکردنەوەدا، بەم شێوەیش کتێبەکانی لێکوڵینەوە بە وردیی لە نێو ئاینەکاندا پەیدا بوو، کە خۆی لە کتێبی فیرقەکاندا دەبینیەوە کە هەندێکیان لە نووسینی بەغدادیی و ئیبنو حەزمو شەهرستانیە .

دەرگەی پێنجەم:

# بارودۆخی جیهان

## بانگەوازی ئیسلامی و بنچینە فیکریەکانی- فتوحات

بەشی یەکەم:

## بانگەوازی ئیسلامی و بنچینە فکریەکانی

### باسی یەکەم:

### تێڕوانینێك بۆ بارودۆخی جیهان پێش فەتحی ئیسلامی

مرۆڤەکان لە کاتی فتوحاتی ئیسلامیدا دابەشبوون بەسەر جیهاندا بە تایبەتی لە هەر سێ کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەروپاو ئەفریقا، ئەوانەش لە ڕەگەزی جیاجیابوون، بۆ نموونە: عەرەب لە نیوەدوورگەی عەرەبو عێراقو شام دەژیان، هیندیەکانیش لە نیوەدوورگەی هیندی، ڕەگەزی زەردیش لە چینو ژاپۆنو باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، ڕۆمەکانیش لە ئاسیای بچووك (تورکیای ئەمڕۆ)و ولاتی شامو میصرو باکووری ئەفریقاو ئەنگلوکسۆن لە ئینگلتەرا، فەرەنگەکانیش لە فەڕەنساو هۆلەنداو ئەلمانیاو غوتەکانیش لە ئیسپانیاو ئیتالیا، ڕەشپێستو حەبەشەیەکان لە ولاتی ناسراوی خۆیان لە ئەفریقا.

زلهێزەکانی ئەو سەردەمە بریتی بوون لە فارسو ڕۆمەکان کە دەسەلاتی تەواویان هەبوو بە سەر جیهاندا، ڕووبەرێکی فراوانیان بە دەستەوە بوو، گەلانێکی زۆریشیان حوکم دەکرد کە دەسەلاتیان دەگەیشتە لایان، فورسەکان لەسەر ئاینێکی ڕاست نەبوون، بەلکو مەجووس بوونو ئاگریان دەپەرست، ڕۆمەکانیش گاور بوون، بەلام پارێزگارییان نەکرد لە ڕێنمایەکانی عیسا (علیه السلام) و دەستکاریشیان کرد، بۆیە ئەو دوو زلهێزەی جیهان لە ئەو سەردەمەدا توانای ئاڕاستەکردنی مرۆڤایەتیان نەبوو بەرەو یەکتاپەرستیو دادگەری و چاکە، ئەودوای گەلانیش لە چین و ژاپۆن و هیندستان و تیبت باوەڕیان بە ئاینی (بوذي) بوو، کە ئاینێکی بتپەرستیە هێما دەکات بۆ خوداکانیان بە بتگەلێکی زۆرو پەرستگایان بۆ دروست دەکەنو باوەڕیان هەیە بە دوای یەکدا هاتنی گیانەکان لە لاشەی مرۆڤەکاندا.

سەبارەت بە گەلانی ئەورووپاش لە بتپەرستی بەربەری بوونو هێزەکانی سروشتیان دەپەرست، لە جیهانی ئەو سەردەمەشدا کەمایەتیەکی جوولەکەی پەرشو بڵاو دەژیان لە نێوان وڵاتی شامو عێراقو حیجازداو رێنمایەکانی موساشیان (علیه السلام) دەستکاری کردبوو، هەندێ راوبۆچوونی تێکەڵ بوو لەلایەن زاناکانیانەوە دەیاندایە پاڵ خوا، جاخوایان کردبوویە خوایەکی نیشتمانپەروەری تایبەت بە جولەکەکان، ئینجا داستانێکی زۆریان لەسەر زاری پێغەمبەرەکانیان هەڵبەستبوو بە شێوەیەك کە ناشیرینی کردبوون، هەروەها مامەڵەیان بە سوو بۆ خۆیان بە رەوا دەزانی لەگەڵ گەلان و تەڵەکەیان لێدەکردنو ئەو شتانەشیان لە نێوخۆیاندا بە قەدەغە دەزانی، بانگی خەڵکی تریشیان نەدەکرد بۆ ئاینەکەیان بۆ ئەوەی ـ لە خەیاڵی خۆیاندا ـ ئەو کەسانە شەرەفمەند نەبن بە خۆخستنە ناو گەلی هەڵبژاردەی خوا، رێنمایەکانی موسا (علیه السلام) پێش دەستکاریکردنی دانی بەو گیانە رەگەزپەرستانەدا نەدەنا، نە بە جیاوازی رەوشتیشدا لە نێوان ئەم و ئەو، دوای ئەم پوختەیە دەمانەوێت بڵێین جیهانی ئەو رۆژەگارە پێویستی هەبوو بە پەیامگەلێکی ئاینی نوێ و بێگەردی یەکتاپەرستی بگێڕێتەوەو گرنگی بداتە ئاکاری جوان، جارێکی تر دەستی مرۆڤیش بگرێت بەرەو راستیو چاکەو دادگەری، دوای ئەوەی کە هاوبەش بۆ خوابڕیاردانو ستەمو خراپە زاڵبوون بۆ ماوەیەکی زۆرو خەڵکی لە پەیامی پێغەمبەران لایاندا.

خوای باڵادەستیش ئەرکی هەڵگرتنی پەیامی کۆتای بە موحەممەد ﷺ نارد، خستیە ئەستۆی عەرەبی دانیشتوانانی نیوەدوورگەی عەرەبەوە، ئەوان لاوازو تێکشکاو بوون، خوای گەورە بەهێزی کردن، هەژارو دەستکورت بوون، خوای مەزن دەوڵەمەندی کردن، هۆزگەلێکی پەرتەوازە بوون، خوای گەورە یەکیخستن، خەڵکێکی لە بیرچووی کەس باسنەکردوو، دونیا هەمووی ناسینی دوای هەڵگرتنیان بۆ پەیامی ئیسلام، ئەمجا پێشکەشیان کرد بە نەتەوەکانی ترو خەڵکانێکی زۆریش بە دەمیانەوە هاتنو یارمەتیان دان بۆ بڵاوکردنەوەی تاکو ئیسلام گەیشتە وڵاتی فارسو تورکو هیندستانو دەوروبەری چین لە رۆژهەڵاتەوە، تاوەکو ئەو وڵاتانەی لە ژێر دەستی رۆمەکاندا بوون لە باکوروی ئەفریقا، بەڵکو گەیشتە ئەندەلوسو باشووری فەڕەنساو ئیتاڵیا، بەم شێوەیەش رووناکی ئیسلام زۆربەی سەرزەمینی گرتەوەو ئەو دوو زلهێزەشی لابرد، فارسەکانی لە ناوبردو رۆمەکانی لاواز کرد لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە هەڵسین بە نمایشکردنی بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتی، ئاینیو رەوشتی کە زاڵبوو بەسەر وڵاتانی فارسو رۆم، دوابەدوای ئەوەیش هەمان ئەو بارودۆخانە لە نیوەدوورگەی عەرەب باسدەکەین، بۆ ئەوەی ئاشنابین بە ئەو رۆژگارەی ئیسلام تیایدا سەریهەڵدا، دواتریش بۆمان روون بێتەوە کە ئاینی ئیسلام چەند گۆڕانکاری لەو بارودۆخەدا دروست کردووە.

## دەوڵەتی فارسەکان

### بارودۆخی رامیاریو ئابووری:

دەوڵەتی ساسانی فەرمانڕەوای وڵاتی ئێرانی دەکرد لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا، فارسەکان ئەو ئیمپراتۆریەتەیان پێکدەهێنا، هەروەها تورکەکان وڵاتی (ماوراء النهر)یشی ملکەچ کردبوو، لەگەڵ عەرەبی عێراقدا، سنوورەکانی رۆژئاوایشی جێگیر نەبوو، چونکە جاری وابوو زاڵدەبووە سەر وڵاتی شامدا وەکو ئەوەی روویدا لە ساڵی (٦١٤ز) کاتێك وڵاتی شامی راماڵی و دەستی گرتە سەر (بیت المقدس)و میصر لە ساڵی (٦١٦ز)،[١] بەڵام هیرەقل کە ئیمبراتۆری رۆمەکان بوو جارێکی تر وڵاتەکەی رێکخستەوەو سوپاکانی ئامادەکردو فارسەکانی بەزاند لە ئاسیای بچووك ساڵی (٦٢٢ز)، دواتر سوریاو میصریشی لێسەندنەوە لە ساڵی (٦٢٥ز)، دوای ئەوە بە سەختی شکاندنی لە ساڵی (٦٢٧ز) ( ٦ك) لە نزیك وێرانەی نەینەوا، ئەوەیش بووە مایەی دروستبوونی شۆڕشی پایتەخت (مەدائین) دژ بە کیسرای دووەم، بەڵام شێرەوەی کە جێنشینی بوو رێکەوت لەگەڵ هیرەقلدا، بەڵام بارودۆخی دەوڵەتی فارسی لە پاش ئەوە ئارامی بە خۆیەوە نەبینی، چونکە شۆڕشو کودەتای ناوخۆی هەرگیز کۆتای پێنەدەهات، تەنانەت لە نۆ ساڵی دوای ئەوە نۆ فەرمانڕەوا هاتنە سەر تەختی فارس، بێگومان ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ پارچە پارچەبوونی ئەو دەوڵەتە، هەروەها بووە گۆڕەپانێك بۆ بشێوی ناوخۆی، تا ئەو کاتەی عەرەبە موسڵمانەکان هاتنە سەریان لە بزووتنەوەی فەتحدا.[٢]

ئەمە دەربارەی رووداوە سیاسیو سەربازیەکان کە بە سەر وڵاتی فارسدا تێپەڕیوو، بەڵام سەبارەت بە سیستمی حوکمڕانی، ئەوە کیسرایەکی رەها بوو، پادشا لە سەرەوەی هەموانەوە بوو، نازناوی

١) د. سعيد عبدالفتاح عاشور: أوربا العصور الوسطي ١: ١٢٤.

٢) توينبـي: مختصر دراسة التاريخ ١: ٢٦٤.

کیسرا بوو، دەسەڵاتەکانی بێسنووربوو، جارجارەش بە خاسیەتی خوایەتی وەسف دەکرا، بۆ نموونە: کیسرای ئەبەروێز وەسفی خۆی دەکرد بە "پیاوی نەمر لە نێوان خواکاندا و خوای مەزن لە نێو پیاواندا".[1] دیارە ئەوەش ئاماژە دەکات بۆ بڕێکی زۆر لە خۆبایبوون و خۆبەزلزانین، ئەمە لە کاتێکدایە کە مێژوونووسەکان وەسفیان کردوە و بە "الملك الحقود المرائي الجشع الرعديد"[2]، واتە: پادشای کینە لەدڵی ریاکاری چڵێسی ترسنۆك، هەروەها ئەوەیان روونکردووەتەوە کە گرنگی زۆری داوە بە کۆکردنەوەی تەپەلۆکەی ئاڵتوونو زیوو زێڕ کە خەزێنەکانی لێ پڕکردبوو لە رێگەی ستەمکردن لە گەلەکەی لە رێگەی قۆستنەوەی هەژاری و بەدبەختی ئەوان،[3] ئینجا پەناشی دەبردە بەر قەشەو جادووباز بۆ راوێژپێکردنیان بە مەبەستی وەرگرتنی بڕیارە گرنگەکان.[4]

سەبارەت بە لایەنی ئابووریش، سامانو سەرچاوەکانیان بۆ خۆیان قۆرخ دەکردو لە نێو خۆشیەکانی دونیادا نغرۆ دەبوون، قازانجەکانیشیان هەر پەرەپێدەدا لە رێگەی سووی لە رادەبەدەر و گومرگو باجی قورس، کە دەیانسەپاندە سەر لاوازان لە جووتیارانو رەشو رووتی خەڵك، هێندەیتر هەژاریو بەدبەختیان زیاد دەکردن، ئینجا قەدەغەیان کردبوو لەسەر خەڵکی کە هەڵسن بە ئەنجامدانی هیچ پیشەیەك جگە لەوەی پێشتر باوکیان ئەنجامیانداوە، خەڵکی شارەکانیش هەروەکو جووتیارەکان سەرانەیان دەداو سەرقاڵی بازرگانیو هەندێ پیشەی تر بوون، حاڵیشیان لە جوتیارەکان چاکتر بوو، چونکە ئەوان پاشکۆی زەویەکانیان بوونو بە زۆرەملێ بێگاریان پێدەکرا، بۆ جەنگەکانیش بەکاردەهێنران بەبێ رەزامەندی خۆیان و یان دانانی هیچ کریەك بۆیان.[5] ئینجا کۆکەرەوانی باج خۆیان نەدەپاراست لە هیچ ناپاکی یان زەوتکردنێك بۆ ماڵەکان لە کاتی خەملاندنی باجەکانو کۆکردنەوەیان، باجەکانیش بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەسەپێنران بە تایبەت لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕەکاندا.

١) کریستینس: ایران في عهد الساسانیین ٤٣٢.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤٣٧.

٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤٣٧

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤٣٧، ٤٦٩.

٥) کریستینس: ایران في عهد الساسانیین ٣٠٦.

**حاڵەتی ئاینی و فیکری:**

فارسەکان ئاینی راستیان نەبوو، ئەو ئاینانەش کە لە پێش ئیسلام هەبوون لە ناو ئەواندا بڵاونەبووەوە لە بازنەیەکی دیاریکراودا نەبێت، زۆربەشیان مەجووسی ئاگرپەرست بوون، هەر لە سەدەی سێ یەمی زاینیەوە دەوڵەت لەسەر ئاینی زەردەشتی بوو، رەوشتی پیاوانی ئاینیش بەجارێك تێکچوو بوو، بۆیە دەناسران بە پاشگەزبوونەوەو پەرۆشی و سەرقاڵبوون بە ماڵی دونیاوە، کیسرای دووەم هەوڵیدا تازەگەری بکات لەو ئاینەداو پەرستگاکانی ئاگر ببوژێنێتەوەو لێکدانەوەیەکی نوی بڵاوبکاتەوە بۆ کتێبی (ئاڤێستا)، سزای لادانی هەرکەسێك لەو کتێبە کوشتن بوو.[1]

بیروباوەڕی زەردەشتی لەسەر بوونی دوو خوا دامەزراوە لە بوونەوەردا، یەکێکیان خوای رووناکیەو (ئەهورامژدە) و ئەویتریشیان خوای تاریکیە (ئەهریمەن)، هەردووکیشیان کێبڕکێ دەکەن لەسەر دەستبەسەراگرتنی بوونەوەر، جا مرۆڤە چاکەکان لەگەڵ خوای چاکەدا دەبن‌و مرۆڤە خراپەکانیش لەگەڵ خوای خراپەدا دەبن.

زەردەشتیەکان ئاگر بە پیرۆز دادەنێن، پەرستگاکانی ئاگریش لە سەرتاسەری دەوڵەتدا دروستکرابوون، پیاوانی ئاینی بە (الموابذة) دەناسرێن، هەریەکێکیش لە ئەوان سەرکردایەتی کۆمەڵێك دەکەن (الهرابذة)یان پێدەوترێت، کە هەڵدەستن بە خزمەتکردنی ئاگری پەرستگا لەهەر لادێ و جێگایەك.

دیارە ئەم بیروباوەڕە بەتاڵانە توانای ئەوەیان نی یە ئارامی و ئاسودەی ببەخشنە مرۆڤ و نە ئامانجەکانیشیان جێبەجێ دەکەن لە یەکخواپەرستندا، نە بەها رەوشتیە جوانەکانی پێدەبەخشن‌و نە بنچینەکانی دادگەری کۆمەڵایەتی بەجێدەهێنن.

**حاڵەتی کۆمەڵایەتی و رەوشتی:**

ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئێران لەسەر دوو کۆڵەکە پێکدەهات: نەژادو سامان، چینی خانەدانان دابڕابوون لە میللەت بە سنوورێکی قایم، چونکە "هەموو کەسێك پلەو پایەی دیاریکراوی خۆی

١) کریستینس: ایران في عهد الساسانیین ٤٧٠-٤٧١، ٤٧٢-٤٧٣.

هەبوو لە کۆمەڵدا، لە بنچینەکانی سیاسەتی ساسانیش ئەوە بوو کە هیچ کەس تەماعی نەبێت بگاتە پلەیەك بەرزتر لەو پلەی تیایدا لەدایکبووە".[1]

خێزانیش لەسەر بنچینەی فرەژنی پێکدەهات، هەروەها ئەوەش بڵاوبوو لەناویاندا کە پیاو دەتوانێ دایكو خوشكو هەر ئافرەتێکی نزیکی خۆی مارە بکات (زواج المحارم)[2]، دۆخی ئافرەتیش لە دۆخی کۆیلە دەچوو، چونکە پیاو دەیتوانی واز لە خێزانەکەی بهێنێ بە بێ ڕەزامەندی خۆی بیبەخشێت بە مێردێکی تر، هەروەها نەریتێکی تر باو بوو لەو سەردەمە، کەسێك دەیتوانی منالێك بکات بە کوڕی خۆی.[3] ئینجا بەدڕەوشتی و بەڕەڵلای بەجارێك تەشەنەی کردبوو لەو کۆمەڵگایە، بە تایبەت دوای بڵاوبونەوەی موزدەکی، کە موزدەك بانگەشەی بۆ دەکرد (لە ساڵی ٤٨٧ ز لە دایك بووە).

## دەوڵەتی ڕۆم

## (ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی) ٣١٢- ١٤٥٣ز

### حاڵەتی سیاسی و ئابووری:

ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی ڕۆمی دەگرتەوە لە ئاسیای بچووك (تورکیای ئێستا)، بڵاویش دەبوویەوە تا دەگەیشتە ئەو وڵاتانەی دەکەوتنە سەرحەوزی دەریای ناوەڕاستی ڕۆژهەڵاتو باشووری، بەم شێوەیەش چەندین ڕەگەزی لە خۆگرتبوو وەکو بەربەرو قیبتو عەرەبو بێجگە لە ڕۆمەکانیش، گونجاندنیش نەبوو لە نێوان ئەم پێکهاتانەدا لە ڕووی ڕەگەزو زمانو ڕۆشنبیریو دابونەریت، سەرەڕای ئەوەیش کە نەصرانیەت لەنێو ئەو گەلانەدا بڵاوبوو، بەڵام توانای ئەوەی نەبوو گونجاندن لە نێوانیاندا دروست بکات بە هۆی ناکۆکی ڕێچکەکانەوە کە بووە مایەی لاوازکردنی گیانی خۆشەویستی لە لای میللەت لە شامو میصر بەرانبەر بە ئیمپڕاتۆریەت.

ئینجا سیستمی حوکمڕانی پادشایەتیەکی ڕەها بوو، چونکە نەصرانیەت کۆمەڵگاو دەوڵەتی ریکنەدەخست، بەڵکو تەنها ڕۆڵی ئەوەی لە ئەستۆ دەگرت پەیوەندی نێوان خەڵکیو خوا

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٣٠٢.

٢) کریستینس: ایران في عهد الساسانیین ٣١٠- ٣١١.

٣) کریستینس: ایران في عهد الساسانیین ٣١٦- ٣١٨.

ڕێکبخات، دروشمیشی ئەوە بوو (دع ما لقيصر لقيصر وما لله لله) واتە: واز لەوە بێنە هی قەیصەرە با بۆ قەیصەر بێتو ئەوەیش بۆ خوایە با بۆ خوا بێت.

بیرۆکەی باویش کە کڵێسا پشتگیری لێدەکرد ئەوە بوو کە خوا هەڵساوە بە هەڵبژاردنی ئیمپڕاتۆریەت بۆ ئەم پلەوپایەیە، بۆیە ئەوە بووە مایەی ڕێزلێگرتن و بە پیرۆز زانینی هاوڵاتیان بۆی لە کاروباری سیاسەتو ئاینیدا، ڕێ و ڕەسمەکانیش لە سەرا بە بەشداریکردنی کڵێساو پیاوانی سەرا بەڕێوەدەچوو، ئەوکاتەش ئیمپڕاتۆر دەردەچوو هەموان کڕنووشیان بۆ دەبرد.[1]

سەرەڕای ئاینی مەسیحی، یاسای ڕۆمانی و شارستانی یۆنانی بتپەرستانە زاڵبوون بەسەر ژیاندا.[2]

ئیمپڕاتۆری بیزەنتی کە هاوچەرخ بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلام، هیرەقل بوو (٦١٠ـ ٦٤١) ئەو بە مەزنترین ئیمپڕاتۆرەکان دەژمێردرێت لە مێژووی بیزەنتەدا، چونکە هەوڵیداوە بۆ نوێکردنەوەی ئیمپڕاتۆریەتو دووبارە ڕێکخستنی دەوڵەتو دروستکردنی سوپاو زۆرکردنی سەرچاوەی دارای لە ڕێگەی ڕێکخستنی باجەکانو شێوازی وەرگرتنیان، هەروەها ئەو توانی سەرکەوێتە سەر ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی کە ئەوان لە ڕۆمەکان بەهێزتر بوون لە رووی سەربازیەوە،[3] قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی کردووە بە سەرکەوتنی ڕۆمە نەصرانیەکان بەسەر فارسە ئاگرپەرستەکان، ئەڵبەتە موسڵمانان لە مەککە خۆشحاڵبوون بەو هەواڵە، هێرشەکانی هیرەقل بۆسەر فارسەکان لە نێوان ساڵانی (٦٢٢ـ ٦٢٨ز) بوو، واتە لە ساڵی دوانزەی پاش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ تاکو ساڵی پێنجی کۆچی.

سەبارەت بە حاڵەتی ئابووریش، سوو و قۆرخکردن بنچینەی سیستمی ئەو وڵاتە بوو،[4] هیرەقل باجی تازەی سەپاندبووە سەر خەڵکی دەڤەرەکان، کە ئەوان قەڵس بوون لە فەرمانڕەوای ڕۆمانی بە هۆی ناچاربوونیان بۆ قەرزبژاردنی شەڕەکانی لەگەڵ فارسەکان، ئەم ئیمپڕاتۆریەتە تووشی داڕوخانێکی ترسێنەر بوو لە ئاکامی بەرزکردنەوەی گومرکو باجەکاندا، هەروەها دواکەوتن لە بازگارنیو پشتگوێخستنی کشتوکاڵو کەمبوونەوەی ساختمان. بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی چۆنێتی

١) د. السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية ٢٦.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو. ٢٧.

٣) د. السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية ١١٦، ١٢٤، ١٢٤ـ ١٢٧، و جوزيف نسيم يوسف: تاريخ الدولة البيزنطية ١٠٥.

٤) ول ديورانت: قصة الحضارة ١٤: ١٧٧.

بەڕێوەبردنی ئیمپڕاتۆریەت بۆ ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون، ئەوەندە بەسە ئاماژە بکەین بۆ وتەی بەتلەر دەربارەی بەڕێوەبردن کە دەڵێت: "ڕۆمەکان سەرانەیان لەسەر کەسەکان وەردەگرت لە میصر، چەندین باجی جۆراوجۆری تریش" هەروەها دەڵێت: "بێگومان باجی ڕۆمەکان لە توانای خەڵکەکەدا نەبوو، بەشێوەیەکی دادگەرانەش لە خەڵکی وەرنەدەگیرا". هەروەها دەڵێت: "فەرمانڕەوایەتی ڕۆمی میصر، تەنها یەك ئامانجی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو خەڵکی بڕوتێنێتەوە وەك دەستکەوتێك بۆ فەرمانڕەواکان".[1] تەنانەت خودی ڕۆمەکان تووشی قورسی باجەکان دەبوون بە تایبەت جوتیارەکان کە زۆری باجەکان ناچاری دەکردن زەویەکانیان بفرۆشنو کۆچ بکەن بۆ شارەکان.[2]

**باری ئاینیو فیکری:**

سەرەڕای ئەوەی کە ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی لەسەر ئاینی نەصرانی بوو، بەڵام ئەو ڕێنمایانەی عیسا (علیه السلام) پی ڕەوانەکرابوو وەکو خۆی نەمابوونەوە، بەڵکو ڕێوڕەسمەکانی کڵێسا بڕێکی زۆری لە بیرکردنەوەی فەیلەسوفە بتپەرستەکان لەخۆگرتبوو، هەروەها کڵێسا خۆی پڕچەك کردبوو بە هەمان سۆنگەو ئامڕازە عەقڵیەکانی لە ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕی مەسیحیدا".[3]

پوختەی قسان ئەوەیە کە مەسیحیەتی ڕاستەقینە پاك و بێگەردی خۆی لە دەستدا بوو بە بۆنەی ئەو ڕێوڕەسمە بتپەرستیانەی کە پۆڵص لەسەری پەروەردە بوو و لەگەڵ خۆیشی هێنایە نێو ئاینی مەسیحیەوە، ئەوکاتەیش ئیمپڕاتۆری بێزەنتە قوستەنتین ئاوێتەیەکی لە ئەفسانەی یۆنانی، بتپەرستی، ڕۆمانی، ئەفلاتونی، میصریو ڕەهبانی، بەم شێوەیەش ئاین تێکدراو ڕێنمایە پەسەندەکانی لە نێوچوو، لە هەمان کاتدا لێژبوونەوە بۆ پەرستنی کەسە پیرۆزەکان و وێنەو بتەکان.[4]

ناکۆکی ڕێچکەیش دروست بوو لە نێوان دانیشتوانی ئیمپڕاتۆریەتدا سەبارەت بە لێکدانەوەی سروشتی مەسیح (علیه السلام)، دەوڵەت لە سەر ڕێبازی (الملكانية) بوو کە پی وایە مەسیح دوو

---

١) بتلر: فتح العرب لمصر ٤٧.

٢) ول ديورانت: قصة الحضارة ١٤: ١٧٤.

٣) الباز العريني: الدولة البيزنطية ٢٧.

٤) أبوالحسن الندوي: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ٤٢. ول ديورانت: قصة الحضارة ١٤: ١٥٤ـ ١٥٥.

سروشتی هەیە: یەکێکیان وەکو خوایەو ئەویتر وەکو مرۆڤ، ئەمە لە کاتێکدا کە ڕێبازی (الیعاقبة) و (المنفوستیة) لە وڵاتی شام و میصر تەشەنەی کردبوو، ئەم ڕێبازە پی وایە تەنها سروشتی خوای هەیە، ئەم ناکۆکیانە بوونە مایەی کەرتو پەرت بوونێکی توند لە نێوان دەوڵەتو میللەتدا، هیرەقل هەوڵی دەدا ڕێبازی ئیمپڕاتۆریەت یەکبخات، کۆڕێکی ئاینیشی بۆ ئەو مەبەستە دامەزراند، بەوە کۆتای پێهات خۆتێهەڵقورتان قەدەغە بکرێت دەربارەی سروشتی مەسیح، تەنها ئەوە بووترێت کە خوا یەك ویستی هەیە.[1]

بەڵام میصریەکان هەڵسان بە بەرگریکردن، بۆیە دووچاری چەوسانەوە بوون بە ئەشکەنجەدانو سوتاندنو بەم شێوەش هەوڵەکانی یەکخستنی ئاینی هەرەسی هێناو یەعاقیبەو مەنۆفیێسییەکان لایەنگیریان کەمیکرد لە شام بۆ ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی.

ئەم ناکۆکی ڕێچکەیە ئەوە ڕووندەکاتەوە تا چەند لێژبوونەوەی ئەندێشەیو لاوازی بیروباوەڕ کاریکردبوو لە گەلانی ئیمپڕاتۆریەت تا گەیشتە ئەوەی عیسا کە بەندەی خوایەو پێغەمبەرێتی، کرا بە خوا.

ئینجا چینەکانی کۆمەڵگای بیزەنتی هەموویان بیروباوەڕیان هەبوو بە ئەستێرەناسی و جادووگەری و پێشبینی کردنی پاشەڕۆژو پەیوەندی کردن بە دێوو هەڵواسینی نوشتەو جادوو.[2]

**باری کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی:**

دابونەریتەکانی کۆمەڵگای یۆنانی و ڕۆمانی گوێزرانەوە بۆ دەوڵەتی بیزەنتی، بۆیە هیچ سەیر نەبوو مەسەلەی بڵاوبوونەوەی بەدرەوشتیو هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی رووبدات لەناو سەراو ڕیزەکانی گەلدا.

ئیمپڕاتۆر و سەرکردەکانی سوپاو گەورەپیاوانی کڵێسە لە سەرووی پەیژەی کۆمەڵایەتیەوە دەژیان، لە کاتێکدا هەزاران کۆیلە لە کێڵگە گەورەکاندا تاڵیان دەچەشتو گیرۆدەی بەدخۆراکیو نزمبوونەوەی ئاستی بژێوی دەبوونەوە، نزیك لە ئاستی ئەوانەش کەسانێك بوون ئازادەکانیان پێدەوترا، ئەو کەسانە لە پیشەسازی کاریان دەکرد، ئەم چینە هەژارانە هەستیان دەکرد بە خراپی گوزەرانی خۆیانو زۆر جاران هەوڵیشیان دەدا شۆڕش بکەن، بەڵام سەرکەوتوو نەدەبوون تیایدا،

١) أرنولد یوینبی: تاریخ البشریة ٢: ٥٩ـ ٦١.

٢) دیورانت: قصة الحضارة ١٤: ١٧٠.

خاوەن ئیشەکانیش کە ئەوانیان بەکاردەهێنا چینێکی ناوەڕاستیان پێکدەهێنا بە ژمارەیەکی گەورە.[1]

بەم شێوەیەش چینایەتی و دەرەبەگی و نەمانی دادگەری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای بیزەنتی بە مۆری خۆی دیاریکردبوو، جگە لەوانەش توندوتیژی و دەمارگیریو ئەفسانە ژیانی کەسەکانی مۆرکردبوو، هەموو ئەوانەش تەنها بە هۆی لاوازی بڕوای ڕاستەقینە بوو بە خواو پێغەمبەرەکەی، هەروەها زاڵبوونی رواڵەتو دیمەنی ژیانی خەڵەتێنەر لەسەر ژیانی ئاینی لە ئیمپڕاتۆریەتدا.[2]

**ئاگاداری:**

سەرەڕای دیاردەکانی لاوازی و خراپەکاری لە هەردوو ئیمپڕاتۆریەتی ساسانیو بیزەنتی لە کاتی سەرهەڵدانی ئیسلامو دروستبوونی بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی، بەڵام بەهەڵەدا دەچین ئەگەر زیادەڕەوی بکەین لە باسکردنی لاوازیاندا، چونکە ئەوان توانیان سوپاگەلێکی بێ شومار ئامادەبکەن بەرانبەر پێشکەوتنی موسڵمانان، سوپاکانی ئەوان لە ڕووی ژمارەو کەرەستەوە لە سوپای موسڵمانان چاکتر بوون، بەڵام بە بڕوای راستەقینەو گیانی جیهادکردن لە پێناوی خوادا و باوەڕ بە سەرخستنی خوای گەورە بۆ موسڵمانان، هەموو ئەو هۆکارانە جەنگی لە بەرژەوەندی موسڵماناندا کۆتای پێهێنا، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو جەنگە دژ بە هێزێکی ڕێکخراوو سوپاگەلێکی کارامەو قەڵاگەلێکی قایمو نەتەوە گەلێکی دێرین بوو.

## هیندستان و چین و ژاپۆن

ئاینی بودای تەشەنەی کردبوو لە چین، ئیتر پەیکەری گڵێنەو شوشەی کە ئاماژەیان دەکرد بۆ خزمەتکارو ئەسپو جوانی لەگەڵ مردووەکاندا لە گۆڕەکانیاندا دەنێژران، دواتر ئەم خووە گۆڕا بۆ سەربڕینی کۆیلەو ئەسپەکان بە زیندوویو ناشتنیان لەگەڵ پادشاو سەرۆکەکان بە مەبەستی خزمەتکردنیان بۆ ئەوان لەپاش مردنیان،[3] جا پەیکەرەکانی بودا (٥٦٣ـ ٤٨٣ پ ـ ز) لە هیندستانیش هەر بڵاوەی کردبوو.

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٤: ١٧٣ـ ١٧٥.

٢) دیورانت: قصة الحضارة ١٤: ١٨٧ـ ١٨٨.

٣) ولز: موجز تاريخ الانسانية ٣: ٧٧٣.

ئاینی بودا جەخت دەکاتەوە لەسەر هەندێ واتا دەربارەی هەتاهەتای ژیان لە خولاوێکی کۆتای پێنەهاتوودا لە یەکبەدوای یەکهاتنی گیانەکاندا، ژیانێکی لێواو لێو لە ئازار کە دەکرێت مرۆڤ خۆی لێقوتار بکات لە رێگەی خۆ رۆشنبیرکردنو گەیشتن بە رووناکیەك کە مرۆڤ بەرز دەکاتەوە تا گەیشتن بە قۆناغی (رەفانا) واتە: یەکبوون لەگەڵ خودی خوادا، یان بە ئاوێتە بوونی خودی مرۆڤ بە شێوەیەکی شادمان لەگەڵ بوونەوەردا.[1]

هەموو کردارێکی خراپیش لە ئەم ژیانە لە دوای گەڕانەوەی گیان بۆ لاشەیەکی تازە دەبێت، ئازاریش بۆ ئارەزوو، بۆیە بنچینەی دانای ئەوەیە کە ئارەزوو و لەزەتەکان سەرکوت بکرێنەوە بە گشتی، بودا هەڵسا بە قەدەغەکردنی کوشتنی هەمووگیان لەبەرێك و دزیو درۆو بێهۆشکەرو پیسی، گرنگیشی نەدا بە هیچ رێورەسمێكو باسی خواو رۆژی دوایشی نەکردووە، چونکە ئەو تەنها باوەڕی بەو شتە بوو کە هەستی پێدەکرێت، ئەگەرچی بودا جەخت دەکاتەوە لەسەرخۆ نکۆڵیکردنو چاکە بۆ خەڵکی، هەروەها ئەو هێرشی نەکردووەتەوە سەر چینە باوەکان لە هیندستان بە شێوەیەکی راشکاو، لە کاتێکدا ئەو خەڵکی بە یەکسان دەزانێت، نکوڵیشی کردووە لە قوربانیکردنو خەڵك بانگکردن بۆ خواردنو نوشتەو پاڕانەوە، بەڵام پەرستنی ئەو خودایانەی قەدەغەکرد کە هیندیەکان دەیانپەرستو لەناویاندا باوبوو، هەروەها بانگەشەی دەکرد بۆ گەیشتن بە بەختەوەری لە رێگەی (نیوفانا) بە هەر حەوت بناغەکەیەوە کە بریتیە لە: زاڵبوون بە سەرخۆدا، گەڕان بە دوای راستیدا، چالاکی، هێمنی، شادی، دامەزراندنو هیممەت بەرزی.[2]

لە وڵاتی هیندستان ئاینی بەرهەمی بەربەرەکانی ئاینی بودای دەکات،[3] ئەو کۆریانەش کە کۆچیان کرد بۆ ژاپۆن ئاینی بودایان لەوێ بڵاوکردەوە،[4] ژاپۆنیەکان پێش بودا خوایەکی تریان دەپەرست ناوی کامی بوو، ئەوەیش بریتی بوو لە پەرستنی دیاردە سروشتیەکان وەکو خۆرو باووباپیرە ئەفسانەیەکان کە ئەوانیش بە پی بیروباوەڕیان دیاردەی سروشتینو ئاینەکەشیان بە (شینتۆ)

١) ادوین رایشاور: اليابانيون ٦٨.

٢) دیورانت: قصة الحضارة ٣: ٦٤، ٧٥، ٧٧، ٧٨، ٨١، ٨٢، ٨٤، ٨٥.

٣) ولز: موجز تاريخ الانسانية ٣: ٧٧٩.

٤) تويبنبی: تاريخ البشرية ٢: ٧٦ـ ٧٧.

دەناسرا، واتە: ڕێگای خوداکان[1] لە کاتی سەرهەڵدانی ئیسلامیشدا ئاینی بودا سەرکەوتبووە سەر شینتۆدا.[2]

ئینجا ئاینی بودای لە سەیلان، مەلایۆ، تیبت، تورکستان، بۆرما، سیام، کەمبۆدیا و کوریا بڵاوبوویەوە، جگە لە چین، هیندستانو ژاپۆنیش.[3] بەڵام سەبارەت بە هیندستان زیاتر بەرهەمی زاڵبوو تیایدا، لە ئەنجامی بەربەرەکانی لەگەڵ بودایدا، بەرهەمی دامەزراوە لەسەر سیستمی چینایەتیو سەرگەورەی بەرهەمیەکانو بە پیرۆززانینی مانگاو یەکبەدوای یەکدا هاتنی گیانەکان، ژمارەی خوداکانی هیندۆسیەکان گەیشتە سی ملیۆن خودا، کە گۆڕستانی مەزنەکانی پێ جەنجاڵ بوو.[4]

لە ڕاستیدا ئەو خودایانە بە شێوەیەك باسکراوە کە ڕەچاوی سنووری ئاکاریەکانی تیادا نەکراوە، بە درێژای سەدەکانیش پارێزگاریان کردووە لە هەندێ شێوەپەرستن وەکو بە قوربانیکردنی کەسانێك لە مرۆڤەکانو سووتاندنی بێوەژن لە کاتی مردنی پیاوەکەیدا، هەروەها بەرهەمی وایدەرخستووە کە ژیان خراپیەکە ڕێگەچارە نی یە بۆ خۆ لێ قوتار کردنی، کاریشی کردووە بۆ دابەزاندنی ورەی شوێنکەوتووانیو بڵاوکردنەوەی دڵتەنگی لە دەروونیاندا، بەڵکو دیاردەکانی دونیا بە خەیاڵ دەزانێت، بەم شێوەیەش جیاوازیەکانی ئازادیو کۆیلایەتی، چاکەو خراپە، چاکسازیو خراپەکاری، هەموو لەناوبرد[5] لە پاش ئەم نمایشە گشتگیرە دەردەکەوێت کە سەرانسەری مرۆڤایەتی لایاندا بوو لە یەکخواپەرستیو نەفامیش بوون بە چۆنیەتی پەرستنی، هاتنی ئیسلامیش بەزەیو لێبوردنێکی گەورە بوو بۆ ئەو جیهانە، چونکە ئیسلام بیروباوەڕە پوچەڵەکانی ڕاستکردەوە لە ڕێگەی پێناسەکردنی پەروەردگارو ناوو سیفەتەکانی، هەروەها لایەنەکانی تری بیروباوەڕ بە شیکراوەیو ئاشکراکردنی ویستی خوا لە بەندەکانی بە باسکردنی حوکمەکانی حەڵاڵو حەرامو ئاکارەکان بە تێروتەسەل، بەم شێوەیەش ڕێگە خۆشکرا بۆ مرۆڤ بۆ گەیشتن بە خوای تاكو بێ هاوتاو پەرستنی بەو شێوازەی ڕوونکراوەتەوە لە قورئانو سوننەتداو جێبەجێکردنی پێڕەوو بەرنامە گشتگیریەکەی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.

---

١) أدوين رايشاور: اليابانيون ٦١.

٢) هەمان سەرچاوە ٦٣.

٣) ديورانت: قصة الحضارة ٣: ٢٠٠، ٢٠٧.

٤) هەمان سەرچاوە.

٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**باسی دووەم:**

**بانگەوازی ئیسلامی و بنەما فیکریەکانی**

گوتاری ئیسلامی ئاڕاستەکراوە بۆ سەراپای خەڵکی بە هەموو جێگەو سەردەمێکیانەوە، بە هەموو رەگەزو نەتەوەو رەنگێکیانەوە (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ).[1] (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ).[2] ئەم گشتگیریە لە گوتاردا بۆ مرۆڤایەتی وایدەخواست کە پێغەمبەر ﷺ هەڵستێت بە بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ هاتنە ناو ئاینی ئیسلام (قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي)[3]، هەموو سەردەمەکانی ئیسلامیش پڕ بووە لە چالاکی بانگەواز لە باردۆخەکانی جەنگو ئاشتیدا بەشێوەیەك کە کاریگەری گەورەی هەبووە لە زۆرکردنی ژمارەی موسڵمانانو فراوانکردنی رووبەری ئاینی ئیسلام. پاڵنەری یەکەمیش بۆ ئەو بانگەوازە بەدەستهێنانی رەزامەندی خواو لێخۆشبوونی بوو، لە فەرموودەدا هاتووە: "لان يهدالله بك رجلاً واحداً خير لك من حمر النعم".[4] واتە: ئەگەر خوای گەورە یەك کەس لەسەر دەستت رێنموونی بکات، لە هەموو ماڵی دونیا بۆ تۆ چاکترە.

بابەتی بانگەوازیش ئیسلامە بە گشتگیری بیروباوەڕو شەریعەتو ئاکار، یان بە وتەیەکی هاوچەرخ بریتیە لە هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی فیکری، کۆمەڵایەتی، ئابووریو سیاسی، بەڵام تەوەری سەرەکی یەکتاپەرستی پەتیە بۆ خوای مەزن، کە ئەو پەروەردگارە و بەدیهێنەرو رۆزیدەرو بەخشندەیە، هەروەها ئادەمیزادی دروستکردووە بۆ هێنانەدی بەندایەتی (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ).[5] لەم دونیایەشدا تاقی دەکرێنەوەو بە گوێڕایەڵیان و پاداشتی کردارەکانیان وەردەگرنەوە لە دوارۆژدا، ئەوجا ئیمانداران دەچنە بەهەشتو بێباوەڕانیش دەچنە دۆزەخ (زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ).[6] (سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ

---

١) (الأنبياء : ١٠٧).

٢) (سبأ : ٢٨ ).

٣) (يوسف : ١٠٨ )

٤) البخاري: الصحيح ٤: ٥٨، ومسلم: الصحيح ، كتاب فضائل الصحابة باب ٤ رقم ٣٤ واللفظ له.

٥) (الذاريات: ٥٦).

٦) (التغابن: ٧).

اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ).[1] (وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ).[2]

له راستیدا هاتنه ناوەی ئیسلام دەستپێدەکات به وتنی: (أشهد أن لا إله الا الله وان محمداً رسول الله). بەوەیش مرۆڤ دڵسۆزی خۆی دەردەبڕێت له پەرستنی خوای تاكو تەنیاداو وابەستەبوون به پێڕەویکردنی حوکمەکانی ئیسلام که موحەممەد ﷺ پی رەوانه کراوە، بەمشێوەیەش مرۆڤ دەچێته قۆناغی هۆشیاری ئاینیەوە، هۆشیاری به ئامانجی مەزن له بوونەوەر، هۆشیاری به پێویستی بەرزبوونەوەی ئاینیو دونیای، هەروەها به هۆکارەکانی ئەو بەرزبوونەوەیه له هەستکردن به واتاکانی باوەڕ و تێگەیشتن و بیرکردنەوەو یادی خواو سوپاسکردنی و پەرستنه جۆراوجۆرەکان وەکو نوێژو رۆژوو بۆ پتەوکردنی پەیوەندی به خواوە (نوێژ هۆکاری بەرزبوونەوەی بڕواداره)، هەروەها پشتگیریکردنی ڕاستیو دادگەریو چاکەو جوانیو فەرمان به چاکەو نەهی له خراپە، ئینجا له خۆدا نواندنی بەها ئیسلامیەکان له ژیانیدا بۆ ئەوەی ببێته نموونەی "مرۆڤی چاکەکار" هەروەها له بەخشندەی بۆ دەوروبەر له رێگەی "کاری چاکە" مرۆڤ له خوا نزیك دەکاتەوە.

بازنەی کاری چاکەیش زۆر فراوانه، ئامانجی ئەوەیه مرۆڤ بەرزکاتەوە له ژیانی ئاینیو دونیایداو پاڵپشتی بەهاکانی راستیو چاکەو جوانی له زەوی بکات.. ئەوانەش واتاگەلێکی گەورەن بەئاسان به دینایەن، ئەگەریش له نەوەیەکدا بەدیهاتن دەستەبەرێك نی یه بۆ بەدیهاتنیان له نەوەی داهاتوودا، چونکه بەرزبوونەوە و داکەوتن هەمیشه دووباره دەبنەوە له مێژووی ئادەمیزاددا، زیندووکردنەوەی ئاینو سوننەتەکانو پتەوکردنی بناغەکانی باوەڕ پەیوەستن به بانگەوازی ئیسلامیەوەو تا چەند بانگهێشتەکان ئاگاداری ناوەڕۆکی ئیسلامو گشتگیریو تواناییان لەسەر بەدیهێنانی ئەو رێنماییانه له خۆیاندا، ئینجا قەناعەت پێکردنی کەسەکانی تر.

قورئان یەکەمین کتێبه به زمانی عەرەبی که هۆشی مرۆڤی جوڵاند پێش چوارده سەدە، هەروەها بیرو هۆشی کردەوە بەرانبەر به شوێنی خۆی له ژیانداو پێناسەی مافو ئەرکەکانی کردووە که تێگەیشتنی کۆمەڵایەتیو تێڕوانینی مرۆڤایەتی قووڵدەکاتەوە، پێغەمبەری خوایش ﷺ هەموو ئەم واتایانەی به فەرموودەکانیو ژیاننامەی خۆی روونکردۆتەوە، ئینجا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر

---

١) (الحديد: ٢١).

٢) (التغابن: ١٠).

ﷺ قورئانی لە خۆیدا بەدی هێنا بە وریایو قوڵیەکی تایبەتەوە، هەروەها کارتێکردنی زۆری لەسەر نەوەی خۆی بە تایبەت، لەبەر هەموو ئەو واتایانە سۆمای قورئانی وەرگەڕا بۆ ڕاستیەکی مرۆڤایەتی هەست پێکراو، چونکە هاریکاری کرد لە پەیامی خوا، بەروبومێکی مەزنیشی بەخشی بە تێگەیشتنی گشتی مرۆڤ، کاتێك ئیسلام بڵاوبوویەوە لەکاتو جێگادا.

ئامانجی بانگەوازی ئیسلامی کە کردنەوەی زوخاوو خواردنی مرۆڤە لە ژیاندا، کە دەکرێت بە بەردەوامی کەمبکرێتەوە لە ژێر سایەی پەیامی خوایدا، ئەمە لە کاتێکدا کە زیاتر هۆشمەندی لەوانەیە ببێتە مایەی چەوسانەوە لە حاڵەتی نەبوونی ئیماندا، چونکە ناڕەحەتی ژیان لە زیادبووندایە، لە کاتی لە دەستدانی واتا، تەنها ئاینیش دەتوانێت ئەو واتایە ببەخشێت.

یەکێکی تر لە مەبەستەکانی بانگەوازی ئیسلامی، رزگارکردنی مرۆڤە لە خەیاڵو ئەفسانەو شتی پڕوپووچو جادوو، کە کەسانێکی سوودگەر پی هەڵدەستنو دەڵێن کە گوایە ئەوان پەیوەندی نێوان خواو خەڵکن، جاری واش هەیە مرۆڤ خۆی سۆنگە پەیدا دەکات لە بەردو درەختو ئادەمیزاد، گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەنو داوایان ئاڕاستە دەکەن، بۆیە بانگەوازی ئیسلامی جاڕی کێشا، کە ئەوە هاوتا بۆ خاو بڕیاردانێکی پەتی یە و روو لێنەر نی یە لە نێوان خواو مرۆڤدا، لەو فەرموودەیشدا هاتووە: "اتق دعوة المظلوم فانه ليس بينه وبين الله حجاب".[1] واتە: وریای نزای ستەم لێکراو بە، چونکە لە نێوان ئەوو خوادا پەرژین نی یە، ئەوەیش بێگومان دەبێتە مایەی ئاگاداربوونی کەسی ئیماندار لە ئاکامی ستەمو بنچینەیەکیش فەراهەم دەکات بۆ دادگەری سیاسیو کۆمەڵایەتی.

هەروەها بانگەوازی ئیسلامی تەرازوویەکی وردی هەیە بۆ مافو ئەرکەکان بە پی شەریعەت، کە بە هیچ شێوەیەك نابێت نە زیادەڕەوی و نە کەمتەرخەمی تیادا بکرێت، چونکە ئەوە خەڵاتێکی خوایە بۆ مرۆڤایەتی، جێبەجێکردنی ئەو ڕێنماییانەش وای دەخواست جیهادو بەخشین ئەنجام بدرێت هەر لە سەرەتای دابەزینی پەیامی خوا، تاکو جێگیربوونی دەوڵەتی ئیسلام، چونکە ئەگەر بزووتنەوەی جیهادی نەبوایە، بتپەرستیو مۆرکی نەفامی بۆ ژیان لە نێو نەدەبرا، واتاکانی بیروباوەڕ و بەها ئیسلامیە کۆمەڵایەتیو ناوەرۆکە رەوشتیەکانیشی لە دڵی ملیۆنەها کەسدا جێگیر نەدەبوو.

---

١) البخاري: الصحيح ٧: ١٦٨، ومسلم: الصحيح ٤: ١٧٤٠.

لەلایەکی تریشەوە بانگەوازی ئیسلامی بە پەرۆش بوو بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگای یەکسانیو هێز (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ).[1] ئەوەیش بناغە پێویستەکان ئاشکرا دەکات بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی بەهێزی ئامادەباش لەسەر دادگەری و هێز، چونکە قورئان و تەرازوو بۆ ڕاگرتنی دادگەریە، ئاسنیش بۆ پەیداکردنی هێزێك پارێزگاری بکات لە دادگەریو بەردەوامی بۆ دەستبەر بکات.

دادگەری گشتگیریش موسڵمانانو ئەهلی زیمەو بێباوەڕیش دەگرێتەوە، دەوڵەمەندو هەژارو بەهێزو بێهێزو پیاوو ژن دەگرێتەوە، چونکە مافی هەموان دیاری دەکرێت بە پێی پێوەرەکانی دادگەری بەبێ قۆرخ کردن، یان قۆستنەوەو خۆپەسەندی یان ستەم (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ).[2]

بانگەوازی ئیسلامی لە بنەمای یەکسانی نێوان ئادەمیزادەکان دەردەپەڕێت، بێ هیچ بایەخدانێك بە سامانو خانەدانیو ڕەنگو ڕەگو ڕیشە "الناس بنو آدم وآدم من تراب".[3] واتە: خەڵکی ئادەمیزادنو ئادەمیش لە گڵە، ئەمەیش هاوتای هەلەکان دەخوازێت بەرانبەر خەڵکی، هەروەها پابەندبوون بە دادگەری ڕەها لە نێوانیانداو ڕووخاندنی سیستمە چینایەتیەکان، چونکە هیچ بواریك نی یە بۆ خۆبەزلزانینو لەخۆبای بوون بەسەر خەڵکیدا "المسلمون تتكافأ دماؤهم ويسعى بذمتهم ادناهم".[4] واتە: خوێنی موسڵمانان هاوتایە.

ئەم فەرموودەیەش بەدەمهاتنەوەی نەتەوە جیاجیاکان ڕووندەکاتەوە بۆ لای بانگەوازی ئیسلامی و پۆل پۆل موسڵمان بوونیان، لەوانەیە لەبەر هەموو ئەمانەش بێت فەیلەسوفی ئەڵمانی هیگڵ دەڵێت: بنەمای ئیسلامی ـ یان گیانی ڕووناکی لە جیهانی ڕۆژهەڵاتدا ـ یەکەمین بنەما بوو بە ڕووی بەربەریەتدا بوەستێ".[5]

---

١) (الحديد : ٢٥ ).

٢) (النحل : ٩٠ ).

٣) الترمذي: الجامع حديث رقم ٣٩٥٦، وأحمد: المسند ٢: ٣٦١.

٤) أبوداود: السنن، حديث رقم ٢٧٥١.

٥) هيجل: محاضرات في فلسفة التاريخ ٢٥٠.

هەروەها بانگەوازی ئیسلامی ڕاوێژکردن بە بنچینەی سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتی دەزانێت لە ڕوانگەی فەرموودەی خوای گەورە (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ).[1] (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ).[2] عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) ڕوونی کردۆتەوە کە فەرمانڕەوای تایبەتە بە ئوممەتەوە، هەرکەسێکیش ئەوەی لێوەرگرتووە زۆرداره.[3]

بانگەوازی ئیسلامی هاوکێشەی دروست دەکات لە نێوان داواکاریە ئاینیەکانیان و دونیایەکان، گەشبینانەش دەڕوانێتە ئاوەدانکردنی سەر زەویو جوانیەکانی ژیانو خۆشیەکانی، داوا لە ئادەمیزادەکان ناکات لێنەبڕێنو بێهیوابنو دووربن لە بەرهەمهێنانی تواناکانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان (قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ).[4] (وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ).[5] گرنگ ئەوەیە ئەو ئاوەدانکردنو بەرهەمهێنانە لە بازنەی هەست پێکراودا بێت، بێ ستەمو لادان لە فیترەتو بەگەڕخستنی تواناو هێزەکان بەرەو خراپەو وێرانکاریو زۆرداری..

ئیسلام لە بانگەوازەکەیدا بۆ ئاوەدانکردنەوە شوێنکەوتووەکانی لەسەر کارامەی پەروەردە دەکات، بە زاراوەی ئەم سەردەمەش مەبەست لە کارامەی تەکنەلۆژیایە، ئینجا (الاحسان) پلەو پایەیەکی هەرە بەرزە لە سەرووی ئیسلامو ئیمانەوە، کە تیایدا تواناکانی مرۆڤ دەکەونە کار، لەسەر جیهانی نادیاریش دەکرێنەوە بە شیوەیەکی چڕ لە خواپەرستنو چاودێریو یەقین "الاحسان أن تعبدالله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك".[6] واتە: ئیحسان ئەوەیە خواپەرستیت وەکو ئەوەی کە بیبینی، ئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێ.

ئەم بانگەوازە شارستانیەکی شۆخو شەنگی هێنایە بەرهەم، لەسەردەمە زێڕینەکانی ئیسلام بوارەکانی فیکر، زانست، کشتوکاڵو پیشەسازی گرتەوە.

---

١)(الشورى : ٣٨ )

٢) (آل عمران : ١٥٩).

٣) يعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ١: ٣٥١ باسناد صحيح.

٤) (الأعراف : ٣٢ )

٥) (القصص : ٧٧ )

٦) البخاري: الصحيح ١: ١٨.

یەکێك لە مەبەستەکانی ئەو بانگەوازەیش پاراستنی جۆری مرۆڤ و بەردەوامیبوونی بوو، لە ڕێگەی فەرمانکردن بە ژنهێنانو شووکردنو بەهێزکردنی خێزانو قەدەغەکردنی خۆکوژیو خەڵك کوشتن (مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً).[١] ئاسایشی تاکیشی کردووەتە بناغەی بەدیهێنانی ئاسایشی کۆمەڵ.

ئینجا بانگەوازی ئیسلامی دەرگای گەڕانەوەی بۆ لای خوا والآ کردووە بۆ سەرانسەری مرۆڤەکان، با تاوانیشیان هەرچەند زۆر بێت، بەبێ هیچ پێویستیەك بە دانپێدانان لە بەردەم هیچ ڕوولێنەرێکدا (قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ).[٢] بەم شێوەیەش جەخت کرایەوە لەسەر بەها چاکەکان کە دەوەستن دژی بێئومێدی و گاڵتەوگەپو هەستکردن بە مەینەتی ژیان، هەروەها هەڵدەستێت بە لابردنی ئەو دیمەنە تاریکانەی دەبنە مایەی دروستبوونی دڵتەنگیو ڕاڕای وەکو ڕەشبینی (الطيرة) و ترسان لە داهاتوو. هاوەڵێك پرسی لە پێغەمبەر ﷺ کەسانێك هەن لە ئێمە ڕەشبینن، ئەویش وەڵامی دایەوە: "ذاك شئ يجدونه في صدورهم فلا يصدنهم".[٣] ئەوە شتانێکە لەلای خۆیانەوە هەستی پێدەکەن، با بەرگریان نەکات لە راستیدا دیمەنە گەشبین و هێما ڕووناكو واتا چاکەکان ژیانو کۆبوونەوەی مرۆڤەکان جواندەکەنەوە لە ڕێگەی بلاوکردنەوەی ئاشتیو خۆشەویستیو بایەخدان بە جوانی رواڵەتو پاکوخاوێنیو بۆنخۆشی.

ئینجا بانگەوزای ئیسلامی جەخت دەکاتەوە لەسەر هاوبەرپەرسیارێتیو هاوکاری لە نێوان خەڵکدا، لە جێبەجێکردنی سەردانی خزمانەوە تا دەگاتە کۆمەڵگاو هاندانی بەخشندەی و لەخۆبوردنو پاراستنی مافی دراوسێ، هەروەها کاتێك کە خەڵکی دەست لە پارەکانیان هەڵدەگرن کە خۆشیاندەوێت لە ژێر دروشمی (الصدقة برهان)،[٤] واتە: صەدەقە کردن بەڵگەیە، واتە بەڵگەیەکی سەلمێنەرە لە چەشتنی شیرینی ئیمان.

١) (المائدة: ٣٢)

٢) (الزمر: ٥٣)

٣) مسلم: الصحيح ١: ٣٨٢ حديث رقم ٥٣٧، وأبوداود: السنن ١: ٢٤٤ـ ٢٤٥.

٤) مسلم: الصحيح ١: ٣٠٣.

لە هەمان کاتدا بانگەوازی ئیسلامی جاڕیدا بۆ پاراستنی دارای کەسێتی، هانی ئەوەشی دا کە ماڵەکان هەمیشە دەستاو دەستیان پێبکرێت بۆ بەرهەمهێنان، بە فیڕۆبردنی سامانیشی قەدەغەکرد، تەنانەت لە لایەن خاوەنەکەیەوە بەکارهێنانی لێ قەدەغە (حجر) دەکات ئەگەر کەسێکی گەوجو گەمژە بێت، ئاکامی پارە بە فیڕۆدان نەزانێت، هەروەها سوو و قۆرخکردنیشی قەودەغە کرد، بۆ ئەوەی ماڵو سامان قەتیس نەبێت لەلای کەسێکی کەم (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ)[1].

ئینجا لە ڕاستیدا باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر هانی دروستبوونی گیانی جەربەزەیو جیهادو زانستو بازرگانی دروست بێتو پاڵنەریشە بۆ بەخشینو فیدارکاری بۆ دروستکردنی نەتەوەو بوونی شارستانی.

هەروەها بانگەوازی ئیسلامی گرنگیدا بە زانست وەکو پێویستیەك لەسەر هەموو موسڵمانێكو بەڵێنی پاداشتی گەورەشی داوە لەسەر فێربوونی، وشەی (علم) لە (٤٢٦) جێگە لە قورئاندا هاتووە، پلەوپایەی زانایانیشی بەرزکردۆتەوەو تا گەیاندوونی بە میراتگری پێغەمبەران،[2] هەروەها هەندێ بەهای رۆشنبیری بەرقەرار کرد کە پێشکەوتنی زانستی دەستەبەر دەکات، چونکە زانست مافی هەموانەو تەنها نەبەستراوە بە دەستەیەکی دیاریکراوەوە، بێگومان ئەوەش دەبێتە مایەی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری سەرانسەری میللەت، ئینجا زانست پێویستە جووت بێت لەگەڵ کردارو رەفتاردا، بەڵگەشە لەسەر یارمەتی خوا بۆ مرۆڤ "من یرد الله به خیراً یفقه في الدین". بۆ تێگەیشتنی ئاینیش پێویستە ئەو کەسە لە ژیانو تێڕوانینی رووداوەکانو کێشەکانی بکات بە پی واتاکانی ئیسلام کە هەمو لایەنەکانی ژیانی رێکخستووە، بۆیە هیچ سەیر نی یە ئەگەر موسڵمان بەرچاو روونی هەبێت بەرانبەر بوارەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریو هەستو چەشتنو بەهاکانی جوانی بەشێوەیەکی فراوانترو قووڵترو گشتگیرتر هەرکاتێك بەرچاو روونی لە ئاینەکەیدا زیاد بکات.

ئینجا زانست بەرپرسیاریەکی ئاینی لێدەکەوێتەوە، چونکە زانا لە رۆژی دوایدا پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی هەڵوێستی زانستی "لاتزول قدما عبد یوم القیامة حتی یسأل عن أربع خصال.. وعن

---

١) (الحشر: ٧)

٢) ابوداود: السنن ٣: ٣١٧، والترمذي: الجامع ٥: ٤٩، وابن ماجة: السنن ١: ٨١.

عمله ماذا عمل فيه".[1] واتە: یەکەم جار لە رۆژی قیامەتدا دەربارەی چوار خەسڵەت پرسیار لە مرۆڤ دەکرێت.. هەروەها دەربارەی زانستەکەی چۆن کاری پێکردووە. زانایانیش بەرپرسیارن لە بڵاوکردنەوەی زانستەکەی و نەشاردنەوەی: "من سئل عن علم فكتمه الجمه الله بلجام من نار يوم القيامة".[2]

زانست دەریایەکی بێ قەراغە، هەرگیز لە توانای کەسیشدا نی یە بە رەهای لی بگات، بۆیە پێویستە ئەو کەسە بەردەوام بێت لە فێربوونی بەبێ دابڕان، ئەم بەها رۆشنبیریانە بوون بە مایەی دروستبوونی بزووتنەوەیەکی فیکری بریقەدار، چونکە "فێربوونی بەردەوام" و "کەڵەکەبوونی زانست"و "کۆکردنەوەی زانست"و لێکۆڵینەوی بە شێوەیەکی بەردەوام، دیارترین تایبەتمەندیەکانی بزووتنەوەی فیکریە لە سەردەمانی زێڕینی ئیسلامی.

بانگەوازی ئیسلامیش راگیرکراوە لەسەر واتای ئەوەی کە بیروهۆشو ئازادی بیرکردنەوەی بناغەی داوا لێکردنە، داوای لە پێڕەوانیشی کردووە خەریکی گەڕانی سەربەست بن بە دوای بەڵگەو سەلماندندا، نکۆڵیشی لە لاسای کردنەوەی خەڵکانی تر کردووە، بۆیە لە ئیسلامدا شتێك سەری هەڵنەدا بەناوی کەهەنووت کە بانگەشەی ئەوە بکەن تەنهاو تەنها ئەوان لە ئیسلام تێگەیشتوونو مافی لێکدانەوەی دەقەکانیان هەیە، وەکو روویدا لە مێژووی ئاینەکانی رابوردوودا، بەڵکو لە توانای هەموو موسڵمانێکدا هەیە بگەڕێتەوە بۆ قورئانو سوننەتو کارامە بێت لە زانستەکانیاندا و دواتر سوودیان لێوەربگرێت، مشتومڕیش بکات لەگەڵ کەسەکاندا لە راستی بەڵگەو شێوازی بەڵگەهێنانەوە.

لە راستیدا تێڕوانین لە بنچینە فیکریەکانی بانگەوازی ئیسلامی، هەندێ بنەمای سەرەکی دەردەخات وەکو بەدیهینانی بەندایەتی بۆ خواو شکۆمەندیو سەربەستیو زانستو دادگەریو یەکسانیو راوێژ بۆ مرۆڤەکانو گوتاری ئیسلامی لە هەموو کاتو ساتێکدا ئاراستەی ئەوە کراوە.

---

١) أبو داود: السنن ٣: ٣٢٣، وابن ماجة: السنن ١: ٩٣.

٢) أبو داود: السنن ٣: ٣٢١، والترمذي: الجامع ٥: ٢٩.

## بەشی دووەم:

# بارو دۆخی جیهان - فتوحات

### باسی یەکەم:

### فەتحی عێراق و رۆژهەلات

### لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکری صدیق ((رەزای خوای لێبێت)):

هەردوو هۆزی شەیبانو سەدوس ـ لە نەوەی بەکری کوڕی وائیل ـ لە بەشی باشووری عێراق نیشتەجێ بوو بوون، موسەنناى کوڕی حاریسەی شەیبانیش سەرۆکی هۆزی شەیبان بوو جەنگی ناوچەکانی حیرەی پێدەکرێ، هەروەها قوتبەی کوڕی قەتادەی سەدوسی سەرۆکی هۆزی سەدوسی بوو، هێرشی پیان دەبردە سەر دەوروبەری ئەبوللە کە ئەو سەردەمە بەندەری سەرەکی عێراق بوو لەسەر کەنداوی عەرەب، ئەم بزوتنەوانە پەیوەندیان نەبوو بە مەدینەوە، بەڵکو سەربەخۆ بوون، هەربۆیە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) خالیدی کوڕی وەلیدو عەیازی کوڕی غەنەمی نارد بۆ عێراق بە مەبەستی سەرکردایەتی کردنی سوپاکان لەوێ. بە مەرجێك عەیاز فەتحی دەومەتولجەندەل بکات کە پەیمانیان لەگەڵ ئەبوبەکر شکاند بوو، دوای ئەوە ڕوو بکاتە حیرە، هەر کامێك لەو دوو سەرکردەیەش یەکەمجار گەیشتە حیرە سەرکردایەتی گشتیی عێراق دەگرێتە دەست.[1]

خالید لە پێشدا چووە عێراقو سوپاکەی موسەنناى خستە پاڵ خۆی، ئەمجا دەستیکرد بە ڕێکخستنی جووڵە سەربازیەکان، جا یەکەمین ڕووداو لە نێوان خالیدو فارسەکان لە ناوچەی حەفیر بوو لە نزیك کەنداوی عەرەب، لەم شەڕەدا خالید سەرکەوتە سەر هورموزی سەرکردەی فارس، ئەم جەنگە بە (ذات السلاسل) ناونرا، چونکە فارسەکان زنجیریان بەکارهێنا، هەروەها ناوی غەزای کازیمەی لێنرا بەهۆی لادیەکی نزیك بەو ناوە.[2]

لەم سەردەمەدا ئەردەشیر پادشای فارسەکان بوو سوپاکەی کۆکردەوە بە سەرکردایەتی قارن، خالیدیش ڕووبەڕووی بوویەوە لە ناوچەی (المذار)و شکاندنیو ژمارەیکی زۆری لیان کوشت،[3] لە

١) الطبري: تاريخ ٣: ٣٤٧ عن سيف بن عمر التميمي، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٩٥ـ ٢٩٦.

٢) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٤٨ـ ٣٤٩ عن سيف.

٣) الطبري: تاريخ ٣: ٣٥١ عن سيف.

پاش ئەم شەرە فارسەکان هەولّیاندا سوود وەرگرن لە هۆزە عەرەبەکان، بەتایبەتی هۆزی بەکری کوڕی وائیل، جا لە ناوچەی وەلجە کۆبوونەوەو ئەندەرزەغەزیش هاتە پالّیان کە سەرکردەیەکی نێرراو بوو لە لایەن ئەردەشیرەوە، خالید دووبارە توانی بیانبەزێنێتو پاشماوەکانیان کشانەوە بۆ ئوللەیس،[1] ئینجا عەرەب کۆبوونەوە بە سەرکردایەتی مالیکی کوڕی قەیسو فارسەکانیش کۆبوونەوە بە سەرکردایەتی بەهمەن جادەوەی، بەلاّم بەهمەن بەرەکانی جەنگی بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆ پایتەخت بە بۆنەی نەخۆشکەوتنی ئەردەشیرو مردنی، ئینجا جابانی لە جێگەی خۆی دیاریکرد بۆ سەرکردایەتی سوپاکە، خالید توانی عەرەبو فارسەکان پەرتەوازەکاتو جابان هەلّهاتو مالیکی کوڕی قەیسیش کوژرا.[2]

ئینجا خالید بە پەلە چوو بۆ ئەمغیشیاو رووخاندی و وێرانی کرد،[3] فارسەکان لەم کاتەدا سەرقالّی پەشێوی سەرا بوون لە دوای مردنی ئەردەشیر کە لە پاش ئەو ژمارەیەك لە شازادەی پیاو ژن هاتنە سەر تەخت، خالید سوودی لەم بارودۆخە وەرگرتو روویکردە حیرەی پایتەختی عێراقی عەرەبی لە ئەمغیشیاوە بە کەشتی، بەلاّم ئازادبەی فەرمانڕەوای حیرەی فارسی پردەکانی فوراتی هەموو داخست بۆ رێگرتن لە کەشتیەکان، بەلاّم خالید هەموو ئەوانەی بەهێز کردەوەو ئابلّوقەی حیرەی دا، دانیشتووە عەرەبەکانی خۆیان قایمکردو بەرگریانکرد و ئازادبە هەلّهات، لە پاش ئابلّوقەیەکی سەخت خالید رێککەوت لەگەلّ دانیشتوانی حیرە لەسەر پێدانی سەرانە، ئینجا خالید حیرەی کرد بە سەربازگە بۆ سوپاکەی، چەند هەلّمەتێکیشی نارد بۆ دەوروبەری حیرە بۆ جێگیرکردنی ئاسایش تیایدا، دوای ئەوە دەرەبەگو گەورە بازرگانەکان لەگەلّ خالید رێککەوتننامەیان کرد.

لە پاش فەتحی حیرە خالید رووی کردە ئەمبارو ئابلّوقەی دا، کە دەوردرابوو بە کەندڕ، ئەویش وشترەکانی نارد بۆ پەڕینەوەی، بەلاّم شێرزدا کە فەرمانڕەوای فارسەکان بوو لەگەلّ خالید صولّحی کرد بە مەرجێك رێگەی بدات خۆی دەربچێت،[4] دوای ئەوە خالید روویکردە عەینوتتەمر لە دەوروبەری سارای شام، لەوێ هۆزەکانی تەغلیبو نەمرو ئەیادو فارسەکان بەسەرکردایەتی مەهرانی

---

١) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٥٣.

٢) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٥٥، عن سيف، والبلاذري: فتوح البلدان ٢٩٧، ٣٠٠ بە کورتی.

٣) الطبري: تاريخ ٣: ٣٥٨ عن سيف.

٤) الطبري: تاريخ ٣: ٣٧٣ عن يوسف.

کوڕی بەهرام، ئیتر خالید ئابلۆقەی دان تا هێنایانی بە چۆکدا، ئەوسا جەنگاوەرەکانی کوشتەو ماڵەکانیانی بە غەنیمەت دەستکەوت.[1]

بەڵام عەیازی کوڕی غەنەم بۆ ماوەی یەکساڵی تەواو نەیتوانی سەرکەوێتە سەر دوژمنەکانی لە هۆزەکانی کەلبو بەهراو غەسسان کە لە دەومەتولجەندەلەوە هاتبوون پاش تێکشکانی لەسەر دەستی خالیدی کوڕی وەلید، سەرکردەی خەڵکی دەومەیش ناوی ئوکەیدەری کوڕی عەبدولمەلیکی کیندی بوو، کاتێك ئاگادار بوو لە نیازی خالید کە بگاتە هانای عەیازەوە تۆقیو ورەی نەما، دەشگێڕنەوە کە هەڵهاتووە پێش دەستپێکردنی شەڕەکە، سەبارەت بە هۆزە عەرەبەکان لە دەرەوەی قەڵاکە شەڕیان کرد لەگەڵ موسڵماناندا، دوایی هەڵهاتن بۆ قەڵاکە جارێکی تر، بەڵام بە هێز چووە ناو ئەو جێگەوەو جەنگاوەرەکانی کوشت، لە ڕاستیدا دەومە کلیلی وڵاتی شامو عێراق بوو، بۆیە موسڵمانەکان زۆر سووربوون لەسەر دەست بەسەراگرتنی.[2]

عەرەبو فارسەکان دەرچوونی خالیدیان لە حیرە قۆستەوەو شۆڕشیان کرد، جا کاتێك خالید گەڕایەوە ملکەچی کردن و لە پڕدا هەڵیکوتایە سەر هۆزەکانی تەغلیب، ئینجا قەعقاعی نارد بۆ ناوچەی حەصید کە بوو بوو بە مۆڵگای هەڵهاتووەکانی حیرە بە عەرەبو فارسەوەو تێکیشکاندن،[3] پاشماوەیان چوون بۆ خەڵکنشینی حەنافیس، بەڵام موسڵمانان پیانگەیشتنو ئەو شارەشیان فەتحکرد، هەروەها خالید لە پڕدا چووە سەر هۆزەکانی هوزەیل لە موصەیخ، بەمشێوەیەش دەسەڵاتی موسڵمانانی گێڕایەوە بۆ سەرانسەری عێراقی عەرەبی،[4] دوای ئەوە خالید ڕوویکردە فیراز لە سنوورەکانی عێراقو شامو جەزیرە، لەوێ عەرەبو فارسو ڕۆمەکانی لێکۆبوونەوە و جەنگی لەگەڵیان کردو سەرکەوتە سەریان،[5] دوای گەڕایەوە بۆ حیرەو فەرمانی ئەبوبەکری بۆ هات کە نیوەی سوپاکە ببات بەرەو شام بۆ یارمەتیدانی موسڵمانان لە دژی ڕۆمەکان، موسەنناش لەسەر نیوەی تری سوپاکە مایەوە لە عێراق.[6]

---

١) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٧٦ عن سيف.

٢) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٧٨ عن سيف.

٣) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٨٠.

٤) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٨١.

٥) هەمان سەرچاوە ٣: ٣٨٣.

٦) هەمان سەرچاوە ٣: ٤٠٨، ٤١٥ـ ٤١٧.

**چەند تێبینیەك:**

١ـ ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت) هیچ کەسێکی لە پاشگەزبووەکان لە ئیسلام بەشدار نەکرد لە فتوحاتدا، بەڵکو ڕووتیکردنەوە لە چەکەکانیان، چونکە دڵنیا نەبوو لیان بە هۆی تازەی پەیوەندیان بە ئیسلامەوە، هەروەها وەکو سزایەك بۆیانو دەربڕینی پێویستی نەبوون پیان، ئینجا ئەبوبەکر نەیدەویست کە ئەوانە ببنە پێشەنگی فەتحی ئیسلامی، چونکە ناتوانن ببنە نموونەیەکی چاك بۆ سەربازی موسڵمان.

٢ـ فاتیحەکان جێگیر نەدەبوون لەو ناوچانەی بۆی دەچوون، بەڵکو خەڵکەکە ـ بە تایبەتی عەرەبە گاورەکان ـ هەمیشە شۆڕشیان دەکرد دژیان، تەنانەت حیرە سێ جار فەتح کراوە، ئەمەیش هۆکاری گۆڕینی مەرجەکانی ڕێککەوتن ڕوون دەکاتەوە بۆ چەندەها جار لە ناوچەی سەواد.

٣ـ هەموو شەڕەکان لە ناوچەکانی عێراقی عەرەبەکان ڕوویدەدا .[١]

١) شكري فيصل: حركة الفتح الاسلامي ٦٢ـ ٦٩.

**لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب ((ڕەزای خوای لێبێت)):**

لە دوای دەرچوونی خالیدی کوڕی وەلید لە عێراقەوە بەرەو شام، موسەننا ناچار بوو بکشێتەوە لەناوچە فەتحکراوەکە بەرەو بیابان، چونکە بەرەنگاری فارسەکانی پێنەدەکرا بەهێزێکی کەمەوە، هەروەها لەبەر مەترسی ڕاپەڕینی دانیشتوانی شارەکان، بۆیە حیرەی بەجێهێشت بەرەو ناوچەی خەففان لە بیابیان دوای هەندێك شپرزەی دروست بوو لە سەرای ساسانیەکان، لە ماوەی چوار ساڵدا نۆ شازادە هاتنە سەر تەختی حوکم، پەشێوی زۆر ئەو کاتە دروست بوو کە شیرەوەی هەستا بە کوشتنی کیسرای پەروێزی باوکی، دوای ئەوە شیرەوەی خۆیشی کوژرا، لە پاش هاتنی چەندین شازادە، شەهریرانی کوڕی ئەردەشیر هاتە سەر حوکم، لە پاش مردنی دەخت زنانی خوشکی هاتە سەر حوکم، بەڵام دواتر لابراو ساسوری کوڕی شەهریران هات، لە پاش کوژرانی ئەویش ئازەرمیدەختی کچی کیسرا لەسەر تەخت دانیشت، بەڵام بۆرانی کچی کیسرا توانی میدەخت لابداتو خۆی بێتە سەر تەختی حوکمڕانی، هەروەها ڕۆستەمی مێردی سەربەست کرد لە دەستکاریکردنی کاروباری دەوڵەتو سوپا.[1]

ڕۆستەم دەستیکرد بە بەرگری دژ بە موسڵمانان، لەم کاتەدا موسەننا داوای لە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) کرد، عومەریش هەڵسا بە ناردنی ئەبوعوبیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی لەگەڵ دە هەزار جەنگاوەردا، کاتێك گەیشتە عێراق ڕۆستەم هانی سەرگەورەکانی سەوادی دابوو ئەوانیش دژ بە موسڵمانان ڕاپەڕیبون، هەروەها سێ سوپای ئامادەکرد، یەکێکیان بە سەرکردایەتی جابانو ئەویتریان بە سەرکردایەتی نەرسو سێ یەمیشیان بە سەرکردایەتی جالینوس، ئەبوعوبیدە توانی هەرسێ سوپاکە ببەزێنێت لە نزیك حیرە و کەسکەرو سەقاتیە بە دوای یەکدا، دووبارە سوادیشی داگیرکردەوەو ڕێککەوتننامەی لەگەڵ سەرگەورەکانیان کرد.[2]

تێکشانەکانی فارسەکان هانی ڕۆستەمی دا بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی گەورە بە سەرکردایەتی بەهمەن جادەوەی ناسراو بە برۆدار (ذي الحاجب) و بەیارمەتی جالینوس، هەروەها فیلیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بەیداخی کیسرایش، (درفش کابیان) هەردوو سوپاکە بەیەکگەیشتن لە (قس الناطق) لە تەنیشتی فورات، فارسەکان ئەبوعوبیدەیان سەربەست کرد لەوەی بپەڕێتەوە بۆ لایان،

---

١) الطبري: تاريخ ٣: ٤١٣ـ ٤١٤، ٤١٧.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٤٥٠ـ ٤٥٣.

یان ئەوان بپەڕنەوە بۆ لای موسڵمانان، بەڵام پەڕینەوەی موسڵمانانی هەڵبژارد بۆ ئەوبەری فورات لەبەرئەوەی وا دەرنەکەوێت ئەوان بوێرترو چاونەترسترن لە موسڵمانان، بەڵام بەو کارە چەندین تاینەتمەندیان لە دەست دا، بیابانیان لە پشتەوە بوو، بە پەڕینەوەیان ڕوبارەکەیان کەوتە پشت، پێشتر لە جێگایەکی ڕاستایدا بوون، کەوتنە ناو گژو گیا و قەڕەم، لە سەرەتای شەڕەکە موسڵمانان زاڵبوون، بەڵام فیل ئەسپی موسڵمانانی تۆقاندو لە ئەبوعوبەیدەشی داو کوشتی، ئەوجا موسڵمانان هەڵهاتن، لەو کاتە یەکێکیان هەڵسا بە بڕینی پردەکە بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لە هەڵهاتنی موسڵمانان، بەڵام کارەکەی هەڵە بوو، زیانی موسڵمانانیشی پێ زیادبوو، تاکو گەیشتە چوار هەزار کەس لە نێوان کوژراوو خنکاودا، بەڵام دوای پردەکەیان چاککردەوەو موسڵمانان جارێکی تر پەڕینەوە، تێکشکانەکە زۆر قورس بوو، تەنانەت هەندێ لە سوپاکە هەر نەگەڕانەوە بۆ مەدینە لە شەرمداو هەر لە بیابان مانەوە.[1]

موسڵمانان ناچاربوون تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت دەستی کرد بە کۆکردەنەوەی سوپا بۆ ئەم مەبەستە، هەندێ لە موسڵمانانیش قورس بوو بەلایانەوە بچن بۆ عێراقو حەزیان دەکرد بچن بۆ شام، تەنانەت عومەر هەڵسا بە ناردنی هۆزی بوجەیلە بە زۆر بۆ عێراق بە سەرکردایەتی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیو قەرەبوکردنەوە بە چواریەکی پێنج یەکی دەستکەوتەکان، هەروەها عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕێگایدا بە پاشگەزبووەکان بەشداری بکەن لە فتوحاتو فریای خستن بە موسەننا کە سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی کردو بە فارسەکان گەیشت لەلای بوەیب لەئەودیوی کووفەی ئەمڕۆ، ئەوان بە سەرکردایەتی موهران بوون، موسەننا توانی ئابلۆقەیان بداتو سەرکەوێتە سەریانو موهرانیشی کوشت.[2] هەروەها وەدووی هەڵهاتووەکان کەوت، بەم شێوەیەش موسڵمانان ورەیان بەرزبوویەوە و جارێکی تر سەوادیان بەزاند، لەم جەنگەدا هەندێك لە هۆزە عەرەبەکانو گاورەکانی هۆزەکانی نەمرو تەغلیب بەشداریان کرد لەگەڵ موسڵمانان دژ بە فارسەکان، لە پاش جەنگی بوەیب فارسەکان زیاتر هەستیان بە ترس کرد و کۆبوونەوە لە ژێر سەرکردایەتی یەزدی گوردی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرا، کە هەڵسا بە ئەنجامدانی ئەرکەکەیو تواناکانی کۆکردەوە، موسەننا دەرکی کرد بە ترسناکی بارودۆخەکە، بۆیە

١) الطبري: تاريخ ٣: ٤٥٤ـ ٤٥٩ عن سيف.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٤٦٠ـ ٤٧٢، عن سيف وابن اسحق.

کشایەوە بۆ (ذي قار)و چاوەڕی گەیشتنی کۆمەکی مەدینەی دەکرد، لەم کاتەدا فارسەکان هەڵسان بە سەربازگری گشتییو دابەشکردنی کۆمەڵەکان بە سەر سەرانسەری ئەو شوێنانەی موسڵمانان داگیریان کردبوو، دانیشتوانیشیان وروژاند دژ بە موسڵمانانو هەڵسان بە شکاندنی پەیمانەکانیان.

**قادسیە (١٥ك):**

لە لایەن موسڵمانانیشەوە موسەننا هەڵسا بە هاندانی هۆزە عەرەبەکان بۆ شەڕکردن دژ بە فارسەکان، عومەریش (رەزای خوای لێبێت) هێزی ڕەوانە کرد لە مەدینەوەو ویستی خۆی سەرکردایەتی بکات، بەڵام هاوەڵان ئامۆژگاریان کرد لە مەدینە بمێنێتەوەو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص سەرکردایەتی سوپاکەی کرد، دەگێڕنەوە کە ژمارەی سوپاکەی لەگەڵ ئەوانەی کە لە ڕێگە هاتنە پاڵیان گەیشتە بیست هەزار جەنگاوەر، کاتێك گەیشتە عێراق موسەننا شەهید بوو بوو بەکاریگەری برینەکانی کە تووشی بوو لە شەڕدا، ئیتر سەعد سوپاکەی موسەننا کە هەشت هەزار کەس بوو خستیە پاڵ سوپاکەی خۆی، ئەمجا عومەر رەزای خوای لێبێت فەرمانی کرد بە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح سەرکردەی سوپا لە شام، سوپاکەی خالیدی کوڕی وەلیدی بۆ بنێرێت کە پێش شەڕی یەرمووك لە عێراق کشاندیەوە، ئەوانیش هەشت هەزار کەس بوون بە سەرکردایەتی هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاص، سەبارەت بە فارسەکان ژمارەیان بە پی هەندێ ریوایەت گەیشتە (١٢٠٠٠٠) جەنگاوەر، لەگەڵ (٣٣) فیل، بە سەرکردایەتی ڕۆستەم گەورەی سەرکردەکانی فارس، سەرەتا سازش دەستی پێکرد، ئەوجا نێرراوە موسڵمانەکان کە موغیرەی کوڕی شوعبەو نوعمانی کوڕی موقەڕینیان تێدا بوو ئامانجی موسڵمانیان ڕوونکردەوە بۆ ڕۆستەم کە وایدەزانی مەسەلەکە بە پارە چارەسەر دەکرێت، لەدوای ئەوە دەستاری شەڕ کە خولایەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژان، ناوی ڕۆژەکانیش ئەرەماس و ئەغواس و عەمەواس شەوەکانیشی ناویان هەدئەو سەوادو هەریر بوو کە ئەمەیان سەختترینیان بوو، موسڵمانان سوودیان لە شکستی پردەکە وەرگرتبوو، بۆیە توانیان خۆیان قوتار بکەن لە فیلەکان بە هۆی تیرهاویشتن بۆ ناو چاویان و فیلەکان هەڵهاتن و ڕۆستەم کوژراو فارسەکان هەڵهاتنو موسڵمانانیش شەش هەزار کەسیان لێ کوژرا.

ناکۆکی هەیە لە دیاریکردنیساڵی ئەم ڕووداوە لە نێوان ١٤و ١٥و ١٦ی کۆچیدا، بەڵام پەسەند ئەوەیە کە لە ساڵی ١٥ی کۆچیدا بووە لە پاش جەنگی یەرمووك، و دیمەشقو فەحل.[١]

١) الطبري: تاريخ ٣: ٤٧٧ـ ٥٩٠.

**مەدائین:**

لە دوای شەڕی قادسیە موسڵمانان بەرەو مەدائین بەڕێککەوتن، پاش ئەوەی بابلو بەهرەسیریان تێکشکاندو یەزدەجەردیش لە مەدائینەوە هەڵهات بۆ حەلوانو بەشێکی لە سوپاکەی لەوێ بەجێهێشت، موسڵمانان خۆیانخزانە ڕووباری دیجلەوەو بە بوێریەکی کەم وێنەوە، فارسەکانیش بەرگریان پێنەکرا، سوپاکەش ڕازی نەبوون سەرانە بدەن، ئەمجا موسڵمانان چوونە ناو کۆشکی سپی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنی پێدابوون فەتحی بکەن.[1]

**جەلەولا (١٦ك):**

یەزدی گورد لە حەلوانەوە دەستی کرد بە ڕێکخستنی بەرگریو کەوتەڕێ بەرەو مەدائین، بەڵام سەعد هەڵسا بە ناردنی هاشمی کوڕی عوتبە لەگەڵ سوپاکەیدا، لەگەڵ فارسەکان یەکیان گرتو تێکی شکاندنو حولوانی فەتحکرد لە شەڕی جەلەولا، ئەو کەوتنەش سەرەتا بوو بۆ ڕووخانی هێڵە یەکەمەکانی بەرگری فارسی، لەپاش شەڕی جەلەولا سەرکردەکان و بازرگانە گەورەکانی سەواد هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) لە جێگەکانی خۆیان هێشتنیەوەو سەرانەی لەسەریان هەڵگرت.[2]

**تکریت:**

لە دوای جەلەولا سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص سوپایەکی نارد بۆ فەتحکردنی تکریت کە بریتی بوو لە پێنج هەزار جەنگاوەر بە سەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی موعەتتیم، ئیتر شەڕیان کرد لەگەڵ ڕۆمەکان کە دەسەڵاتدار بوون لەوێ، لە پاش چل ڕۆژ ئابڵۆقەدان تکریت کەوتە دەستی موسڵمانان، ئینجا ئیبنولموعەتتیم ڕەبعی کوڕی ئەفکەلی عەنزی نارد بۆ موصڵ، ئەویش لەگەڵ خەڵکەکەی ڕێککەوت لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن.[3]

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤: ٦ـ ٢٤.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤: ٢٤ـ ٣٤.

٣) الطبري: تاريخ ٤: ٣٥ـ ٣٧.

### دروستكردنی كووفە (١٧ ك):

عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) داوای كرد سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص دوورنەكەوێتەوە بەرەو وڵاتی فارس، بەڵكو هەڵسێت بە دروستكردنی شارێك بۆ موسڵمانان، چونكە كەش و هەوای مەدائینیان پێ ناڕەحەتە، لەوانەشە عومەر مەترسی بووبێت لەوەی خوو بەو جێگایەوە بگرن و فێری خۆشگوزەرانی بن، ئیتر سەعد كووفەی دروست كرد كە ئاو داینابڕێت لە بیابان، بۆ ئەوەی ببێتە بارەگای سوپای ئیسلام لە عێراق.[1]

### دروستكردنی بەصرە (١٦ك یان ١٧ ك):

هەر لەو كاتانەدا عوتبەی كوڕی غەزوان بەصرەی دروستكرد لە ناوچەی ئەبوللە كە عوتبەی كوڕی غەزوان لە ساڵی ١٤ ك فەتیحكرد، ئەوكاتەی عومەر ئاڕاستەی كرد بەرەو غەزای باشوور لە هەمان كاتدا كە سەعدی كوڕی ئەبوو وەققاصی ئاڕاستە كرد بەرەو قادسیە.[2] جا عوتبە فەتحی ئەبوللەی كرد كە بەندەرێكی گەورەی كەشتی بوو لە ئاكامی جەنگێكدا لەگەڵ فارسەكان، ئەمجا هەڵسا بە دروستكردنی بەصرە، بەم شێوەیەش كووفەو بەصرە بوون بە دوو بنكەی سەرەكی بۆ لێوەدەرچوونی سوپاكانی ئیسلام بۆ فەتحكردنی ڕۆژهەڵات، هەروەها ئۆقرەگرتن و جێگیربوون بوو بە مۆركی فتوحات لەسەردەمی خیلافەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت).

لە ڕاستیدا زۆربەی عێراق بەزۆر فەتحكرا، چەندین جاریش خەڵكەكەی پەیمانەكانیان دەشكاند، بۆیە پەیمانەكانی فەتح و مەرجەكانی صولح چەندین جار دەگۆڕدرا، یەكێك لە شوێنەوارەكانی فەتحكردن بەهێز ئەوە بوو كە موسڵمانان زەویەكانی ئەو دەڤەرەیان لێوەردەگرتن، بەڵام وێڕای ئەوەش موسڵمانان هێشتیان بەزیوەكان لەناو زەویەكانیان بمێننەوە بە مەرجێك خەراجەكەی بدەن، یەكێك لە سوودەكانی ئەم بەجێهێنانە ئەوەبوو جەنگاوەرەكان نەبن بە جوتیار، هەروەها بەستنەوەی جوتیارەكۆنەكان بە زەویەكانیان و خۆشەویستیان بۆ ناوچەكەیان، گەشەكردنی كشتوكاڵ یارمەتیدەر بوو بۆ ئەو مەسەلە، لە توانای فاتحەكانیشدا نەبوو، دەستبكەن بە بەرهەمهێنانی زەوی بەهۆی كەمی شارەزایان، سەبارەت بە هەڵوێستی دانیشتوانیش ئەوان بەرگریەكی توندیان كرد لە عەرەبە

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤: ٤٠ـ ٤٨.

٢) هەمان سەرچاوە ٣: ٥٩٠ـ ٥٩٥.

گەیشتووەکان، بەتایبەتی گاورەکانی بەکری کوڕی وائیل، جوتیارەکانیش یارمەتی فاتیحەکانیان دا، چونکە زەویەکانیان بەدەستیانەوە هێشتەوە، بەلاّم سەربازەکانی خەلّکی سەواد بەرگریەکی زۆر توندیان کرد، چونکە ئەوان پەیوەست بوون بە دەولّەتەوە، سەبارەت بە سەرگەورەو سەربازەکان، ئەوان لەگەلّ سەرکەوتوودا بوون، کاتێك بینیان موسلّمانان زالّبوون ئیسلامەتی خۆیانیان راگەیاندو لەسەر هەمان کارەکانی پێشوویان مانەوە، سەبارەت بە موسلّمان بوونی دانیشتوان زۆربەیان هاتن بە دەم ئاینی ئیسلامەوە و سەرگەورەکانیش بە هەمان شێوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانیان بپارێزن، هەندێ لە هۆزە عەرەبەکانیش موسلّمان بوون وەکو رەبیعە، بەلاّم هۆزی بەکری کوڕی وائیل لەسەر گاوری خۆیان مانەوە، هەندێ لە فارسەکانیش موسلّمان بوونو بەشداریان کرد لەگەلّ موسلّمانان لە شەڕی قادسیە، بەلاّم ژمارەیان کەم بوو.[1]

ئینجا لە ئاکامی بە دوو کەوتنی موسلّمانان بۆ پاشماوەی فارسەکان بە پێی پلانی عومەر (رەزای خوای لێبێت) هەندێك لە سەرکردەکانیان وەکو هورموزانو یەزدی گورد توانیان دووبارە سوپا رێکخەنەوەو وابزانن کە لە ترساندا بە دوایاننەکەوتوون، کۆبونەوەی فارسەکان لە دوو شوێن دەستی پێکرد نەهاوەند، بەسەرکردایەتیو کۆکردنەوەی سوپا لە لایەن یەزدی گوردەوەو، ئەهواز بە سەرکردایەتی هورموزان کە لە جەنگی قادسیە هەلّهاتبوو.

ئینجا بە هۆی نزیکی ئەهواز لە بەصرەوە، فارسەکان دەستیان کرد بە یەخەگرتنی موسلّمانان لەوێ، جا با تۆزێك بگەڕین بە دواوە، تا بارودۆخی بەصرەو پەیوەندی بە ئەهوازەوە دەرکەوێت بۆمان.

عوتبە وەفاتی کردبوو بۆیە عومەر سەرکردایەتی دابووە دەست موغیرەی کوڕی شوعبە، کە ئەو توانیبووی سەرکەوێتە سەر دانیشتوانی ئەهواز و رێککەوتننامەیان لەگەل مۆر بکات لەسەر سەرانەدان.

دوای ئەوە عومەر (رەزای خوای لێبێت) موغیرەی لابرد لە ئەنجامی ئاژاوەنانەوەی هەندێك لە خەلّکی بەصرە و تۆمەتبارکردنیان بۆ موغیرە کە زینای کردووە، تۆمەتەکەشیان نەسەلمێنرا، بەلاّم عومەر ئەبوموسای ئەشعەری کرد بە فەرمانڕەوای بەصرە، لە ڕێگەی رۆشتنی ئەبوموسا بۆ بەصرە فارسەکان شۆڕشیان کرد لە ئەهوازو بڕیاریاندا سەرانە نەدەن، ئەوە تەماعی فارسەکانی زیاتر کرد

١) شكري فيصل: حركة الفتح الاسلامي ١٠٠ـ ١٠٥.

هەرەسهێنانی ئەو جەربەزەیەی عەلای حەزرەمی پی هەڵسا کاتێك کە لەگەڵ موسڵمانان لە بەحرێنەوە بە کەشتی ڕوویان کردە هەرێمی فارس بەرەو ئیستەخری پایتەختی ئەو هەرێمە، جا فارسەکان رێگای گەڕانەوەیان لێبڕی، ئیتر هێزەکانی بەصرەو کوفە عەلای حەزرەمیان قوتار کردو دوایی ئەو لەسەر بەحرێن لابرا.

**فەتحی ئەهواز:**

کاتێك ئەبوموسا ئاگاداربوو لە یەخەگرتنەکانی فارسەکانو تەماعکردنیان، هێزەکانی بەرەو ئەهواز بەرێخستو فەتحی ئەهوازیان کرد دوای ئەوەی کە پێش ئەوە فەتحی مەنازیرو روباری تیریان کردبوو، هورموزانیش لە ئەهوازەوە هەڵهات، بۆ ڕامهورموز، ئینجا لەوێش فارسەکان گردبوونەوە بە دەوریدا بە هاندانی یەزدی گورد بۆیە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص داوای کرد لە نوعمانی کوڕی موقەڕین لە کووفەوە بڕوات. بۆ رامهورموز.[1]

**فەتحی رامهورموز:**

هەروەها داوایکرد لە ئەبوموسای ئەشعەری سوهەیلی کوڕی عەدی بنێرێت بۆ رامهورموز، بەلاَم نوعمان توانی فەتحی رامهورموز بکات تەنانەت پێش گەیشتنی سوهەیل.[2]

**فەتحی توستور:**

هورمەزان هەڵهات بەرەو توستور، نوعمانو سوهەیلیش بەدوویکەوتنو ئابڵوقەی توستووریان دا، بەڵام لەبەر زۆری سوپاکانی هورموزان و قەڵاکانی، موسڵمانان نەیانتوانی فەتحی بکەن تاکو هێزێکی زۆر لە بەصرەوە بە سەرکردایەتی ئەبوموسای ئەشعەری گەیشتە لایان، هەروەها هێزێکی تریش لە کووفەوە بە سەرکردایەتی فەرمانڕەواکەی عەمماری کوڕی یاسر، شەڕێکی سەختیش هەڵگیرسا لە دەرەوەی توستور، کە پایتەختی خوزستان بوو، لە بەهێزترین شارەکانیش بوو، فارسەکان ناچاربون پەنا ببنە قەڵاکانیان، پیاوێکیش خەڵکی توستور بوو رێنموونی موسڵمانانی کرد بۆ دەروازەیەکی ئاویی بۆ ناو شارەکە، ئیتر بە شەو (٢٤٠) جەنگاوەری لێوەرۆیشتو دەرگاکانی شاریان کردەوەو موسڵمانان چوونە ژوورەوە، بەڵام هورموزان مانی گرت لە قەڵاکەی،

١) الطبري: تاريخ ٤: ٧٢ـ ٧٦.

٢) هەمان سەرچاوە ٤: ٨٣.

دواتر خۆی دا بە دەستەوە بە مەرجێك بدرێت بە دەستی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت)و خۆی دەربارەی بڕیار بدات، ئەوجا شار لە بەرگری کەوت.[1]

**فەتحی سووس و جوندیسابوور:**

دوای ئەوە موسڵمانان ڕوویانکردە سووس‌و ئابڵوقەیان دا تا هێزیان لێپساو ڕێککەوتننامەیان لەگەڵیان کرد، سیای ئەسواریش موسڵمان بوو بە مەرجێك خۆی‌و سوپاکەی بچن بۆ (أشراف العطاء)، ئینجا جوندیسابوور ڕێککەوتننامەی ئاشتیان لەگەڵ موسڵمانان کردو بەم شێوەیەش هەرێمی فارس بەجارێك ملکەچی موسڵمانان بوو.[2]

**نەهاوەند ( ٢١ ك ):**

بەڵام یەزدی گورد بەردەوام هەر سوپای کۆدەکردەوە لە نەهاوەند، لە زۆربەی دەڤەرەکان بە سەرکردایەتی فەیرەزان، تەنانەت دەگێڕنەوە کە ژمارەی سوپاکەی گەیشتە (١٥٠٠٠٠) جەنگاوەر، ئینجا بۆچوونی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) گۆڕا لە قەدەغەکردنی قووڵبوونەوە بەرەو ناو خاکی ئێران لە دوای ئەوەی کە ئەحنەف مەسەلەکەی بۆ ڕوونکردەوە، ئەوەی باسکرد کە فارسەکان بەردەوام دەبن لە بەرگریدا تاکو یەزدی گورد لە ژیاندا بێت، خەریکیش بوو عومەر خۆی ڕوو بکاتە عێراق بۆ سەرکردایەتی سوپاکە، بەڵام هاوەڵان ئامۆژگاریان کرد هەنگاوی وانەنێت، ئیتر ئەویش نوعمانی کوڕی موقەڕین و دواتر حوزەیفەی کوڕی یەمانی کرد بە سەرکردەی سوپاکە، دەشگێڕنەوە کە سوپای موسڵمانان ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠٠٠) جەنگاوەر، ئینجا نەهاوەند زۆر قایم‌و بەهێز بوو، فورسەکانیش لەوێوە دەردەچوون بۆ جەنگی موسڵمانان، دووبارە دەشگەڕانەوە بۆ خۆپاراستن لە قەڵاکانی بۆیە موسڵمانان زاڵنەدەبوونە سەریان تا ئەو کاتەی توانیان لەوێ دووریان بخەنەوە، ئەوجا شەڕیان لەگەڵیان کردو تێکیانشکاندن، فەیرەزان کوژرا، نوعمانیش شەهید بوو، موسڵمانانیش نەهاوەندیان فەتحکردو ناویان نا (فتح الفتوح)، ئیدی داوی ئەوە فارسەکان جارێکی تر سەریان بەرز نەکردەوە. لە ئاکامدا هەمەدان‌و دەبنەوەرو سیروان‌و صەیمەرو ماهیش هەموویان ملیانداو ڕێککەوتننامەیان لەگەڵ موسڵماناندا نووسی.[3]

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ٧٧ـ ٨٣.

٢) هەمان سەرچاوە ٤: ٨٩ـ ٩٤.

٣) الطبري: تاريخ ٤: ١١٤ـ ١٣٩، ١٤٢ـ ١٤٣.

پلانەکەی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بریتی بوو لەوەی لە پاش نەهاوەند یەکسەر بچنە ناو قوولای خاکی ئێران بۆ ئەوەی فارسەکان فریا نەکەون خۆیان گردکەنەوە، بۆیە بە دەستی خۆی بەیداخی حەوت سوپای بەستو ناردنی، یەکەمیان بۆ خۆراسان بە سەرکردایەتی ئەحنەفی کوڕی قەیس، دووەمیان بۆ ئەردەشێرو سابوور بەسەرکردایەتی موجاشیعی کوڕی مەسعوودی سولەمی، سێ یەم بۆ ئیستەخر بەسەرکردایەتی عوسمانی کوڕی ئەبوعاصی سەقەفی، چوارەم بۆ درابجورد بە سەرکردایەتی ساریەی کوڕی زونەیمی کینانی، پێنجەم بۆ کرمان بە سەرکردایەتی سوهەیلی کوڕی عەدی، شەشەم بۆ سەجستان بە سەرکردایەتی عاصیمی کوڕی عەمر، حەوتەمیش بۆ مەکران بە سەرکردایەتی حەکەمی کوڕی عەمری تەعلیبی.

**فەتحی ئەصفەهان :**

عومەر هەستا بە ئاڕاستەکردنی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبان بۆ ئەصفەهان، لە دوای شەڕێکی سەخت لە دەرەوەی شارەکە، ئەصفەهان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە سەرانە بدەن، هەندێك ڕیوایەت ئەوە ئاشکرا دەکەن کە بەشێك لە ئەصفەهان لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەوە فەتحکراوە، بەڵام بەشەکەی تری بەشەڕ فەتکراوە، جا بە پی ئەوەی ئەبوشەیخی ئەنصاری دەیگێڕێتەوە شاری جەی لە ئەصفەهان بەبێ جەنگ فەتحکراوە، بەڵام (شق التیمرة) و ڕوستاق و شەیخ و ڕوستاق بوحوار و روستاق جورم قاشان لە ڕێگەی جەنگەوە موسڵمانان چوونەتە ژوورەوە.[1]

**دووبارە فەتحکردنەوەی هەمەدان:**

پاش ماوەیەك هەمەدان صوڵحەکەیان هەڵوەشاندەوە، ئیتر نوعەیمی کوڕی موقەڕین دوبارە بە صوڵح فەتیحکردەوە، سوپای هەرێمەکانی باکوور کۆبوونەوە لە دەیلەمو خەڵکی ڕەیو ئازەربایجان بە سەرکردایەتی ئەسفەندیاری ڕازی برای ڕۆستەمی سەرکردەی قادسیە، بەڵام نوعەیم هەموویانی بەزاند لە واج ڕەوزدا.[2]

**فەتحکردنی ڕەی:**

پاشماوەی ئەو سوپایانە جارێکی تر خۆیان گردکردەوە لە شاری ڕەی بە سەرکردایەتی پادشاکەی سیاوەخش، ڕەی پایتەختی بەهێزی باکوور بوو، یارمەتیشیان پێدەگەیشت لە خەڵکی دەنباوەندو

١) الطبري: تاريخ ٤: ١٣٩ـ ١٤١، وابو الشيخ: طبقات ١٨٩.

٢) الطبري: تأريخ ٤: ١٤٦ ـ ١٥٠.

تەبەرستانو قەومەسو جورجان، چونکە کەوتنی ڕەی بە دەستی موسڵمانان ترسناکیەکی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر ئەو ناوچانە، هەروەها بە هۆی گرنگی ئاینی ئەو شارە کە پەرستگاکانی ئاگری تیادابوو، لە ڕاستیشدا موسڵمانان ڕووبەڕووی بەرگریەکی توند بوونەوە، تا سەرەنجام ئەو شارە بە هێز فەتحکرا، لەگەڵ ئەوەشدا نوعەیم هەر ڕێککەوتننامەی صوڵحی لەگەڵیان بەست، لەوانەشە ترسناکی دۆخو دژی دوژمنانی لەم ناوچانە هانیدا بێت بۆ ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە کە خەڵکی ڕەی هێمن بکاتەوە.

لەگەڵ کەوتنی ڕەی بە دەستی موسڵمانان، قەومەسو دەنباوەندیش هاتن ڕێککەوتننامەیان لەگەڵ موسڵمانان مۆر کرد، تەنها شارەکانی فارس، جورجان، تەبەرستان و ئازەربایجان مانەوە لە ڕێگەی موسڵماناندا بۆ گەیشتن بە ڕۆخی قەزوین، سوەیدی کوڕی موقەڕین نامەی نارد بۆ پادشای ئەم هەرێمانە، بۆیە هەردوو پادشای تەبەرستانو جورجان ڕازی بوون بە ڕێککەوتن، عوتبەی کوڕی فەرقەدو بەکری کوڕی عەبدوڵڵا چوونە پێشەوە بەرەو شارەکانی ئازەبایجانو تووشی ئەسفەندیار بوونو شکاندیانو بە دیلی گرتیان، دوای ئەوە ڕازی بوون لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن، هەروەها شەهریرازی فەرمانداەی بابیش ملیدا بۆ موسڵمانان، بەم شێوەیەش موسڵمانان گەیشتن بە دوورترین شارەکانی فارسو بە تەواوی لە وڵاتی تورکەکانیش نزیکبوونەوە لە باکورەوە.[1]

سەبارەت بە باشووری وڵاتی ئێرانیش موسڵمانان لە بەحرێنو بەصرەوە بەرێکەوتن بۆ گرتنی هەرێمی فارس، ئیتر عوسمانی کوڕی ئەبولعاصی تەووەجی فەتحکرد بە هاریکاری موجاشیعی کوڕی مەسعوود کە فەرماندەی سوپای بەصرە بوو سەرکەوتنی بەدەست هێنا.[2]

**فەتحی هەرێمی فارس:**

موجاشیع بەرێکەوت بەرەو سابوورو ئەردەشیرو لە پاش شەڕێك دەستی بەسەریان گرت، عوسمانی کوڕی ئەبولعاصیش بەرێکەوت بەرەو ئیستەخر کە پایتەختی هەرێمەکە بوو، گرنگیەکی سیاسیو ئاینی زۆری هەبوو سەرەڕای بەرگریکردنی هوربوز لە شار، بەڵام موسڵمانان توانیان بە زۆر بچنە ژوورەوەو دوای ئەوە صوڵحیان لەگەڵ هوربوز کرد کە سەرانە بدەن، دووجار دوای ئەوە ڕێککەوتننامەکەیان هەڵوەشاندەوەو دیسان فەتحکرایەوە، بیلازەری دەگێڕێتەوە کە ئەبوموسای

١) الطبري: تاريخ ٤: ١٥٠ـ ١٦٠.

٢) الطبري: تاريخ ٤: ١٧٤

ئەشعەری لە بەصرەوە هاتو بەشداریکرد لە فتوحاتی هەرێمی فارس لەگەڵ عوسمانی کوڕی ئەبولعاصدا، ئیدی فەتحی ئەرجانو شیرازو سبنیزی کرد بە صولح، عوسمانیش درابوجوردی بە هەمان شێوە فەتحکرد، بەڵام تەبەریی ریوایەتێکی جیاواز دەهێنێتەوەو دەڵێت ساریەی کوڕی زونەیم فەتحی پەساو درابوجوردی کرد.[1]

**فەتحی کەرمان و موکران:**

لەلایەکی تریشەوە سوهەیلی کوڕی عەدی کرمانی فەتحکرد بە هێز، هەروەها حەکەمی کوڕی عەمری تەغلیبیش موکرانی بە هەمان شێواز فەتحکرد، ئەوکاتە یەزی گورد لە کرمان بوو هەڵهات بەرەو مەروی خوراسان..[2]

**فەتحی سەجیستان :**

عاصیمی کوڕی عەمر توانی فەتحی سەجیستان بکات دوای ئابلۆقەدانی زرنجی پایتەختەکەیو ڕازیبوونیان لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن.[3]

**فەتحی خۆراسان :**

ئەحنەفی کوڕی قەیس توانی دورکەوێتەوە بەرەو قوڵای خۆراسان ـ هەرێمی باکووری ڕۆژهەڵات لە ئێران ـ ئەوجا بە هێز فەتحی هیراتی کردو ڕێککەوتننامەی لەگەڵ خەڵکەکەی نووسی، هێزەکانی نارد بۆ نەیسابوورو سەرەخس، خۆیشی رۆیشت بۆ مەرو کە یەزدی گوردی تیا جێگیر بوو، بەڵام لەوێوە هەڵهات بۆ مەروی رەودو لەوێشەوە بۆ بەڵخو ئەحنەف بە دووی کەوت، بەڵخ کەوتە دەستی موسڵمانانو یەدزدی گورد لەوێشەوە هەڵهات بەرەو سەمەرقەندو پەنای بردە بەر خاقانی تورك، خاقان سوپایەکی کۆکردەوە لە فەرغانەو سەغەد، فەرمانەکانی عومەر گەیشتە ئەحنەف کە نەچێتە پێشەوە بەرەو وڵاتی تورك، چونکە فتوحات بەربڵاوبووەتەوەو دڵنیا نی یە لەوەی فارسەکان پەیمانەکانیان هەڵوەشاندبێتەوەو ببێتە مەترسیەك لە ڕێگەی گەڕانەوەی موسڵمانان، خاقان بە سوپایەکی تورکەوە بەڕێکەوت بۆ بەرەنگاری ئەحنەف، بەڵام کە زانی موسڵمانەکان ئامادەنین پێشکەون بۆ ناو خاکی تورك گەڕایەوە وازیهێنا لە نیازی شەڕکردن، سەبارەت بە یەزدی گوردیش

١) هەمان سەرچاوە ٤: ١٧٥ـ ١٧٩.

٢) هەمان سەرچاوە ٤: ١٨٠ـ ١٨١.

٣) هەمان سەرچاوە.

بێهیوا بوو لە پاشگەزبوونەوەی خاقان لە بڕیارەکەی، یەزدی گورد لەگەڵ خاقان هاتبوو بۆ مەرو، جا کاتیك پاشەکشەی کرد یەزدی گورد هەوڵیدا خەزێنەکانی لە مەرو بهێنێتەوەو لەگەڵ خاقان بگەڕێتەوە، بەڵام خەڵکی شارەکە بەوە رازی نەبوون کاتێك هەر سوور بوو لەسەر داواکاریەکەی خەڵکی مەرو هەڵسان بە کوشتنی یەزدی گورد.[1]

بەم شیوەیەش وڵاتی فارس لە خیلافەتی عومەر دا فەتحکراو موسڵمانان سەربازگەیان لە سەرانسەری شوێنەکان دامەزراند و پێشبینیان دەکرد کە ئەوان پەیمانەکانیان هەڵوەشیننەوە، لە ڕاستیدا فتوحاتی ڕۆژهەڵات پڕ لە سەختییو زەبرو زەنگ بوو، واشی لە موسڵمانان دەخواست قوربانیی زۆر بدەن بە هۆی جیاوازی خوێنەوە، چونکە دانیشتوانی ئێران عەجەم بوون و هیچ پەیوەندیەك نەیدەبەستنەوە بە عەرەبەوە لە ڕووی زمانو ڕەگەزو ڕۆشنبیریەوە، هەروەها هەستی نەتەوایەتی لەلای ئێرانیەکان مێژووی درێژو ڕۆشنبیریی ڕەگو ڕیشەدار گرێی دەدا، لەوەش گرنگتر، شەڕەکان لە ناوەڕاست نیشتمانی ئێراندا هەڵدەگیرساو پیاوانی ئاینی ئاگرپەرستانیش خەڵکیان کۆدەکردەوە لەسەر بەرگریکردن، جگە لەم هۆیانەش دووری ئەو ناوچانە لە مەڵبەندی سوپاکان لە بەصرەو کووفە، ئینجا زەوی ئەو وڵاتە کە شاخاوی بوو یارمەتی دانیشتوانی دەدا بۆ بەرگریکردن، بۆیە زۆربەی ئەو ناوچانە پەیمانەکانیان هەڵدەوەشانەوە، دووبارە فەتحکرایەوە لە سەردەمی عومەر یان عوسمان (رەزای خوایان لێبێت).[2]

١) الطبري: تاريخ ٤: ١٦٦ـ ١٧٣.

٢) شكري فيصل: حركة الفتح الاسلامي ٢٢٠ـ ٢٢٥.

**لە خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان ((ڕەزای خوای لێبێت)):**

هەندێ لە هەرێمە ئێرانییەکان پەیمانەکانیان هەڵوەشاندەوە، بۆیە موسڵمانان جارێکی تر فەتحیان کردەوە لە سەردەمی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، لە ساڵی ۳۱ی کۆچی خۆراسان پەیمانیان شکاند بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عامیر بە سوپایەکەوە لە بەصرەوە بەڕێکەوتو دووبارە هەڵسان بە فەتحکردنی شارەکانی مەرو نیسابوورو نەساو هیراتو بوشنەجو بادغیسو مەڕوی شاهجان. ئەمجا ئەحنەفی کوڕی قەیس ئاڕاستەی تەخارستان کرا، لەوێش خەڵکی مەڕوو و ڕەودو جوزەجان و تالەقانو فاریابو صەغانیانی لەسەر کۆبوویەوە، ئیتر هەندێکیان بە صولحو هەندێکیان بە هێز فەتحکران، ئینجا هەوڵیدا فەتحی بەڵخ بکات بەڵام نەیتوانی، دواتر لە ڕووباری حەیحون تێپەڕی و خەڵکی وڵاتی (ماوراء النهر) صولحیان کرد لەگەڵیدا، لەپاش ئەوە عوسمان هەڵسا بە دانانی قەیسی کوڕی هەیسەم لە جیاتی ئەحنەف، ئەویش دوورکەوتەوە بە سوپاکەی بەرەو تەخارستانو شارەکانی فەتحکرد، لە لایەکی تریشەوە سەعیدی کوڕی عاس هەڵسا بە فەتحکردنی تەبەرستان، پادشای جورجانیش ڕێککەوتننامەی لەگەڵیان کردو خەڵکی ئازەربایجانیش شۆڕشیان کرد، بۆیە وەلیدی کوڕی عوقبە غەزایکردن و گێڕایاندنیەوە بۆ گوێڕایەڵی، هەروەها ئەرمینیاش لە سەردەمی عوسماندا فەتحکرا.[1]

**لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ((ڕەزای خوای لێبێت)):**

پەشێویو ڕووداوەکانی شاری مەدینە کاریگەریان هەبوو لەسەر فتوحاتی ڕۆژهەڵات لە کۆتای حوکمڕانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، تاڕادەیەك کپی دروست بوو لە بەرەکانی ڕۆژهەڵاتدا، بەڵکو هەندێك لەو شارانە هەڵسان بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەکانیان لەگەڵ موسڵماندا لە کۆتایەکانی خیلافەتی عوسمان، نموونەی ئەوانەیش شارەکانی بەڵخو هیرات بوون، پەشێوی ناوخۆی لە خیلافەتی عەلی بواری نەکردەوە بۆ بەردەوامی بزووتنەوەی فەتحکردن.

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ٢٤٦ـ ٢٤٧، ٢٦٩ـ ٢٧١، ٢٨٦، ٢٨٧، ٢٩٣ـ ٢٩٤، ٣٠٣، ٣٠٩ـ ٣١٦.

## باسی دووەم: فتوحاتی شام و میصر و مەغریب

## فتوحاتی شام لە خیلافەتی صدیق ((ڕەزای خوای لێبێت)):

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرنجی موسڵمانانی ڕاکێشابوو بۆ فەتحی شام، لە سەردەمانی شەڕی موئتە (٨ك)و ئینجا هەڵمەتەکەی ئوسامە لە ساڵی (١١ك) کە قەدەری خوا وابوو دواکەوێت تا خیلافەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت).

دواتر ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) دەستی کرد بە ئاڕاستەکردنی هەڵمەتەکان بۆ شام پاش ئەوەی لە ساڵی ١٣ ك لە حەج گەڕایەوە، پاشان خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی ئاڕاستە کرد بۆ تەیماء بۆ ئەوەی بیکات بە سەربازگەیەك جەنگاوەری تیا گردبکاتەوە، پاشان خالید دوورکەوتەوە بەرەو وڵاتی شامو دواتر ئەبوبەکر کۆمەکی کرد بە ناردنی وەلیدی کوڕی عوقبەو عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل بە دوایدا، سەرکردەی ڕۆمیش (باهان) توانی خالید ڕاکێشێت بە دوای خۆیدا، چونکە وای بۆ دەردەخست کە دەکشێتەوە بۆ دیمەشق تا گەمارۆی دا و کەوتە جەنگ لەگەڵیاندا لە شەڕی ناسراو بە (مرج الصفر) خالیدی کوڕی سەعیدو وەلیدی کوڕی عوقبە هەڵهاتن، عیکریمەش بە سوپاکە پاشەکشەی کردو گەیشتە ئەو هێزانەی ئەبوبەکر ناردوویانی بۆ شام، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) جێگای مەبەستی بۆ ئەو هێزانە دیاری کردبوو، ئەبوعوبیدە بەرەو حیمصو یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان بەرەو دیمەشقو شورەحبیلی کوڕی حەسەنەیش بەرەو ئوردونو عەمری کوڕی عاصیش بۆ فەلەستین، ئەم سوپایانەش لە ژێر یەك سەرکردایەتیدا نەبوون.[1]

## یەکەم پێکدادان:

لە هەندێ دەڤەرەکانی شام لێکدان دروست بوو لەگەڵ ڕۆمەکان، کاتێك یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان لەگەڵ سوپای ڕۆمەکان بەسەرکردایەتی سەرجیوس بەیەکگەیشتنو سەرکەوتنە سەریان لە جەنگی وادی عەرەبە، هەروەها عەمری کوڕی عاصو شورەحبیلی کوڕی حەسەنە بە یەکگەیشتن لە ئەرتەبۆن (أريطيون) لە ئەجنادینی فەلەستین، ناچاریشیان کرد بکیشێتەوە بۆ قودس.[2]

بەڵام موسڵمانان کۆسپو تەگەرەیان هاتە پێش لە بەر زۆری ژمارەی ڕۆمەکان، ئەوان سوپایەکی گەورەیان ئامادەکردبوو بە سەرکردایەتی تیودریکی برای هیرەقل کە سەربازگەی ڕاگرتبوو لە

١) الطبري: تاريخ ٣: ٣٨٧ـ ٣٩٤.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٤٠٦ـ ٤١٧، ٤١٨، عن ابن اسحق، ٦٠٥ والبلاذري: فتوح البلدان ١٣٥ـ ١٣٦.

جێگایەك لای یەرمووك، بۆیە عەمری کوڕی عاص پێشنیاری وابوو کە سوپاکانی ئیسلام لەلای یەرمووك کۆببنەوە، ئیتر وایانکرد.

**یەرمووك ( لەتەبەری ساڵی ١٣ ك ):**

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، خالیدی کوڕی وەلیدی لەگەڵ نیوەی سوپاکەی عێراق نارد کە هاتبوون بۆ یارمەتی موسڵمانانی شام، خالید بە خێرایەکی لە ئاسایی بەدەر بیابانی بڕیو پەیوەندیی کرد بە سوپاکانی ئیسلامەوە لە یەرمووك، پاش ئەوەی کە لە ڕێگەی خۆیدا بوصراو چەند مێرگێکی فەتحکرد، سوپاکانی ئیسلام هەموویان لە ژێر ئالآی خالیدی کوڕی وەلید دا کۆبوونەوە، ئەمجا دەستاڕی شەڕ کەوتە خولانەوە، موسڵمانان ئازایەکی بێوێنەیان نواند و عیکریمەیش شەهید بوو.

ڕۆمەکان بەرگری سەختیانکرد، هەندێکیشیان هەڵهاتن، زۆربەشیان کەوتنە ناوشیوی واقووسە و کوژراوەکانیان بە هەزاران بوون، سوپای موسڵمانانیش هەزار لە یارو یاوەرانی پێغەمبەری (ﷺ) لەخۆگرتبوو کە سەدیان لەوانە بوون بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو،[1] لە پاش ئەم شەڕە هیرەقل لە شاری ئەنتاکیە دەرچوو، دواتر ماڵئاوای لە سوریا کرد، ڕێگاشی لە بەردەم موسڵماناندا والآ کرد بۆ ئەوەی بڵاوببنەوە بەناو وڵاتی شامدا، بەڵام لە کۆتای ئەم جەنگەدا ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) وەفاتی کرد،[2] و عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بوو بە خەلیفە، دەشگێڕنەوە دوای گەمارۆی دیمەشق بووە،[3] بەڵکو ڕیوایەتێکی تریشی هەیە پێچەوانەی ئەوەکان دەڵێت یەرمووك دوای فەتحی دیمەشق ڕوویداوە، واتە لە خیلافەتی عومەردا ڕوویداوە.

١) ابن عساكر: تاريخ دمشق ١: ٥٢٩ (ط. المنجد).

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٣٩٤- ٤٠٨.

٣) البلاذري: فتوح البلدان ١٤٤.

**لە خیلافەتی عومەر ((ڕەزای خوای لێبێت)):**

**لابردنی خالید:**

عومەر خیلافەتی خۆی بە لابردنی خالید دەستپێکرد لە سەرکردایەتی گشتیی شامو بە ئەبو عوبەیدەی عامیری کوڕی جەڕاحی سپارد، هەندێك ئەوە پەسەند دەکەن کە هۆی لابردنی خالید دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی لە مالیکی کوڕی نووەیرە، یان دەیگێڕنەوە بۆ ناکۆکیەك لە نێوانیاندا هەر لە سەردەمی جاهیلیەوە، یان بۆ بێتاقەتبوونی عومەر لە هەڵەشەی خالید بە موسڵمان لە شەڕەکاندا، بەڵام ئەوەی کە عومەر دەیەویست خۆی سەرپەرشتی فەرمانڕەواو سەرکردەکانی بکات، هەر خۆیشی پلانی سازدەکرد بۆ ئەو شەڕانەی لەبەرەکانی عێراقو شام هەڵدەگیرسا، سەرچاوەکانیش وردەکاری ئەو مەسەلەیەیان گێڕاوەتەوە، خالیدیش سروشتێکی بوو حەزی لەسەربەخۆی و هەڵسوکەوتی سەربەستانە دەکرد، بۆیە پێویست بوو لابرێت بۆ دروستبوونی گونجاندن لە نێوان خەلیفەو فەرماندەی سوپادا، هەروەها دووریش نی یە لەبەرئەوە لایبردبێت خەڵکی شەیدا نەبنو وابزانن سەرکەوتن بە دەست نایەت بەبێ خالید.

**فەتحی دیمەشق (لەتەبەری سەرەتاکانی ساڵی ١٤ ك):**

ئەبوعوبەیدە ڕاوێژی بە خەلیفە کرد ئایا بچێت بۆ دیمەشق یان بەرەو فەحلی ئوردوون، ئەویش ڕای وابوو بەرەو دیمەشق بچن، موسڵمانان شەش مانگ ئابلۆقەیاندا، دوای خالید بە زۆر دەروازەی ڕۆژهەڵاتی کردەوە، ئەبوعوبەیدەش دەروازەی جابیەی بەڕێکەوتن کردەوە، ئینجا ئەبوعوبەیدە ڕێککەوتننامەی لەگەڵ دیمەشقدا نووسی، موسڵمانانیش لە دیمەشق زیاتر لە دەوروبەرەکەی جێگیر بوون.[1]

دواتر موسڵمانان بە سەرکردایەتی شورەحبیل ڕوویانکردە فەحل، کە گەیشتن بە ڕۆمەکان سەرکەوتن بەسەریانداو ڕاویاننان، بۆیە خەڵکی تەبەریەو بەیسانو ئەزرەعات و عەممان و جەرەش و مەئاب و بوصرا لەگەڵ موسڵمانان ڕێککەوتن بە پی ڕێککەوتننی دیمەشق (ئەویش ئەوەبوو موسڵمانان نیوەی ماڵو سامانەکانیان ببەن و ساڵانە یەك دینار سەرانەیش بدەن بۆ هەموو کەسێك).[2]

١) ملكة ابيض: التربية والثقافة العربية الاسلامية في الشام والجزيرة ص٣٩٣.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٤٣٤- ٤٣٧- ٤٤٤. والبلاذري: فتوح البلدان ١٤٤- ١٤٧.

**حیمص و حەما و لادەقیە و قەنسەرین و حەڵەب:**

لەپاش فەتحی دیمەشق‌و فەحەل موسڵمانان توانیان دەسەڵاتیان فراوانکەنەوە سەر سوریاو جەزیرەو فەلەستین‌و ئوردون، ئەبوعوبەیدە بەرەو حیمص بەڕێکەوت‌و ئابڵوقەی دا، دواتر لە ڕێگەی ڕێککەوتنەوە فەتحکرا پاش بومەلەرزەیەك کە لە شارەکەیدا، ئینجا حەمایش ڕێککەوتننامەی بەست لەگەڵ موسڵماناندا لەسەر هەمان مەرجەکانی صوڵحی حیمص.

دوای ئەوە ئەبوعوبەیدە بەرەو لادەقیە بەڕێکەوت‌و گەمارۆیدا، خەڵکەکە ماوەی ئابڵوقەکەیان درێژکردەوە بەمەبەستی فراوانکردنی ئەنتاکیە، بەڵام ئەبوعوبەیدە توانی بە هێز شارەکەیان فەتح بکات.

دوای ئەوە خالید ڕوویکردە قەنسەرین لە نزیك حەڵەب‌و بە هێز دەستی بەسەرا گرت، خەڵکەکەی داوای صوڵحیان کردو خالید ڕازی نەبوو، بەڵام ئەبوعوبەیدە ڕێککەوتننامەی صوڵحی لەگەڵیان بەست، سەرەڕای ئەوەش کاتێك موسڵمانان بەجیانهێشت بۆ حەڵەب خەڵکەکە شۆڕشیانکردو پەیمانەکەیان شکاند،بۆیە دووبارە داگیرکراو هێزێکی تیا بەجێما.

هەروەها ئەبوعوبەیدە هەڵسا بە ناردنی عیازی کوڕی غەنەم بۆ حەلەب کە عەیاز ئابڵوقەیدا و دواتر لەگەڵیان ڕێکەوت.[1]

**ئەنتاکیە:**

ئەنتاکیە پایتەختی ئیمپراتۆریەت بوو لە ڕۆژهەڵات هەروەکو خۆی مایەوە، هیرەقلیش بەجیهێشت بەرەو ڕوها، بۆیە ئەبوعوبەیدە ئابڵوقەیداو بەپی ڕێککەوتننامەیەك شارەکەیان بەجێهێشت، بەڵام خەڵکەکە شۆڕشیانکردو پەیمانکەیان شکاند، ئینجا عەیازی کوڕی غەنەم جارێکی تر دەستی بەسەرا گرتەوەو پارچەیەك لە سوپاکەی تیایدا جێگیر کرد.

لە کاتێکدا کە ئەبوعوبەیدەو خالیدو عەیاز کۆششیان دەکرد بۆ پاککردنەوەی سوریاو جەزیرە، عەمری کوڕی عاص بەرەو فەلەستین بەرەوپێش دەچوو، چونکە لە پاش شەڕی ئەجاندین (١٣ ك) ئەرتەبۆن پەنایبردە بەر قەڵاکانی (بيت المقدس)، موسڵمانانیش دەرچوون بە ئاڕاستەی شارەکانی ڕۆخی دەریا بۆ فەتحکردنیان، ئیتر ڕەفەح‌و غەززەو سەبستیەو نابلوس‌و لەددو عەمەواس و بەیت

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ٥٠ـ ٥٦، والبلاذري: فتوح البلدان ١٥٦، ١٥٧، ١٦٢، ١٧٢، ١٧٤، ١٧٥.

جیبرینو یافا هەموویان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانانەوە، هەندێکیان بە هێزو هەندێکیان بە ڕێککەوتن.

**بەیتولمەقدیس:**

دواتر عەمری کوڕی عاص ڕوویکردە (بیت المقدس) و ئابڵوقەی دا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، خەڵکی قودس کاتێك هەستیان کرد بە توندی ئابڵوقەکەو دەستبەسەراگرتنی موسڵمانان بەسەر شارەکانی قەراغی دەریا، حەزیان لە ڕێککەوتن کرد، مەرجی سیفرۆنیس لە ڕێگای مەدینە ئەوەبوو کە ڕێککەوتنەکە لە لایەن عومەر خۆیەوە سەرپەرشتی بکرێت بۆ ئەوەی متمانە پێکراو بێت، ئیتر عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) خۆی هات بۆ جابیەو ڕێککەوتننامەکەی نووسی بۆ قودس، دوای ئەوە کلیلەکانی تەسلیم بە عومەر کرا، سەبارەت بە ئەرتەبۆن کە فەرماندەی هێزەکانی قودس بوو پاشەکشەی کرد بۆ میصر.[1]

ئا بەم شێوەیە فەتحکردنی وڵاتی شام ئەنجامدرا لە خیلافەتی عومەردا (ڕەزای خوای لێبێت)، "بێزەنتەکانیش دەرچوونو لایەنگرەکانیان لە شارەکان شوێنیان کەوتن، ژمارەی ئاوارە عەربەکان زۆر لە ژمارەی سوپای موسڵمانان زۆرتر بوو، چونکە ژمارەی سوپاکانی فەتح ـ وەکو سەرچاوەکان دەڵێن ـ دەگەشتە (٢٤٠٠٠) تا (٢٧٠٠٠) شەڕکەر، پاشان زیادی کرد بۆ (٤٠٠٠٠) لە کۆتای خیلافەتی ڕاشیدەو ئینجا بۆ (٦٠٠٠٠) لە ڕۆژگاری موعاویەی یەکەمدا، جگە لە خێزانەکانیان، ئەم ژمارەیەش ئەوەندەی ژمارەی یەك هۆزە لەو هۆزانەی بەر لە ئیسلام لەو ناوچەیە جێگیربوون، وەکو هۆزی غەسسان کە دەوڵەتێکیان لە حۆران پێکهێنا لە سەدەی پێنجەمی زاینی،[2] بیلازەری دەگێڕێتەوە کە شازادەی غەسسانی جەبەلەی کوڕی ئەیهەم لە پاش فەتح شامی بەجێهێشت لەگەڵ (٣٠٠٠٠) کەس لە شوێنکەوتوانی.[3]

ئەوەش تێبینی دەکرێت کە مێژوونووسەکان بە کورتی باسی فتوحاتی شامیان کردووە، لە کاتێکدا فتوحاتی عێراقیان بە شیکراوەی باسکردووە، وێڕای ئەوەش هەندێك شیکردنەوە هەیە دەربارەی یەرمووكو فەتحی دیمەشقو قودس. بەڵام هەڵوێستی عەرەبەکانی شام لە فەتحو لە ئیسلام، لە ژیانی

١) الطبري: تاريخ ٣: ٦٠٧ـ ٩١٢.

٢) ملكة أبيض: التربية والثقافة العربية الاسلامية ص٥٨.

٣) البلاذري: فتوح البلدان ١٦١.

پێغەمبەردا (ﷺ) هیچ نێردەیەك لە لای ئەوانەوە نەهات بۆ بەیعەتدان، ئەگەرچی خەڵکی جەرباو ئەدرەح‌و دەومەتولجەندەل رێککەوتننامەی ئاشتیان لەگەڵدا کرد لە غەزای تەبووك.

لە راستیدا زۆرێك لە هۆزە عەرەبەکان وەکو بەهراء کەلب‌و سولەیم‌و تەنوخ‌و لەخم‌و غەسسان لەگەڵ رۆمەکان دژ بە فارسەکان شەریان کرد، لە هەمان کاتدا هەندێ لە عەرەبکانی لەخم‌و جوزام پشتگیری موسڵمانیان کرد دواتر لە یەرمووك، بەڵام کاتێك سەختیی شەریان چاوپێکەوت هەڵهاتن، ئینجا نیوەی سوپای رۆمەکانی عەرەب بوون بەسەرکردایەتی جەبەلەی کوری ئەیهەمی غەسسانی.

گاورەکانی شامیش بەرگری سوپاکانی ئیسلامیان کرد لەبەر هەندێ هۆکاری ئاینی، بەڵام کاتێك بینیان موسڵمانان سەرکەوتن حەزیان لە رێککەوتن کرد لەگەڵیان، نۆڵدێکەو تریمەنکەهام بۆچوونیان وایە هەڵسانی هۆزە بەگاوربووەکان بە بەرگریکردنی فەتحی ئیسلامی هەڵقوڵاو نەبوو لە پابەندبوونێکی ئاینیەوە، ئەوەندەی کە پەیوەست بوو بە بەرژەوەندیەکانیان، جا کاتێك ئەو بەرژەوەندیانە نەماو رۆمەکانیش رازی نەبوون ئەو برە پارانەی پێشتر دەیاندا بیدەن بەو هۆزانە کە دەروازەکانی بیابانیان دەپاراست، ئەو کاتە ئەوانیش دەستیان کرد بە گۆرینی هەڵوێستەکانیان لەگەڵ موسڵماناندا.[1]

بەڵام رۆمەکان لە چەندین گۆرەپاندا بە سەختی جەنگیان کرد و وایانزانی بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی غەزایەکەو کۆتای پێدێت بە کشانەوەی عەرەبەکان دوای بەدەستهێنانی هەندێ سەروەت‌و سامان، بەڵام ئەوەیان نەزانی کە عەرەب گۆرانکاریان بەسەردا هاتووە و ئێستا نموونەو بەهاو بنەماگەلێکیان هەیە لە هەموو گەنجینەکانی سەرزەوی بەنرخترە. کاتێکیش بە هەزاران شەهیدیان داوە لەسەر خاکی شام مەبەستیان بڵاوکردنەوەی پەیامی خواو جێگیرکردنیەتی، نەوەك تاڵانکردنی وڵاتە فەتحکراوەکان، هەرئەوەش نهێنی بەردەوامی بوونیان بو لەوێ.[2]

١) د. محمد عبدالقادر خريسات: دور العرب المتنصرة في الفتوحات ص٢، ضمن بحوث المؤتمر الدولي الرابع لتاريخ بلاد الشام ـ ١٩٨٥ م.

Trimingham Christinaty amang the Arabs in Pre – islsmic tim – long man Landon and New York, P. 56 – 1979.

٢) شكري فيصل: حركة الفتح الاسلامي ٤٤ـ ٥٥.

**فەتحکردنی میصر :**

پالنەرەکانی فەتحکردنی میصر لە لای موسڵمانان بەهێز بوو، لە لایەکەوە بیروباوەڕەکەیان کە دەیانەویست جێگیری بکەن لە هەموو شوێنێکدا، میصریش بەدەم فەلەستینەوە بوو، جا شتێکی ئاسای بوو دوای فەتحکردنی فەلەستین ڕوو بکەنە میصر، موسڵمانان توانیان ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بکەن بە دووکەرتەوە، دەریا نەبێت هیچیان لە نێوندا نەبوو، دوای ئەوەی کە دەستیان گرت بەسەر ڕێی شامدا، هەروەها لە میصرو باکووری ئەفریقا سوپاو سەربازگەی ڕۆمی زۆری تێدا بوو، موسڵمانانیش لە شام و میصر دلنیا نابن لە ژێر دەسەلاتی ڕۆمەکاندا، میصریش دەولەمەندە، سەرچاوەیەکیشە بۆ بەخێوکردنی قوستەنتینیە، جا ئەگەر موسڵمانان دەستیان بەسەرا گرت، دەسەلاتی بیزەنتیەکان زۆر لاواز دەبێت و موسڵمانانی شامو حیجازیش دلنیا دەبن، چونکە پەیوەندیکردنی ڕۆم بە حیجازەوە ئاسان دەبێت لە ڕێگەی میصرەوە.

**عەریش :**

عەمری کوڕی عاص داوای ڕێگەپێدانی کرد لە عومەری کوڕی خەتتاب سەبارەت بە فەتحکردنی میصر و بە سوپاکەیەوە ڕوویکردە عەریش و داگیریکرد بەبێ هیچ بەرگریەك، ئەمجا بەرێکەوت بەرەو فەرما، ڕۆمەکان بۆ ماوەی مانگێك یان دوو مانگ بەرگریان لێکرد، بەلام سەرئەنجام عەمر توانی دەستی بەسەرابگرێت، دوای ئەوە بەرەو بەلبیس[1] ڕۆیشت لە باکووری ڕۆژهەلاتی قاهیرەو داگیریکرد، پێکدادانیش ڕوویدا لەگەل ئەرتەبۆن، بەلام عەمر توانی بیبەزێنێ.

**قەلای بابلیۆن :**

ئینجا چووە پێشەوە بەرەو قەلای بابلیۆن کە هێزەکانی ڕۆم بەسەرکردایەتی نیۆدۆرس و سەرۆکایەتی مقۆقیس کە ڕۆمەکان کردبوویان بە بەتریکی ئەسکەندەریەو فەرمانڕەوای میصر، موسڵمانان سەربازگەی خۆیان لە عەین شەمس (هیلوبۆلیس) دامەزراند، یارمەتی خەلیفەشیان پێگەیشت بە سەرکردایەتی زوبەیری کوڕی عەووام و میقدادی کوڕی عەمرو عوبادەی کوڕی صامیت، چوونە پێشەوە بەرەو قەلای بابلیۆنو ئابلوقەیان دا، بەلام ئابلوقەکە درێژەی کێشا لەبەر قایمی قەلاکە، ڕۆمەکانیش لی دەردەچوون بۆ شەڕکردن و دەگەڕانەوە نێو قەلاکە، تا ئەوەی کە موسڵمانان زالبوونە سەریان لە دەرەوەی ئەو قەلایە، ئیتر سیودورس هەلهات بەرەو ئەسکەندەریە و

١) شكري فيصل: حركة الفتح الاسلامي ١١٨ـ ١٢٠، وبتلر: فتح العرب المصر ١٩١.

مقۆقیسیش پەنای بردە بەر قەلاکان، لە پاش حەوت مانگ ئابلۆقەدا ڕێککەوت لەگەڵ موسڵمانان لەسەر ئەوەی کە قیبتیەکان سەرانە بدەنو ڕۆمەکان سەربەست بکرێن، لە ماوەی ئابلۆقەدانەکەدا عەمری کوڕی عاص توانی دەست بگرێتە سەر فەیومو باشووری دەلتاو هەروەها ئوم دەنین کە یەکێك بوو لە سەربازگە گرنگەکانی ڕۆم.

لە دوای کەوتنی قەلای بابلیۆن، ڕێگە لەبەردەم موسڵمانان والا بوو بۆ دەستبەسەرگرتنی میصری خوارووی کە لەوێ تووشی بەرگری سەخت بوون، هەروەها ڕۆیشتن بەرەو ئەسکەندەریە لە باکوور کە جیێگایەکی قایمکراوو بەهێز بوو، هەروەها لەبەرئەوەی لەسەر دەریایە بواری بۆ ڕۆم دەکردەوە کە یارمەتی بگەیەنن پی لە ڕێگای دەریاوە، سوپای ئیسلامیش لە ڕێکردنی بەرەو ئەوێ تووشی بەرگری ڕۆمەکان بوویەوە تاکو گەیشتن بە ئیسکەندەریە، ڕۆمەکان بەرگریان لەو شارە کردو بە مەنجەنیق لە موسڵمانانیان دەدا، ئابلۆقە درێژەی کێشا، ئینجا هیرەقلی ئیمپراتۆر مقۆقیسی لەسەر میصر لادابوو و دەربەدەری کردبوو لەبەرئەوەی صولحی لەگەڵ موسڵمانان کرد لە بابلیۆن، بەلام هیرەقل مردو مقۆقیس گەڕایەوە سەر فەرمانڕەوایەتی خۆی لە میصرو بینی ئەسکەندەریە ئابلۆقە دراوە، ئەویش بڕیاریدا ڕێککەوتن لەگەڵ موسڵمانان بکات، هەرکەسێك دەمێنێتەوە سەرانە بداتو ڕێگەش لەکەس ناگیردرێت بچێت بۆ لای ڕۆمەکان. بەم شێوەیەش موسڵمانان دەستیان گرتە سەر ئەسکەندەریەو دەستیانکرد بە دروستکردنی شاری (الفسطاط)و هەڵکەندنی کەناڵێك لە نێوان نیلو دەریای سوور، دواتر عەمری کوڕی عاص بەرەو ڕۆژئاوا چوو، ئینجا شاری بورقەی فەتحکرد بەڕێککەوتن لە ساڵی ٢١ ك، تەرابلوسیشی بە زەبری هێز فەتحکرد لە ساڵی ٢٢ك.

تێبینی دەکرێت کە هەڵوێستی ڕۆمەکان لە میصر بەوە جیادەکرێتەوە بەرگری توندوتیژی موسڵمانیان دەکرد، چونکە موسڵمانان دەسەلاتیان لێزەوتکردن، هەندێکیشیان ئاشتیان هەڵدەبژارد وەکو مقۆقیس بە مەبەستی سوودوەرگرتن لە موسڵمانان، دوای ئەوەی دەستی تەکان لە بیزەنتیەکان.

سەبارەت بە قیبتیەکان، ئەوان یارمەتی موسڵمانیاندا لە چاککردنی ڕێگەوبانو پردەکانو تفاقی پێویستیشیان پیان دەدا.

ئینجا بە هۆی ستەمی بیزەنتەکان لە ئەوان لە ڕووی ئایینیو ماندووکردنیان بە باجدان، لەلایەکی تریشەوە ئەو ئازادیە ئاینیە کە موسڵمانان دەرفەتیاندا بۆ گاورەکانی شام وایکرد قیبتیەکان پێشوازی بکەن لە موسڵمانان.[1]

لە خیلافەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت):

## دووبارە فەتحکردنی ئیسکەندەریە:

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) عەمری کوڕی عاصی لەسەر فەرمانڕەوایەتی میصر لابردو عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرحی خستە جێگەکەی لە ساڵی ٢٧ ك، بۆیە ئیسکەندەریە بە جارێ ڕاپەڕین دژ بە موسڵمانان و قوستەنتین ـ کە ئیمپراتۆر بوو ـ گەلەکەشتیەکی نارد بە فەرماندەی مەنویل ئەرمەنی و ئیسکەندەریەی داگیرکرد و بەرەو جێگەکانی تر بەڕێکەوت، لەم کاتەدا عوسمان عەمری کوڕی عاصی گەڕاندەوە بۆ سەرکردایەتی سوپاکەو ئەویش ڕۆمەکانی قاوداو ئیسکەندەریەی داگیرکردەوەو شوورەکانیشی ڕووخاند.[2]

## سوودان:

عوقبەی کوڕی نافیعی فیهری دەرچوو بەرەو وڵاتی نەوبە (سوودان)، بەڵام نەیتوانی زۆر بچێتە قووڵای ئەو وڵاتەوە، دواتر عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح ئاشتی لەگەڵیان کردو دیاریان ئاڵوگۆڕ کرد.

## ئیفریقیە:

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبوسەرح نێردراوی نارد بۆ لای عوسمان بۆ ئەوەی ڕێگە بدات غەزای ئیفریقیەکان بکات، عوسمانیش هەڵسا بە ناردنی سوپایەك لە مەدینەوە سەرانی هاوەڵانی تیادا بوو، سەرەتا عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوسەرح خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد، بەڵام دواتر زوبەیری کوڕی عەوام بوو بە سەرکردە، ئەویش توانی سەرکەوێتە سەر جەرجیری پادشای ئیفیرقیە، دەستکەوتێکی باشی دەستکەوتو گەڕایەوە، جا غەزاکەی فەتحێکی ڕێك و پێك نەبوو،[3]

---

١) الطبري: تاريخ ٤: ١٠٤، وشكري فيصل: حركة فتح الاسلامي ١٣٧ـ ١٤٥.

٢) البلاذري: فتوح ابلدان ٢٥٧ـ ٢٦٣.

٣) جرجوريس یەکێکە لە سەرکردەکانی ئیفرەنج کە سەرکەوتنە سەر ئیفریقیە دوای کەمبوونەوەی دەسەڵاتی ڕۆمەکان، ئەو سوبەیتەلەی وەکو پایتەخت بۆ خۆی راگرت لە جیاتی قرتاجەننە لەبەر پتەوی و قایمی جێگاکەی، سەرەتا جێگری بێزەنتەکان

بەربەریش لە ئیفیرقیەوە و مەغریبدا لە ژێر دەسەڵاتی پادشای فێرەنجەدا بوونو ئاینیان مەسیحی بوو.[1]

**(ذات الصواري):**

موسڵمانان بایەخیان دایە دروستکردنی گەلەکەشتی دەریای، بە سوودوەرگرتن لە شارەزای دانیشتوانی ئەسکەندەریە، گەلەکەشتی موسڵمانان توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لەسەر گەلەکەشتی ڕۆمەکاندا لەشەڕی (ذات الصواري) لە دەریای ناوەڕاست لە نزیك ئیسکەندەریە ساڵی ٣٤ ك، هەروەها موسڵمانان توانیان دەستبگرنە سەر هەندێ کەشتی ڕۆمەکانو بیخەنە سەرکەشتیەکانی خۆیان.[2]

**سوپاو سیستمی شەڕکردن:**

سوپا لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەدا بەو شێوە ڕێکوپێکە نەبوو کە دەیبینین لە سەردەمی عەباسیەکاندا، بەڵکو میللەت هەمووی جەنگاوەر بوون کاتێك بانگ دەکران بۆ جیهاد، ئەو کاتە هەر کەسێك توانای چەك هەڵگرتنی بوایە و ناوی لە دیوانی خەڵاتو موچە نووسرابێت، هەموویان هەڵدەستان بۆ بەدەنگچوونەوەی هەڵمەت سەربازی،[3] بۆیە مەشقی ڕۆژانە لە ژێر چاودێری دەوڵەتدا نەبوو، بەڵکو سوپاکانی فەتح پشتی دەبەست بە ئەو خۆبەخشانەی خۆیان مەشقیان بە خۆیان دەکرد لە مەلەوانیو تیرهاویشتن و زۆرانو سوارچاکی بە شێوەیەکی بەردەوام بە مەبەستی ئامادەباشی بۆ جیهاد، ئەویش بوو بە مایەی ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر جەنگاوەرانی شارەزا بە شێوازو هونەرەکانی جەنگ لەو سەردەمەدا.

"بەڕاستی پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ) بنچینەکانی سەربازی ئیسلامی گیرسانەوە، هەڵسا بە دانانی ڕێنمایە بیردۆزەیو پیادەیەکان، خەلیفە ڕاشیدەکانیش لەسەر هەمان ئەو هەنگاوانە بەرێوە ڕۆیشتن لە جێبەجێکردنی ئەو ڕێنمایانەدا، هەربۆیە توانیان گەورەترین سەرکەوتن بەدەست بهێنن

---

بوو، بەڵام دوایی سەربەخۆیی راگەیاند لە ئەوان. (حسين مؤنس: فتح العرب للمغرب ٩٦ هامش رقم ٢، والزاوي: تاريخ الفتح العربي في ليبيا ٢٤، والسلاوي: الاستقصا في اخبار الدول المغرب ١: ٧٥).

١) الطبري: تاريخ ٤: ٢٥٣ـ ٢٥٦، والبلاذري: فتوح ٢٦٧ـ ٢٦٨.

٢) سعد زغلول: تاريخ المغرب ١ـ ١٢٦.

٣) فاروق عمر فوزي: النظم العسكرية، نشأة الجيش النظامي في الاسلام ٢: ٢٢٩، (وقائع ندوة النظم الاسلامية، أبوظبي ٥: ١٤ك).

بەسەر سوپا زەبەلاحەکانی ڕۆم‌و عەجەم، ئەو هەموو وڵاتانەشیان فەتحکرد لە ماوەیەکی کورتدا،[1] ئینجا هۆز یەکەیەکی سەربازی بوو لە گۆڕەپانی جەنگدا، هەروەها بناغەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی‌و کارگێڕی بوون لە شارو شارۆچکەکان.[2] ئینجا سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندیی هۆزایەتی هەر بە چالاکی مایەوە لە پەیوەندیی هۆزەکان پێکەوە یان بە دەوڵەتەوە، دەوڵەتیش گرنگیی پیان دەدا، بەڵام پەلهاویشتنی ئیسلام لەناو کۆمەڵگاو بەهێزی بیروباوەڕی ئیسلامی لە دڵەکاندا، کەم کەم بوو بە مایەی کزبوونی گیانی هۆزایەتی، بۆیە هەندێك پێوەرو پەیوەندی تازە سەری هەڵدا لەسەر بناغەی یەکسانی‌و لە خوا ترسان، بەدەر لە تێڕوانین بۆ بنچینەو ڕەچەڵەك، هەروەها سەرهەڵدانی کۆمەڵانێکی نوێ کە خەڵکی کۆدەکردەوە لە ناوەندە جیا جیاو هۆزگەلی جیاواز، ئەمانە هەمووی یارمەتی ئەوەیان دا کە گەیەنەری تازە دروست بێت لەسەر بنەمای ئەندێشەیی‌و سیاسی‌و ئاینی لە جیاتی گەیەنەری هۆزایەتی کۆن،[3] هەروەها جێگیربوونی عەرەب لە شارەکان بوو بە مایەی تێکەڵبوونی هۆزەکان‌و بەیەکداچوونی کۆمەڵایەتی وەکو ژنهێنان‌و شووکردن، هەروەها لە ڕووی ئابووریەوە بە یەکێتی بەرژەوەندیەکانی میصر، ئینجا پەیوەندیە کۆمەڵایەتی‌و ئابووریە تازەکان لەگەڵ ڕۆژگاردا بەهێز دەبوون، لە کاتێکدا کە پەیوەندیە هۆزایەتیەکان لاواز دەبوو.

سوپایش لە سەرەتاوە عەرەب بوون، بەڵام دواتر ژمارەیەکی زۆر هێزەکانی فارس‌و ڕۆم خۆیان دەدا بە دەستەوەو موسڵمان دەبوون، حەزیشیان دەکرد لە ریزی هێزە موسڵمانەکاندا خزمەت بکەن، دەوڵەتی ئیسلامیش بە نەرمی مامەڵەی لەگەڵ کردن، جا ڕازی بوو ئەوان بچنە ناو هێزەکانەوە، بەڵام لە یەکەو کۆمەڵی سەربەخۆی خۆیان، ڕێگەشیان پێدرا ـ ئەگەر حەز بکەن ـ هاوپەیمانێتی‌و پەیوەندی بکەن بە هۆزە عەرەبەکانەوە، هەروەها ناویان لە دیوانی مووچەو خەڵات تۆمار کرا، لەوانە: (الحمراء) بۆ ڕۆمەکان (الابناء) بۆ خەڵکی صەنعا، (الديالمي) و (القيقانية)و (الاساورة) بۆ فارسەکان.[4]

---

١) هەمان سەرچاوە ٢: ٢٣٥.

٢) صالح العلي: التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة ٣٨ـ ٤٠.

٣) صالح العلي: التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة ١٣٧، وفاروق عمر فوزي: التنظيم العسكرية ٢: ٢٣٩.

٤) البلاذري: انساب الاشراف ٣٦٦ـ ٣٧٩، وابن عبدالحكم: فتوح مصر ١٢٩، وصالح العلي: التنظيمات ٥٩، وفاروق عمر: النظم العسكرية ٢: ٢٤٢.

لەناو سوپای ئیسلامیشدا چەندین پلەی سەربازی ناسرا وەکو فەرماندەی سوپاو جێگرەکەی، فەرمانەکانی کردۆس، فەرماندەکانی ئامادەکردن، نەقیبەکانو عەریفەکان[1] ئینجا سوپا بەیداخێکی سپی و ئالآیەکی رەشی بەرز دەکردەوە،[2] هەروەکو چۆن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دەکرا،[3]جەنگاوەرەکانیش سوارو پیادە بوون، دەوڵەتیش سوور بوو لەسەر بەخێوکردنی ئەسپ بۆ مەبەستی جیهاد، هەروەها هانی خەڵکیشی دەدا بۆ بەخێوکردنیان، جگە لەوەش پێشبڕکی بۆیان سازدەکردو لەوەڕی بۆیان دیاری دەکرد، سواریش دوو پشکی هەبوو لە دەستکەوتو پیادە یەك بەش.[4]

سەبارەت بە کۆکردنەوەی عەرەبی لەسەر سیستمی ریزو کردۆسو سیستمی (الخميس) بۆیە سوپا دەکرا بە پێنج بەشەوە: ڕاست، چەپ، باڵەکانیان پێدەوترا، دڵ، لق، دوایەکی، هەر بەشێك چەند کردۆسێکی لە خۆدەگرت، هەر کردۆسێکیش لە هەزار جەنگاوەر پێکدەهات کە سەرکردەو دارو دەستەو ئالآی خۆی هەبوو، لە نێوان کردۆسەکانیشدا ڕووبەرێکی زەوی هەبوو دەرفەت بدات بۆ جووڵانەوەیو جەنگکردن.

دەوڵەتیش پێویستیەکانی سوپای دەستەبەر دەکرد لە خۆراكو چەكو ئەسپو وشتر.[5]

١) محمد فرج: المدرسة العسكرية ٤٢٥، وعبدالعزيز السلومي: ديوان الجند ٢٩٤.

٢) البلاذري: فتوح البلدان ١٣٢ـ ١٣٣، الطبري: تاريخ ٤: ٥١٤.

٣) ابن حجر: فتح الباري ٦: ١٢٦، وسمي الراية "العقاب".

٤) عبدالعزيز السلومي: ديوان الجند ٣٤٣ـ ٣٤٦.

٥) عبدالعزيز السلومي: ديوان الجند ٣٦٢ـ ٣٨٠.

## دەرگەی شەشەم

# پشێوی ناوخۆی

## بەشی یەکەم: پاشگەزبوونەوە (الردة)

### پێشەکی: باسی یەکەم : بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە دەرەوەی مەدینە[1]

بڵاوبوونەوەی ئیسلام تەنها لە ناو شاری مەدینەدا نەبوو، چونکە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەت هەندێك لە موسڵمانان هەڵسان بە گەیاندنی ئیسلام بە هۆزەکانیان لە دەرەوەی مەککە، وەکو ئەوەی ئەبوزەڕی غیفاری کردی لەگەڵ هۆزی غیفارو نوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی لەگەڵ هۆزی دەوس (لە ئەزدی یەمەن).

کاتێکیش دەوڵەتی ئیسلام دامەزرا لە مەدینە، بایەخیدا بە ناردنی بانگخواز بۆ بیابان بە مەبەستی ئاڕاستەکردنی بانگەواز بۆ هۆزەکان، سەرەڕای ئەو مەترسیانەی چاوی دەبڕیە نێردەکان، نموونەی ئەوەیش ڕووداوی ڕەجیعو (بئر معونە)، هەروەها ئەو نامە بانگەوازیانەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی شەشەمدا لەپاش حودەیبیە بۆ پادشاو فەرمانڕەوای ناوچەی بەحرێنو بوصرای نارد.

"یەکەمین جومعەیش کرا - پاش ئەو جومعەیەی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)- لە مزگەوتی عەبدولقەیس بوو لە جەواسای بەحرێن".[2]

مەککەیش دوای فەتحکردنی لە ساڵی ٨ ك هاتە ناو ئاینی ئیسلامەوە، خەڵکی تائیفیش لە ساڵی ٩ك موسڵمان بوون، تەوەرەی مەدینە - مەککە - تائیف ناوەندێکی قورسای ئیسلامی پێکهێنا لە شەڕەکانی پاشگەزبوونەوە، ئەنصار و موهاجیرەکانو ئەو دوای قوەڕیشو موزەینەو غیفارو جوهەینەو بەلجەو ئەشجەع و ئەسلەم و کەعبی لە خۆگرت، سەبارەت بە نەجدیش کۆمەڵانێك هەر لە سەر ئیسلام مانەوە لە بەنی سولەیمو تەی هودەیلو تەمیم - چەند بەشێك لەم هۆزانە جێگیر بوون لەسەر ئیسلام لە بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەو وەکو بەنوعەوفو (الابناء)و ڕەبابو بەهوا،

---

١) بڕوانە: صالح العلي: الدولة في عهد الرسول (ﷺ)، بەرگی دووەم، و مهدی رزق الله أحمد، الثابتون على الاسلام أيام فتنة الردة.

٢) صحيح البخاري: كتاب الجمعة باب ١١ (فتح الباري ٢: ٣٧٩).

هەندێکیشیان هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام وەکو بەنو حەنزەلەو مەقاعیسو بوتون[1] ـ ئینجا عەبسو دوبیانو قوزاعە و کەلب و ئەسەد و غەتەفان[2]و هەوازنو عامر[3]، ئەم کۆمەڵانە دژ بە پاشگەزبووەکان ڕاوەستانو توشی کوژرانو ناخۆشی بوون.

بەم شێوەیەش دەبینین هۆزەکان لە نێو خۆیاندا دابەشبوون بە هۆی مانەوەیان و پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام. هەروەها ئیسلام گەیشتە باکووری نیوەدورگەی عەرەب لەویش بەنو شەیبانو بەنو عوزرە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر دا (ﷺ) موسڵمان بوون،[4] هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسا بە ناردنی فەرمانڕەواو بانگخواز بۆ یەمەن وەکو موعازی کوڕی جەبەلو عەلی کوڕی ئەبو تالیب، دواتر ئەبوموسای ئەشعەری نارد بۆ لای ئەشعەریەکان،[5] لە زەبیدو ڕەمەعو عەدەن لە قەراغی دەریا، ئەوانیش بەرنگاری بتپەرسیان کرد لە زۆربەی هۆزەکانی یەمەن، هەروەها بەرەنگاری نەصرانیەت بوونەوە کە بەنو حاریسی کوری کەعب لەسەری بوون، بەهەمان شێوە جوولەکەیش کە حیمیەرو (کثیر) لە کیندە لەسەری بوون،[6] لە ڕاستیدا کارەکانیان بەرهەمی هێناو سەرگەورەکانی حیمیەر موسڵمان بوون، شورەحبیل و حاریسی کوڕانی عەبدو کەلالو نوعەیمی کوڕی عەبدوکەلال و (ذي رعين)[7]، هەروەها بادانی فەرمانڕەوای صەنعایش کە لە لایەن فارسەکانەوە دانرابوو، خۆیو ئەوانەی پیان دەوترا (الابناء) هەموویان موسڵمان بوون[8]، ئینجا یەمەن نێردەکانی خۆی نارد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی نۆی کۆچی، لەوانە نێردەکانی کیندەو ئەشعەریەکانو هەمەدانو دەوس،[9] ئەو نێردانەش بڵاوبونەوەی ئیسلامی پیشان دەدا لە یەمەندا، لە ڕاستیدا جێگیربوونی

---

١) الطبري: تاريخ ٣: ٢٦٨، ٢٦٩.

٢) الكلاعي: حروب الردة ٤١، ٤٢، ٤٩، ٥١، ٦٧، ٦٩، والطبري: تاريخ ٣: ٢٤٢، ٢٤٣، وابن الاعثم الكوفي: كتاب الفتوح ١: ٧.

٣) الطبري: تاريخ ٣: ٢٦٤.

٤) وابن الاعثم الكوفي: كتاب الفتوح ٤٥، وابن حجر: الاصابة ٣: ٤٨.

٥) صحيح البخاري: (فتح الباري ٨: ٦١).

٦) ابن حزم: جمهرة انساب العرب ٤٩١.

٧) ابن سعد: الطبقات ١: ٢٦٥، ٢٨٢، ٣٥٦، وابن هشام: السيرة النبوية ٢: ٥٨٨ـ ٥٩٠، والبلاذري: فتوح البلدان ٩٥.

٨) الطبري: تاريخ ٢: ٦٥٥، والبيهقي: دلائل النبوة ٢: ٤٥٢.

٩) احمد: المسند ٣: ١٠٥ باسناد صحيح، ١٥٥ باسناد فيه ضعف من جهة يحى الغافقي ١٥: ٢١١، ٢١٢، حديثين بمتن واحد تفرد بها مسلم بن هيضم العبدي مقبول فيحتاج الى متابعة، والبخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ٩٦ــ ١٠٠)

هۆزەکانی: (ذي مران) و (ذي ظليم)و بوجەیلەو زەبیدو نەخەعو جەعفیو (الابناء)و سکونو سەکاسیك لەسەر ئیسلام کاریگەری زۆری هەبوو لە هەرەسهێنانی هەڵگەڕانەوەیەی ئەسوەدی عەنسی. بەڵکو هەر لە نێو هۆزە هەڵگەڕاوەکان خەڵکانێکیان هەر لە سەر ئیسلام مانەوەو لە دژی ئەسوەدیشدا ڕاوەستان، بەڵکو هۆزی مەدحەج ـ کە ئەسوەد خۆی لەوان بوو ـ خەڵکانێکیان هەر لەسەر ئیسلام مانەوەو شەڕیان لەگەڵ ئەسوەد کرد، بەڵام نەفامانی هۆزەکە لەگەڵی بوون،[1] سەبارەت بە حەزرەمەوت ئیسلام بڵاوبوویەوە لەناو کۆمەڵانێك لە هۆزی کیندەدا، بەڵام بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە لایەنگرانی زۆر دەستکەوت لە نێو ئەو هۆزەدا، کە ئەوەش دابەشبوون پیشان دەدات لەناو هۆزەکەدا،[2] بەڵام هۆزەکانی نەجران لە سەر گاوری خۆیان مانەوە[3]و ملکەچی دەوڵەتی ئیسلامیش بوون، پەیوەندیەکانیشی پاراست لەگەڵیدا لەسەردەمی ڕووداوەکانی هەڵگەڕانەوەی ئەسوەدی عەنسی[4]، ئەو کاتە عەمری کوڕی حەزم فەرمانڕەوای نەجران بوو.

ئینجا ئیسلام لە یەمامەش بڵاوبوویەوە، زۆرێك لە موسڵمانانیش بەردەوام بوون لەسەر ئیسلامەتی خۆیان بەرانبەر بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە کە موسەیلەمە سەرکردایەتی دەکرد، هەر لە بەنی حەنیفە کە هۆزی موسەیلەمە بوو ژمارەیەکی زۆر هەبوو لە موسڵمانان، بەرەنگاری موسەیلەمەشیان کرد بە سەرکردایەتی سومامەی کوڕی ئەسالی حەنەفی،[5] هەروەها ئیسلام بڵاوبوویەوە لە عومانو بەحرێن لە نێو هۆزەکانی بەنی جەدیدو بەنی ناجیەو بەنی عەبدولقەیسو کەعبی کوڕی ڕەبیعە،[6] بەڵام ئیسلام بڵاونەبوویەوە لە نێو هۆزی ڕەبیعە بەشێوەیەکی فراوان، بە

---

والبيهقي: السنن الكبرى٢: ٣٦٩، باسناد قال البيهقي: انه على شرط البخاري، وليس كما قال فإن فيه أباعبيدة بن أبي السفر صدوق يهم وليس من رجال البخاري ولا مثلهم.

١) ابن سعد: الطبقات ٥: ٥٢٥ـ ٥٢٦، و الطبري: تاريخ ٣: ٢٢٩، ٢٣٠، ٣٢٧، والكلاعي: حروب الردة ٩٠، ٢١٦، ٢٢٠.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٣٣٩ـ ٣٤٢، والكلاعي: حروب الردة ٢٢٣، ٢٢٦ـ ٢٢٩، وابن اعثم: الفتوح ١: ٥٧.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ١٠١).

٤) ابن هشام: السيرة النبوية ٤: ٥٩٤، وخليفة ين خياط: تاريخ ٩٤.

٥) ابن سعد: الطبقات ٥: ٥٥٠ـ ٥٥١، والطلاعي: حروب الردة ١١٦، ١١٧، و الطبري: تاريخ ٣: ٢٧٢.

٦) خلية: تاريخ ١١٦، و الطبري: تاريخ ٣: ٣١٥ـ ٣١٦، والكلاعي حروب الردة ١٩٤، ٢٠٨ـ ٢١٠، وابن أعثم: الفتوح ١: ٤٥ـ ٤٧، وابن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٧٢، وابن حجر: الاصابة ١: ٤٢٣ـ ٤٣٤و ٢: ١٠٣.

بەڵگەی ئەوەی بەپەلە چوونەدەم بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەوە،[1] ئینجا ئیسلام بڵاوبوویەوە لە نێو هۆزەکانی موهرە بە تایبەت خەڵکی نەجدو خەڵکی ڕیازو ڕەوەزو ساحیلو جەزائیرو مەرلەببانو جیروتو هەروەها شەحەرو صەبراتو یەنعوبو (ذات الخیم)و هەندێك لە بەنی موحاریب.[2]

١) الكلاعي: حروب الردة ٣٩٦.

٢) الطبري: تاريخ ٣: ٣١٧، ٣٢٧.

## باسی دووەم: بزووتنەوەکانی پاشگەزبوونەوە

لە ڕاستیدا مێژووی تەبەری بە گرنگترین سەرچاوەکانی بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە دادەنرێت، چونکە کۆی ئەو ڕیوایەتانەی هێناویێتی دەربارەی ئەو بزووتنەوە دەگاتە (١٠٤) ڕیوایەت زۆربەیان لە ڕێگەی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمیەوە (٧٣) ڕیوایەت، دوای ئەو ئیبنوئیسحاق (١٤ ڕیوایەت) ئەمجا ئەبو میخنەف (٥ ڕیوایەت) دوای ئەو هیشامی کەلبی (٤ ڕیوایەت) مەدائینی (٣ ڕیوایەت)،[1] لەوانەشە ئەم ژمارانە تێکەڵێەك دروست بکات، دەربارەی ڕاستیی گرنگیدانی ئەو مێژوونووسانە بە ڕووداوەکانی پاشگەزبوونەوە، چونکە لەوانەیە گێڕانەوەی تەبەری لە ئەوانەوە بەشێوەیەکی سنووردار لەبەرئەوە نەبێت دانراوەکانی ئەوان لە ناوچووبێت، یان تەبەری پی نەگەیشتووە، یان پی گەیشتووەو متمانەی پێنەکردووە، سەرچاوەکان هەندێ کتێبیان لەم بارەوە دەستنیشان کردووە وەکو (کتاب الردة)ی ئەبومیخنەفو (مسیلمة الکذاب وسجاح)ی هیشامی کەلبیو (کتاب الردة)ی واقیدیو (کتاب الردة)ی مەدائینی.[2] بەهەرحاڵ سەرچاوەکان کە دواتر نووسران زانیاریی چاکیان پێمان گەیاندووە، هەر لە ڕێگەی ئەو مێژوونووسانەشەوە، بۆ نموونە کولاعی،[3] بەشێکی زۆری بۆ پاشگەزبوونەوە[4] تەرخان کردووە لە کتێبی (الاکتفا في مغازي المصطفی والثلاثة الخلفاء) لە ئیبنوئیسحاق زانیاری وەردەگرێت کە کتێبی (تأریخ الخلفاء)ی هەیە، لە واقیدیش کە (کتاب الردة)ی هەیەو هەردووکیان لەناوچوون، لەوانەشە لە ڕێگەی حوبەیشی مامۆستای[5] زانیاریەکانی وەرگرتبێت، چونکە بەزۆری پشتی بەو دوو کەسە بەستووە بۆ نووسینی کتێبەکەی (الغزوات الضامنة الکاملة).

گرنگی هەردوو کتێبەکەی ئیبنو حوبەیش و کولاعی زۆرە بە هۆی هێنانەوەیان بۆ ڕیوایەتەکانی یەعقوبیو زوهری و (وثیمة)، کە ئەمەی دووەم بە کتێبەکەی ناسراوە دەربارەی پاشگەزبوونەوە بە ناوی (الردة) کە لەناوچووە،[6] خەلیفەی کوڕی خەیاتیش چلو دوو ڕیوایەت دەهێنێتەوە دەربارەی

---

١) عبدالعزیز محمد نور ولی، حرکة الردة في الیمن وحضرموت وعمان في خلافة أبي بکر الصدیق ص١٠.

٢) عبدالعزیز محمد نور ولی، حرکة الردة ١١٦ ـ ١١٩.

٣) أبوالربیع سلیمان بن موسی لە پێشەوایانی فەرموودەیە لەسەردەمی خۆیدا. (الذهبي: سیر أعلام النبلاء ٢٣: ١٣٤).

٤) د. أحمد غنیم بلاوی کردۆتەوە.

٥) عبدالرحمن بن محمد بن حبیش الاندلسي، کتێبی (المغازي) هەیە (الذهبي: سیر أعلام النبلاء ٢١: ١١٨).

٦) لە کۆکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی ولهم هونرباخ ، مینصتة ـ ١٩٥١م.

پاشگەزبوونەوە، زۆربەشی پەیوەندی هەیە بە هەڵگەڕانەوەی بەنی حەنیفە لە ئیسلام، پێویستیشە ئاماژە بکەین بۆ سەرچاوەیەکی پێشوەخت ئەویش (فتوح البلدان)ی بیلازەریە (٢٧٥ك) کە ئەو لە بەسەرهات گێڕەوەکان هەشت ڕیوایەتی هێناوەتەوە و وشەی (قالوا) وتیانی بەکارهێناوە بۆ ڕیوایەتەکانی تر.

لە ڕاستیدا هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بزووتنەوەیەکی بەرفروان بوو لە نێو هۆزە گەورەکانی عەرەبدا وەکو هۆزی ئەسەد بە سەرۆکایەتی تولەیحەی کوڕی خوەیلدی ئەسەدیو بەنوحەنیفە بە سەرۆکایەتی موسەیلەمەی کوڕی حەبیبو هۆزەکانی عەنسو مورادو سەعدلعەشیرە - هەموویان لە مەدحەجن - بە سەرۆکایەتی ئەسوەدی عەنسی، هەڵگەڕانەوەی بەنو حەنیفە تاکدەبێتەوە بەوەی لە ڕووی جوگرافیەوە نزیك بوو لە پایتەختی ئیسلامەوە "مەدینە" کە ئەوەش دەبێتە مایەی ترسناکی لەسەر دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو، بەڵام سەبارەت بە پاشگەزبوونەوەی بەنی حەنیفە لە یەمامەو پاشگەزبوونەوەی مەدحەج کە ماڵەکانیان بڵاوبوو لە باکووری ڕۆژهەڵاتو باشووری ڕۆژهەڵاتو ناوەڕاستو ڕۆژئاوای یەمەن، سامناکیان لە چڕی دانیشتوانی دایە، چونکە دەتوانرێت هەزاران لە جەنگاوەران لەوێوە ئامادە بکرێت، بێجگە لە توانا ئابووریەکان لە هەردوو ناوچەکە بە هۆی بەرووبوومی کشتووکاڵی بەرفروان و چالاکی بازرگانیو پیشەسازی.

هۆکارەکانی پاشگەزبوونەوە دەگەڕێتەوە بۆ جێگیرنەبوونی ئیمان لە دڵەکاندا، لەبەر درەنگی ئیسلامبوونیان و کورتی ئەو ماوەی بانگەوازی تیادا گەیەنرا، هەروەها بە هۆی سروشتی عەرەبە بیابانشینەکان کە وشك بوون، هاوکات لەگەڵ لاوازی ئاستی ڕۆشنبیریی کە ئەویش سەری کێشا بۆ لاوازی تێگەیشتن لە ڕێنمایەکانی ئاین، بە تایبەتی سەبارەت بە زەکات کە هەندێ لە خەڵکی وا دەیانڕوانی بۆی کە باجێکی پڕ لە سووکایەتیە، هەروەها نوێژو پەرستنەکانی تریان بەلاوە گران بوو، هەروەها دەمارگیری هۆزایەتی هێشتا قووڵ بوو لەو وڵاتە دوورانەو ناوەڕاستی نەجددا، چونکە ئەو هۆزانە خۆیانیان گەورەتر دەزانی لە قوڕەیشو بەشایستەتریش لە سەرۆکایەتی، یان هیچ نەبێت ڕازینەدەبوون بە ملکەچی بۆ قورەیش، ئینجا هەندێك سەرکردەی بەرزخواز سەریان هەڵدا کە لاسای پێغەمبەریان دەکرد ﷺ لە شێوازی ئیشو بانگەوازدا، بە ئاگایش نەبوون لە جیاوازی گەورەی نێوان پێغەمبەرایەتی ڕاستەقینەو نواندنی پێغەمبەرایەتی بە درۆو لەبەر بەرژەوەندی کەسێتی، ئەمەیش هۆکاری ئەو بانگەشەیە بوو لە لایەن ئەو سەرکردە دووبەرەکی خوازانەوە، ئینجا

کتێبەکانی فەرموودەیش زانیاریەکی ورد پێشکەش ناکەن دەربارەی بزوتنەوەی پاشگەزبوونەوە، بەڵکو تەنها هەڵدەستێت بە سەلماندنی ڕوودانی مەسەلەکەو ڕازینەبوونی هەندێ هۆز بۆ دەرکردنی زەکات، هەروەها ئەو وتووێژەی لە نێوان ئەبوبەکرو عومەر ڕوویدا دەربارەی نکۆڵیکەران لە دەرکردنی زەکات، عومەر فەرمووی: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله فمن قال لا اله الا الله عصم مني ماله ونفسه الا بحقه وحسابه على الله". ئیتر ئەبوبەکر فەرمووی: سوێند بە خوا شەڕ لەگەڵ هەرکەسێکدا دەکەم جیاوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵە، سوێند بە خوا ئەگەر کارە میەکیان دەدایە پێغەمبەر ﷺ و ئێستا نایدەن لەسەر ئەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەم"، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا هەرئەوەندەی بینیم ئەبوبەکر دڵی دەکرێتەوە بە شەڕکردنیان زانیم ئەو لەسەر ڕاستیە".[1]

هەروەها باسی ڕوودانی پاشگەزبوونەوەی موسەیلەمەو ئەسوەد هاتووەو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداریکردوونەتەوە بە دەرکەوتنی سی درۆزن هەموویان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن کە ئەسوەدو موسەیلەمە لەوانەن،[2] هەروەها هاتنی موسەیلەمە بۆ مەدینە لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا لە کەسوکاری[3] و مەرجدانانی کە فەرمان لە دوای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو بێت، وەڵامدانەوەی پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئەو کە لقێکی دارخورمای بەدەستەوە بووە: "ئەگەر داوای ئەم لقە دارەم لێبکەی پێت نادەم، تۆیش ناتوانیت دەرچیت لە فەرمانی خوا لەسەرت، کە لێرەش پشت هەڵدەکەیت خوای گەورە لەناوت دەبات، ئینجا من وا دەتبینم لەو حاڵەتەی کە خوای گەورە پێی نیشان داوم دەربارەی تۆ،[4] هەروەها فەرموودەی خەو بنینیی پێغەمبەر ﷺ : "بينما أنا نائم رأيت في يدي سوارين من ذهب، فاهمني شأنها، فاوحي الي في المنام أن انفخها، فنفختها فطارا،

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢: ٢٧٥) ومسلم: الصحيح حديث رقم ٢٠، ومالك: الموطأ ١: ٢٦٩، وأبوداود: السنن ٢: ١٩٨، والترمذي: السنن ٥: ٣، والنسائي: السنن ٥: ١٤.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ٦١٦) واشدیارە ئەو قسەی کردووە لەو کاتەی قسە زۆر بووە دەربارەی موسەیلەمە لە مەدینە (أحمد: المسند ٥: ٤٦).

٣) واقیدی دەگێڕێتەوە کە حەڤدە کەس بوون (إبن حجر: فتح الباري ٨: ٩٠).

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ٢٧ و ٨: ٨٩، ٩٢و ١٢: ٤٢٠و ١٣: ٤٤٢) ومسلم: الصحيح ٤: ١٧٨٠ـ ١٧٨١، والترمذي: الجامع ٤: ٥٤٢ وأحمد: المسند ١: ٢٦٣ و ٣: ٣٤٥ و ٦: ٣٤٤.

فاولتهما كذابين يخرجان، فكان احدهما العنسي والآخر مسيلمة الكذاب صاحب اليمامة". [1] واتە: لە خەونمدا بینیم کە دوو بازنم لە دەستدایە، منیش پێی خەمبار بووم، لە خەونەکەمدا وەحیم بۆ هات کە فوویان پیا بکەم، منیش فووم پیایاندا کردو هەڵفڕین خەونەکەم بەوە لێکدایەوە کە دوو درۆزن پەیدا دەبن، جا یەکەمیان عەنسی بوو، ئەو کەسەیش موسەیلەمەی درۆزن بوو خەڵکی یەمامە، موسەیلەمە لەسەر دەستی وەحشی کوژرا، کە هەواڵەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك موسەیلەمەی درۆزن سەری هەڵدا وتم: ئەبێ بچم بۆ لای، بەڵکو بیکوژم بۆ هاوتای کوشتنی حەمزە، دەڵێت: منیش لەگەڵ خەڵکەکەدا دەرچووم و ئەوەی ڕوویدا کە دەیزانن، وتی: پیاوێکم بینی لە کەلی دیوارێکدا دەتووت وشترە قژی هەڵچووبوو، وتی: منیش رمێکم تێهاویشت، لەنیوان هەردوو مەمکی داو لەناو شانیەوە دەرچوو، وتی: پیاوە ئەنصاریەکەش بازیدایە سەریو بە شمشێر لەسەری دا". ئیبنو عومەر دەفەرموێت: "کچێك لەسەربانێکدا وتی: هاوار بۆ ئەمیری خاوەن باوەڕداران، کۆیلەیەکی ڕەش موسەیلەمەی کوشت" [2] ئەنەسیش باسی ژمارەی شەهیدانی ئەنصاری کردووە لە یەمامەداو فەرموویەتی حەفتا بوون. [3]

ئەبو ڕەجای عوتاریدیش بارودۆخی ئاینی کەسوکارەکەی باسکڕوو کە ئەوان بەردیان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی جوانتریان دەستکەوتایە کۆنەکەیان فرێدەدا، جاری واشبوو لەخۆڵو خشت دروستیان دەکردو لە دەوری دەگەڕان، هەروەها ئاسنیان لە چەك دەکردەوە لە مانگی رەجەبدا وەکو ئاماژەیەك بۆ وازهێنانی شەڕ لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا، [4] کەسوکارەکەشی کاتێك بە سەرهەڵدانی ئیسلامیان زانیوە خۆیان گەیاندووەتە موسەیلەمەو خۆیشی لەگەڵیان بووە، [5] ڕیوایەتێکیش هەیە دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە فەرمانڕەوایەتی خۆی لەسەر کووفە لە سەرەتای خیلافەتی عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) داوای تەوبەکردنی کردووە لە کەسانێك لە شوێنکەوتووانی موسەیلەمە لە هۆزی بەنی حەنیفە هێشتا هەر لەسەر بڕوایانبوون پێی،

١) سەرچاوەکانی پێشوو.

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٣٦٨)، وأحمد: المسند ٣: ٥٠١، ئیبنو ئەبی شەیبەش دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری موسەیلەمەی کوشتووە (المصنف ١٢: ٥٤٧).

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٣٧٤).

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ٩٠).

٥) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٨: ٩٠).

دەشگێڕنەوە کە تەنها ئیبنونەواحەی کوشتووە کە پێشتر نێردراوی موسەیلەمە بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ رازینەبوو بکوژرێت، چونکە (الرسل لا تقتل) واتە: نێردراوان نابێت بکوژرێن، جا کاتێك دەستی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کەوت کوشتی.[1]

ئینجا ئەوانە هەشتا کەس دەبوون، پەڕاوێکیان بوو خوێندنەوەی موسەیلەمەی تیادا بوو،[2] لەگەڵ هەواڵی شکستی بەنی ئەسەد بەرانبەر خالیدی کوڕی وەلید لە ڕۆژی بزاخەدا.[3]

چەندین ڕیوایەتیش هەیە ئاماژە دەکات بۆ ئازایەتی سابیتی کوڕی قەیس لە ڕۆژی یەمامەدا، هەروەها بەڕائی کوڕی عازیب بکوژی توفەیلی سەرکردەی یەمامە پیاوێکی کەتەی زەبەلاح بوو، دروشمی موسڵمانانیش (یا أصحاب سورة البقرة) بوو واتە ئەی خاوەنانی سوورەتی بەقەرە، هەندێ لە جەنگاوەرە موسڵمانەکانیش بە ڕۆژوو بوون لە کاتی شەڕەکەدا، هەروەها هەڵکوتانی زوبەیری کوڕی عەوام بۆ سەر هەندێك لە کوژراوەکان کە هێشتا هەناسەیان تیامابوو، ئەمجا کڕنوشك بردنی ئەبوبەکر لە سوپاسی خوادا کە یەمامە فەتحکرا.[4] هەروەها هاتنی بەنی ئەسەدو غەتەفان‌و داواکردنی ئاشتی لە ئەبوبەکر ئەویش هەڵبژاردنی خستە دەستیان لە نێوان شەڕێکی ئاشکرا یان ئاشتیەکی ئابڕووبەر، ئەو واتایەیشی بۆ ڕوونکردنەوە چی دەگەیەنێت: "خوێنبای کوژراوەکانمان دەدەن‌و ئێمە خوێنبای کوژراوەکان نادەین، شایەتیش بدەن کە کوژراوەکانتان لە دۆزەخدان، هەرچیشتان بردووە بۆمانیان دەگێڕنەوە، بەڵام ئێمە هیچتان بۆ ناگێڕینەوە، هەروەها چەك‌و ئەسپەکانتان لێدەسێنینەوە، وازتان لێناهێنین بە دوای کلکی وشتر بکەون تا خوا ڕێگایەك پیشانی جێگری پێغەمبەرەکەی‌و بڕواداران دەدات دەربارەی ئێوە، عومەر فەرمووی: ئەوەی وتم هەر ئەوەیە

١) أبوداود: السنن ٣: ٨٤ (ط. محي الدين عبدالحميد) والخبر فيه عنعنه أبي اسحق السبيعي، وهو يخالف رواية مسند أحمد لان الذي اطلع على حال اتباع مسيلمة هو حارثة بن مضرب فابلغ عنهم وليس ابن معيز كما هو في رواية احمد، وفي مسند أبي داود محمد بن كثير فان كان الثقفي فهو صدوق كثير الغلط، وان كان العبدي فهو ثقة، وابوداود يروي عن اثنين، وهما يرويان عن الثوري.. وأحمد المسند ١: ٣٩١، ٣٩٦، ٤٠٤، ٤٠٦، ٣: ٤٨٨ والحديث عند الامام أحمد من طريق عبدالله بن معيز وهو تابعي مجهول الحال. وقد ذكر الحاكم النيسابوري باسناد صحيح مسلسل بابناء واحفاد ابن مسعود (المستدرك ٣:٥٣) والصحاوي: شرح معاني الاثار ٣: ٢١١.

٢) الحاكم: المستدرك ٣: ٥٣ باسناد صحيح.

٣) ابن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٥٥.

٤) ابن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٥٤٧ ـ ٥٥٢.

کە وتم، بەڵام کوژراوەکانمان لە پێناو خوادا کوژراونو پاداشتیان لای خوایە خوێنبایمان ناوێت".[1]
هەروەها باسی پاشگەزبوونەوەی بەنی سولەیم کراوە، کە خالیدی کوڕی وەلید خەڵکەکەی کۆکردووەتەوە لە گەوڕێکداو ئاگری تێبەردان، پاش ئەوە پێشنیارکردنی عومەر بۆ ئەبوبەکر خالید لابداتو ئەبوبەکریش رازی نەبوو لەسەر لابردنیو فەرموویەتی: "سوێند بە خوا شمشێرێك لانابەم خوا زاڵیکردووەتە سەر دوژمنەکانیدا.. ئینجا فەرمانی پێکردو کەوتەڕێ بەرەو لای موسەیلەمە.[2]

١) سعيد بن منصور: السنن ٢: ٣٣٣ وبعضه في صحيح البخاري (فتح الباري ١٢: ٢٠٦) وفيه ابراهيم بن بشار الرمادي حافظ له اوهام (التقريب ١٥٥).
٢) ابن أبي شيبة: المصنف ١٢: ٥٥٠.

## هەڵبەندی هەڵگەڕاوەکان

### یەمەن :

یەمەن بەناو سەر بە ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی بوو، ساسانیەکان دەسەڵاتیان لە یەمەن بوو لەو سەردەمەی کە (سیف بن ذي یزن) پەنای پیانبرد بۆ دەرکردنی ئەحباشەکان، جا ئەو کاتەی سەیف مرد، سەرکردەی سوپای فارسی لەوێ بووبە فەمانڕەوای یەمەن، فارسەکانیش لە خەڵکی ژنیان هێناو منالەکانیان بە (الابناء) ناسران، بەڵام دەسەڵاتی میری فارسی سنوردار بوو لە صەنعاو دەوروبەری، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەوەی لە وڵات دابەشکراوە لە نێوان (الاذواء)و میرە ناوخۆیەکانو سەرۆك عەشیرەتەکان کە هەمیشە لە بەربەرەکانیدا بوون، بە تایبەت هۆزە گەورەکانی ئەزدی شەنوئە (بەنوحاریسو نەخەعو بوجەیلەو خەسعەمو عەکو ئەشاعیرەکان) ئەمانە لەلای ڕۆخی دەریا دەژیان، بەڵام مەدحەجو هەمەدان لە تەپۆڵکە دەژیان لە ناوەوە.

سەرهەڵدانی ئەسوەدی عەنسی ـ بە پی ڕیوایەتی ڕاست ـ پێش حەجکردنی ماڵئاوای بوو لە ساڵی دەی کۆچی،[1] کە ئەوە یەکەم هەڵگەڕانەوە بوو لە ئیسلامداو چوار مانگی خایاند،[2] سەیفی کوڕی عومەر دەنگوباسی ئەم هەڵگەڕانەوەی بە درێژی گێڕاوەتەوە بە پشتبەستن بە چەند شایەتحاڵێك وەکو فەیروزی دەیلەمیو جەشیشی دەیلەمی، ئەسوەد سەربە عەنسە لە هۆزی مەدحەج کە بە گەورەترین هۆزەکانی یەمەن دەژمێردرێت، ئەو لە ناوچەی (کهف خبان) بوو لە نزیکی شاری نەجران،[3] بە (ذي الخمار)و (رحمن الیمن) دەناسرا قەشە بوو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، هەندێ لە هۆزەکانی مەدحەجیش پشتگیریان لێکرد، سەرەتا دەستی بەسەر نەجران گرتو ئینجا صەنعاو فەرمانڕەواکەشی کوشت کە شەهری کوڕی بادام بوو، سەرکردەکانی (الانباء)یش وایان دەرخست کە سەر بە ئەسوەدن، موعازی کوڕی جەبەلو ئەبوموسای ئەشعەریش ناچار بوون لەگەڵ شکوێنکەتووەکانیان بکشێنەوە بەرەو حەزرەمەوت، ئینجا خەڵکی نەجرانیش هەڵسان بە دەرکردنی عەمری کوڕی حەزمو خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، ئیتر ئەوانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە، قەیسی کوڕی مەکشوحیش کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی هۆزی موراد هەڵسا بە دەرکردنی

---

١) البخاري: الصحیح، کتاب المغازي باب ٧٠ ومسلم: الصحیح حدیث رقم ٢٢٧٢.

٢) الطبري: تاریخ ٣: ٢٣٩ـ ٢٤٠.

٣) ابن حبیش: المغازي ٤٠، والکلاعي: حروب الردة ٢١٣.

فەروەی کوڕی میسك کە کاربەدەستی موسڵمانان بوو، ئینجا قەیسی کوڕی مەکشوحیش پاڵی دایە پاڵ ئەسوەدی عەنسیەوە، هەروەها عەمری کوڕی مەعدیکەرەبی زەبیدیش کە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی هۆزی مەدحەج بەهەمان شێوە پشتگیری خۆی بۆ ئەسوەد ڕاگەیاند، ئەوانەش لەسەر موسڵمانێتی خۆیان مانەوە لە خەڵکی یەمەن لەگەڵ فەرمانڕەوا موسڵمانەکان لەناوچەکە دوورکەوتنەوە.

هێزی ئەسوەد لەوە خۆی دەبینی کە ئازاو بەهێزو زەبەلاح بوو لە قەدو باڵایدا، هەروەها جادوو قەشەیەتی بەکاردەهێنا، لەگەڵ وتاربێژی سەرنج ڕاکێشیدا "ئەسوەد قەشەیەکی فێڵبازو ساختەچی بوو، شتی سەیری پیشانی دەدان، دڵەکانی بۆ خۆی ڕادەکێشا بە قسەکانی"،[1] هەروەها ئەو پارەشی بەکاردەهێنا بۆ کارتێکردنی خەڵکی ئەم جۆرە خەسڵەتانەش لە کەسێکی ناوداری کرد لەناو میللەتەکەیدا، دیارە بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش پلەوپایەی لاواز دەکرد، چونکە ئیسلام قەشەیەتی قەدەغە دەکات، ڕێگە بە خەڵکیش نادات ڕاوێژ بە قەشەکان بکەن.

ئەسوەد باسی وەرگرتنی زەکاتی لە یەمەن وروژاند. ئینجا نامەی نووسی بۆ کۆکەرەوانی زەکات لە ناوچەی یەمەن "ئەی لە دەرەوە هێنراوەکان بۆ سەرمان، ئیتر بەس بێت ماڵخواردنمان ئەوەی کۆتانکردووەتەوە بەجی بهێڵن بۆمان، ئێمە لە پێشترین پێ، ئێوەش هەروا بمێننەوە".[2] پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لەو موسڵمانانەی کە لە نەجرانو حەزرەمەوت کۆبوونەوە بەرگری ئەسوەد بکەن، موعازی کوڕی جەبەلیش سوودی وەرگرت لە دووبەرەکی لە بزووتنەوەی ئەسووەددا، چونکە ئەبنائەکان دڵسۆز نەبوون بۆی بەهەمان شێوە قەیسی کوڕی مەکشوحیش، بۆیە توانیان لەناو کۆشکەکەی خۆیدا بیکوژنو گەڕانەوە بۆ ئیسلام ڕابگەیەنن.[3]

## هەڵگەڕانەوەی یەمامە:

یەمامە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دوورگەی عەرەبەوە، بریتیە لە دۆڵێکی بەرهەم زۆری ئاو بە خوڕەم، گەنمو جۆو زەڕاتو دارخورمای تیا دەچێنرێت، لادێکانیشی تیا بڵاودەبێتەوە، زۆربەی

١) الطبري: تاريخ ٣: ١٨٥.
٢) الطبري: تاريخ ٣: ٢٢٩.
٣) عبدالعزيز نور ولي: حركة الردة ١٨٢ـ ٢٠٧.

دانیشتوانەکانیش لە بەنی حەنیفە بوون، هەندێکیشیان لەبەنی بەکر یان بەنی تەمیم بوون، بە تایبەت لە باکووری یەمامە، ئینجا پیشەسازی دروستکردنی شمشێرو نووکە ڕمیشی تیادا بوو.

لە قەتەریش مەڵبەندێکی بانگخوازانی مەسیحی نەستووریەکانی تیادا بوو، کە بیزەنتیەکان دووریان خستبونەوەو ئەوانیش خۆیان دابووە پاڵ ساسانیەکانو لەولاتی فارسیشەوە بانگەشەیان گەیاندبووە یەمامە،[1] بەنو حەنیفەش لە ساڵی نۆی کۆچی هاتنە ئاینی ئیسلامەوە و نێردەیان ناردە لای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، بە ئامادەبوونی خودی موسەیلەمەی کوڕی حەبیب، شایانی باسە کە موسەیلەمە هەر لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ جاڕیدا بۆ پێغەمبەرایەتی خۆی، لەوانەشە لە دوای گەڕانەوەی لەگەڵ نێردەکەدا ئەوەی کردبێت، دەسەڵاتی زۆربوویەوە لە پاش مردنی هەودەی کوڕی عەلی سەرکردەی یەمامە دوا بەدوای فەتحی مەککە.[2] موسەیلەمە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە سروشی بۆ دادەبەزێت، بەرنوێژێکیشی بۆ خۆی دروستکردبوو لەگەڵ ڕاگرتنی بانگخوێنێك ناوی حوجەیر بوو، نوێژیشی کرد بە سێ کات، سبەینانو نیوەڕوانو خەوتنان،[3] سنووری بۆ منالبوونیش دانابوو بەیەك منالّ، (الجاحظ) دەگێڕێتەوە کە موسەیلەمە پێش بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی لە بازاڕەکانی عەرەبدا دەگەڕا بۆ فێربوونی فێڵو تەڵەکەو نێرنجەو ئەستێرەناسیو پێشبینی کردن، تا کارامە بوو و شارەزای تەواوی پەیدا کرد لە فرۆفێڵی بەختگرەوە و قەشە و جادووگەر و هاوەڵانی جنۆکەکە و دەڵێن پاشکۆیان لەگەڵە،[4] سەرچاوەکان ئەو ئایەتانەیان لە موسەیلەمە گێڕاوەتەوە کە بەرهەڵستی قورئانی پێکردووە، شێوازەکەشی لەنگیو ناتەواوی پێوە دیارە، لەوانەشە لە دروستکردنی هەواڵ گێڕەوەکان بێت، بۆیە ناکرێت پشتیان پێببەسترێت بۆ ناسینی بنەما بیروباوەڕیەکانی.[5] ئینجا زۆربەی بەنی حەنیفە لە دەوری کۆبوونەوە، هەندێکیان بە نەفامیو

١) احسان صدقي العمد: حركة مسيلمة الحنفي ص٣١ـ ٣٢ (بحث في حوليات، كلية الآداب، جامعة الكويت، الحولية العاشرة ١٤٠٩ (١٩٨٨).

٢) البلاذري: فتوح البلدان ١: ١٠٥.

٣) البلاذري: فتوزح البلدان ١: ١١٨، وأبو الفرج الاصفهاني: الاغاني ٢١: ٣٧، وابن طباطبا: الفخري في الآداب السلطانية ٧٤.

٤) الجاحظ: كتاب الحيوان ٤: ٣٦٩، ٣٧٠.

٥) احسان صدقي العمد: حركة مسيلمة الحنفي ٣٦ـ ٤٠.

باوەڕپێکردن وەکو کەسە ئاسایەکانی هۆز، هەندێکیشیان بە دەمارگیریی وەکو خەڵکە تایبەتەکانی هۆز کە دەیانوت: (درۆزنی ڕەبیعەمان بەلاوە باشترە لە ڕاستگۆیی موزەر).

بانگەشەی موسەیلەمە گەورەتر بوو پاش هاتنی ڕەججالی کوڕی عەنفەوە لە مەدینەوە، کە ئەو فێری قورئان بوو بوو لەگەڵ شارەزایی ئاینیشدا، کاتێك بینی بەنی حەنیفە پێڕەویی موسەیلەمە دەکەن لە ئیسلام پاشگەزبوویەوەو باوەڕپێکردنی موسەیلەمەی ئاشکرا کرد، بۆیە ئاژاوەکەی ڕەججال گەورەتر بوو لە موسەیلەمە.

موسەیلەمە لە کۆتایی ساڵی دەی پاش حەجیماڵئاوایی نامەی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺو تیایدا نووسی: "من بەشدارم لەگەڵتدا لەم مەسەلەیە، نیوەی سەرزەوی بۆ ئێمەیەو ئەو نیوەکەشی بۆ قورەیشە"[1] کاتێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، دەسەڵاتی موسەیلەمە زیادیکردو هاوپەیمانێتی بەست لەگەڵ سەجاحی تەمیمی، دەشگێڕنەوە کە مارەشی کردووە، بەڵام ئەم هاوپەیمانێتیە بەردەوام نەبوو بەهۆی کشانەوەی سەجاح بە هێزەکانیەوە لە یەمامە لەدوای وەرگرتنی نیوەی داهاتەکانی.[2]

ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) پەیبرد بە ترسناکی پاشگەزبوونەوەی بەنی حەنیفە لەبەر هێزو زۆریو خۆشگوزەرانیو کۆبونەوەیان لەسەر موسەیلەمە.

### پاشگەزبوونەوەی تولەیحەی ئەسەدی:

هۆزی غەتەفان کە نیشتەجێی ڕۆژهەڵاتی خەیبەر بوون دەستیان دەگرتەسەر باکووری حیجازدا بەهاوپەیمانێتی لەگەڵ هۆزی تەیو جولەکەکانی خەیبەر، جا لەپاش کەوتنی خەیبەر بەدەست موسڵمانان لە ساڵی حەوتی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ هەستی کرد بە ناردنی هەڵمەتەکانی بۆ باکوور، تولەیحەی کوڕی خوەیلددی ئەسەدیش هەوڵیدا دەسبگرێتە سەر باکووری نیوە دوورگەدا لە ڕێگەی هاوپەیمانیکردن لەگەڵ هۆزەکانی تەیو فەزارە (کە گرنگترین لقەکانی غەتەفانن) لە کۆتایی ژیانی پێغەمبەر پڕوپاگەندەی پێغەمبەرایەتی کردو گوایە فریشتەیەك بەناوی (ذو النون) سروشی بۆ دەهێنێ، سەرچاوەکانی مێژوویش هەندێ ئایەتی شێواز ناتەواویان لێگێڕاوەتەوە کە دەیخوێندەوە،

١) ابن هشام: السيرة النبوية ٦٠٠، وابن سعد: الطبقات الكبرى ١: ٢٧٣. مەبەستی لە نیوەی سەرزەوی نیوەی داهاتی یەمامەیە (احسان صدقي العمد: حركة مسلمة الحنفي ٤٨).

٢) الطبري: تأريخ ٣: ٢٧٢.

سەرقاڵبوونی پێغەمبەر ﷺ بوو بە مایەی گەورەبوونەوەی مەسەلەی تولەیحە لە کاتی خیلافەتی ئەبوبەکردا (رەزای خوای لێبێت)، ئەسەد و غەتەفان و تەی لەسەر تولەیحە کۆبوونەوە، ئیتر دەیەکیشیان نارد بۆ مەدینە داوایان لە ئەبوبەکر کرد کە زەکاتیان لەسەر لابدات، بەڵام ئەبو بەکر ڕازی نەبووو فەرمووی: ئەگەر نکۆڵی لە گوریسێك لە دەکەن پێشتر دەیاندا من شەڕیان لەگەڵ دەکەم.[1] لەوانەشە زانیبێتی کە داواکاری عەرەبە بیابانشینەکان لەو سنورەدا ناوەستێ، جگە لەوەی کە کارێکی لەو جۆرە لە توانای ئەودا نی یە، نێردەکە بینیان هێزی موسڵمانان لاوازە لە مەدینە لە پاش دەرچوونی هەڵمەتەکەی ئوسامە، بۆیە ئەو هۆزانە زاتیانکردە سەر هێرشبردنە سەر مەدینە.

## تەشەنکردنی پاشگەزبوونەوە :

وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بوو بەمایەی هەڕەشە لەسەر یەکپارچەیی دەوڵەتی ئیسلامی تازەپێگەیشتوو، چونکە بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوە بەسەرانسەری دەوڵەت ـ حیجاز نەبێت ـ بڵاوبوویەوە، لە هەمووشیان مەترسیدارتر بزووتنەوەی موسەیلەمەی حەنەفی بوو، کە دوور بوو لە شاری مەدینەوە، بەڵام جووڵەکانی تری پاشگەزبوونەوە نزیك بوون لە مەدینە وەبە گەیشتنی هەواڵی لەدونیا دەرچونی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵانێکی زۆر لە بەنی ئەسەد و غەتەفان و تەمیم و بەحرێن و عومان و حەزرەمەوت هەڵگەڕانەوە، هەروەها پاشگەزبوونەوە لەیەمەنیش تازە بوویەوە.

هەڵوێستی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) بەرامبەر ئەو بزووتنەوانە هەڵوێستێکی توندوتۆڵ بوو، بەهیچ شێوەیەکیش کەمتەرخەمی نەکرد لە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بیروباوەڕو دەوڵەت، بۆیە دوانەکەوت لە کۆکردنەوەی سوپا، چەنوچۆنیشی نەکرد لە حوکمەکانی ئیسلامو هەوڵی هەندێ لە هۆزەکان بۆ دەرباز بوون لەزەکاتدان. عومەر (رەزای خوای لێبێت)، هەوڵی دەدا قایلی بکات بە نەرمی مامەڵەکردن لەگەڵ دەرنەکەرانی زەکات، بۆ ئەوەی یەکلابیێتەوە بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکان لە هەموو ئیسلام لەوانەی کە گەڕانەوە بۆ بتپەرستیو شوێنکەووتوی ئەوانە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، بەڵام ئەبوبەکر بەتوندی ئەو بۆچوونەی ڕەتکردەوە، ڕوونیشی کردەوە بۆ هاوەڵان (رەزای خوایان لێبێت)و فەرمووی: "سوێند بەخوا جەنگ بەرپادەکەم لەگەڵ ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان نوێژو زەکاتەوە، زەکات مافی سەروەتو سامانە، سوێند بە خوا ئەگەر کارە

١) الطبري: تأريخ ٣: ٣٤٤.

میەکیان دەدایە پێغەمبەر ﷺو ئێستا نکۆڵی لێبکەن شەڕیان لەگەڵ دەکەم لەسەری"[1] بەم شێوەیش هاوەڵان (رەزای خوایان لێبێت) رازیبوون بە شەڕکردنو زانیان کە هەڵبژاردنێکی راستە.

ئەم روونیە لە تێگەیشتنی پەیوەندیی حوکمە شەرعیەکان بەیەکترەوە، ئینجا رەتکردنەوەی هەر جۆرە پاساوێك بۆ یەکخستنی فەرمانێك لە فەرمانەکان، هەنگاوێکی گرنگ بو بۆ شەڕکردن لەگەڵ قەدەغەکەرانی زەکات بەتایبەتی، چونکە شوبهەی مانەوەیان لەسەر ئیسلام لەلای هەندێك هەبوو کەلەو حاڵەتە گیانیشیان پارێزراو دەبێت لەبەر داننانیان بەشایەتماندا، ئەمەش بوو کە ئەبوبەکر (رەزای خوای لێبێت) هەڵسا بە چارەسەرکردنی بە روونکردنەوەو بەڵگە. خۆ ئەگەر رازی بووبایە بە جێبەجێکردنی داواکاریەکەیان، لەوانەیە عەرەبە بیابانشینەکان داواکاری تریان بوایە لە یەکخستنی هەندێ فەرمانو پابەندبوونی شەرعی دیکە... ئەگەریش قایل بوایە ئەوان هەستیان بەلاوازیی موسڵمانان دەکردو تەماعیان زیاتر دەبوو.

عائیشە (رەزای خوای لێبێت) دەوڵەتو بنیاتنەرانی لە هاوەڵان کردووەتە نموونەی "بزنێك لە باخێکدا لە خاکێکی حەوت گۆشەدا"، ئەمەیش نیگارگیریەکی وردە بۆ حاڵەتی مەترسی لەرادەبەدەر بەبۆنەی دەورەدانی دوژمنانی لیان لە هەموو لایەکەوە، هەروەها وەسفی ئەبوبەکری کردووە لەسەرکردایەتی کردنیدا، دیدێکی روونو نیازو بڕیارێکی توندو بۆچوونێکی راست "سوێند بەخوا لە شتێکدا ناکۆك نەدەبوون باوکم چارەسەری نەکات".[2]

جێگەی داخیشە کە هەواڵگێڕەوەکان تاکەوە بوونە لە وێنەگرتنی رووداوەکانی پاشگەزبوونەوە لە سەرانسەری دوورگەی عەرەب بێ بەشدارکردنێکی گرنگ لەلایەن فەرموودەناسانەوە، ئەوەیش وادەکات کە تواناممان نەمێنێت رەخنەگرتن ئەنجام بدەین لەسەر ریوایەتەکان..

ئەم وێنەیەش کە دەریدەخەین لێرەدا، روونیدەکاتەوە کە بزووتنەوەکانی پاشگەزبوونەوە جیاوازبوونە لە بۆچوونەکانیان لە بیروباوەڕدا، هەندێکیان درێژە پێدانبوون بۆ ئەو بزووتنەوانەی دوای ساڵی دەیەمی سەردەمی پێغەمبەرایەتی سەریانهەڵدا، وەکو پاشگەزبوونەوەی بەنی حەنیفە ـ یەکێکە لە لقەکانی بەکری کوڕی وائیل ـ لە یەمامە بە سەرۆکایەتی موسەیلەمەی درۆزن، هەندێکیشیان پەیوەست بون بە بانگەشەکەرانی پێغەمبەرایەتی نوێ وەکو پاشگەزبوونەوەی بەنی ئەسەدو

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢: ٢٧٥)، ومسلم: الصحيح ١: ٥١.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ١٤: ٥٧٢ باسناد صحيح، وابن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٠٩ عن هشام بن عروة عن ابيه عن عائشة.

فەزارەکە ئەمانە پەیوەندیان هەبوو بە تولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیەوە. هەروەها پاشگەزبوونەوەی بەنی یەربووع لە تەمیم بەسەرۆکایەتی سەجاح ئەمە لەکاتێکدا کە هەندێکی تریان دەوریاندا لە مالیکی کوڕی نوەیرە، کە نکۆڵی دەکرد لەوەی زەکات بدرێت بە ئەبوبکر. بەنو عەتاریدی تەمیمیش هاوپەیمانیان کرد لەگەڵ موسەیلەمەدا..

هۆزی سولەیمی عەدنانیش لە بەرزایی نەجد لەنێو خۆیاندا دابەشبوون، هەندێکیان لەسەر ئیسلامەتی خۆیان مانەوە، هەندێکیشیان پاشگەزبونەوە، واشدەردەکەوێت نزیکیان لە مەدینەو بەشداریکردنی زۆرێك لە پیاوەکانیان لە شەڕەکانی فەتحی مەککەو حونەینو تائیف، بوو بە هۆکارێك بۆ خۆڕاگرتنی زۆرێکیان بەرانبەر ئەوانەی تریان کە پاشگەزبووبوونەوە.

فەزارەیش ـ کە بەشێکە لە هۆزی غەتەفان ـ لە نەجد بە سەرۆکایەتی عویەینەی کوڕی حیصن هاوپەیمانێتیان کرد لەگەڵ تولەیحەی ئەسەدی.

هەندێکی تریش لە بەشەکانی هۆزی بەنی بەکری کوڕی وائیل لە بەحرێن بەسەرۆکایەتی حوتەمی کوڕی ڕەبیعە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، هۆزی عەبدولقەیسیش جێگیر بوون لەسەر ئیسلام بەسەرکردایەتی جارودی کوڕی موعەیدی، بەڵام زاڵبوون لە بەحرێن بۆ هەڵگەڕاوکان بوو لە ئیسلام پێش گەیشتنی هێزەکانی ئیسلام لە مەدینەوە.

هۆزی ئەزدیش لە عومان لە نێوان خۆیاندا دابەشبوون، هەندێکیان بەسەرکردایەتی جەیفەرو عەببادی کوڕانی جەلەندی هەر لەئیسلام مانەوە، هەندێکیشیان دوای (ذي التاج) لوقەیتی کوڕی مالیکی ئەزدی کەوتن کە دەستی گرت بە سەر عومانداو جەیفەرو عەببادیان دەرکرد بۆ چیاو ڕۆخەکانی دەریا.

سەبارەت بە هۆزەکانی حەزرەمەوتیش، کە بریتی بوو لە هۆزەکانی کیندەو سەکاسیكو سکون، هەندێکیان پارێزگاریان کرد لەسەر پشتیوانکردنیان بۆ ئیسلامو بەیعەتیشیاندا بە فەرمانڕەوا زیادی کوڕی لەبیدی بەیازی، لەکاتێکدا هەندێکی تریان پەیوەندیان کرد بە ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی کە قەدەغەکردنی زەکاتی کرد، دوای ئەوەش پشێوی ڕانەوەستا لە حەزرەمەوت تا ئەوکاتەی هێزکانی ئیسلام گەیشتن.

سەرەڕای ئەوەش کە بزووتنەوەی ئەسوەدی عەنسی هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەناو برا، بەڵام وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ڕێگای خۆشکرد بۆ دابەشبوونێکی مەترسیدار لەنێو هۆزەکاندا،

هەندێکیان کۆبوونەوە لە دەوری فەرمانڕەوا فەیرووز کە لە (الأبناء) بوو، هەندێکیشیان لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دەرچوون وەکو قەیسی کوڕی عەبدویەغوس(مەکشوح) کە تەماعی سەرۆکایەتی هەبوو، پەناشی بردە بەر پاشماوەکانی بزووتنەوەی ئەسوەدی عەنسی.

بەم شێوەیش بزووتنەوەکانی پاشگەزبوونەوە تەشەنەیان کرد لەسەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، لە باکووری دورگەو ڕۆژهەڵاتیو باشووری، زۆریشی نەمابوو دەوڵەتی ئیسلام لەناو ببەن.

## باسی سێیەم:

## سەرکوتکردنەوەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە مەبەستی سەرکوتکردنەوەی هەڵگەڕاوەکان لە ئیسلامو ئینجا کۆمەڵکردنی ئەوانەی لەسەر ئیسلام مابوونەوە لە مەڵبەندەکانی پاشگەزبوونەوە، پشتی بەست بە خەڵکی مەدینەو مەککەو تائیفو دەوروبەری.

هیچ ئاماژەیەکیش نەهاتووە کە یەکێك لە خەڵکی مەدینە بیری کردبێتەوە لە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، بە هەمان شێوە خەڵکی مەککەیش جێگیر بوون لەسەر ئیسلام، بەڵام لەوانەیە هەندێك بیریان لەپاشگەزبوونەوە کردبێت، بۆ نموونە عەتابی کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبو عاص ـ کاربەدەستی مەککە ـ خۆی شاردەوە، سوهەیلی کوڕی عەمریش هەڵوێستێکی شەرەفمەندانەی نواند کە کاریگەری باشی هەبوو لەسەر جێگیرکردنی خەڵکیی لەسەر ئیسلام، گوتاری ئاڕاستەیان کرد وتی: "ئەم شتە تەنها ئیسلام بەهێزتر دەکاتەوە، جا ئەگەر گومانمان لە هەرکێ بوو لەگەردنی دەدەین"، بەهەمان شێوە خەڵکی تائیف، لەسەر دینداری خۆیان جێگیر بوون، لەوانەشە هەندێکیان خەریکبوبێت هەڵگەڕێنەوە لە ئیسلام، عوسمانی کوڕی عاص ـ کاربەدەستی تائیف ـ وتاری ئاڕاستە کردن و وتی: "ئەی ڕۆڵەکانی سەقیف، ئێوە ئاخرین کەس بوون موسڵمان بوون، نەکەن ببن بە یەکەمین کەسانێك لێی هەڵگەڕێنەوە".

لەوانەشە پەیوەندیی پتەوی مەککەو تائیف وایکردبێت سەقیف پەنا ببەنە بەر هێمنی وەکو مەککە.

دانیشتووانی هەرسێ شارەکە بەشێکیان بەرکەوت لە پەروەردەی ئیسلامییو ئامۆژگاری پێغەمبەرایەتی زیاتر لە شوێنەکانی تر، ئاشنای ڕێنمایەکانی ئیسلامیش بوون لە نزیکەوە، شارەزایشیان تیا پەیدا کرد، بۆیە دانیشتوانی تەوەرەی (مەدینە ـ مەککە ـ تائیف) هەر هەڵسان بەکاروباری ئیسلامو شەڕوشۆڕی پاشگەزبووەکان، لەوەشدا یارمەتیان وەرگرت لە ئەو کەسانەی لەسەر ئیسلام مابوونەوە لە خوودی ناوچەکانی پاشگەزبوونەوەدا.

یەکەمین پێکدادانیش ڕوویدا لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، لە خیلافەتی ئەبوبەکردا بوو (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ هۆزەکانی فەزارەو ئەسەد کە دەرچوونی هێزەکانی ئوسامەیان قۆستەوە لە مەدینەو هەوڵیاندا هێرش ببەنە سەر مەدینە، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) پارێزگاری بۆ مەدینە

ڕێکخست، موسڵمانانیشی ناچارکرد کە ئامادەبن بۆ نوێژەکان لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وەکو ئامادەباشی بۆ ڕووداوی کتوپڕ، دواتر دەرچوو لەگەڵ موسڵماناندا بۆ ناوچەی (ذی القصة) ـ ماوەی بەریدێك دووربوو لە مەدینەوە بەلای نەجددا. لەوێ یەکەمین هێرشی عەبس و دوبیانی شکاندنەوە بۆ سەر شاری مەدینە، پاش زیاتر لە مانگێك لە دەرچوونی هێزەکەی ئوسامە. دوای چەند ڕۆژێك ئوسامە گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) کردی بەجێنشینی خۆی لە مەدینە و چوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی عەبس و دوبیان لە ڕەبەدەو تێکیانی شکاند، کاتێك سەربازەکانی ئوسامە حەسانەوە، ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) یانزە بەیداخی بەدەستی خۆی بەست بۆ شەڕی پاشگەزبووەکان، فەرماندەکانی لەسەریان دەستنیشانکرد بەم شێوە:

١ـ خالیدی کوڕی وەلیدی[1] ئاڕاستە کرد بۆلای تولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی لە بەنی ئەسەد، دوای ئەوانیش بۆ لای مالیکی کوڕی نوەیر لە تەمیم.

٢ـ عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل، بۆلای موسەیلەمەی کوڕی حەبیبی درۆزن لە یەمامە، بەڵام سەرکەوتوو نەبو لە کارەکەی، بۆیە فەرمانی پێکرد بچێت بەرەو عومان.

٣ـ موهاجیری کوڕی ئومەیە، بۆ یەمەن بۆ لەناوبردنی قەیسی کوڕی عەبدو یەغوسی (مەکشوح) ئەمجا بۆ حەزرەمەوت بۆ لەناوبردنی کیندە بە سەرکردایەتی ئەشعەسی کوڕی قەیس.

٤ـ خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، بۆ سنوورەکانی شام.

٥ـ عەمری کوڕی عاص، بۆ خوزاعە.

٦ـ حوزەیفەی کوڕی یەمان، بۆ دوبا.

٧ـ عەرفەجەی کوڕی هەرسەمە، بۆ مەهرە.

٨ـ شورەحبیلی کوڕی حەسەنە، بۆ یارمەتیدانی عیکریمە.

٩ـ حوزەیفەی کوڕی حاجیز، بۆ بەنی سولەیم.

١٠ـ سوەیدی کوڕی موقەڕین، بۆ تیهامەی یەمەن.

---

١) فەرموودەی: "نعى رسول الله ﷺ اهل مؤتة على المنبر ثم قال: فاخذ الراية خالد بن الوليد وهو سيف من سيوف الله". واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی موجاهیدانی موئتەی ڕاگەیاند لەسەر مینبەرو فەرمووی: دوای ئەوە ئاڵاکە خالیدی کوڕی وەلید هەڵیگرت کە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا. اخرجه الحاكم : ٣: ٢٩٨ وصححه وتعقبه الذهبي بقوله: لم يسمع ايوب ـ وهو السختياني ـ من انس ـ وهو ابن مالك الصحابي ـ لكنه راه.

١١ـ عەلای کوڕی حەزرەمی، بۆ بەحرێن.[1]

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) نامەشی ئاڕاستە کرد بۆ هەموو پاشگەزبووەکان، پێشی سوپاکان کەوتن، نامەکان بیرخستنەوەو ئامۆژگاریو ترساندنی لەخۆ گرتبوو، ئارامیش بۆ ئەو کەسەیە گوێڕایەڵی بکاتو بگەڕێتەوە بۆ ئاینی خۆی.

## لەناوبردنی هەڵگەڕانەوەی توڵەیحەی ئەسەدی:

عەبسو دوبیان لە پاش تێکشکانەکەیان کۆبوونەوە لە (ذي القصة) لە دەوری توڵەیحە لە ناوچەی بەزاخە، ژمارەیەکیش لە پیاوانی تەی پیان گەیشتن، جا کاتێك ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) خالیدی کوڕی وەلیدی ئاڕاستەکرد بۆ لەناوبردنی توڵەیحە، عەدی کوڕی حاتەم هەوڵێکی سەرکەووتویدا، تیایدا قەناعەتی کرد بە هۆزی تەی بگەڕێنەوە بۆ ئیسلامو بچنە ڕیزی سوپاکەی خالیدیشەوە، بێگومان ئەوەش توڵەیحەی لاوازکرد، عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاریش سوپاکەی تولەیحەی سەرکردایەتی دەرکردو حەوت سەد جەنگاوەری خەڵکی فەزارەی لەگەڵدا بوو، جا کاتێك خالید بە سوپای ئەسەدو فەزارە گەیشتو شەڕ گەرم بوو، عویەینە بە دروستی بۆیان دەرکەوت کە تولەیحە درۆزن بوو، بۆیە لەگەڵ فەزارەدا لە شەڕەکە کشانەوە... تولەیحەیش هەڵهات بەرەو شامو لەویش گەڕایەوەو موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند و بەردەوامیش لەسەر ئیسلام هەر مایەوە.

## لەناوبردنی مالیکی کوڕی نوەیرە:

دوای ئەوەی کە خالید پاشگەزبوونەوەی بەنی ئەسەدی سەرکوتکردەوە، ڕوویکردە ناوچەکانی تەمیم، کاتێك مالیکی کوڕی نوەیرە بەهاتنی موسڵمانانی زانی، داوایکرد لە کەسو کارەکەی بڵاوە بکەن بۆ ناوماڵەکانیان، چونکە توانایان نیە بەرەنگاریان بکەن ـ خۆیشیان دووبەرەکیان تیادا بووـ موسڵمانان چوونە ناو ماڵەکانی تەمیمەوەو مالیکیان بەدیلی گرت، خالید مشتو مڕی لەگەڵ کرد، کاتێك بۆی دەرکەوت لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوەو زەکاتی قەدەغەکردووە، فەرمانی کرد بە کوشتنی و ئیتر کوژرا، خالید لەیلای خێزانی مالیکی مارەکرد دوای تێپەڕبوونی عیددەکەی، هەندێ ڕیوایەتی هەڵبەسراو لە کتێبەکانی مێژوودا هاتووە ئاماژە بەوە دەکات کە خالید مالیکی کوشتووە سەرەڕای ئەوەی کە لەسەر ئیسلام بووە، یان کوژرانی مالیك بە بۆنەی هەڵەگەیشتن بووە لە وتەی خالد "ادفئوا اسراکم" ئەم وتەیەیش لە زمانی ئەواندا واتای کوشتنی گەیاندووەو خالید

---

[1] الطبري: تأريخ ٣: ٢٤٩ من رواية سيف.

مەبەستی کوشتنی نەبووە، ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) پێی ناخۆش بوو کە خالید هەڵسا بە مارەکردنی لەیلا، عەرەب ڕقیان لە ژنهێنان بوو لە بارودۆخی شەڕدا.[1]

## لەناوبردنی پاشگەزبوونەوەی موسەیلەمەی درۆزن :

لەپاش سەرکوتکردنەوەی خالید بۆ پاشگەزبوونەوەی بەنی تەمیم ڕوویکردە یەمامە بۆ لەناوبردنی پاشگەزبوونەوەی بەنی حەنیفە، پێشتریش عیکریمە تێکشکابوو بەرانبەر بەنی حەنیفەو ئەبوبەکر فەرمانی پێکردبوو بچێت بۆ عومان، بەهەمان شێوە شورەحبیلی کوڕی حەسەنە هەرەسی هێنابوو لە دژیانو دواتر چووە پاڵ سوپاکەی خالید، موسەیلەمە چل هەزار کەسی لە هۆزەکەی خۆی کۆکردەوە[2] بەو هێزەوە پێشکەوت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خالید، ئیتر جەنگی عەقرەبای سەخت هەڵگیرسا، ئەو جەنگەی کە موهاجیرو ئەنصارەکان ئازایەکی بێوێنەیان تیایدا پیشاندا، بەنی حەنیفەیش بەرگریو زاتکردنێکی زۆریان پیشاندا تەنانەت خالید خۆی شایەتی دا بۆیان، سوپای موسڵمانانیش نزیکەی (١١٠٠٠) جەنگاوەر بوون،[3] دوو هەزارو پێنج سەدیان لە موهاجیرو ئەنصار بوو[4]، ئەوانی تریش لە خەڵکی بیابانەکان بوون لەو کەسانەی کە لەسەر ئیسلام جێگیر بووبوون.

لە سەرەتای ڕووبەڕووبوونەوە، موسڵمانان پاشەکشیان کرد بەرانبەر زۆریی هێزی دوژمنەکانیان تا گەیشتنەوە جێو ڕێی خۆیان، ئەوسا سەرکردە نەبەردەکان هاواریان کرد لیان، ئەنصارەکان داوایان لە خالیدی کوڕی وەلید کرد، با هەر هۆزێك بە جیا شەڕ بکات، خالید بە بۆچوونەکەیان قایل بوو، ئیتر موهاجیرەکانو ئەنصارەکان هەریەکەو لە بەرەیەکدا جەنگیانکرد، هەمووو هۆزێکیش لە بەرەیەکدا شەڕیانکرد بۆ ئەوەی ئازا لە لاواز جیاببێتەوەو بزانن موسڵمانان لە کام لاوە زەفەریان پێدەبڕێت، ئیتر هەموان کێبڕکێیان دەکرد لە جەنگدا، توانیشیان بەنی حەنیفە بگەڕێننەوە بۆ باخچەی مەرگ، ئەمجا

---

١) راجە صادق ابراهیم عرجون: خالد بن الولید.

٢) ڕیوایەتەکان زیادەڕەوی دەکەن لە مەزەندەکردنی ژمارەی سوپای موسەیلەمە، بۆ نموونە (ابن کثیر) دەڵێت نزیك سەدهەزار کەسن یان لەوەش زیاترن، لە شوێنێکی تردا دەڵێت چل هەزار کەس بوون (البدایة والنهایة ٦: ٢٦٨)

٣) (ابن کثیر) دەگێڕێتەوە کە یانزە هەزار کەس بوون (البدایة والنهایة ٦: ٢٦٨) بەنی حەنیفە باخچەیەکی زۆر گەورەیان هەبوو، شوورەی بەرزی هەبووە، لەگەڵ دەرگای قایمو بەهێزدا، پەنایان بۆی دەبرد لەکاتی قەیرانو نارەحەتیدا، جا کاتێك کە تێکشکان لە شەڕەکەدا هەموویان ڕایانکرد بۆ ئەو باخچەیە، لەوێیش مەرگی سووریان بەرەو ڕووچوو، جا ئەو باخچە بە باخچەی مەرگ ناسرا لەبەر زۆری ئەو کەسانەی لەبەنی حەنیفە تیایدا کوژران (وەرگێڕ)

٤) الدیاربکری: تأریخ الخمسین ٢: ١٦٠.

بەزۆر چوونە ناو باخچەکەوەو هەڵسان بە کوشتنی موسەیلەمەو ڕەججالی کوڕی عەنفەوەو موحەکیمەی یەمامە کە ئەمانە سەرانی هۆزی بەنی حەنیفە بوون" لە ئاکامی ئەم جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمان شەهید بوون ڕیوایەتەکان مەزەندەیان کردووە بە (٤٥٠[١]ـ ١٧٠٠[٢]) شەهید، لە هەندێ ڕیوایەتیشدا هاتووە کە (١٢٠٠)[٣] شەهید بوونە، سێ یان پەنجایان لە هەڵگرانی قورئان بوون[٤]، کە ئەوەیش بوو بە هاندەرێك بۆ کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی ئەبو بەکر.

سەبارەت بە کوژراوانی بەنی حەنیفەیش بەپێی هەندێ ڕیوایەت گەیشتە (١٠٠٠٠) کوژراو[٥]، هەندێ ڕیوایەتی تریش هەیە دەیانگەیەنێت بە (٢١٠٠٠) کوژراو[٦]. تا ئێستاش شوێنەواری گۆڕی شەهیدان لە هاوەڵان ئاشکرایە لە لای شاری جوبێلەی نزیك باخچەی (حديقة الموت)[٧]شەڕەکە بە گرێبەستی ئاشتی کۆتایی پێهات، دوای ئەوەی کە خەریك بوو بەنی حەنیفە بە جارێ لەناو بچن، دوای ئەویش کە جەنگ بە تەواوی موسڵمانانی بێ هێزکردو هەندێك لە چاکترین سەرانیان تیابردو بریندار سەختیش بەزۆرێك لە موسڵمانانەوە بوو، خالید ئاشتەوایی کرد لەگەڵ مەجاعەی کوڕی مەرارەی حەنەفی ـ کەپێش جەنگەکە بەدیل گرتبووی ـ لەسەر ئەوەی کە بەنی حەنیفە بگەڕێنەوە بۆ ئیسلامو قەڵاکانیان بدەن بەدەستەوەو لەگەڵ نیوەی سەروەتو سامانو چەکەکانیان، هەروەها نیوە (یان چواریەکی) کۆیلەکانیشیانو بەشێك لە کێڵگەکانیان.[٨]

یەکێك لە توێژەرەوە هاوچەرخەکان بۆچوونی هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکانو هەڵسەنگاندنیان بۆ بزووتنەوەی موسەیلەمە دەخاتە ڕوو دەڵێت: "لەوانەیە توێژەر لەگەڵ زۆرێك لەڕاوبۆچوونی توێژەرەوانی پێش خۆیدا

١) خليفة بن خياط: التأريخ ١١١.

٢) البلاذري: فتوح البدان ١: ١١١.

٣) البلاذري: فتوح البلدان ١: ١١١، والطبري: تأريخ ٣: ٢٩٦، وابن اعثم: كتاب الفتوح ١: ٤٠، ٤٤، والكلاعي: الاكتف ١٧٦، والدياربكري: تأريخ الخميس ٢: ٢٢٠ فى حين ينفرد برواية اخرى تذكر انهم ١٨٠٠ شهيد.

٤) خليفة: التأريخ ١١١.

٥) الطبري: تأريخ ٣: ٢٩٤، وابن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٢٥، والدياربكري: تأريخ الخميس ٢: ٢٢٠.

٦) الطبري: تأريخ ٣: ٢٩٧، وابن كثير: البداية والنهاية ٦: ٣٢٥. هەروەها بڕوانە بۆ ئەو خشتەی کە (احسان صدقى العمد) هەڵساوە بە دروستکردنی لە توێژینەوەکەیدا: حركة مسيلمة الحنفى ٦٧ـ ٦٨.

٧) الكلاعي: الاكتاف (حروب الردة) ص١٨٠ کولاعی لە یەعقووبی و زوهری دەگێڕێتەوە کە زیاتر لە حەوت هەزار کەس بوونە، حەوتسەدیان لە بەنی حەنیفە بوونە، و احسان العمد: حركة مسيلمة الحنفي ٧١.

٨) الزركلي: اللاعلام ٨: ١٢٥، واحسان صدقي العمد: حركة مسيلمة الحنفي ٦٩.

پێکبێت لەسەر سروشتی بزووتنەوەی موسەیلەمە، لە ڕووی ئەوەی کە پۆشاکی ئاینی لەبەر کردوبانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی لە جیابوونەوە، لەسایەی بۆشایەکی سیاسی کە لە دوورگەی عەرەبدا دروست بووە هەروەها لەپێناو پتەوکردنی شکۆی هۆزایەتی بەنی حەنیفەو بەرەبەرەکانیان بۆ قوڕەیش، ئینجا قایلنەبوونیان بە ملکەچیو شوێنکەوتنی مەدینە، چاوتێبڕینیان بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی هاوتا بۆ قەوارەی مەدینە، کە پارێزگاری بکات لە بەرژەوەندیە سیاسیو کشتوکاڵیو بازرگانیەکان، بەڵام بزووتنەوەی موسەیلەمە - سەرەڕای هەموو شتێك - بزووتنەوەیەکی دروستکراوی کاڵوکرچ لە ڕووی هزرو بیرو باوەڕەوە، بەتایبەتی ئەگەر بەراوردێك بکرێت لەگەڵ ئیسلامو بنەما بەرزەکانیو گشتگیری بیرو باوەڕوشەریعەتی، کە مەسەلەی هۆزایەتیو هەرێمایەتیو نەتەوایەتی تێپەڕاندووە، بەڵکو بەرزیش بوونەوە بۆ ئاستی مرۆڤایەتی جیهانی، بەم شێوەش ئیسلام ئەو بزووتنەوەو هاوشێوەکانیشی بەزاند بە بیرو باوەڕ، پێش ئەوەی بیانبەزێنێت لە گۆڕەپانی جیهادو شەهید بوون، بۆیە بزووتنەوەی موسەیلەمە زیاتر لەوە دەچوو کە بزووتنەوەیەکی کاردانەوەی هەڵەشەو هەڕەمەکیە دژ بە بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی ڕاستگۆو ڕەسەن". [1]

## کۆتای پێهێنانی پاشگەزبوونەوەی بەحرێن:

نەوەکانی بەکرو عەبدولقەیس لە هۆزەکانی ڕەبیعە لە بەحرێن جێگیر بوون، پادشاکەشیان مونزیری کوڕی ساوا موسڵمان بوو لەسەر دەستی عەلای حەزرەمی لەساڵی نۆی کۆچی، مونزیر لە هەمان ئەو مانگەی پێغەمبەر ﷺ وەفاتیکرد تیایدا ئەویش وەفاتی کرد، دوای ئەوەی خەڵکی بەحرێن هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام جگە لە نەوەکانی قەیس کە جارودی سەرگەورەیان توانی قایلیان بکات بە جێگیر بوون لەسەر ئیسلام، حوتەمی کوڕی ڕەبیعە بوو بە سەرکردەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلامو، ئابلۆقەی جاڕوودیدا لەناوچەی جەواسا، جا هەر لەوکاتەدا عەلای حەزرەمی بەسوپایەکەوە هات بۆ بەحرێنو پەیوەندیکرد بە جاڕوودەوە، بۆماوەی یەك مانگ جەنگ بەردەوام بوو لە نێوانیاندا بە پێکدادانێکی یەکلاکەرەوە، شەوێك موسڵمانان ئاگاداربوونەوە لەوەی کە هەڵگەڕاوەکان سەرخۆشبوونە، بۆیە هەر لەو شەوە هێرشیان بردە سەریانو لەناویانبردن و حوتەم کوژراو هەڵگەڕاوەکانیش هەڵهاتن بۆ دوورگەی دارین لە بەرانبەر بەحرێن، لە ڕێگەی بەلەمەوە، موسڵمانان

---
١) احسان صدقي العن: حركة مسيلمة الحنفي ٧٨.

بە ئەسپەکانیان لە ئاوەکەیاندا بۆ دوورگەکەو پاشماوەی هەڵگەڕاوەکانیان کوشتو دەستکەوتێکی زۆریان هێناو گەڕانەوە بۆ بەحرێن.

**کۆتایی پێهێنانی پاشگەزبوونەوەی عومان و موهرە:**

عومان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ملکەچی فارسەکان بوو، دوای ئەوە جەیفەری میریان موسڵمان بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی عاصی نارد بۆلایان ئیسلامیان فێربکات، ئیتر لەسەر ئەوە پێکهاتن کە ماڵی زەکات لەنێو هەژارەکانی ئەو وڵاتە دابەشبکرێتەوە، جا کاتێك پیغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد خەڵکی عومان بەسەرکردایەتی (ذي التاج) لوقەیتی کوڕی مالیکی ئەزدی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئینجا ئەو لوقەیتە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکردو جەیفەریش هەڵهات بەرەو چیاکان.

ڕیوایەتێکیش هەیە باس لە بێزاری خەڵکی عومان دەکات لە دەرکردنی زەکات، قوڕەی کوڕی هوبەیرە بە عەمری کوڕی عاصی وت لەکاتی دەرچوونی لە عومان: "ئەی فلانی، عەرەب لەم بەرتیلدانە بێزارن، وادەبینم ئەگەر واز لە وەرگرتنی ئەو ماڵو سامانانە بهێنن لیان گوێڕایەڵتان دەبن، ئەگەریش بەوە ڕازی نەبن وانازانم لە دەورتان کۆببنەوە"[1] ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسا بەناردنی عەرفەجەی کوڕی هەرسەمەی بارقی بۆ موهرە، حوزەیفەی کوڕی موحصینی غەلفانیش بۆ عومان، ئینجا عەکریمەی بەدوایاندا نارد دوای ئەوەی کە هیچی پێنەکرا بەرانبەر بەنی حەنیفە. سەرکردایەتیشی دایە دەستی عەکریمە، کە توانی لوقەیتی ئەزدی لەناوبداتو عومان بگێڕێتەوە ڕیزکانی ئیسلام بە هاوکاری لەگەڵ جەیفەرو بەنی عەبدولقەیس، کە یارمەتیاندا لە بەحرێنەوە دوای ئەوە عەکریمە بەرێکەوت بەرەو موهرە کە خەڵکەکەی پاشگەز بووبوونەوە لە پاڵی عیکرمە و هەندێکیان لە دژی شەڕیان کرد، دوای ئەوە بەرێکەوت بەرەو حەزرەمەوتو یەمەن بۆ هاوکاریکردنی موهاجیری کوڕی ئەبو ئومەیە بۆ کۆتایی پێهێنانی هەڵگەڕانەوە لەوێ[2].

---

١) الطبري: تأريخ ٣: ٢٥٩.

٢) جیاوازیەکی زۆر هەیە لە وردەکاری ڕووداوەکاندا لەنێوان ڕیوایەتی سەیفی کوڕی عومەر لەلای تەبەری (الطبري: تأريخ ٣: ٣١٧٤ـ ٣١٦)و ڕیوایەتی واقیدی لەلای کولاعی (الكلاعي: الاكتاف ٢٠٨ـ ٢١١، ٢١٧) هەردو ڕیوایەتەکانیش سەنەدیان لاوازە، جیاوازی ناوەڕۆکەکەشی زیاترە.

### کۆتایی پێهێنانی پاشگەزبوونەوەی یەمەن :

هەرئەوەندە بوو کە خەڵکی یەمەن بە مردنی پێغەمبەر ﷺیان زانی، تاکو قەیسی کوڕی عەبدو یەغوس لە ئیسلام پاشگەزبوویەوە، دادەوەیشی کوشت، نامەشی نارد بۆ پێڕەوکەرانی ئەسوەدو داوای یارمەتی لیان کرد، ئینجا دەستی گرت بە سەر صەنعاو ئەبنائەکانی وەدەرنا، هەروەها عەمری کوڕی مەعدیکەرەب هەڵگەڕایەوە لە نەجران.

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسا بە دانانی فەیرووز وەکو فەرمانڕەوا بۆ یەمەن، ئەویش هانای هێنا بۆ خاڵوانی، هۆزەکانی عەككو عەقیلیش یارمەتیاندا، بۆیە توانی قەیس لە صەنعا وەدەربنێ، قەیس لەگەڵ عەمری کوڕی مەعدیکەرەب هاوپەیمانێتیان کرد، پەشێویش هەر بەردەوام بوو تا هاتنی عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل لە عومانەوەو مهاجیری کوڕی ئەبو ئومەیە لە مەدینەوە، کە توانیان یەمەن پاکبکەنەوە لە پاشگەزبووەکان، توانیشیان عەمری کوڕی مەعدیکەرەبو قەیسی کوڕی عەبدو یەغوس کۆتبکەنو بیاننێرن بۆ لای ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، کە لەوێ داوای تەوبەیان لێکردن و ئەوانیش تەوبەیان کردو ئەبوبەکر لیان خۆش بوو.

بەم شێوەیش ڕووداوەکانی پاشگەزبوونەوەی دووەم کۆتایی پێهات لە یەمەن، کەتیایدا بەربەرکانێی هۆزایەتیو تەماعی کەسێتی[1] بەئاشکرا دەرکەوت، یەکێ لە هۆکاری وروژاندنی هۆزەکانیش ئەوەبوو (الابناء) کە یەمەنیان حکومڕانی دەکرد بە نەژاد عەرەب نەبوون.

### کۆتایی پێهێنانی هەڵگەڕانەوەی حەزرەمەوت :

کوڕانی عەمری کوڕی موعاویە بەسەرکردایەتی چوار پادشاکە زەکاتیان قەدەغەکرد، پەنایان بردە بەر باخەکانیان، ئەوانەشیان لەسەر ئیسلامەتی خۆیان مانەوە، دەرچوون بەرەو لای کاربەدەستی موسڵمانان زیادی کوڕی لەبیدی بەیازی کە بەرەنگاری پاشگەزبووەکانی کردو توانی هەر چوارپادشاکە بکوژێت، ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵسا بەناردنی موهاجیری کوڕی ئومەییەو عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل بۆئەوەی یارمەتی زیاد بدەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کیندە بە سەرکردایەتی ئەشعەسی کوڕی قەیس، موسڵمانان دوای چەندین شەڕی سەخت توانیان کیندە تێکبشکێننو ئەشعەس بنێرن بۆ مەدینە کە لەوێ

---

١) الطبري: تأريخ ٣: ٣٢٠، ٣١٩ عن سيف. هەروەها بڕوانە بۆ پوختەکەی لەلای کولاعی: حروب الردة ٣٢٨، هەروەها بڕوانە بۆ هەندێ ڕیوایەتی پێچەوانە لە (الإصابة ١: ٢٥).

گەڕانەوەی خۆی ڕاگەیاند بۆ ئیسلام[1] هەندێ ڕیوایەتی لاوازیش هەیە باس لەوە دەکەن کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ئومموفەروەی خوشکیشی لێمارەکردووە[2]

لە دەرەنجامی بزووتنەوەی پاشگەزبوونەوەو کۆتایی پێهێنانی یەکڕیزی فەرمانڕەوایەتی بوو بۆ ئیسلام، هەروەها داماڵینی چەكو ئەسپ لە عەرەبە بیابانشینەکان لە سەردەمی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، بێگومان ئەو شەڕانە شارەزایەکی زیاتریان لەبارەی جەنگو جوگرافیای دورگەی عەرەبەوە دەستەبەر کرد بۆ موسڵمانان، کە دواتر سوودیان لێوەرگرت لە بزووتنەوەی فەتحکردنی ئیسلامی.

1) الطبري: تأريخ ٣: ٣٣٤ـ ٣٣٩، والكلاعي: حروب الردة ٢٢٥ـ ٢٤١.

2) الطبراني: المعجم الكبير ١: ٢٣٧، والكلاعي: حروب الردة ٢٣٨، والطبري: تأريخ ٣: ٣٣٩، والمزي: تهذيب الكمال ٣:٢٩٠.

## بەشی دووەم:

# ئاژاوەی کوژرانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت).

### ئاژاوەی کوژرانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت):

کوژرانی خەلیفەی سێ یەم عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێبێت) بە ترسناکترین ئەو ڕووداوانە دەژمێرێت کە دەوڵەتی ئیسلامی پیاتێپەڕ بوو لەسەردەمی خیلافەتی ڕاشیدەدا، ئەوەندەش جیاوازیی و دابەشبوونی بە جهێشت لە ڕیزەکانی نەتەوەدا، کە خەریك بوو لە ناوی ببات، لە پاش ئەو ئاژاوە، چەند ئاژاوەیەکی ناوخۆی دیکە دروستبوو پەیوەندیدارو سەرچاوە گرتووە لە ئاژاوەی یەکەم، کە بریتی بوو لە شەڕەکانی جەمەلو صەففینو نەهرەوان، شوێنەوارەکانیشی بە هەمان شێوە بەردەوام بوون کە خۆیان دەبینیەوە لە پارتە نەیارەکانی دەوڵەتی ئومەوی (خەواریجو شیعە)، بەڵکو ئەم دوو پارتە کاریگەریان لەسەر ژیانی سیاسیی هەر مایەوە تاکو سەردەمی عەباسی یەکەم، بەڵکو دەتوانین بڵێن ئەو دابەش بوونانەی درووست بوون لە ئاکامی ئاژاوەدا، هەتا ئەمڕۆش کاریگەریان هەر ماوە، ئاژاوەیەکی لەم جۆرەش بێگومان ڕاو بۆچوونەکان جیاواز دەبن، ئارەزووەکانیش دەسیکاری هەواڵەکانی دەکەن، سەرچاوە مێژووەکانیش پڕن لە هەزاران لە ڕیوایەتی ناکۆکیی کە دەربڕین دەکەن لە ڕەوتە جیاجیاکان کە باو بووە لەو سەردەمە، یان لەسەردەمی نووسیندا.

ئالێرەشەوە گرنگیی ڕەخنەگرتن لەو گێڕاوانە دەردەکەوێت، هەروەها شارەزابوونی ئاڕاستەی گێڕاوەکان و ئەو بارو دۆخەی کەدەوری شایەتحاڵەکەی داوە، کە ئیسنادەکە بەرز دەبێتەوە بۆ لای، لەگەڵ تاقیکردنەوەی ناوەڕۆکەکانیانو دڵنیابوون لە بێعەیبی عیللەتەکان وەکو (التناقض و الاضطراب) کتێبەکانی (علم الرجال) زانیاریە سەرەتایەکان پێشکەش دەکات دەربارەی گێڕەوەکان، هەروەها (مصطلح الحديث)یش ڕێبازی ڕەخنەگری لەگەڵ ئەو زانیاریانە پێشکەشدەکات، لەگەڵ ڕیوایەتیشدا لە ڕووی سەنەدو مەتندا. ڕیواتە (صحیح)و (حسن)ەکان ـ خۆی لە خۆیدا یان بە هۆی ڕیوایەتێکی تر ـ وێنەیەکی پێچەوانە پێشکەش دەکەن، بۆ ئەو وێنەیەی کە هەواڵگێڕەوەکان دەیخەنە ڕوو، لە ڕێگەی ئەو سەرچاوە مێژوویانەی کە ڕیوایەت لیان گێڕاوەتەوە ئەگەرچی لەگەڵیان یەکدەگرنەوە لە هەندێ وردەکاریدا.

کەواتە نیشانەی ڕووداوەکان کامانەن لە ڕێگەی ڕیوایەتی صەحیحو حەسەنەکانەوە؟ بۆچی نەیارەکان کینەیان هەڵگرت لە عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)؟

وادیارە نەیارەکان بیانوویان دەگرت بە هەندێ هۆکاری ئاینی و سیاسی و ئابووریەوە، یەکێك لەو کێشانەی وروژاندیان کێشەی نووسینەوەی قورئانو پشتبەستن بە نووسخەیەکی نووسراو و سووتاندنی نووسخەکانی تر بوون، ئەڵبەتە ئەم مەسەلەیەمان پێنەگەیشتووە لە سەرزاری کەسێك لە نەیارەکان، بەڵام لەم ڕیوایەتەوە دەردەکەوێت: سوەیدەی کوڕی غەفلە کەیەکێکە لە گەورە تابعیەکان (٨٠ك) و تەمەنی (١٣٠) ساڵ بووە دەڵێت: سوێند بەخوا شتێکتان بۆ باس دەکەم لە عەلی کوڕی ئەبوو تالیبەوە بیستوومە، گوێم لێبوو دەیووت:

خەڵکینە زیادەڕەوی مەکەن لە عوسمان، لە مەسەلەی قوورئان سووتاندندا، لە چاکە زیاتر هیچی دەربارەی مەڵێن، سوێند بە خوا ئەوەی کە ئەنجامی دا لە پێش چاوی هەمووماندا بوو، فەرمووی: چی دەڵێن دەربارەی ئەم شێوە خوێندنە، چونکە پێم گەیشتووە هەندێکیان دەڵێن خوێندنەکەی تۆ باشترە، ئەمەش زۆری نەماوە ببێتە کوفر؟

وتمان: ئەی چی بە باش دەزانی؟

وتی: بەباشی دەزانم خەڵکیی لەسەر یەك قورئان کۆبکەینەوە، ئیتر جیاوازی دروست نابێت.

وتمان: بۆچوونەکەت چاکەو پەسەندە.

عەلی وتی: کەسێك وتی: کێ زۆر زمانی پاراوە؟ کێ زۆر شارەزای قورئانە؟

وتیان: زمانپاراو ترین کەس سەعیدی کوڕی عاصە، شارەزاترینشیان لە قورئان زەیدی کوڕی سابیتە.

وتی: یەکێکیان بابنووسن، ئەوی تریش بخوێنێتەوە، ئەوانیش وایانکرد، ئیتر خەڵکیی لەسەر یەك موصحەف کۆبوونەوە، عەلی وتی: سوێند بە خوا منیش بووایەم هەر وام دەکرد.[1]

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) ئەرکی پشت پێبەستنی نووسخەی یەکگرتووی موصحەفی خستە ئەستۆی چوار کەس لە هاوەڵانی کە بریتی بوون لە:

---

١) ابن ابي داود: المصاحف ٢٨ـ ٢٩ باسناد صحيح، و ابن عساكر: تاريخ دمشق، ترجمة عثمان ٢٣٧، ٢٣٨ (ابن حجر: فتح الباري ٩: ١٨).

زەیدی کوڕی سابیت، سەعیدی کوڕی عاص، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام، ئینجا پیانی وت: ئەگەر ئێوەو زەیدی کوڕی سابیت لە وشەیەك لە وشە عەرەبیەکانی قورئان ناکۆك بوون، لەو حاڵەتەدا بەزمانی قوڕەیشی بینووسن، چونکە قورئان بە زمانی ئەوان دابەزیووە" ئەوانیش وایان کرد، دوای ئەوە بۆ هەرلایەك قورئانێکی نارد، لەوانەی ئەو هاوەڵانە نوسویانەوە، فەرمانی کرد هەرچی قورئانی تر هەیە بسووتێنرێت[1]، ئەگەر ورد بینەوە لە دەقەکە دەبینین ئاماژە دەکات بۆ هەبوونی نەیاریەك بۆ پشتبەستن بە یەك نوسخەی قورئانو سووتاندنی ئەوەکانی تر، بۆ قەدەغە کردنی جیاوازییو زیادو کەم لە قسەی خوای گەورە.

وادیارە نەیارەکان ئەم مەسەلەیان وروژاندووەو عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بەرگریکردووە لە هەڵوێستی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)و ڕوونیکردووەتەوە کە ئەو کارە لەسەر بنەمانی یەکدەنگیی هاوەڵان ئەنجامی داوە، نەیارەکانیش زانای گەورەیان تیادانەبوو تا حاڵیی بێت لە مەسەلەی عوسمان لەم کردارە مەزنە، لەوانەشە هەندێکیان لە سوودی ئەو کارە گەیشتبێتن، بەڵام خەشمو قین و کوێرایی چاویانی هێنابێت و مەسەلەکەیان قۆستبێتەوە دژ بە خەلیفە، زۆرینەی خەڵکیش توانای جیاکردنەوەیان نی یە لە نێوان مەسەلەکانو پڕوپاگەندەکان، بەڵکو شوێنی هەموو بانگکەرێك دەکەون، قسەکانی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە نەیارەکان زیادەڕەویان کردووە لە پڕوپاگەندەکانیاندا، ڕەوایان کردووە بە ناڕەوا، چاکەیان کردووە بە خراپە.

یەکێکی تر لەو مەسەلانەی وروژاندیان دژ بە عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) دوای کوژرانی و خەواریجەکانیش پەسەندیان کرد، ئەوەبوو کە ئەو ئامادەی جەنگی بەدر نەبووە، لە جەنگی ئوحودا خۆڕاگر نەبووە، هەروەها بەشدارینەکردنی لە بەیعەتی (رضوان) دا، یەکێك لە خەواریجەکان ـ دەگێڕنەوە کە عەلای کوڕی عەراڕ بوو ـ پرسیاری کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) لەناو حەرەمی مەککەدا دەربارەی ئەو هەڵویستەی عوسمان، ئیتر عەبدوڵڵا ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕوون کردەوە، هۆکاری ئامادەنەبوونی بۆ جەنگی بەدر بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بووە بە هۆی نەخۆشکەوتنی ڕوقیەی خێزانی، پێغەمبەر ﷺ بە لێنیشی پێداوە: "ان لك اجر رجل ممن شهد بدراً وسهمه"[2]، سەبارەت بە هەڵهاتنی لەگەڵ هەڵهاتووەکاندا لە ڕۆژی ئوحودا، ئەوە خوای گەورە لە

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٩: ٩، ١١).

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٥٤، ٣٦٣)

هەموویان خۆشبووە[1]، دیارنەبوونیشی لە بەیعەتی (رضوان) بۆ ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ ناردبووی بۆ مەککە وەکو نێردە، بەیعەتەکەش لەبەر گلدانەوەی قورەیش بوو بۆ عوسمان، پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی خۆی بە یەکدا داو فەرمووی: "وهذه لعثمان"[2] واتە: ئەمەش لە جیاتی عوسمان، بەم شێوەیە ئیبنو عومەر رێگای گرت لە کابرای خاریجی کە سەر لە خەڵك بشێوێنی بە هەندێ مەسەلەو باس کە راستیەکەی نازانن.

لەوانەشە نەیارەکان ئەم کێشانەیان قۆستبێتەوە لە پڕوپاگەندەکانیان دژ بە خەلیفە، لە دوای مردنیشی هەر وروژاندویانە، بەڵام بەڵگەیەك نی یە ئەو مەسەلەیە ببڕێتەوە.

کێشەیەکی تر لەو کێشانەی وروژاندیان دژ بە خەلیفە ئەوەبوو لە کۆتایی خیلافەتی خۆیدا نوێژی بە تەوای کردووە لە "منی" و قەصری نەکردووە، بە پێچەوانەوەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و کردارەکانی ئەبوبەکرو عومەر[3]، عوسمان (رەزای خوای لێبێت) لەو مەسەلەیە تەئویلی دەکرد و وای بۆ دەچوو کە حوکمی نیشتەجێی هەیە، عائیشەش (رەزای خوای لێبێت) بە هەمان شێوە نوێژی کورت نەدەکرد لە (منی[4]) بەڵکو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەو کارەی ئەنجامدا، لە کاتێکدا بەراستیشی نەدەزانی ـ لە رووی فیقهیەوە ـ چونکە نەی دەویست پێچەوانەی کرداری عوسمان بکات کە خەلیفەی شەرعیە[5]. ئیبنو عومەریش کە لەگەڵ ئیمام نوێژی بکردایە چوارڕکاتی دەکرد، ئەگەر بە تەنیاش بوایە دووڕکاتی دەکرد[6].

نێردەی میصریش کاتێك عوسمان پێشوازیی لێکردن، مەسەلەی تەرخان کردنی لەوەڕگایان وروژاند، عوسمانیش (رەزای خوای لێبێت) بۆی ڕوونکردەوە کە عومەر (رەزای خوای لێبێت) پێش ئەو

---

١) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا اللّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ) ﴿آل عمران: ١٥٥﴾

٢) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٩: ٩، ١١).

٣) الصحيح (فتح الباري ٢: ٥٦٣، ٣: ٥٨).

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٢: ٥٦٩) ومسلم: الصحيح ١: ٤٧٨.

٥)البخاري: الصحيح ( فتح الباري ٢: ٥٦٣) ومسلم: الصحيح ١: ٤٨٣.

٦) مالك: الموطأ ١٤٩، ومسلم : الصحيح ١: ٤٨٢.

لەوەڕگای تەرخان دەکرد بۆ حوشتری زەکات، ئەمیش ئەو لەوەڕگانەی زیاد کردووە بە زیاد کردنی حوشترەکان[1].

لە ئاخاوتنی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ هەڵچووەکاندا، دەتوانین گرنگترین ڕەخنەکانیان کە ئاڕاستەی سیاسەتی عوسمانیان کردووە (ڕەزای خوای لێبێت) دەستنیشان بکەین، دەڵێت: "گوێڕاگرن باقسەتان بۆ بکەین دەربارەی ئەوەی کە بۆی هاتوون، ئێوە گلەیتان هەیە لە عوسمان لە سێ ڕەفتاردا، لە فەرمانڕەواکردنی گەنج و مەسەلەی لەوەڕگەو لێدان بە قامچیو دار. تا ئەوکاتەی ئەوتان شۆرد وەکو چۆن پۆشاك بە صابوون دەشۆردرێت، ئەمجا سێ بڕگەتان لەسەری ژمارد، قەدەغە کردنی وڵاتو خیلافەت و مانگە قەدەغە کراوەکان، بەڕاستی عوسمانیش داوێن پاکترین و بە ڕەحمترین کەسە"[2] .

موحەممەدی کوڕی سیرین (٣٣ـ ١١٠ك) ئاشکرای کردووە کە عوسمان هەڵساوە بە ناردنی عەلی کوڕی ئەبوتالیب و کەسێکی تر بۆ لای نەیارەکانی و لەگەڵیاندا لەسەر پێنج شت ڕێککەوتن: دەربەدەر بگەڕێتەوە، بێبەش بەشی بدرێت، دەسکەوتەکان بە یەکسانی دابەش بکرێت، کەسێك بکرێت بە کاربەدەست دەستپاك و بەهێزبێت. ئەمانەیان لە نووسراوێکدا نووسی، هەروەها مەرجیان کرد کە ئیبنو عامر بگەڕێتەوە سەر بەصرە و ئەبوموسای ئەشعەری بۆ کووفە[3].

ئەم ڕیوایەتانە دروشمە ڕاگەیەنراوەکانی نەیارەکان ئاشکرا دەکات، توێژینەوە تازەکانیش ڕووداوی ئاژاوە دەگێڕنەوە بۆ هەندێ هۆکاری ئابووریی و کۆمەڵایەتیی، ئاماژەش دەکەن بۆ فیچقە کردنی ماڵو سامان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیی لە دەرئەنجامی فتوحات، سەرهەڵدانی حاڵەتی

---

١) خليفة بن خياط: التاريخ ١٦٨ـ ١٦٩ باسانيد حسنة ينتهي الى شاهد عيان هو ابو سعيد مولى ابي اسيد الانصاري مختلف فى صحبته، لكنة ادرك خلافة ابي بكر و شهد مقتل عثمان (مسلم: الكنى ١٢١، وابن حجر: الاصابة ٤: ٩٩).

٢) احمد: فضائل الصحابة ١: ٤٥٢ من زيادات ابنة عبدالله، باسناد منه عبدالملك بن عمير ربما دلس و كلامه فى التقريب متأخر عن كلامة فى" تعريف اصل التقديس" فينسخه، وقد عمر فمات عن ثلاثة و مائة، فوهنت ذاكرته دون ان يبلغ حد الاختلاط( الذهبي ميزان الاعتدال) و مسعر بن كدام عنه كوفي قديم الطلب، والاغلب انه روى عنه قبل اختلاطه، وقد تابعه هُشيم بن عبدالملك وهو مدلس وقد عنعن (احمد: فضائل الصحابة ١: ٤٥٥). ئەم ڕوایەتانە مێژوویین، ئەگەر هەڵسین بە ڕەت کردنەوەیان، مێژوو لەناو دەچێت....

٣) خليفة: التاريخ ١٦٩ـ ١٧٠ باسناد الى ابن سيرين الصحيح، ولكنه منقطع ضعيف لان ابن سيرين لم يدرك الاحداث، ويعتضد برواية أبي سعيد مولى ابن اسيد (ابن عساكر: تاريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٣٢٨ وهو أيضا مرسل ابن سيرين).

خۆشگوزەرانی لە کۆمەڵگەدا، دروستبوونی جیاوازیی گەورە لە ئاستی بژێویدا لە ئەنجامی جیاوازیی لە سەروەت‌و ساماندا، هەروەها ئاماژە دەکەن بەوەستاندنی فتوحات لە نیوەی دووەمی خیلافەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەوەش بووەتە مایەی هەستکردنی خەڵکی شارەکان بە بۆشایی و خۆتێهەڵقورتانیان لە ئاژاوەو پەشێوی لەسەر فەرمان ڕەواکان.

سەبارەت بە کتێبەکانی هەواڵ‌و مێژوو، بایەخێکی زۆریان داوە بە ڕۆڵی (ابن سبأ) لە ڕووداوەکاندا، پوختەی ئەو وێنەیەی سەیفی کوڕی عومەر و کەسانی تر دەیگێڕنەوە لە کتێبەکانی مێژوودا، بە تایبەتی مێژووی تەبەری، ئەوەیە کە (ابن سبأ) جوولەکەیەك بووە لە خەڵکی صنعا، لە سەردەمی خیلافەتی عوسماندا موسڵمان بووە، هەڵساوە بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی عوسمان لە حیجازو عیراق‌و شام‌و میصر، هەروەها هەڵساوە بە تووڕە کردنی ئەبوزەڕ لە دژی مەعاویە کە گوایە وتویەتی ماڵ ماڵی خوایە، قایلیشی کردووە کە ئەو مەبەستی لەو قسەیەی گلدانەوەی ماڵ قەدەغە کردنێتی لە خەڵکیی، بۆیە ئەبوزەڕ داوای کرد لە موعاویە کە بڵێت ماڵ ماڵی موسڵمانانە، موعاویەش قایل بوو لەبەر ڕزامەندی ئەو، بەڵام ئەبوزەڕ بەردەوام هەر لە ڕاگەیاندنی ڕاوبۆچوونەکانی بوو لە سیاسەتی ماڵ‌و خەرجکردندا، زیادەی ماڵی دەڵەمەندەکان پێویستە بگەڕێتەوە بۆ هەژاران، ئەگەر نا ئەوە گەنجینە کردنی ناڕەوایە، موعاویە سکاڵای لە ئەبوزەڕ کرد لەلای عوسمان، ئەویش هەڵسابە بە بانگکردنی ئەبوزەڕ، ڕیوایەتە مێژوویەکان باسیان کردووە کە (ابن سبأ) وایکردووە لە عەمماری کوڕی یاسر بێزاری دەربڕێت لە میصرەوە لە دژی عوسمان، دەشڵێن کە خاوەنی بیرو هۆشێکی تیژ بووە و توانیویەتی پڕوپاگەندە ڕێك بخات بە شێوەیەکی فراوان دژ بە عوسمان‌و کاربەدەستەکانی لە شارەکان، شوێنکەوتوانیشی لە نێو خۆیاندا نامەیان ئاڵوگۆڕدەکردەوە کە تیایدا بیزاری‌و سکاڵایان دەربڕیوە لە کاربەدەستانی عوسمان، ئەو نامانەش لە شارەکاندا دەخوێنرانەوە، ئینجا دەبووە مایەی ئاژاوە، بیروبۆچوونێك لای خەڵکی گشتیی دروست بوو دەربارەی خراپی‌و پشێوی‌و ستەم کە دەوڵەت لێژبووەتەوە بۆی!! گوایە (ابن سبأ) لە پشت ئەو نێردانەوە بووە کە لە میصرو عێراق هاتنە مەدینە و ئابڵوقەی ماڵی عوسمانیان داو کوشتیان.

بەلای هەندێکەوە وایە، ئەوەی کە تەبەری هێناویەتی دەربارەی شوێنەواری ئیبنوسەبەء لە ئاژاوەگێڕیدا خۆی ناگرێت بەرامبەر ڕەخنەی مێژووی، چونکە سەیفی کوڕی عومەر تاك ببێتەوە لە باسکردنی زۆربەی هەواڵەکاندا، کە ئەو متمانە پێنەکراوە لای فەرموودەناسان، پێویستە ئەوەش

تێبینی بکرێت کە سەیفی کوڕی عومەر پشت پێنەبەستراوە لە مێژوودا ئەگەر چی وا نی یە لە فەرمووددەدا، ڕیوایەتەکانیش پێویستە شانسدار بن بە ڕەخنەگریی مێژوویی وەکو هەواڵگرە ڕەواکانی تر، دەکرێت بیرۆکەی ڕودانی زیادەڕەوی وەربگرین سەبارەت بە کاریگەریی (ابن سبأ) لە ڕووداوەکانی ئاژاوەدا، کە ئەویش وادەکات بگەڕێین بە دوای هۆکارەکاندا لە بارودۆخی گشتیی، لەگەڵ تێبینیکردنی ئەو پێشکەوتنەی بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامیدا هات لە ئاکامی بلاوبوونەوە لە ناوچەی (الهلال الخصيب).

**هەواڵی ئەو سوارەی تووشی نێردەی میسری بوو:**

نێردە میصریەکان کە وتووێژیان لە گەڵ عوسماندا کردبوو دەربارەی ئەو مەسەلانەی کە جێگای ڕەخنە گرتن بوون، ئینجا بەڵێنیان لێوەرگرت و مەرجیان لەسەر نووسی، عوسمانیش (ڕەزای خوای لێبێت) بەڵێنی لیان وەرگرت گێرەشێوێنی نەکەنو لە کۆمەڵ دانەبڕێن مادام عوسمان مەرجەکانیان بەجێدەهێنێت، دوای ئەوە گەڕانەوە و ڕازی بوون. بەڵام لە ڕێگای گەڕانەوەیان سوارێکیان تووش بوو، ئینجا لیان تێپەڕی، دواتر گەڕایەوە و لیان تێپەڕی.

وتیان: بۆ وادەکەیت؟

وتی: من نێرراوی (أمير المؤمنين)م بۆ لای کاربە دەستی میصر.

ئەوانیش هەڵسان بە پشکنینی و نووسراوێکیان دۆزیەوە کە لەسەر زاری عوسمان نووسرابوو، مۆرەکەیشی لەسەر بوو، بۆ کاربەدەستی میصر: کە هەموویان لە خاچ بدات، یان بیانکوژێت، یان دەست و قاچیان ببڕێتەوە. ئیتر ئەوانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە، هاتنە لای عەلی و وتیان: ئایا نابینی دوژمنی خوا چیکردووە، ئەوەو ئەوەی دەربارەمان نووسیووە، خوای گەورەش خوێنڕشتنی ڕەوا کردووە، جا هەڵسە لەگەڵمان بچینە لای.

وتی: سوێند بەخوا لە گەڵتان نایەم.

وتیان: ئیتر بۆ نامەت بۆ مان نووسیوە ؟

وتی: سوێند بە خوا نووسراوم بۆتان نەنووسیووە.

ئەوانیش لەناو خۆیاندا تەماشای یەکتریان دەکرد، ئینجا عەلی دەرچوو لە مەدینە. ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ لای عوسمانو وتیان: ئەو شتانەت دەربارەمان نووسیوە.

وتی: دوو شتە، یان دوو شایەت راگرن لەسەرم، یان سوێندتان بە خوا بۆ دەخۆم نەنووسیومەو نە پڕم کردوەتەوە یەکێکی تر بینوسێت و نە ئاگاشم لێی بووە. لەوانەشە نووسراوێك لەسەر زمانی کەسێك بنووسرێت و نەخشی مۆرەکەشی دروست بکەن.

وتیان: خوای گەورە خوێنتی بۆ مان رەوا کردووە بیرێژین، چونکە پەیمانەکەت شکاندووە، ئینجا ئابلۆقەیان دا لە کۆشکەکەیدا.[1]

عوسمان (رەزای خوای لێبێت) چاوەڕوانی کەوتنەوەی ئاژاوە بوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدابوو کە ئاژاوەیەك ڕوودەدات و تیایدا شەهید دەبێت.[2] دەریش دەچوو بۆ لای نەیارەکانی و بەڵگەی بۆ دەهێنانەوە لە قورئان و سوننەتو بیریانی دەخستەوە، کە چەند هەڵوێستی هەبووە لە خزمەتی ئیسلامدا و موسڵمانانیدا دەی وت: ئەگەر لە قورئاندا هاتووە هەردوو پێم بخەنە کۆتەوە، بیانخەن".[3]

" کاتێك عوسمان ئابلۆقە درا، لەسەربانەوە قسەی لەگەڵیان کردو وتی: خواتان بە یاد دەخەمەوە، ئایا دەزانن کێوی حیرا کاتێك لەرزی پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ئەی حیرا ئارام ببە پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك‌و شەهیدێکت لە سەرە؟ دەربارەی سوپای عوسرە فەرمووی: کێ خەرجیەکی وەرگیراو لای خوا خەرج دەکات؟ خەڵکیش هەمووی ماندووە دەستکورت بوون، منیش ئەو سوپایەم ئامادە کرد. وتیان: بەڵێ. دوای ئەوە وتی: خواتان یاد دەخەمەوە، ئایا دەزانن کە بیری ڕوومە کەس ئاوی لێنەدەخواردەوە بەپارە نەبێت، من کڕیم و بەخشیم بە دەوڵەمەندو فەقیرو لە ڕێگا دابڕاو؟ وتیان بەڵێ. لەگەڵ چەند

١) خليفة: التاريخ ٦٨ـ ١٦٩ باسناد حسن، ورواه البزار صحيح اسناد ( الهيثمي مجمع الزوائد ٧: ٢٢٨ـ ٢٢٩)، وانظر رواية الاخرين عن معتمر عند محمد عبدولله الغبان: فتنة مقتل عثمان بن عفان، الملحق ص ١٠٦ـ ١٠٧ و احال على الهيثمي: كشف الستار عن زوائد البزار ٤: ٩٠ـ٩١، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢١٥ـ ٢٢٠، الطبري: تاريخ ٣٥٤ـ ٣٥٦، وابن عساكر: تاريخ دمشق ـ ترجمة عنان ـ ٣٢٧، و ابن نعيم الاصفهاني: الامامة ٣٤٧، وابن حجر: المطالب العالية ٤: ٢٨٣ـ ٢٨٦ نقلا عن اسحق بن راهويه فى مسنده، والمحب الطبرى: الرياض النضرة ٣: ٦٠ وعزاه الى ابن حاتم الازدي.

٢) احمد: المسند: ٣٣٤، ٣٧٧، والترميذي: السنن (تحفة الاحوذي: ٦٣١، ١٠: ٢٠٩) وابن ماجة: السنن: ١: ٤٢، وابن سعد: الطبقات الكبرى ٣:٦٦ـ ٦٧، وابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٢، والحميدي: المسند ١: ١٣٠.

٣) ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٩ـ ٧٠، باسناد صحيح، و ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٢٤ باسناد الصحيح.

شتێکی تر کە باسی کرد[1]. ئیتر چەند پیاوێك بە دەنگییەوە هاتن[2]، ئەو لە بانگکردنەکەی زیاتر ڕوی دەکردە هاوەڵان[3].؟

تێبینیش دەکرێت قسەکانی بۆ هەڵچووەکان کاریگەری کاتی بەجێدەهێشت، تەنانەت جارێکیان" خەڵکەکە لەنێو خۆیاندا وتیان: شێنەیتان هەبێت لەسەر ئەمیری بڕواداران" [4]. "ئەشتەر هەڵساو وتی: لەوانەیە عوسمان‌و ئێوەش فێڵتان لێکرابێت. ئەبوو ئوسەید ـ کە شایەتحاڵە وتی: خەڵکەکە بەسەریدا هاتن‌و شێلایان تا ئەوەی کارێکی خراپی بەسەردا هات. وتی: جارێکی تر عوسمانم بینی ئامۆژگاری کردن‌و بیری خستنەوە، ئامۆژگاریەکەی کاریگەری نەبوو لەسەریان، ئەوان یەکەمجار قسەکانی کاریگەری دەبوو لەسەریان، بەڵام کە دووبارە دەبووەوە گویان پێنەدەدا، دوای ئەوە دەرگاکەی کردەوەو قورئانەکەی لە پێش خۆیدا دانا"[5].

لە یەکێك لە وتارەکانیدا تیایدا ئاماژەی دەکرد بۆ هاوەڵێتی‌و پلەوپایەی خۆی، کوڕی ژنەکەی فەرەزدەق هەڵساو وتی: ئەی نەعسەل تۆ گۆڕای".

ئەمجا دوای ئەوە عوسمان پێناسە کراو وتی: بەڵکو تۆ گۆڕاوی ئەی کۆیلە"و "خەڵکەکە هەڵیان کوتایە سەر ئەو کابرایە"و "کەسێکیش لە بەنی لەیس پاڵی پێوە دەنان، تاکو خستیە ناو ئاگرەکەوە". [6]

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە پەرۆشەوە بوو بۆ نوێژکردنی موسڵمانان لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، سەرەڕای ئەوەی کە دەرچوونی لێ قەدەغە کرابوو بۆ نوێژکردن، عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی خیار وتی: تۆ پێشەوای هەموانی بۆ نوێژ، ئەوەیشت بەسەرداهاتووە کە دەبینیت،

---

١) الترميذي: السنن ٥: ٦٢٥ و قال: هذا حسن صحيح غريب، و احمد: المسند ١: ٣٤ـ ٣٤١ باسناد حسن.

٢) احمد: المسند ١: ٣٤٠ـ ٣٤١ باسناد صحيح ط. احمد شاكر.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٥: ٤٠٦، ٤٠٧) معلق.

٤) خليفة: التاريخ: ١٧٢ باسناد حسن، و ابو سعيد شاهيد عيان مختلف فى صحبته، و الطبري تاريخ ٤: ٣٨٣.

٥) الطبري: تاريخ ٤: ٣٨٣ باسناد حسن. عەرەب کاتێك بیەوێت سووکایەتی بە ناوی (عثمان) بکات دەڵێت (نعثل) وەکو چۆن لە کوردیدا بۆ هەمان مەبەست بە عوسمان دەوترێت عوسە. (وەرگێر).

٦) احمد: المسند ١: ٣٧٨ ط. احمد شاكر وحسنه، لكن شاهد العيان عباد بن زاهر ابا الرواع فمن يعبر بحديث و لا يبلغ رتبة صدوق، ولكن الخبر تاريخي فيتساهل معه، و سماع شعبة بن الحجاج عن سماك بن حرب قديم فلا يضر اختلاط الاخير (ابن الكيال: الكواكب النيران ٢٣٧ـ ٢٤١).

پێشەوایەکی ئاژاوەگێڕ نوێژمان بۆ دەکاو ئێمەش ئیحراج دەبین؟ عوسمان فەرمووی: نوێژ چاکترین شتە بکرێت، جا ئەگەر کەسێك بە چاکی کردی لەگەڵی بیکە ئەگەریش نارێك کردی خۆتی لێبپارێزە.[1]

جێگیریش بووە کە عوسمان هەڵوێستێکی ڕوونو کۆتایی پێهێنەری هەبوو بریتی بوو لە بەرگری نەکردن، هاوەڵانیشی بەوە پابەند کردبوو، عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە- شایەتحاڵە لە ساڵی شەشی کۆچی لە دایك بووە ـ دەڵێت: لەگەڵ عوسماندا بووم لەماڵەکەی، وتی: "داوا ئەکەم لە هەموو کەسێك وا دەزانێت پێویستە لەسەری گوێڕایەڵیم بکات، دەستو چەك بەدوور بگرن لەم ئاژاوە".[2]

لە ماڵەکەش دەرچوو دوای ئەوەی عوسمان فەرمانی پیانکرد چەکەکانیان دابنێنو بچنە ماڵەکانیان، حەسەنو حوسەینو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەرچوون، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو مەروانی کوڕی حەکەم[3] سوور بوون لەسەر مانەوە لەگەڵ عوسمان لە ماڵدا، عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) عەبدوڵڵای کوڕی زوبێری کردبوو بە ئەمیر لەسەر ئەوانی تر، فەرمانیشی کردبوو گوێڕایەڵی بکرێت، کاتێك داوای لە عوسمان کرد شەڕ لەگەڵ ئەو ئاژاوەچیانەدا بکات" خوای گەورە ڕێی پێداویت شەڕیان لەگەڵ بکەیت" عوسمان وتی: "نا سوێند بە خوا هەرگیز شەڕیان لەگەڵ ناکەم"[4]. کۆمەڵێك چەکدار هەبوو لە ماڵەکەی عوسمان، ئیبنو زوبێر وتی: خوای گەورە بە کەمتر لەمانە سەرکەوتن دەبەخشێت".[5]

"یەکێك لە وانەش دەیویست شەڕبکات بۆ بەرگریکردن لە عوسمان، هاوەڵی مەزن ئەبو هورەیرە ـ شمشێرەکەی بەلاقیدا کردبوو[6]ـ بەڵام عوسمان ڕێگەی نەداو وتی: ئەی ئەبا هورەیرە، حەز دەکەی

---

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٢: ١٨٨)

٢) خليفة: التاريخ ١٧٣، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٤، و ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٠ كلهم باسانيد صحيحة

٣) خليفة: التاريخ ١٧٢ باسناد صحيح الى ابن سيرين، لكن ابن سيرين له يشهد الحادثة.

٤) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٠ باسناد صحيح.

٥) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٠ باسناد صحيح. وخليفة: التاريخ ١٧٣ باسناد صحيح.

٦) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٠ باسناد صحيح. وابن سعيد من اثبت الناس فى قتادة، و رواية كهمس عن سعيد قبل اختلاطه (البخاري فتح الباري ٧: ٤٢).

هەموو خەڵكو منیش بکوژرین؟ وتی: وتم: نەخێر. وتی: دەی ـ ئەگەر یەك پیاو بکوژێت وەکو ئەوەیە هەموو خەڵکت کوشتبێت. ئەبو هورەیرە وتی: ئیتر منیش گەڕامەوەو شەڕم نەکرد" .[1]

ئەبو حەبیبەی مەولای عوروە دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژی (صائف) چووەتە لای عوسمان لە ماڵەکەی لە کاتێکدا ئابڵوقەی درا بوو، بۆ ئەوەی نامەی زوبێری کوڕی عەوامی پێبگەیەنێت، کە تیایدا گوێڕایەڵی و پشتیوانیکردنی خۆیو نەوەی عەمری کوڕی عەوف ڕادەگەیەنێت بۆ عوسمان سەبارەت بە فریاکەوتنی، ئەبو حەبیبە ژمارەیەك لە هاوەڵانی بینی لە ناو ماڵەکەیدا وەکو حەسەنی کوڕی عەلیو ئەبو هورەیرەو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، خەڵکیش قسەیان لەگەڵ عوسمان کردبوو ڕێگەیان بدات جیهاد بکەن لە دژی ئەوانە، بەڵام عوسمان فەرمووی" داوا لە هەموو کەس دەکەم گوێڕایەڵیم پێویست بێت لەسەری شەڕ نەکات".[2] حەسەنی کوڕی عەلی بە هەمان شێوە داوای ڕێگە پێدانی کرد لە عوسمان شەڕبکات بەڵام عوسمان ڕازی نەبوو[3].

یەکێك لە وانەش ئامۆژگاری شەڕ نەکردنی کرد عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بوو، عوسمان پرسیاری بۆچوونی لێکرد دەربارەی هەڵچووەکان، ئەویش وەڵامی دایەوە "وازهێنان وازهێنان ئەوەش بەڵگەیەکی بەهێز ترە بۆ تۆ".[4]

دوو ڕیوایەتی لاوازیش هەیە یەکتری بەهێز دەکەنەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی پێشنیارێك لەلایەن موغەیرەی کوڕی شوعبەوە بۆ عوسمان کە تیایدا بە باشی دەزانێت عوسمان دەربچێت بەرەو مەککە بۆ ئەوەی خۆی قوتار بکات لە نەیارەکان، عوسمانیش ئەو پێشنیارەی ڕەتکردووەتەوە.[5] بەم شێوەیەش پێشنیارو تاوتوێکردنەکان لە بارودۆخێکی ناهەمواردا ئەنجام دەدرا، لە کاتێکدا نەیارەکان پاڵەپەستۆیان دروست کردبوو لەسەر ماڵەکەو دانیشتوانەکانی.

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٠ باسناد صحيح، والاعمش مدلس ولكن ثبت روايته عن ابن صالح كما فى الصحيحين (المزي: تحفة الاشراف ٩: ٣٧٦ـ ٣٨٤، وابن حجر: هدي الساري ١٢).

٢) ابن عساكر: تاريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٢٧٤ نقلا عن مصعب بن عبدالله الزبيري، و اسناد مصعب حسن، و احال المحقق على حديث مصعب فى الظاهرية (مجلد ١١٧ ورقة ١٥١ب).

٣) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٢٤ اسناد حسن ان صح سماع ابى قلابة من الحسن.

٤) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧١ باسناد حسن.

٥) احمد: المسند ١: ٣٩١ ط. احمد شاكر وضعفه بالانقطاع لان محمد بن عبدالملك بن مروان لم يسمع المغيرة (الهيثمى: مجمع الزوائد ٧: ٣٢٩)، والمسند ١: ٣٦١ باسناد ضعيف ايضا لان ابن ابزي لم يدرك عثمان.

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) ڕازی نەبوو دەست لە خیلافەت هەڵبگریت، فەرموودەیەکی ڕاستیش هەیە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ بە عوسمانی فەرمووە: "یا عثمان ان الله مقمصك قمیصاً فان ارادك المنافقون علی ان تخلعه فلا تخلعه لهم ولا كرامة".[1] واتە: ئەی عوسمان خوای گەورە کراسێکت لەبەر دەکات، جا ئەگەر مونافیقەکان داوایان لێکردی دایکەنیت بە قسەیان مەکە"، بەڵام موغیرەی کوڕی ئەخنەس ئاماژەی بۆ عوسمان کردبوو واز لە خیلافەت بهێنیت بۆ ئەوەی ئاژاوەچیەکان نەیکوژن، عوسمانیش پرسی بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کرد دەربارەی ئەو بۆچوونەی موغیرە[2]، عەبدوڵڵایش ئامۆژگاری کرد واز لە خیلافەت نەهێنێ. "ئیبنو عومەر پێی وت: ئەگەر وازت لە خیلافەت هێنا، دوایی بە هەمیشەیی لە دونیادا دەمێنیتەوە؟

وتی: نەخێر. وتی: ئەگەر ڕازی نەبووی لەوە زیاتریان لە دەست دێت کە بتکوژن؟

وتی: نەخێر.

وتی: ئەوان دەتوانن بە هەشت یان دۆزەخت پێبدەن؟

وتی: نەخێر. وتی: بۆیە من بە باشی نازانم کە کراسێك خوای گەورە لەبەرتی کردووە بە قسەی هیچ کەس فڕی بدەیت، چونکە دەبێتە ڕێبازێك، هەر جارێك خەڵکانێك ڕقیان لە خەلیفەیەك بوو بیکوژن"[3].

هەندێك فەرموودەی لاوازیش هەن ئاماژە دەکەن کە عوسمان ـ لە کاتی ئابڵوقەکەیدا ـ ناردوویەتی بە دوای عەلی بێت بۆ لای، ئینجا عەلی فەرمانەکەی بەجێهێناوە، بەڵام ڕێگە نەدراوە بگاتە ماڵەکەی کە نەیارەکان دەوریان دابوو، بۆیە عەمامە ڕەشەکەی سەر خۆی کردووەتەوە و فڕێداوە بۆ نێردەکەی عوسمان، دوای دەرچووە تاگەیشتوەتە (احجار الزیت) لە بازاڕی مەدینە، ئیتر هەواڵی کوژرانی عوسمانی پێگەشتووە، ئەویش پاکانەو بێبەری خۆی ڕاگەیاندەوە لە کوشتنی عوسمانو هەرکەسێ

١) احمد: المسند ٦: ٨٦ـ ٨٧، ١٤٩، و فضائل الصحابة ١: ٥٠٠ رقم ٩١٦ باسناد صحیح، والترمذي: السنن رقم ٣٧٨٩ وقال: حسن غریب، و ابن ماجة: السنن ١: ٤١ رقم ١١٢، و ابن حبان كما فی الا حسان لابن بلبان رقم ٢١٩٦.

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٦ باسناد صحیح رجاله رجال الشیخین.

٣) خلیفة: التاریخ ١٧٠ باسناد حسن، كهمس صدوق روایتة عن سعید بن ابی عروبة قدیمة قبل اختلاط سعید الكلاباذي: رجال البخاري ٢: ٤٨٥، ٨٧٥، و ابن منجویه: رجال مسلم ١: ٢٤٥ ، و ابن حجر: تعریف (اصل التقدیس ٦٣) .

دەستی تیابووه.[1] عوسمان هەموو هەوڵێکی بە خەرج دا بۆ قایلکردنی ئاژاوەچیەکان بە هەڵوێستە هەڵەکەیان، چی لە ڕێگەی باسکردنی پلەو پایەو خزمەت کردنەکانی بۆ ئیسلام، یان بە ڕوونکردنەوەی مەترسی کوشتنی لەسەریەکرێزی نەتەوەی ئیسلام" خەڵکینە مەم کوژن و داوای گەڕانەوەم لێبکەن، سوێند بەخوا ئەگەر منتان کوشت هەرگیز پێکەوە بە هیچ ناگەنو شەڕی دوژمنتان پێکەوە پێ ناکرێت، ئەوەندەش جیاوازیتان تیادروست دەبێت ، تاکو واتان لێبێت ـ پەنجەکانی بەیەکدا کرد ـ" لە شەقی دیوارێکەوە قسەی لەگەڵ دەکردن[2]. چونکە دڵنیا نەبوو لیان ئەگەر دەربچێت نە یکوژن.

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) چاودێری هەنگاوی نەیارەکانی دەکرد، گوێی لە قسەکانیان دەبوو، ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف دەڵێت: "لەگەڵ عوسماندا بووم لە خانووەکەدا ـ لە کاتی ئابلۆقەکاندا ـ شوێنێك هەبوو کاتێك دەچووینە ئەوێ گوێم لە قسەی ئەوانە دەبوو کە لە (البلاط) بوو ـ جێگەیەکە لای دەرگای ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە نێوان ئەولای ماڵەکەی عوسمان ـ جارێکیان عوسمان چووە ئەوشوێنەوەو گەڕایەوەو ڕەنگی تێکچوو بوو، وتی: ئەوانە هەڕەشەی کوشتنیان لێ دەکردم تۆزێك پێش ئێستا، وتمان: خوای گەورە دەتپارێزێت لیان ئەی ئەمیری بڕواداران. وتی: ئەی بۆچی دەمکوژن[3]، خۆ گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی (لايحل دم امرى مسلم إلا فى إحدى ثلاث، رجل كفر بعد إيمانه، أو زنى بعد احصانه، أو قتل نفساً بغير نفس). واتە: کوشتنی کەسێکی موسڵمان ڕەوا نی یە مەگەر لەبەر سێ شت نەبێت: پیاوێك دوای مسڵمان بوونی کوفر بکاتو هەڵگەڕێتەوە، یان ژنی هێنابێت و زینا بکات، یان کەسێك بکوژێت بێ ئەوەی ئەو کەسە کەسێکی تری کوشتبێت.

سوێند بە خوا داوێن پیسیم نەکردووە نە لە جاهیلیەت و نە لە ئیسلامدا هەرگیز، هیچ کاتێش ئاواتەخواز نەبوومە لە جیاتی ئاینەکەم شتێکی ترم هەبێت لەو ڕۆژەوە کە خوای گەورە ڕێگای

---

١) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٩ بسند منقطع، و ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٨/ ٦٩ بسند منقطع، و سند اخر منقطع مع تدليس حبيب بن ابى ثابت. (انظر محمد عبدالله الغبان: فننة مقتل عثمان ـ المحلق ـ ١٤٦).

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ٧١ باسناد حسن، و ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٣ باسناد حسن، و ابن الاعرابي: المعجم ١٢٥ أ، و خليفة: التاريخ ١٧١ مخترصراً سقط منه (ابو ليلى).

٣) راجع عن البلاط السمهودي: الوفا ٣: ٧٣٤.

پیشانداوم نه کەسیشم کوشووه.ئیتر بۆ دەمکوژن؟ [1]عەبدوڵڵای کوری عومەریش ڕوونیکردووەتەوە لەسەرەوە قسەی لەگەڵ نەیارەکان کردووە بەم واتایە[2]هەندێ ریوایەتی لاوازیش یەك دەگرن بۆ دووپاتکرنەوەی ئەوە کە عوسمان لە ڕۆژی شەهید بوونی بە رۆژو بووە، هەروەها باسی ئەوەشی کردبوو کە پێغەمبەر ﷺی بینیوە، دەعوەتی کردووە بۆ بەربانگ کردن لەلای خۆی،[3] ئەبو سەعیدی مەولای ئەبو ئوسەید ـ کە شایەتی حاڵە ـ دەڵێت: "عوسمان ئەمجا دەرگاکەی کردەوەو قورئانەکەی دانا لەپێش خۆی، پیاوێك هاتە ژورەوە عوسمان پێی وت: کتێبی خوا لە نێوانماندایە. ئیتر کابرا دەرچو وازی لێهێنا، پیاوێکی تر هاتە ژورەوە عوسمان وتی کتێبی خوا لە نێوانماندایە .کابرا شمشێرەکەی بۆ داهێنا، عوسمان دەستی بۆ بەرز کردەوەو شمشێرەکە بەریکەتو بڕی، ئیتر نازانم لەیەکی کردەوە یان بڕی و دەستی جیانەبووەوە لەلاشەی. عوسمان وتی: سوێند بە خوا ئەمە یەکەمین دەستە قورئانی نووسی"،[4]خوێنەکەش بڵاوەی کرد لە سەر ئەو قورئانەی تیایدا دەیخوێنیو گەشتە سەر ئەو ئایەتەی دەفەرموێت "فسيكيفكهم الله وهو السميع العليم".[5] چەندین ڕایوایەتیش هاتووە ئەوە دەسەلمێنێ کە موحەمەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق لەگەڵ نەیارەکانیدا بووەو چوەتە ژووریشەوە لە ڕۆژی کوژرانەکەدا، کردوویەتی بەڕیشی عوسماندا، ئەویش باسی ڕێزو حورمەتی خۆی کردوە لەلای باوکی- واتە لای ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)- ئەویش دوای ئەوە دەرچووە بێئەوەی بەشداری بکات لە کوشتنەکەدا.[6] هەندێ لە گەنجەکان بەرگریان کرد لە عوسمان کینانەی مەولای صەفیە- کە شایەتی حاڵ بووە- دەڵێت:" لە کوژرانی عوسماندا ئامادە بووم، بەبەردەمیدا چوار لاوی قوڕەیشی لەماڵەکەی عوسماندا دەرکران کە گیانیان بەخوێنەوە بوو، ئەوانە بەرگریان کردبوو

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٧ باسناد صحيح، واحمد: المسند ١: ٣٤٨، ٣٦٣، ٣٧٩ ـ ٣٨٠ ط. احمد شاكر وصحيح اسناده.

٢) احمد: المسند ١ : ٣٥٥ اسناد صحيح.

٣) الهيثمي: المقصد العلي في زوائد ابي يعلى الموصلي ق ١٦٤ ا، وفي اسناده ابی جعفر الرازي صدوق سيئ الحفظ، و ابن سعد: الطبقات ٣: ٧٤ـ ٧٥ باسناد منقطع لأن نافعاً لم يروِ عن عثمان، وأحمد: المسند ١: ٣٨٨ـ ٣٨٩ تحقيق احمد شاكر وصحح اسناده لكنه ضعيف لان مسلما ابا سعد وانفرد ابن حبان بتوثيقه.

٤) خليفة: التاريخ ١٧٤ باسناد حسن، وقارن بالطبري: تاريخ ٤: ٣٣٣ـ ٣٣٤ من مرسل الحسن البصري.

٥) احمد: فضائل الصحابة ١: ٤٧، ٤٧٣ باسناد صحيح.

٦) خليفة: التاريخ ١٧٤ من مرسل الحسن البصري نقلا عن اسد بن موسى باسناد حسن، وابن عبد البر: الاستيعاب ٣:٣٤٩.

له عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، حەسەنی کوڕی عەلیو عەبدوڵای کوڕی زوبێرو موحەمەدی کوڕی حاتیبو مەروانی کوڕی حەکەم.[١] بەڵام بەرگریەکە توندو بەهێز نەبوو، بەهۆی دەرچوونی زۆرێك لەوانەی بەرگریان دەکرد لە ماڵەکە بە بۆنەی فەرمانەکانی عوسمان بە وازهێنان لە شەڕ، بەڵکو فەرمانیشی پێدەکردن لە ماڵەکەشی دەربچنو لە ماڵەکەی خۆیان دانیشنو دەر نەچن... عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) پاراستنی خوێنی موسڵمانانی هەڵبژاردو بڕیاریدا بە خوێنی خۆی خوێنو گیانی ئەوان بپارێزێت. ریوایەتە ڕاستیەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو کەسەی کە عوسمانی کوشت پیاوێك بوو لە بەنی سەدووس، خنکاندی پێش ئەوەی بە شمشێر لێی بدات[٢]، ڕیوایەتەکەش بە شایەتحاڵێك تەواو دەبێت کە ناکۆکیەك هەیە لەسەر ئەوەی ئایا لە هاوەڵان بووە یان نە، بەڵام ڕووداوەکەی بینیووە[٣]. کینانەی مەولای صەفیە دەڵێت: "بکوژەکەی عوسمانم بینی، پیاوێکی ڕەش بوو لە خەڵکی میصر، لە ماڵەکەدا دەستی بەرز کردەوەو دەیووت: من نەعسەلم کوشت"[٤] "ئەو کابرایە ناوی جەبەلە بوو: واتە پیاوە ڕەشەکە" [٥].

عەبدوڵڵای کوڕی شەفیق ـ هاوچەرخی ڕوداوەکان بوو، دەڵێت: یەکەم کەس لە عوسمانی دا ڕومانی یەمانی بوو بە گاڵۆك لیدا" [٦].

## هەڵوێستی ئەنصارەکان:

ئاژاوەکە لە مەدینە ڕویدا، کە مەنزڵگای موهاجیرو ئەنصارەکانە، بۆیە پێویست بوو ئەنصارەکان هەڵوێستێکیان بووایە لەم ڕووداوە ترسناکەی لە شارەکەیان ڕوویداوە لە دژی خەلیفە، چەندین ڕیوایەت یەکدەگرن بۆ بەهێزکردنی ئەوەی کە زەید پێشنیاری کردە سەر عوسماندا: "ئەوە

---

١) ابن عبد البر: الاستیعاب (مع الاصابة) ٣: ٧٨ باسناد حسن.

٢) خلیفة: التاریخ ١٧٤/ ١٧٥ باسناد صحیح، وقارن الطبري. تاریخ ٤: ٣٨٣ـ ٣٨٤.

٣) الذهبي: التجرید ٢: ١٧٣، و ابن حجر: الاصابة ٤: ٩٩.

٤) علي بن الجعد: المسند ٢: ٩٥٨ـ ٩٥٩ باسناد حسن.

٥) ابن سعد: الطبقات الکبرى ٣: ٨٣ـ ٨٤ باسناد حسن، و المحب الطبري: الریاض النضرة ٣: ٧١.

٦) خلیفة: التاریخ ١٧٥ بسناد صحیح، و انضر روایتة عن عثمان فی ابن منجویه: رجال صحیح مسلم ١: ٣٦ والصولجان: المحجن.

ئەنصارەکانن لە دەرگا دەڵێن: ئەگەر دەتەوێ دووجار دەبینە ئەنصاری خوا: عوسمان وتی: پێویستم بەوە نی یە وازبهێنن". [1]

موحەممەدی کوڕی سیرین باسی کردووە کە ژمارەی ئەو ئەنصارانەی لەگەڵ زەیدی کوڕی سابیت بوون (٣٠٠)[2] کەس بوون. هەروەها وتوویەتی ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ عوسماندا بوون لە خانووەکەی (٧٠٠)[3] کەس بوون" ئەگەر ڕێگەی پێبدانایە بە شێوەیەك لیان دەدات ـ گەر خوا بیوستایەـ لە شار وەدەریان دەنان"، بەڵام ئەم ژمارەیە لە ڕێگەی ڕاستەوە نەسەلمێنراوە، بەڵام دوور نی یە وابێت" ئاماژەیش دەکات بۆ هەڵویستی ئەنصارەکان لەو ساتە سەختەدا.

ڕیوایەتە متمانە پێکراوەکان ئەوە دەردەخەن کەنەوەی عەمری کوڕی عەوف لە ئەنصارەکان بەڵێنیان دا بە زوبێری کوڕی عەوام کە گوێڕایەڵی بن بۆ فریاکەوتنی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت). [4]

حاریسەی کوڕی نوعمانیش پێشنیاری کرد بۆ عوسمان لە کاتی ئابڵوقەکەیدا، کە ئەنصارەکان ئامادەن شەڕ بکەن بۆ بەرگریکردن لە خەلیفە[5]. ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاری لە گەڵیدا چووە ناوماڵەکەوە[6].

---

١) خليفة: التاريخ١٧٣ عن قتادة، و ابن ابی شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٥ و ابن سعد الطبقات ٣: ٧٠ والاخرين عن ابن سيرن، و فيه انقطاع بين ابن سيرين و زيد ويعتضد الطريقان الى الحسن.

٢) ابن عساكر: تاريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٤٠٠، و هو مرسل محمد بن سيرين و لم يدرك زيد بن ثابيت.

٣)ابن سعد: الطبقات ٣: ٧١ باسناد صحيح الى ابن سيرين، لكن ابن سيرين ولد سنة ٣٣هـ لسنتين البقيتا من خلافة عثمان، ويبدو ان ابن سيرين نقل الخبر عن سليط بن سليط دون الرقم سبعمانة ذلك فى رواية خليفة ١٧٣، و فى اسناد خليفة سعيد بن عبدالرحمن لم يترجموا له فهو مجهول.

٤) ابن عساكر: تاريخ دمشقـ ترجمة عثمانـ ٣٧٤ نقلا عن مصعب بن عبدالله الزبيرى و اسناد مصعب حسن لذاته.

٥) البخاري: التاريخ الصغير ١٠١:١ باسناد صحيح.

٦) ابن سعد: الطبقات ٣: ٦٧ باسناد صحيح.

## هەڵوێستی هاوەڵان لە ئاژاوەکە:

### صەفیەی دایکی ئیمانداران:

کینانەی مەولای صەفیە دەڵێت: "صەفیەم برد بۆ ئەوەی بەرگریی بکات لە عوسمان، لە ڕێگە ئەشتەر چاوی پێی کەوتو لە ڕوومەتی هێسترەکەیدا تاکو لار بوویەوە، وتی: بمگێڕنەوە با ئەم سەگە ئابڕوم نەبات[1]." جا کە نەیتوانی بگات بە ماڵەکەی عوسمان، تەختە دارێکی لە نێوان ماڵی خۆی و سەربانی ماڵ عوسماندا دانا، چونکە ماڵیان بە تەنیش یەکەوە بووە - بۆ گواستنەوەی خواردنو خواردنەوە.[2]

### زوبێری کوڕی عەوام:

ئەبو حەبیبەی مەولای عوروە نامەیەکی نارد بۆ عوسمان لەکاتی ئابڵوقەدانیدا، سڵاوی لێدەکردوو دەیوت: من لەسەر گوێڕایەڵی خۆمم نەگۆڕاوم و پەیمانم نەشکاندووە، ئەگەر دەتەوێ دێمە ژوورە بۆ لاتو دەبم بەکەسێك لەوانەی لەلاتن، ئەگەریش دەتەوێ لێرە دەمێنمەوە، چونکە نەوەی عەمری کوڕی عەوف بە لێنیان پێم داوە سبەینی لە دەرگاکەم ڕاوەستنو ئەوەی فەرمانیان پێبکەم ئەنجامی بدەن، ئیتر عوسمان پێی وت لە جێگای خۆت بمێنەوە" بەڵکو خوا لە بۆنەی تۆوە زیانم لێبەدوور بگرێت".[3]

### ئەبوزەری غیفاری:

لێکۆڵینەوە نوێکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەبوزەڕ و بۆچوونەکانی لە سیاسەتی دارایی خەرجکردندا، کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە سەر ڕووداوەکانی ئاژاوەگێڕی، هەندێ ڕیوایەتی لاوازیش هەیە ئەوە دەگەیەنن کە دوژمنایەتی و کینە لە نێوان ئەبوزەڕو عوسماندا هەبوو، مەعاویەش گوایە سکاڵای ئەبوزەڕی کردووە لەلای عوسمان، ئەویش فەرمانی کردووە بە ئامادەبوونی لە مەدینە، دواتریش دەربەدەری کردووە بۆ ڕەبەزە، بەڵام ڕیوایەتە صەحیحەکان چی دەڵێن؟

---

١) البخاري: التاريخ الكبير ٧:٢٣٧،ء احمد: المسند ٢: ٩٥٩، و ابن سعد: الطبقات ٨: ١٢٨ باسناد صحيح الى كنانة وهو شاهد عيان وثقة ابن حبان (الثقات ٥: ٣٣٩) و العجلي: الثقات ٢: ٢٩٩، ويرى ابن حجر انه مقبول ( التقريب).

٢) علي بن الجعد: المسند٢: ٩٥٩ باسناد صحيح.

٣) ابن عساكر: تاريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٣٧٤ نقلا عن مصعب بن عبدالله الزبيري، و اسناد مصعب صحيح.

ئەبو زەڕ (رەزای خوای لێبێت) باسی ناکۆکی خۆی دەکات لەگەڵ معاویە لە شام لەسەر لێکدانەوەی فەرموودەی خوای گەورە: (والذين يكنزون الذهب و الفضة ولا ينفقونها في سبيل لله) موعاویە وتی: ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی کیتاب دابەزیوە، منیش وتم: لەسەر ئێمەو ئەوان دابەزیوە. ئیتر لەسەر ئەوە شتێك کەوتە نێوانمانەوە، ئینجا نامەی نارد بۆ عوسمان سکاڵای لێم کرد، عوسمانیش نامەی بۆ من نوسی بچمە مەدینە، منیش چووم، لەوێ خەڵکەکە بەزۆر لە دەورم کۆبوونەوە وەکو چۆن لەوەو پێشتر منیان نەبینبێت، ئەوەم بۆ عوسمان باس کرد، پێی وتم: ئەگەر پێت باشە کەمێك دووربگرە تا ئاوەها لە خەڵکی نزیك بیت.

ئەوە بوو منی لەو پلەو پایە دانا، ئەگەر کەسێکی حەبەشیان بکردایە بە فەرمانددەم گوێم لێی دەگرتو بەقسەم دەکرد.[1]

ئەبو زەڕ چاوی بە عوسمان کەوت پاش گەڕانەوەی لە شام لەگەڵ کۆمەڵێك لە غیفار لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی صامیتی غیفاری، لەوێ پابەندبوونی بە گوێڕایەڵیکردنی بۆ عوسمان دووپاتکردەوە" ئایا لەمن دوو دڵی؟ سوێند بە خوا ئەگەر فەرمانم پێبکەیت خۆم هەڵواسم بە گرێی باریکەوە تاکو دەمرم، لە قسەت دەرناچم".[2] داوای ڕێگە پێدانیشی کرد کە لە لادێی (الربذة) جێگیر بێت.

داوای لێبوردنیشی کرد لەوەی ناتوانێت حوشتری زەکات وەربگرێت کە عوسمان پێی دابو بۆ ئەوەی سوود لە شیرەکەی وەربگرێت" ئەی کۆمەڵانی قورەیش دنیای خۆتان بۆ خۆتان پێویستیمان پێی نی یە".[3]

عەبدوڵڵای کوڕی صامیت بارودۆخی ئەو چاوپێکەوتنە ئاشکرا دەکاتو دەڵێت: ئەبو زەڕ عەمامەکەی لە دەسداگرتو بە عوسمانی وت: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە ئەوانە نیم ـ واتە هەڵچووەکان، ئەگەریش فەرمانم پێبکەیت قەپ بە دەماری سەر پاژنەی خۆمدا بکەم تا ئەو کاتەی دەمرم، قەپی پیادەکەم.

---

١) البخاري: الصحيح ( فتح الباري ٣: ٢٧١)، و ابن سعد: الطبقات ٤: ٢٢٦ باسناد صحيح لان سماع هيثم من حصين قبل اختلاط الاخير( ابن حج: تهذيب التهذب ١١: ٦١) وقد صرح هيثم بالتحديث.

٢) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٣٣٢ باسناد صحيح.

٣) ابن سعد: الطبقات ٤: ٢٣٢ باسناد صحيح، و عمربن شبة: تأريخ المدينة ١٠٣٥ـ ١٠٣٦ .

عوسمان وتی: ڕاست دەکەیت ئەی ئەبوزەڕ، بەڵکو ئێمە بۆ کارێکی چاکە ناردوومانە بە شوێنتدا، لە تەنیشتمان بیت لە مەدینە.

ئەبوزەڕ وتی: پێویستم بەوە نی یە، ڕێگەم بدە بچم بۆ لادێکەی خۆم.

عوسمان وتی: بەڵێ باشە.[1]

بۆیە موحەممەدی کوڕی سیرینو حەسەنی بەصری نکۆڵیان دەکرد لەوەی کە عوسمان ئەبوزەڕی دەرکردبێت بۆ (ربذة)[2] ئومموزەڕی خێزانی دەیووت: سوێند بە خوا عوسمان ئەبوزەڕی دەرنەکرد، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووو: ئەگەر خانووەکانی مەدینە گەیشتنە کێوی سەلع تۆ ئیتر مەدینە بەجێبهێڵە، جا ئەوکاتەی ماڵەکان لە سەلع تێپەڕین، ئەبوزەڕ دەرچوو بۆ شام.[3]

سەبارەت بە بۆچوونی ئەبوزەڕیش لە سیاسەتی داراییو تێگەیشتنی بۆ ئایەتی (الانفاق) گۆڕانکاری بەسەردا نەهات دوای هاتنی بۆ لای عوسمان لە مەدینە، چونکە کاتێك گەیشتە لای عوسمان ئەو خەریکی دابەشکردنی ماڵی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو لەنێو میراتگرەکانیدا، (کعب الاحبار)یش ئامادە بوو، جا عوسمان پرسیاری لێکرد لە پێش ئەبوزەڕدا: ئەی ئەبا ئیسحاق، چیدەڵێت دەربارەی کەسێك ئەم ماڵەی کۆکردووەتەوەو زەکاتیشی لێدەردەهێنا، لە پێناو خوایشدا لێی خرج دەکردو پەیوەندیەکانی خزمایەتیشی لێی جێبەجێدەکرد؟ (کعب الاحبار) وتی: خێری دێتەڕێ بە پشتیوانی خوا، ئیتر ئەبوزەڕ تووڕەبوو، گۆچانەکەشی لێبەرزکردەوەو وتی: چووزانیت کوڕی جوولەکە، خاوەنی ئەم ماڵە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاواتدەخوازێت ئەم پارانە دوپشك بوونایەو ناخی دڵیان بگەستایە.[4] ئەبوزەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە زیادەی ماڵی دەوڵەمەندەکان پێویستە دابەشکرێتە سەر هەژاراندا، ئەگەر نا دەبێتە گەنجینە کردنی نارەوا، ئەمەیش بۆچوونێکی تایبەتی خۆیەتی، نە عوسمانو نە هیچ کەسێك لە هاوەڵان قایل نەبوونە پێی.

---

١) عمر بن شبة: تأريخ المدينة ١٠٣٦ـ ١٠٣٧ باسناد حسن.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٠٣٧.

٣) الحاكم: المستدرك ٣: ٣٤٤ وقال: هذا حديث صحيح الاسناد على شرط الشيخين ولم يخرجاه وانظر الذهبي: سير اعلام البنلاء.

٤) عمر بن شبة: تأريخ المدينة ١٠٣٦ـ ١٠٣٧ باسناد حسن.

**ئوسامەی کوڕی زەید:**

ئەوکاتەی بە ئوسامە وترا قسە لەگەڵ عوسمان بکات (ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی ڕووداوەکانی ئاژاوە، وەڵامی دایەوە کە بەنهێنی قسەی لەگەڵ دەکات بێئەوەی دەرگای ئاژاوە بکاتەوە.[1]

حەسەنی کوڕی عەلی: عوسمانی بەجێنەهێشت ـ لەکاتی ئابلۆقەکەدا ـ تاکو خۆی داوای لێکرد دەربچێت[2].، برینداریش بوو بوو لەکاتی پەلاماردانەکاندا، دوای ئەوەی هەڵگیراو دەرکرا لە ماڵەکە.[3]

**عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف:**

سەعیدی کوڕی ئیبراهیمی زوهری دەڵێت: "عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفم بینی لە مینا سەری تاشیبوو بوو، دەگریاو دەیووت: چاوەڕوانی ئەوە نەبووم ئەوەندە بمێنم تاکو کوژرانی عوسمان ببینم".[4]

**زەیدی کوڕی سابیت:**

"لەسەر عوسمان دەگریا لە ڕۆژی کوژرانەکەیدا".[5]

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر:**

چووە ناو ماڵەکەی عوسمان بۆ ئەوەی بەرگری لێبکات، عوسمانیش فەرمانی پێکرد بە شەڕنەکردنو پەنادانی خەڵکیی، کەسانێکیش لەگەڵیدا لە خزمانی (ابن سراقة و ابن مطيع) پێش کوژرانی خەلیفە ماڵەکەیان بەجێهێشت[6]. ئیبنو عومەر ئەو ڕۆژە دووجار قەڵغانەکەی لەبەرکرد[7]و شمشێرەکەی هەڵگرت، تاکو عوسمان زۆری لێکرد ماڵەکە بەجێبهێڵێت نەکو بکوژرێت[8]

١) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٦: ٣٣١، ١٢: ٤٨).
٢) ابن عساكر: تأريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٣٩٥ ـ ٣٩٦.
٣) البخاري: التأريخ الكبير ٧: ٢٣٧.
٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٤٢ باسناد صحيح.
٥) ابن سعيد: الطبقات ٣: ٨١ باسناد حسن.
٦) خليفة: التأريخ ١٧٣ باسناد صحيح.
٧) خليفة: التأريخ ١٧٣ باسناد حسن.
٨) هەمان سەرچاوە (باسناد حسن).

چەند لەسەر ڕۆشتنێك لەسەر کوژرانی خەلیفە ڕاوبۆچونی هاوەڵانو پێشبینیەکانیان بۆ دەرەنجامەکانی کوژرانی عوسمان (رەزای خوای لێبێت).

**عەلی کوڕی ئەبو تالیب:**

"سوێند بەخوا عوسمانم نەکوشتووە، فەرمانیشم نەکردووە بە کوشتنی، بەڵام بەزێنرام"،[1] "من بۆ کوژرانەکەی زۆر ناڕەحەت بووم"[2]

**سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل:**

لە مزگەوتی کوففە وتی: "لو أن أحداً ارفضَّ للذي صنعتم بعثمان لكان محقوقاً أن يرفضَّ".[3]

**ئەبو موسای ئەشعەری:**

"ئەگەر کوژرانی عوسمان چاکە بوایە هەموو عەرەب شیریان پێی دەدۆشی، بەڵام گومڕایی بوو بۆیە خوێنی پێدەدۆشن".[4]

**سەمورەی کوڕی جوندوب:**

"ئیسلام لە قەڵایەکی قایمدا بوو، بە کوشتنی عوسمانیش کەلێنێکیان دروست کرد لە ئیسلام، کارەساتێکی خراپیان ئەنجامدا، ئەو کەلێنەشیان پێناگیرێت تا ڕۆژی قیامەت، خیلافەتیش لەناو خەڵکی مەدینەدا بوو، بەڵام لەخۆیانیان دەرکردو جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆیان".[5]

**عائیشە (رەزای خوای لێبێت):**

تەلەقی کوڕی خەششاف دەڵێت: "عوسمان کوژرا، ئێمەش دەستمان کرد بە پرسیارکردن لە یارو یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کارەساتە گوێم لە عائیشە بوو دەیووت: بەستەملێکراوی

---

١) مسلم: الصحيح ٣: ١١٦٠.

٢) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٠٨، وانظر اقوالا مماثلة فى ابن عساكر: تأريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ، ٤٦٤.

٣) البخاري: الصحيح (فتح البارى ٧: ١٧٦، ١٧٨، ١٢: ٣١٥)

٤) البخاري: التأريخ الكبير ١: ٣٦٩، وابن عساكر: تأريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ٤٨٩ـ ٤٩٠، واسناد البخاري فيه سعيد بن ابى عروبة اختلط باخرة، ورواية ابن ابي عدي بعد اختلاطه (ابن كيال: الكواكب النيرات ١٩٩) وفيه اسماعيل بن عمران لم يوثقه الا ابن حبان، واما اسناد ابن عساكر ففيه انقطاع لان قتادة لم يسمع ابا موسى الاشعري، ويقوي الطريقان ببعضهما الى الحسن لغيره.

٥) ابن عساكر: تأريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٤٩٣ باسناد حسن، ولا تضره كثرة ارسال وتدليس الحسن البصري، فقد ثبت سماعه عن سمرة (البخاري: الصحيح ـ فتح الباري ٤: ٥٩٠، ومحمد عبدالله سنيور: فتنة مقتل عثمان، الملحق ص ٧٦ـ ٧٧).

کوژرا، نەفرین لە بکوژانی".[1]

مەسروقی کوڕی ئەجدەعیش دەگێڕێتەوە لە عائیشە کە لەکاتی کوژرانی عوسماندا فەرموویەتی: "وەکو جلی پاککراوە لەهەموو پیسیەك بەجێتان هێشت، دوایی نزیکتان کردەوە وەکو سەرببڕێت. مەسروق بە عائیشەی وت: نەسوێند بەو کەسەی باوەڕداران باوەڕیان پیەتیو بێباوەڕان باوەڕیان پێی نیە، هەرگیز من هیچم بۆیان نەنووسیوە تا ئەوکاتەی لەم جێگەی خۆمدا دانیشتومە". ئەعمەش وتی: دوایی وا دەزانرا کە لەسەر زمانی ئەو نوسراوە نامەکان[2] ئینجا عائیشە (رەزای خوای لێبێت) هەڵوێستی خۆی ڕوونکردەوە سەبارەت بە سەرەتاکانی بشێونەی کوژرانی عوسمان وتی: "ئەو خەڵکە سەردانی منیان دەکرد سەبارەت بە کەموکورتیەکانی عوسمان، من هەربەگلەیی لێی حاڵی دەبووم، بەڵام خوێنی عوسمان، پەنا دەگرمە خوا لە ڕژاندنی ئەو خوێنە، سوێند بەخوا ئاواتم دەخواست گەڕبووایەم و پێستم بەگیانەوە نەمایە، بەڵام مەرگی عوسمانم بەم شێوە نەبینایە" دوای هەندێ قسەی تری کرد کە عوسمانی بە باشتر زانی تیایدا لە عەلی.[3]

عائیشە هەرکاتێك باسی عوسمان بکرایە، ئەوەندە دەگریا تاکو سەرپۆشەکەی لە فرمێسك تەڕ دەبوو، دەیووت: ئاواتەخوازی هەرچیەك بووم بۆ عوسمان بەسەرخۆمدا هات، تەنانەت ئەگەر ئاواتەخوازی کوژرانی بووایەم دەکوژرام[4]. سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی عائیشە (رەزای خوای لێبێت) بۆ نەیارەکانی عوسمان، بە ڕوونی دەردەکەوێت لە وتەیەکیدا بۆ عەبدوڵڵای کوڕی خیاری قوڕەیشی ـ یەکێکە لە پاڵەوانانی موسڵمانان ـ: "ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەدی، بەکەس هەڵمەخەڵەتێ دوای ئەوەی کە بینیت، سوێند بەخوا، کرداری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺم بەکەم نەدەزانی تا ئەو کەسانە دەرکەوتن کە بەرانبەری عوسمانیان گرت، قسەیەکیان لەگەڵ کرد لەوە

١) البخاري: التأريخ الكبير ٤: ٣٥٨ باسناد حسن.

٢) خليفة: تأريخ ١٧٦ باسناد صححه ابن كثير (البداية والنهاية ٧: ٢٠٤) وعنعنة الاعمش هنا لا تضر، وابن سعد: الطبقات ٣: ٨٢، وابن شبة: تأريخ المدينة ١٢٢٥، وابن عساكر: تأريخ دمشق ـ ترجمة عثمان ـ ٤٩٦. وقارن برواية ابن شبة: تأريخ المدينة ١٢٢٤ ـ ١٢٢٥ وفى سنده ام الحجاج العوفية مجهولة

٣) احمد: مسائل الامام احمد، برواية اسحق بن ابراهيم بن هان ٢: ١٧١ رقم ١٩٤٢، والخلال: كتاب السنة ٣٥٨ عند الامام احمد واسنادة صحيح.

٤) ابو نعيم: الامامة والرد على الرافضة ٣٣٠ باسناد صحيح، هانئ وقارن مع البخاري: خلق افعال العباد ٢٥ باسناد صحيح.

جوانتر نەدەبوو، خوێندنەوەیەکیش بۆیان خوێندنەوەو لەوە چاکتر نابێت، نوێژێکیشیان دەکرد لەوە ڕێكو پێکتر نەدەکرا، بەڵام کاتێك کرداریانم بینی، بۆم دەرکەوت بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ناگەن، جا ئەگەر قسەی کەسێکت بەلاوە جوان بوو، بڵێ: (اعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله)". [1]

بەم شێوەیش ڕوونی کردەوە کە نەیارەکان، سەرەڕای خوا پەرستنیان، کە هاوەڵانیشیان پیانەدەگەیشت، بەڵام هەرئەوەبوو کە خەڵکی پیان هەڵخەڵەتانو ڕێگەیان دابەخۆیان کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن.

## بەیعەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) بە خیلافەت:

بەڵایەکی گەورە بەرۆکی موسڵمانانی گرت بەهۆی کوژرانی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت)، چونکە موسڵمانان بە شێوەیەکی ئاسایی بە گواستنەوەی دەسەڵاتدا تێپەڕ بوو بوون لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت)، بەڵام ئێستا بەرانبەر تاقیکردنەوەیەکی تازەن، ئەویش بەکارهێنانی توندو تیژیە بۆ گۆڕانی دەسەڵات، کە لە ئەنجامی ئەوەشدا خەلیفە کوژرا، جێگاکەشی بە بەتاڵی مایەوە، نەیارەکان هەوڵیاندا بەیعەت بدەن بە یەکێك لە سەرانی هاوەڵان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشایە، بۆیە خیلافەتیان پێشنیارکرد بۆ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا [2] و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تەنانەت هەڕەشەی کوشتنیشیان لێکرد، [3] بەڵام بەهیچ شێوەیەك کەس ئەوەی قبوڵ نەدەکرد لە ئاوها بارودۆخێکدا، چونکە ئەوان نوێنەری موسڵمانان نین، بەڵکو گەورە هاوەڵان لە مەدینە ئەو نوێنەرایەتیە دەکەن، خەڵکیش تەنها بە هەڵبژاردنی ئەوان قایل دەبن، نەیارەکانیش بەم ڕاستیەیان زانی [4] پاشی هەرەسهێنانی هەموو هاوەڵەکانیان. خەڵکیش واق وڕمابوون، بەڵکو سەرکردەکانیش بەهەمان شێوە، عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: "کە عوسمان کوژرا، خەریك بوو بیروهۆشم لە دەست بدەمو خۆم نەناسمەوە، هاتنە لام بۆ بەیعەت، منیش وتم: سوێند بەخوا شەرم دەکەم لە پەروەردگارم بەیعەت وەربگرم لە کەسانێك پیاوێکیان کوشتووە،

١) البخاري: خلق افعال العباد ٢٥ باسناد صحيح، وعبد الرزاق: المصنف ١١: ٤٤٧.

٢) احمد: فضائل الصحابة ٢: ٥٧٣ـ ٥٧٤.

٣) احمد: فضائل الصحابة ٢: ٨٩٥ رقم ١٧٠٢، وابن سعد: الطبقات ٤: ١٥١ باسناد صحيح، حەسەنی بەصری بە چاوی خۆی ڕووداوەکانی لە مەدینەدا بینیوە، لە تەمەنی چواردە ساڵیدا (ابن حجر: تهذيب التهذيب ٢: ٢٦٦ـ ٢٦٧)

٤) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٢: ٤٤ـ ١٤٥، واحمد: المسند١: ٣٢٣، والبلاذري: انساب الاشراف٣٥:٢ب.

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: (ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك فریشتەکان شەرمی لێدەکەن) من لە خوای خۆم شەرم دەکەم بەیعەت وەربگرمو هێشتا عوسمان لاشەکەی لەسەر زەوی کەوتووەو نەنێژراوە، دوای ئەو قسانە ڕۆیشتن. لە دوای بەخاکسپاردنی تەرمەکە، دووبارە خەڵکەکە گەڕانەوە لامو داوای بەیعەتیان کرد، وتم: خوایەگیان من ترساوم لەوەی بەرەو ڕووی دەچم، دوای ئەوە هەستم کرد ورەم باشترە ڕازی بووم. ئەوانیش پیان وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران. هەروەکو چۆن جەرگم بڕێت لەو وشە، وتم: خوایە گیان لەمن وەربگرە بۆ عوسمان تا ڕازی دەبیت".[١]

بەم گیانە ناسكو خەمبارەی پڕ لە بێگەردییو ئەمەکە بۆ برایەتیو یادگاریی هاوڕێیەتی، عەلی بەیعەتی وەردەگرت بۆ خەلیفەیی، ڕازیبوونیشی لەسەر داواکاری خەڵکیی لەبەر ئەوەبوو کۆتایی بهێنێ بە قۆناغێکی پەشێوی بەهۆی درووستبوونی بۆشایی لە دەسەڵاتدا، مەرجیشی کرد لەسەر ئەوەی بەیعەتەکەی نهێنی نەبێت "من دەردەچم بۆ مزگەوت، کێ حەزیکرد بەیعەتم پێبدات بابیدات"، ئیتر بەرەو مزگەوت ڕۆیشتو خەڵکەکە بەیعەتیان پێدا.[٢]

تەڵحەی کوڕی عەوبەیدوڵڵای تەیمیو زوبەیری کوڕی عەوام ـ کە لە دە کەسە مژدە پێدراوەکان بوون بە بەهەشت ـ ئاشکرایان کرد کە ئەوان بە زۆر بەیعەتیان لێوەرگیراوەو لەژێر هەڕەشەی بکوژەکانی عوسماندا[٣] چونکە ئەوان ڕازینەبوون لەسەر ئەو شێوازەی بەیعەتی تیادا وەرگیراوە، دوور لە ئەهلی شوراو لە بارودۆخێکدا کە توندوتیژیی و ناکۆکی تیا باڵادەستە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر[٤] مەیلی بەلای خۆبەدوورگرتندا بوو لە ڕووداوەکان، هەروەها ئوسامەی کوڕی زەید کە بە عەلی وت: "ئەگەر لەناو دەمی شێر بوایەیت حەزم دەکرد لەگەڵتدا بم، بەڵام ئەمەی ئەمڕۆ ڕوودەدا، من شتی لەو جۆرەم نەبینیوە"[٥]، هەروەها موحەممەدی کوڕی مەسلەمە[٦]و،

١) الحاكم: المستدرك ٣: ٩٥ وصححه على شرطها ووافقه الذهبي. وله متابعة ضعيفة لدى الحاكم ٣: ١٠٣ بسند فيه الكديمي وهو ضعيف.

٢) احمد: فضائل الصحابة ٢: ٥٧٣ باسناد حسن، والحاكم: المستدرك ٣: ٩٥ باسناد حسن، وابو نعيم: الامامة ٣٢٩.

٣) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١٠٧و ١٥: ٢٦١ باسناد صحيح، والبلاذري: انساب الاشراف ٢: ٣٧ ٥ب.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١٣٣و ١٥: ٨١ باسناد صحيح.

٥) البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٣: ٦١)، وابن سعد: الطبقات ٤: ٧١.

٦) احمد: المسند ٤: ٢٢٥ من زوائد عبد الله و ٣: ٤٩٣، والبخاري: التأريخ الصغير ١: ١٠٥، وابن ماجة: السنن ٢:١٣١٠ رقم ٣٩٦٢و تعتضد طرقه الى الصحيح (الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ٣: ٣٦٩ رقم ١٣٨٠)

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص[1]و، ئوهبانی کوڕی صەیفی کە بە عەلی وت: "خۆشەویستەکەمو ئامۆزاکەت ﷺ فەرمانی پێکردم ئەگەر شەڕ هەڵگیرسا لە نێوان موسڵماناندا، شمشێرێك لەدار بۆ خۆم دروست بکەم"[2]، عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی سەرح[3]و کەسانێکی تر[4]بە هەمان شێوە دووریان گرت لە ڕووداوەکانو بەیعەتیان بەکەس نەدا بۆ خیلافەت. بەڵام زۆرینەی هاوەڵان لە موهاجیرو ئەنصارەکان بەیعەتیاندا بە عەلی و خەڵکیش بە شوێن ئەواندا.

بەیعەتی عەلی لە پاش حەوت ڕۆژ بوو لە کوژرانی عوسمان، ئینجا هەڵسا بە جێگیرکردنی ئەبو موسای ئەشعەری لەسەر فەرمانڕەوایەتی کووفەو ئەویش هەڵسا بە وەرگرتنی بەیعەت بۆ عەلی لە زۆربەی خەڵکی کوفە[5].

هەروەها عەلی هەڵسا بە لابردنی فەرمانڕەوای مەککە خالیدی کوڕی عاصی مەخزومیو ئەبو قەتادەی ئەنصاری بۆ ماوەی دوو مانگ لە جێگاکەی داناو دواتر ئەویشی لابردو (قثم)ی کوڕی عەباسی[6] خستە جێگاکەی، واشدەردەکەوێت ڕاوبۆچوونی گشتیی لە مەککە خەشمگیر بوو لەبەر کوژرانی عوسمان، هەروەها توڕەبوونیش زیادی دەکرد لە نێوانیاندا بەهۆی زۆری ئاوارەکان لە مەدینەوە بۆ مەککە بە کاریگەریی زاڵبوونی ئاژاوەگێڕەکان لەسەر مەدینە.[7]

ئینجا عەلی هەڵسا بە ناردنی عوسمانی کوڕی حونەیفی ئەنصاریی بۆ بەصرە وەکو فەرمانڕەوا لە جێگەی عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی کورەیز، کە پێشتر لەلایەن عوسمانەوە دانرابوو، بەصرەشی بەجێهێشتبوو بەرەو مەککە، ئینجا خەڵکی بەصرە دووبەرەکیان تێکەوتبوو دەربارەی فەرمانڕەوای تازە، هەندێکیان بەیعەتیان دابوو، هەندێکیشیان خۆیان بەدوور گرتبوو، کۆمەڵەکەی تریشیان

---

١) الحاكم: المستدرك ٣: ١١٥ بدون اسناد.

٢) احمد: المسند ٥: ٦٩و ٦: ٣٩٣، والطبراني: المعجم الكبير ١: ٢٧١ باسناد حسن.

٣) البخاري: التأريخ الكبير ٥: ٢٩.

٤) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٣٥٧، واحمد: المسند (كما في الفتح الرباني للساعاتي ٢٣: ٢١٣٩، وابن عبد البر: الاستيعاب ١: ٧٧و ١١٦.

٥) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ٣٦ب.

٦) خليفة بن خياط: التأريخ ١٧٨، ٢٠١.

٧) عبد الحميد علي ناصر: خلافة علي ١١٥ـ ١١٧.

دەیانووت بەیعەت نادەین تا بکوژانی عوسمان نەکوژرێن، ئەمانە دوایی لە دەوری تەڵحەو زوبەیرو عائیشە کۆبوونەوە لەکاتی هاتنیان بۆ بەصرە.[1]

سەبارەت بە وڵاتی شام موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کە فەرمانڕەوا بوو لەوێ، بەیعەتی بە عەلی نەدا، دوایی داوای تۆڵەسەندنی کرد لە بکوژەکانی عوسمان، بەڵام یارمەتی نەیارەکانی بەصرەیشی نەدا.

عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی سەرحیش میصری بەجێهێشتبوو ڕووەو عەسقەلان، بۆیە موحەممەدی کوڕی ئەبو حوزەیفە دەستی بەسەر میصردا گرت بۆ ماوەی ساڵێك، ڕووبەڕووی نەیاریەکی توند بوویەوە لەلایەن لایەنگرانی عوسمان کە داوای تۆڵەیان دەکرد لە بکوژانی عوسمان لە پاش کوژرانی دوای ئەو ساڵە، عەلی هەڵسا بە دانانی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری، کە توانی بەیعەت لە خەڵکەکە وەربگرێت بۆ عەلیو ڕێکەوتنو سازاندیشی بەر قەرار کرد لەگەڵ عوسمانیەکاندا،[2] هەروەها عەلی هەڵسا بەناردنی عوبەیدوڵڵای کوڕی عەباس وەکو فەرمانڕەوا لەسەر یەمەن، ئەویش بەیعەتی لە زۆربەی خەڵکی یەمەن وەرگرت بۆ عەلی، کۆمەڵانێکیش هەر مانەوە داوای تۆڵە کردنەوەیان دەکرد لە بکوژانی عوسمان، "ثمامة"ی کوڕی عەدی کە فەرمانڕەوای صەنعا بوو لەلایەن عوسمانەوە، بە کوڵ دەگریاو باسی ڕووداوەکانی دەکرد:"ئا ئەمڕۆ خیلافەتی پیغەمبەر هەڵکەنراو لەدەستی ئوممەتی موحەممەد ﷺدا دەرکرا، بووە موڵکێکی زۆرەملێ، هەر کەسێك شتێکی لێوەرگریت دەرەقەتی نایەت".[3]

مەترسیدارترین مەسەلەیش کە ڕووبەڕووی خەلیفەی تازە کرایەوە، مەسەلەی دادگایکردنی بکوژانی عوسمانو تۆڵەلێسەندنیان بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیش عەلی ئاگادارکردبوویەوە لە ترسناکی ئەو مەسەلە پێش ئەوەی بکرێت بە خەلیفە: "خەڵکیی خوێنی عوسمانیان لە تۆ دەوێت دوایی"[4] چونکە ئەو کارەساتە خوێناویە دڵەکانی پڕکردبوو لە خەمو پەشیمانی لەسەر ئەوەی کە هەوڵی

---

١) ابن سعد: الطبقات ٦: ٣٣٣.

٢)عبدالرزاق: المصنف ٢: ٤٥٨ بسند صحيح الى الزهري ثم هو من مراسيله، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتأريخ ١: ٢٥٤، والبخاري: التأريخ الكبير ٥: ٢٩، والكندي: ولاة مصر ٢١.

٣) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٤٤٧، وابن سعد: الطبقات ٣: ٨٠ بسند صحيح، والبخاري: التأريخ الكبير ٢: ١٧٦.

٤) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٤٤٨ باسناد صحيح، والذهبي: تأريخ الاسلام (٦١ـ ٨٠ م) ص٥٩.

تەواو نەدرا بۆ بەرگریکردن لە خەلیفە، با ئەوەش گوێڕایەڵی نەکردنی فەرمانەکانی عوسمانی تیادا بووایە بۆ شەڕنەکردن.

تەلحەو زوبەیرو عائیشە سەرکردەی داواکەرانی تۆڵەسەندنەوە بوون لە بکوژانی عوسمان، ئەوەیشیان کردبوو بەمەرجی گوێڕایەڵیکردن بۆ خەلیفەی تازە..

تەڵحەی کوڕی عەبدوڵڵای تەیمی هەستی بەکەم تەرخەمیو سستی دەکرد کە ئەنجامی دابێت لەگەڵ بکوژەکاندا لەکاتی ئاژاوەکەدا، بۆیە پەشیمان بووەو حەزیشیدەکرد ئەو گوناهانە بسڕێتەوە "لە ڕووداوی کوشتنی عوسماندا شتانێك ڕوویداوە، کەفارەتو قەرەبووی نی یە، مەگەر خوێنم بڕێژم لە پێناو تۆڵەکەیدا"،[1] "ئێمە ڕووپاماییمان دەکرد لە مەسەلەی عوسماندا، بۆیە ئێستە ڕێگەچارەیەکی ترمان لە بەردەم نەماوە جگە لەوەی بەتوندترین شێوە داوای تۆڵەی عوسمان بکەین"،[2] واشدەردەکەوێت کە ئەم هەستە لەلای زۆر کەس درووست بوو بوو، بە شێوەیەك کە تەوژمێکی نەیاری بەهێزی دروستکردبوو، لە زۆربەی شوێنکەوتوانو بەهێزیی پاڵنەرو سوور بوون لەسەر جێبەجێکردنی ئامانجەکانی، کە هاوتا بوو لەگەڵ ئەوانەی پشتگیریان دەکرد لە خیلافەتی عەلی، شەڕەکانی جەمەلو صەففینیش ئەو ڕاستیانەی ئاشکرا کرد.

عەلی کەوتبووە نێوان دوو تەوژمی بەهێزەوە، یەکێکیان تەوژمی بەشداریکەرانو هاندەرانی کوشتنی عوسمان وەکو حەکیمی کوڕی جەبەلەی عەبدی سەرکردەی هەڵچووەکانی بەصرە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عودەیسی بەلەویو کینانەی کوڕی بشیر لە سەرکردەی هەڵچووەکانی میصر بوون، مالیکی ئەشتەری نەخەعی کە لەسەرکردەی هەڵچووەکانی کووفە بوون، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئەبو حوزەیفە کە دەستی بەسەر میصردا گرت، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر، هەموو ئەمانەیش تێکەڵیان هەبوو لەگەڵ سوپای عەلیو کاریگەریشیان هەبوو لەسەر هۆزەکانیان، هەندێ لەوانەیش مەدینەیان بەجێهێشتبوو بەرەو شارەکانی تر دوای بەیعەتدان بەعەلی، بۆیە عەلی توانای جێبەجێکردنی تۆڵەی نەبوو لەسەر ئەوانە، لەکاتێکدا هێشتا خەڵکی پێك نەهاتون لەسەر خیلافەتەکەی.[3]

١) الحاکم: المستدرك ٣: ٣٧١ـ ٣٧٢ وقال الذهبي: سنده حسن.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١٤٢ بسند صحيح.

٣) ابن تيمية: منهاج السنة ٤: ٤٠٧.

تەوژمی دووەم خۆی دەبینیەوە لە تەلحەی عوبەیدوڵڵاو زوبەیری کوڕی عەوامو عائیشەی دایکی بڕواداران، ئەمانە گوشاریان دەکرد بەتوندی لەسەر تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمان، پێشیان وابو کە عەلی وازیهێناوە لە مەسەلەی تۆڵەسەندن.[1]ئینجا پۆزشیان بۆ عەلی نەدەبینی لە ئەو جۆرە سیاسەتەی بەرپای دەکرد لە مراندنی ڕووداوانی ئاژاوەو چاوپۆشیکردنیان لە ڕێگەی جێبەجێکردنی تۆڵەسەندن لەو کەسانە، تا بارودۆخ ئاسایی دەبێتەوەو خەڵکیی هەموویان بەیعەتدەدەن. ئینجا عەلی ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە یەك بە یەکی بکوژەکان ناناسێت، دەیووت: "سوێند بەخوا حەزم دەکرد بەنی ئومەیە ڕازیبوونایە، پەنجا کەس لە بەنی هاشم سوێندیان بخواردایە بۆیان، ئێمە عوسمانمان نەکوشتووەو بکوژەکەشی ناناسین"[2] لە پاش تێپەڕبوونی چوارمانگ بەسەر بەیعەتی عەلی، بێئەوەی تۆڵەی عوسمان بکرێتەوە، تەلحەو زوبەیر دەرچوون بۆ مەککە[3] لەویش لایەنگرانی خۆیانیان کۆکردەوە کە حەوت سەد کەس دەبوون[4] ئینجا بەرەو بەصرە ڕۆیشتن بە ئامانجی دەستگیرکردنی بکوژەکانو کوشتنەوەیان، کاتێك گەیشتنە بەصرە ژمارەیان بووبوو بە سێ هەزار کەس، چونکە لە ڕێگە خەڵکیی پەیوەندیان پیانەوە دەکرد، عەبدڵڵای کوڕی عامیری کوڕی کورەیزو یەعلای کوڕی ئومەیە سەروەتو سامنێکی زۆریان خەرج کرد لەسەر ئامادەکردنی ئەو سوپایە لە مەککە، یەعلا بەتەنها خۆی چوارسەد حوشتری پێشکەش کرد[5]. زۆربەی خەڵکی بەصرەیش لەگەڵ ئەوەدا بوون تۆڵە لە بکوژانی عوسمان بکرێتەوە، بۆیە لە ڕووی دەروونیەوە ئامادەبوون بچنە پاڵ تەڵحەو زوبەیرو عائیشە لەکاتی گەیشتنیان.

خەمو پەژارە دڵی سەرکردەکانی نەیاری عەلی داگرتبوویەوە، چونکە سەرەڕای ئەوەی داوایان کرد حوکمی شەرع دژ بە بکوژانی عوسمان ئەنجام بدرێت، بەڵام ئەوەی یەکڕیزیی موسڵمانان لە دەست بدرێتو خوێنیان بڕژێت، هەستێکی گورچکبڕی تیایان دروستکرد، جاری واشبوو دەبووە مایەی

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١١٨ بسند صحيح (ابن حجر: فتح الباري ١٣: ٣٤، ٥٧)

٢) سعيد بن منصور: السنن ٢: ٢٣٥ـ ٣٣٦ رقم ٢٩٤٢ باسناد صحيح.

٣) الطبري: تأريخ ٤: ٤٣٩ بسند صحيح الزهري ثم هو مرسل لان الزهري (ت ١١٤ ح) لم يشهد الاحداث.

٤) زوهری ژمارەی سوپاکە پێش دەرچوونی لە مەککە بە حەوت سەد کەس دەستنیشان کردووە، بە سێ هەزاریش پێش ئەوەی بچنە ناو بەصرەوە (عبد الرزاق: المصنف ٥: ٤٥٦، والطبري: تأريخ ٤: ٤٥٢ من مرسل الزهري، والبلاذري: انساب الاشراف ٢: ٣٨ من مرسل حاكم بن كيسان) ويعتضد الخبران المرسلان.

٥) عبد الرزاق: المصنف ٥: ٥٦ من مرسل الزهري.

دڵەڕاوکیەکی ئاشکرا، بەڵام هەرچۆنێك بێت بەرەو چارەنوسەکانی خۆیان بە دڵێکی بارکراو لە خەم بە ڕێکەوتن.

عەلقەمەی کوڕی وەققاص ـ کە شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوە ـ دەڵێت: "من ئەوم بینی ـ مەبەستی تەڵحەیە ـ تەنیایی خۆشترین کۆڕ بوو لەلای، ڕیشی دابوویە سەر سەرووی سنگیدا، پێم وت: ئەی ئەبو موحەممەد، وادەتبینم حەز لە تەنیایی دەکەیت‌و ڕیشت خستووەتە سەر سنگت، ئەگەر ئەم کارەت پێ باش نی یە وازی لێبهێنە، کەس زۆرت لێناکات. وتی: ئەی عەلقەمەی کوڕی وەققاص لۆمەم مەکە، ئێمە هەمووومان یەکدەستبووین لە دژی دوژمنەکانمان، کەچی ئەمڕۆ بووینەتە دوو چیا پەلاماری یەکتر دەدەین[1].

سەبارەت بە ئەو سەرکردەی تر ـ زوبەیری کوڕی عەوام ـ موتەڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شخیر ـ کە شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوی بەڕێزە ـ دەڵێت: "بە زوبەیرمان وت: ئەی ئەبو عەبدڵڵا، بۆچی هاتوون؟ عوسمانتان بە کوشت داو ئێستە هاتوون داوای تۆڵەکەی دەکەن!! زوبەیر وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان ئەم فەرموودەی خوامان دەخوێندەوە (واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة)[2] نەماندەزانی ئێمە دەبینە ئەو کەسانە، تا لە نێوانماندا بەم شێوە ڕوویدا"[3]

سەبارەت بە دایکی بڕواداران عائیشە، قەیسی کوڕی ئەبو حازیمی بەجەلی ـ کە شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوە ـ دەڵێت: "کاتێك عائیشە بەرەو بەصرە دەهات، گەیشتە کانی‌و ئاوەکانی بەنی عامیر لەکاتی شەوداو سەگەکان پێی دەوەڕین، وتی: ئەمە چی ئاوێکە؟ وتیان: ئاوی حەوئەبە. وتی: وا ئەزانم بگەڕێمەوە باشترە. پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان بە خێزانەکانی وت: (ئای لە ڕۆژێك کە سەگەکانی حەوئەب بەیەکێکتان دەوەڕێت؟!) زوبەیر پێی وت: دەگەڕێینەوە!! بەڵکو خوای گەورە بەبۆنەی تۆوە ئاشتی بخاتە نێو خەڵکەوە"[4]

---

١) الحاكم: المستدرك ٣: ٣٧١ ـ ٣٧٢ وقال الذهبي: سنده جيد والطبري: تأريخ ٤: ٤٥٣، ٤٧٦.

٢) الانفال ٢٥.

٣) احمد: المسند ٣: ٩ (ط. احمد شاكر) باسناد حسن، وابن ابي خيثمة: التأريخ الكبير ٥٠: ٧٧ أ بمثل اسناد احمد، وانظر البزار: كشف الاستار ٤: ٩١ رقم ٣٢٦٦ من طريق مطرف ايضا، وابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١١٥ عن حسن البصري و ١٥: ٢٧٧، والطبري: تأريخ ٩: ٢١٨ ويعتضد الخبر الى مرتبة الصحيح.

٤) احمد: المسند ٦: ٥٢، ٩٧ باسناد صحيح، وقد جمعت بين المتنين، والحاكم: المستدرك ٣: ١٣٠ وقال الألباني: اسناده صحيح جدا، صححه خمسة من كبار أئمة الحديث هم: ابن حبان، والحاكم، والذهبي، وابن كثير، وابن حجر (سلسلة الاحاديث الصحيحة ١: ٧٦٧ رقم ٤٧٤).

ئەم دەقەیش هەندێ مەسەلەی گرنگ ئاشکرا دەکات، یەکێ لەوانە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ، بە ڕووداوێکی ڕوونەداو کە لە ئایندەدا ڕوودەدات، هەروەها دوودڵی عائیشە لە ڕێکردن بەرەو بەصرە، ئینجا ئەوەی کە نەیارەکان حەزیان لە چاکسازی بووە لە نێوان خەڵکدا، وێڕای سووربونیان لەسەر جێبەجێکردنی تۆڵە لەسەر بکوژانی عوسمان. کاتێك چوونە ناو بەصرەوە زۆربەی خەڵکەکە هاتنە ڕیزەکانیانەوە، بەڵام هەندێکیان دوورکەوتنەوەیان هەڵبژارد لە هەموان، چونکە سەریان لێشێواو نەیانزانی چیبکەن، جا با گوێ لە یەکێك لەوانە بگرین، لە ئەحنەفی کوڕی قیسی تەمیمی کە یەکێکە لە سەرانی تەمیم و هۆشمەندانی عەرەب، کاتێك زوبەیری کوڕی عەوام داوای لێکرد بێتە ڕیزەکانەوە، وتی: "ناخۆشترین و سەختترین هەڵوێست هاتبێتە ڕێگام ئەمەیە، ئەگەر پشتی ئەوانە بەربدەم، کە دایکی ئیماندارانو حەواری پێغەمبەر ﷺیان تیادایە، ئەوە کارێکی سەختە لە سەرم، ئەگەریش شەڕ لەگەڵ کەسێکدا بکەم کە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ و فەرمانیشم پێکراوە بەیعەتی پێبدەم، ئەوەیش هەر سەختە لە سەرم"[1] بەم شێوەیش لەگەڵ شەش هەزارکەس لە هۆزەکەی کە بە قسەیان دەکرد، دووریان گرت لە ڕووداوەکان، ئەوەکانی تریش ـ کە زۆر بوون ـ چوونە ناو هێزەکانی تەڵحەو زوبەیرو عائیشە.[2]

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١١٨، والطبري: تأريخ ٤: ٤٩٧ـ ٤٩٩، وابن حجر: فتح الباري ١٣: ٣٤ من طريق الطبري وقال: سند صحيح.

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ١١٠ـ ١١١.

# بەشی سێیەم

# شەڕی جەمەل

**شەڕی جەمەل:**

نەیارەکان گەیشتنە بەصرە بە شێوەیەکی کتوپڕو ناگەهان، بۆیە خەڵکەکە شپرزە بوونو سەریان سوڕما، کولەیبی کوڕی شیهاب ـ شایەتحاڵێکی تابعی ڕاستگۆیەـ دەڵێت:" هەواڵی کوژرانی عوسمان لەکاتێکدا پێمان گەیشت ئێمە لە غەزا دەگەڕاینەوە، کاتێك گەیشتینەوە بەصرە، زۆرمان پێنەچوو تاکو وترا: ئەوە تەڵحەو زوبەیرە، دایکی ئیماندارانیشیان لەگەڵدایە، ئیتر خەڵکەکە واق وڕمان، ئەمجا بینیمان کە ئەوان بە خەڵك دەڵێن کە لەبەر عوسمان دەرچوونە، وەکو تۆڵەسەندن بۆ ئەو و تەوبەکردنیش بۆ خۆیان لە بری پشتبەردانیان بۆ عوسمان، عائیشەیش (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتی خۆی لەبەر ئێوە لە عوسمان تووڕەبووین بۆ سێ مەسەلە: بە فەرمانڕەواکردنی گەنجو تەرخانکردنی لەوەرگەو بەکارهێنانی دارو قەمچی بۆ لێدان، ویژدانمان نیە ئەگەر ئەمڕۆ لە سێ مەسەلەدا لێتان تووڕە نەبین بۆ عوسمان: دەستدرێژیتان کردە سەری لە مانگێکی قەدەغەکراو شارێکی قەدەغەکراو خوێنێکی قەدەغەکراو کە ڕشتان. خەڵکەکە وتیان: ئەی ئێوە بەیعەتتان نەداوە بە عەلی؟ نەچوونەتە ژێر فەرمانیەوە؟ وتیان: بەیعەتمان لەکاتێکدا داوە شمشێریان لەسەر گەردنمان بوو.[1]

نەیارەکان زاڵبوونە سەر بەصرەدا بێئەوەی عوسمانی کوڕی حونەیف کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو لەلایەن عەلیەوە، بتوانێت هیچ بەرگریەك بکات لە ڕوویان، چونکە زۆربەی هۆزەکانی بەصرە خۆیان خستە پاڵیان، سەرەتا فەرمانڕەواکەش دەسگیرکرا، بەڵام دواتر بەریاندا بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێت بە عەلی... نەیارەکان ڕوویانکردە خەزێنەی موسڵمانان"بیت المال"و جێگای ئازووقە، لەوێ حەکیمی کوڕی جەبەلەی عەبدی کە یەکێك بوو لەوانەی بەشداری ئابڵووقەی ماڵی عوسمانیان کرد لە مەدینە، لەگەڵ حەوت سەدی کەسی تر ڕێگەیان پێگرتنو شەڕ لە نێوانیاندا هەڵگیرساو حەکیمی کوڕی جەبەلەو حەفتا کەسی تر کوژران لەوانەی کە بەشداری ئابڵوقەکەی ماڵی عوسمانیان کردبوو.[2]

١) الطبري: تأريخ ٤: صحيح.٤٩٠ بسناد حسن.

٢) الطبري: تأريخ ٤: ٤٦٩ من مرسل الزهري باسناد صحيح اليه.

نەیارەکان بەسەرکردایەتی زووبەیری کوڕی عەوام دەستیان گرتە سەر شاری بەصرە،[1] هەڵوێستیشیان بەهێز بوو بە دەستبەسەراگرتنیان بۆ "بيت المال" کە ئاڵتوون و زیوی تیادا بوو[2].

عەلی هەستی کرد مەسەلەکە مەترسیدارە، ئەم دوبەرەکیە لەوانەیە دەوڵەتی ئیسلامی بەرەو هەڵدێر ببات، بۆیە بڕیاری دا نەیارەکانی بگێڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵیی، بەڵام هەندێ لە گەورە هاوەڵان سستیان پێشاندا لە دەرچوون لەگەڵ عەلی، لەوانە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبو مەسعودی ئەنصاری و عەبدوڵڵا کوڕی سەلام‌و ئوسامەی کوڕی زەیدو ئوهبانی کوڕی صەیفی...

چونکە ئەوان بۆچوونیان وابوو ئەم ڕووداوگەلی بشێونەیە نابێت کەس خۆی تێهەڵقورتێنێ. پێغەمبەری خواش ﷺ بەتایبەت هەندێ لە هاوەڵانی وریاکردبووەوە لە بەشداریکردن لەو ئاژاوانە، بۆیە ئەوانیش پۆزشیان هێنایەوە بۆ عەلی.

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام هەوڵیدا عەلی پەشیمان بکاتەوە لە بڕیاری دەرچوونی بەرەو عێراق، وتی: "مەچۆ بۆ عێراق، مینبەری پێغەمبەر ﷺ بەرمەدە.. سوێند بەخوا ئەگەر بەجیبهێڵێت جارێکی تر نایبینیتەوە". ئەوجا کەسانێك لە دەوروبەری عەلی وتیان: ڕێگەمان بدە با بیکوژین. عەلی وەڵامی نەدانەوە وتی: عەبدوڵڵا پیاوێکی چاکەو لە خۆمانە.[3]

ئینجا عەلی لە مەدینەوە دەرچوو بەرەو عێراق، لە ناوچەی "الربذة"یش هێزەکانی ڕاگرت‌و لەوێ دووسەد کەسی تر هاتن بۆ ڕیزەکانیان.[4] ئەمجا بوون بە نۆ سەد کەس، حەسەنی کوڕی عەلی بە هەمان شێوە هەوڵی بەگەڕ خست بۆ پەشیمان کردنەوەی باوکی سەبارەت بە دەرچوون بەرەو عێراق، ئەو دەگریا بۆ ئەو جیاوازیی‌و دووبەرەکیەی تووشی موسڵمانان بووە، بەڵام عەلی ڕازی نەبوو، هەر سووریش بوو لەسەر گێڕانەوەی نەیارەکان بۆ گوێڕایەڵی، بەڵگەشی ئەوەبوو کە ئەوان بەیعەتیان پێداوە لە مەدینە[5] لە شوێنی مانەوەی هێزەکانەوە لە "الربذة" عەلی دوو کەسی نارد بۆ هاندانی

١) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ٣٩ باسناد صحيح.

٢) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥. ٢٨٠ باسناد صحيح.

٣) ابن حجر: المطالب العالية"المسندة" ق. ٦٣-٦٣١ نقلا عن اسحق بن راهويه.

٤) الربذة: لادێیەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مەدینە لە دووری"٢٠٤"کم بە حوشتریش ماوەی سێ ڕۆژوو نیو بۆ حوشتری خێرا"علي ثائب العمري: النبذة فى ترجمة ابى ذر وتأريخ الربذة ص ٢٦٩".

٥) البلاذري: انساب ٢: ٤٥ ب.

خەڵکی کووفە، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیقو موحەممەدی کوڕی جەعفەر، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە قایلکردنی خەڵکی کووفە بە دەرچوون بۆ شەڕ، چونکە ئەبو موسای ئەشعەری کە فەرمانڕەوا بوو لەوێ پابەند بوو بە خۆبەدوورگرتن لە ئاژاوەو خەڵکیشی دەترساند لە بەشداریکردن.[١] ئینجا عەلی هەڵسا بەناردنی کەسێکی سێ یەم کە ئەویش هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص بوو، ئەویش بەهەمان شێوە سەرکەوتوو نەبوو لە کارتێکردنیان ئینجا عەلی بەڕێکەوت بەرەو "ذي قار" ـ نزیکی کووفە ـ و لەوێ سەربازگەی دامەزراند،[٢] هەر لەوێشەوە جارێکی تر هەڵسا بەناردنی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، بەدوایشیدا حەسەنی کوڕی عەمماری کوڕی یاسر بۆ لای خەڵکی کووفە بۆ هاندانیان بۆ دەرچوون، هەروەها ئەبوموسای ئەشعەری لەسەر فەرمانڕەوایی کووفە لابردوو، قورەزەی کوڕی کەعبی خستە جێگاکەی.[٣]

سەرزەنشتی ئەبو موسای ئەشعەریو ئەبو مەسعودی ئەنصاری هیچ کاریگەریەکی نەبوو لەسەر عەممار، کە پییان وت پەلەت کردووە لەم کارە، بەڵکو لە ڕۆژی جومعە چووە سەر مینبەرو وتی: "بەڵێ سوێند بەخوا ئەوە خێزانی پێغەمبەرەکەتانە لە دونیاو قیامەتدا، بەڵام خوای گەورە تاقیتان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی دەرکەوێت بزانێت گوێڕایەڵی پەروەردگارتان دەکەن، یان گوێڕایەڵی خێزانی پێغەمبەرەکەتان دەکەن"[٤] بەم شێوەش عەممار شایەتی بەهەشتیدا بۆ عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت)، بەرچاوی خەڵکیشی ڕوونکردەوە کە ئەمە تاقیکردنەوەیە کە لە خواوە، بۆ ئەوەی بزانێت ئایا شوێن ئارەزووەکانیان دەکەون، یان ملکەچی ڕێگای ڕاست دەبن کە عەلی گرتویەتی، کە ئەو خەلیفەی شەرعیەو گوێڕایەڵی پێویستە.. دوای ئەم هاندانە، لە نێوان شەش هەزار تاکو حەوت هەزار کەسی خۆیان خستە نێو سوپای عەلی لە (ذي قار)، هەروەها دوو هەزاری تر لە بەصرە لە هۆزی عەبدوولقەیس ـ کە حەکیمی کووڕی جەبەل لە ئەوانە ـ هاتنە نێو سوپاکەی عەلیەوە، دواتر هەندێك

---

١)ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٩٩-١٠٠ باسناد ص٢٧٤، والبخاري: التأريخ الكبير (:٦٧، والحاكم: المستدرك ٣: ١١٥، والذهبي: تأريخ الاسلام (الخلفاء الراشدون) ٤٨٧ .

٢) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥:١٢ باسناد ص، وابو داود: التى (مع شرح الخطابي) ٤: ٤٥٧ باسناد، والترمذي: السنن ـ نسخة تحفة الاحوذي ـ٦ـ: ٤٤٦ حديث رقم ٢٣٠٠ وقال: اسنادة صحيح رجاله كلهم ثقات رجال البخاري. الطبري: تأريخ٤: ٤٤٧ وفيه محمد بن ابى ليلى سيئ الحفظ، وابن حجر: فتح الباري ١٣: ٥٨ .

٣) الطبري: تأريخ٤: ٤٥٢ بسند صحيح الى الزهري مرسلا.

٤)البخاري: الصحيح (فتح الباري ١٣: ٥٣ و١٣: ٥٨) نفلاً عن ابن ابى شيبة وصحح الحافظ سنده.

هۆزی تریش بە هەمان شێوە پەیوەندیان کرد بە سوپاکەی عەلی، تا ژمارەیان گەیشتە نزیکەی دوانزە هەزار کەس، هەشت سەدیان لە ئەنصار بوون، چوار سەدیشیان لەوانەبوون کە ئامادەی بەیعەتی (رضوان) بوون،[1] عەلی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك هێزەکانی لە (زاویە) ڕاگرت، داواشی کرد لە ئەحنەفی کوڕی قەیس کە ڕێگای خەڵکی نەدات بچنە لای زوبیر- ئەحنەف یەکێك بوو لەوانەی بەیعەتیان بە عەلی دابوو لە مەدینە- بە ئەمەکیش بێت بۆ ئەو بەڵێنەی بە تەڵحەی داوە کە دوور بگرێت لە شەڕەکان.[2]

بەرەنگاری لەلای کۆشکی عەبدوڵڵا دروست بوو، لە نێوان عەلی لە لایەکەوە وە زووبەیرو لایەنگرانی لەلایەکی ترەوە، هەندێ هەوڵیش درا بۆ هەڵنەگیرسانی جەنگ لە لایەن ئەوانەی کە بڕیاریان دابوو شەڕنەکەن "کەعبی کوڕی سوور دەرچوو قوورئانێکی بە دەستەوە بوو، ئامۆژگاری ئەمانی دەکرد، ئامۆژگاری ئەوانی دەکرد، تا تیرێکی بۆهاتو کوشتی".[3] بەهەمان شێوە عیمرانی کوڕی حوصەینی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، ڕەوانە کراوێکی نارد بۆ لای بەنی عەدی ئامۆژگاریان بکات بە دورکەوتنەوە لەو شەڕە: "من بۆ ئێوە ئامۆژیارم، سوێند دەخۆم بە پەروەردگار کە ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشی لووت بڕاو بێت لەسەر شاخێدا چەند بزنێك بلەوەڕێنێت تاکو دەمرێت، پێخۆشترە لەوەی تیرێك بهاوێژێت لە یەکێك لە دوو کۆمەڵەکە بپێکێت یان نەیپێکێت" ئەوانیش وەڵامی نێردراوەکەیان نەدایەوە: "لێمان گەڕێ ئەی لاو، چونکە ئێمە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هیچ شتێك بەجێناهێڵین"[4]

ئینجا خەڵکیی هەڵوێستی خۆیان دیاریدەکرد، لە ڕێگەی پرسیارکردن لە گەورە هاوەڵان، جاری واشبوو فەتواکە لە زیانی فەتوا دەرکەرەکە تەواو دەبوو، جارێك یەکێك لە کۆیلەکانی هۆزی ڕەبیعە

١) عبد الرزاق: المصنف ٥: ٤٥٦ـ٤٥٧، والطبري: تأريخ٤: ٥٠٨ كلامها باسناد صحيح الى الزهري: وخليفة بن خياط: التأريخ ١٨٤ من مرسل سعيد بن جبير، والبلاذري: انساب الاشراف ٢: ٤٥ بسند صحيح وتعتضد الطرق.

٢) الداني: الفتن ١٩٤ب-١٩٥ أ والطبري: تأريخ٤. ٥٠٠ ـ ٥٠١.

٣) ابن سعد: الطبقات ٧: ٩٢ء صحيح ابن حجر (فتح الباري ١٣ ـ ٣٤).

٤) ابن سعد: طبقات ٤: ٢٨٧ـ ٢٨٨ باسناد صحيح، والطبراني: المعجم الكبير ١٨: ١٠٥، والطبري: تأريخ ٤: ٥٢، تعتضد هذه الطرق الى الصحيح لغيره.

پرسیاری کرد لە زوبەیر دەربارەی هەڵوێستی کۆیلەکان: "کۆیلەکان لەگەڵ کێ دەبن؟ وتی: لەگەڵ سەرگەورەکانیان. وتمان: سەرگەورەکانمان لەگەڵ عەلی دان. وتی: گریمان بەردێکمان دەرخوارد درا"[1].

پێش هەڵگیرسانی شەڕەکە بە سێ ڕۆژ، خێوەتێك هەڵدرا لە نێوان هەردوو سەربازگەکەدا، عەلیو تەڵحەو زوبەیر بەیەکگەیشتن لە هەوڵێکدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی ئاشتیانە بۆ ئەم کێشەیە،[2] هەروەها عەلی هەڵسا بە ناردنی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس بۆ لای تەڵحەو زوبەیر، لیان بپرسێت: "ئایا عەلی کارێکی داهێناوە لە خیلافەتدا، شایانی توڕەیی ئێوە بێت، وەکو ئەوەی ستەمی کردبێت، یان بەشێکی لە دەستکەوتەکان بۆ خۆی بردبێت، یان لە فلاّنە شتدا؟ زوبێر وتی: هیچ شتێك لەوانەی نەکردووە"[3].

هەردوو لایەنەکە لە ئەو سێ ڕۆژەدا نەیانتوانی بە چارەسەر بگرن، ئینجا پیاوێك پێشنیاری کرد بۆ زوبەیر عەلی بکوژێت لەناکاودا، دوای ئەوەی کە وادەربخات دەیەوێت بچێتە سوپاکەیەوە، بەڵام زوبەیر ئەوەی ڕەتکردەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "لا یفتك مؤمن" واتە: ئیماندار بەد ڕەوشتانە پەلامار نادات.

لە ڕۆژی چوارەم پێکدادان ڕوویدا لە نێوان هەردوو سوپاکەدا، ڕیوایەتێکی ڕاستیش هەیە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە سوپای زبەیرو تەڵحە یەکەمجار شەڕیان دەستپێکردووە، عەلی دوای نوێژی نیوەڕۆ فەرمانیدا بە دەستپێکردنی شەڕەکە، کە بەردەوام بوو بۆ ماوەی چەند سەعاتێك" تاکو خۆرئاوا بوو، یەك کەس بە زیندوویی نەما لەوانەی بەدەوری حوشترەکەدا بەرگریان لێدەکرد"،[4] دیمەنی کارەساتەکە زیاترو زیاتر ڕووندەبێتەوە، دڵەڕاوکێ تووشی زوبەیر دەبێت، کە سەرکردەی یەکەمە دەربارەی شەرعیەتی ئەم جەنگە، بە چاوی خۆی گەورەیی بەڵاکەو جیاوازی خەڵکی دەبینێ، بۆیە گۆڕەپانی جەنگ بەجێدەهێڵێ بێئەوەی شەڕبکات[5]، عومەیری کوڕی جەرمووز و دوو

---

١) الداني: الفتن ١٦ ب وفي اسناده ابو كنانة شاهد عيان مجهول الحال (البخاري: التأيخ الكبير ٨:٦٥).

٢) احمد: فضائل الصحابة ٢: ٥٩٦ بسند صحيح، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٧.

٣) هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٨٦ ـ ٢٨٧ باسناد صحيح (ابن حجر: فتح الباري ١٣: ٥٧)

٥) الحاكم: المستدرك ٣: ٣٦٦ باسناد صحيح، وانظر الذهبي: تأريخ الاسلام (الخلفاء الراشدون) ٥٠٥.

کەسی تر شوێنی دەکەون تاکو سەفوانو لەوێ لەناکاو دەیکوژن[1]. بەم شێوەیش ژیانی سەرکردەی یەکەم کۆتایی پێهات، بەدوای ئەویشدا سەرکردەی دووەم، کاتێك مەروانی کوڕی حەکەم تیرێکی بۆ هاوێشتو کوشتیو لەلای (شط الكلأ)[2] نێژرا. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش بە خەستی بریندار بوو، لە ناوەڕاستی کوژراوەکان دەرکراو زیاتر لە چل برین بەلاشەیەوە بوو[3] ئینجا "کەسانێکی زۆر لە دەوری عائیشە کوژران لەو ڕۆژەدا، حەفتایان تەنها ئەوانە بوون کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو، ئەوانەیش کە قورئانیان لەبەر نەبوو زۆرتر بوون"[4].

ئەبوڕەجا عیمرانی کوڕی میلحانی عوتاریدی ـ شایەتحاڵـ دەڵێت: "لەو ڕۆژەدا حوشترەکەم بینی دەتووت ژوژوە، ئەوەندە تیری پێوە بوو، کەسێکیش ڕەشمەکەی گرتبوو، دەیووت:

"نحن بنو ضبة أصحاب الجمل

ننازل الموت إذا الموت نزل

والموت أحلى عندنا من العسل

نبغي ابن عفان بأطراف الأسل"،[5]

واتە: ئێمە نەوەی (ضبة)ین، خاوەن حوشترەکەین، زۆران لەگەڵ مردن دەکەین کە مردن بێت، مردنیش بەلامانەوە لە هەنگوین شیرینترە، بە نووکی ڕمەکانمان تۆڵەی عوسمان دەکەینەوە.

عائیشە لەسەر حوشترێکی سوور بوو، لەناو کەژاوەیەکی سووردا،[6] پێشتریش لە میربەد قسەی کردبوو، نەفرینی لە بکوژانی عوسمان کردبوو[7]، لایەنگرانی "هاواریان دەرکرد بە بکوژانی عوسمان"، جا کاتێك ئەوە بە عەلی گەیشتو وتی :"خوایە بکوژانی عوسمان ڕووڕەش بکەیت"[1].

---

١) ابن سعد: الطبقات ٣: ١١٠ باسناد صحيح (ابن حجر: الاصابة (٢٥٦)، وخليفة: التأريخ ١٨٦، وابن أبي عاصم: الآحاد والمثاني (:١٦٠ ).

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ٢٢٣ باسناد صحيح، وخليفة: التأريخ ١٨٦، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٢٩، والحاكم: المستدرك ٣:٣٧٠.

٣) ابن سعد: تأريخ دمشق ـ ترجمة عبدالله بن الزبير ـ ص ٤٢٧ نقلا عن يحيى بن معين باسناد صحيح.

٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ٢٨٧ ـ ٢٨٧ باسناد (صحيح لغيره، وابو نعامة توبع (الطبراني: المعجم الكبير ١٨: ١٠٥)، ورواية عمر حميد بن جلال في صحيح مسلم (بشرح النووي) ٢:٨ فلا يضر اختلاطه.

٥) خليفة: التأريخ ١٩٠ باسنادصحيح.

٦) الطبري : التأريخ ٤: ٥٣٣ باسناد فيه مقبول فيحتاج الى متابعة، لكن الرواية مما يتساهل فيه.

٧) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٨ باسناد صحيح.

ئینجا دەنگی پاڕانەوە بەرز بوویەوە لەناو هەردوو سەربازگەکە.. حاریسی کوڕی سوەیدی کووفی ـ شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوە ـ دەڵێت :"لە ڕۆژی شەڕی جەمەلدا، ڕمەکانی ئێمەو ئەوان لەیەکیان دەدا، پیاوان بیانویستبا لەسەری ڕیان دەرکرد، دەیانووت: (الله اکبر، سبحان الله، الله اکبر). هەندێ دەنگ بەرزدەبوویەوە باسی هەڵوێستی جەنگاوەرەکانی دەکرد لە ڕووی ئاینیەوە "گومانی تێدانی یە" واتە: گومانیان نی یە لەوەی کە شەڕکردن لەگەڵ بەرانبەرەکەیان ڕەوایە. هەروەها دەبیسترا گومان لە شەرعیەتی شەڕکردن، هەروەها دەوترا "پێمخۆشنەبوو نەهاتبام"،[2] دووپاتکردنەوەی ڕوونیی دیدی شەرعیی لە شەڕکردن لەگەڵ سوپای عەلی.

کوژراو لە هەردوو کۆمەڵەکە پەیتا پەیتا دەکەوتن"لە ڕۆژی جەمەل بیست هەزار کەس کوژران"[3] ژمارەکە زیادەڕۆیی تێدایە، بەڵام دەربڕین دەکات لە قووڵی هەستکردن بەتاڵی ڕووداوەکە ـ "دووهەزار کەس لە ئەزد کوژرا، هەشت سەدیش لەبەنی (ضبة)" ـ بەنی (ضبة) لە هۆزی تەمیم ـهەردوو گێڕەوەکەش لە بەنی تەمیمن، یەکێکیان جێگای متمانەیە، ئەوی تر ڕاستگۆیەو (ناصبی)یە[4] بەڵام ڕیوایەتی تەبەری لە یەکێکیانەوە دەگێڕێتەوە کە "لە ڕۆژی جەمەلدا دوو هەزارو پێنجسەد کەس کوژران، هەزارو سێ سەدو

پەنجا لە هۆزی ئەزد، هەشت سەد لە بەنی (ضبة)و سێ سەدو پەنجا لە خەڵکانی تر"[5].

بەم شێوەیش سوپای نەیارەکان سەرکردەکانیان لە دەستدا، شەڕیش گەرمبوو لە دەوری حوشترەکەی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت)، ئیتر عەبدوڵڵای کوڕی بودەیل فەرمانی کرد بە سەربڕینی حوشترەکە بۆ ئەوەی شەڕەکە ببڕێتەوە، دوایی دابەزی لەگەڵ موحەممەدی برایداو کەژاوەکەیان هەڵگرت تاکو لە بەردەستی عەلی دایانگرت، ئەمجا عەلی فەرمانی کرد ببرێت بۆ ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی بودەیل.[6]

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٥: ٢٢٧ باسناد صحيح.
٢) خليفة: تأريخ ١٩٨ باسناد صحيح.
٣)خليفة: التأريخ ١٨٦ باسنادين ضعيفين احدهما فيه انقطاع والاخر فية مجاهيل.
٤) خليفة: التأريخ ١٨٦ مرسلا، والطبري: تأريخ ٤: ٥٤٥ باسناد صحيح.
٥) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ١٤٥، والطبري، تأريخ ٤: ٥٤٥.
٦) ابن ابی شيبة: المصنف ١٥: ٢٨٤ ـ ٢٨٥ باسناد جيد (ابن حجر: فتح الباري ١٣: ٥٧).

"زۆری پێنەچوو خەڵکی بەصرە هەڵهاتن، ئەمجا کەسێك لە لایەن عەلیەوە هاواری کرد: هەڵهاتوو ناکوژرێت، کەسیش بۆی نی یە هەڵکوتێتە سەر بریندارەکان، هەر کەسێکیش چەکی فڕێدا دەستی بۆ نابرێت"[1].

هەردوو لایەنەکە بەزیانەکانی خۆیان زانی، ئینجا بەخۆدا چوونەوە هاتە جێگەی خەشمو قین، پەشیمانی دڵەکانیانی داڕزاند، خەریك بوو گیانیان لە دەست دەدا لە خەمی ئەو ڕووداوە، کە موسڵمانان تیایدا بە شمشێرەکانیان بەرانبەر یەکتریانگرت لە ئاژاوەیەکی ناوخۆیدا ئێستا بەتەواوی ئاشکرا بوو، کە نەیانتوانی خۆیانی لێبەدوور بگرن، بەردەوامیش بوون تاکو کوژراوێکی زۆر لە چاکترینی موسڵمانان لە هەردوولا نەکەوت، بەبێ هیچ دەستکەوتێك بۆ بەرژەوەندی دونیاو دوارۆژ، بەڵکو پەشیمانی تەنانەت لەکاتی جەنگیشدا دڵی سەرکردەکانی داگرت، حەسەنی کوڕی عەلی باسی باری دەروونی باوکی دەکاتو دەڵێت: "من ئەوم بینی لە گەرمەی شەڕدا پەنای بۆ من دەهێناو دەیوت: ئەی حەسەن، خۆزگە پێش ئەم شەڕە بە بیست ساڵ بمردایەم"[2].

کاتێ چاوی کەوت بە موحەممەدی کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا بە کوژراوی، وتی: "انا لله وانا الیه راجعون، سوێند بەخوا گەنجێکی خواناس بوو" دوای ئەوە دانیشت بەماتیو غەمباری.[3]، عیمرانی کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا دوای چەند ساڵێك سەردانی عەلی کرد، عەلی پێشوازی لێکردو وتی:"ئومێدم هەیە منو باوکت، خوای گەورە لەوانەمان بگێڕێت کە دەربارەیان فەرموویەتی (اخوانا علی سرر متقابلین)"[4] زەویەکانیشی بۆ گێڕایەوەو وتی: "ئێمە ئەم چەند ساڵە زەویەکانتمان نەبردووە وەکو زەوتکردن، بەڵکو لەبەر ئەوەی خەڵکی داگیری نەکەن"[5]. زۆرجاریش

١) سعيد بن منصور: السنن ٣٣٧ ـ ٣٣٨ باسناد صحيح واحد: المسند١ : ١٠٢، وابن ابي عاصم: السنة ٢: ٦١٠، واحد : فضائل الصحابة ٢: ٧٣٧، والطبراني: المعجم الكبير١: ٨٣، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٧.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٨٨ باسناد صحيح، و عبدالله بن احمد: السنة ٢ : ٥٦٦، ونعيم بن حماد: الفتن١: ق١٩ب، والطبراني: المعجم الكبير (:٧٢ حديث رقم ٢٠٣).

٣) الحاكم: المستدرك ٣:١٠٣ ـ ١٠٤، ٣٧٥ باسناد صحيح لغيره، ونعيم بن حماد: الفتن ١: ١٨١ باسناد صحيح.

٤) ١٤٤٥ الحجر٤٧.

٥) ١٤٤٦ ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٢٢٤، والبلاذري: انساب الاشراف ١٣: ق ٨٥ب ـ ٨٦أ، والطبري: تفسير ١٤: ٣٧، والحاكم: المستدرك ٣:٣٧٦ وصححه ووافقه الذهبي.

ئەم ئایەتەی دەخوێندەوەو خۆشەویستی بۆ تەلْحەو زوبەیر پیشان دەدا، سەرەڕای ناکۆکیان.[1] کوڕی سێ یەمی تەلْحەش، بەدوای شەڕەکەدا یەکسەر بەیعەتیدا بە عەلیو گەڕایەوە ناو ماڵو حاڵی خۆی، نەیارەکان دڵنیا بوونو چوونە لای عەلیو بەیعەتیان پێدا،[2] ئاوها عەلی بە ئەمەك بوو بەرانبەر بە براکەی کە شەڕی لەگەڵ کرد بە تەئویلکردن. سەبارەت بە تێڕوانینیشی بۆ زوبەیری کوڕی عەووام، بەدوای کوژرانیدا وتی: "مژدە بدەن بە بکوژی کوڕی صەفیە بە دۆزەخ".[3]

داخو پەژارە لەسەر ئەو ڕووداوە تەنها تایبەت نەبوو بە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێت)، ئەوەتا عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: "خۆزگە چلە دارێکی تەڕ بووایەمو بۆ ئەم شوێنە نەهاتبام"،[4] هەروەها دەڵێت: "خۆزگە جەرگم بسووتایە بە دەی وەکو حاریسی کوڕی هیشام، بەلاّم لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی زوبێر ئەم ڕێگام نەبڕیبا"،[5] هەروەها وتویەتی:"ئەمە چارەنوس بوو"[6] جا ڕەحمەتیشی دەنارد بۆ کوژراوانی هەردوولا کاتێك باسدەکران، ڕەحمەتی دەنارد بۆ تەلْحەو زوبەیرو زەیدی کوڕی صەدحان، کە ئەمەی دوایی لەگەڵ عەلیدا بوو، بۆیە خالیدی کوڕی واشیمە وتی: ڕەحمەتی خوات لێبێت، ڕەحمەتیان بۆ دەنێرێتو ئەوان یەکتریان کوشتووە، سوێند بەخوا پێکەوە لە بەهەشت کۆنابنەوە هەرگیز!! وتی: ئایا نازانیت بەزەیی خوا فراوانەو بە توانایشە لەسەر ئەنجامدانی هەرشتێك. خالید وتی: جا ئەو لە من چاکتر بوو.[7]

ئاژاوە تەنانەت دەستکەوتەکانی شەڕیشی لێنابینرێت، عەلی لە ڕۆژی جەمەلدا هەڵسا بەدابەشکردنی ئەو چەكو وڵاغانەی[8] نەیارەکان دەستیان بەسەردا گرتبو لەسەر سەربازەکانی، پێنج

---

١) احمد: فضائل الصحابة ٢: ٦١٨ باسناد صحيح.

٢) ابن ابی شيبة: المصنف ١٥: ٢٧٦، وابو العرب: المن ٣٥٠.

٣) ابن سعد: الطبقات ٣: ١٠٥، والطيالسي: المسند ٢٤، واحمد: المسند ١: ١٠٢، وفضائل الصحابة ٢: ٧٣٧، وابن ابی عاصم: السنة٢: ٧٣٧ باسناد صحيح مداره على ابی عاصم بن بهدلة صدوق له اوهام.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٨١ باسناد صحيح.

٥) الحاكم: المستدرك ٣: ١١٩ باسناد حسن، والهيثمي: مجمع الزوائد ٧: ٢٣٨ وفی سنده ابو معشر نجيح ضعيف.

٦) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٨١، والبلاذري: انساب الاشراف ٢: ١٤٦ واسناده حسن، لان رواية احمد بن يونس عن ابي بكر بن عياش فی صحيح البخاري (فتح الباري ١٣: ٤٧٣)

٧) البيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٧٤ باسناد حسن وساق له طرقاً اخرى.

٨) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٣ باسناد (ضعيف، ٢٨١ باسناد حسن).

سەد[1] درهەمیشی دایە هەریەك لە جەنگاوەرەكان و هیچی تر.. كەوابوو "عەلی لە ڕۆژی جەمەلدا كەسی بە كۆیلە نەگرتو پێنجیەكیشی دابەشنەكرد، وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا پێنجیەكی ماڵەكانیان دابەش ناكەیت؟ وتی: ئەوە عائیشەیە بزانە چی دەڵێن: وتیان: "هەرچی هەیە هەر ئەوەیە"[2].

چەند ڕیوایەتێكیش یەكدەگرن بۆ ڕوونكردنەوەی ڕاوبۆچوونی عەلی لە فەرمانی شەرع لەوەی كە ڕوویدا لە بشێونەو شەڕ "عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەهلی جەمەل، ئەویش وتی: برامانن ستمیان لێكردین، ئێمەش شەڕمان لەگەڵدا كردن، ئەمجا ئەوان گەڕانەوە، ئێمەیش لێمان قبوڵ كردن"[3] لەڕاستیدا فەرمانەكانی شەرع دەربارەی سنووربەزێنەكان (البغاة) پێویستی بە ڕوونكردنەوە بوو، بۆیە عەلی ڕوونی كردەوە بە بیرو هۆشێكی شەرعناسانەی قووڵو گیانێكی تیژ لە تێگەیشتنی مەبەستەكانی ئیسلامو ئامانجە بەرزەكانی. "عەممار لە ڕۆژی جەمەل، بە عەلی وت: پێت چۆنە ژنو منالیان بە كۆیلە بكەین؟ وتی: بەڵكو ئێمە تەنها شەڕمان لەگەڵ ئەوانەدا كرد كە كردمان ـ واتە: ئەو شەڕكردنی لەگەڵیان بە ڕەوازانی وەكو بەرگریی لە خۆكردن، چونكە نەیارەكان دەستیان كرد بەشەڕـ عەممار وتی: ئەگەر شتێكی ترت بوتایە ڕازی نەدەبوین"[4].

(حافظ)ی زوهری یەكدەنگی هاوەڵان دەگێڕێتەوە سەبارەت بە پارێزراوی ماڵو خێزانی ئەو كەسانەی بە لێكدانەوە (تأویل) دەردەچن لە گوێڕایەڵی خەلیفە... "..ئاژاوەی یەكەم كە ڕوویدا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەوانەی كە بەشداریی بەدریان كردبوو، زۆر بوون. بۆچوونیشیان لەسەر ئەوە كۆبوویەوە سزای شەرعی جێبەجێ نەكرێت لەسەر كەسێك كە ئافرەتێكی بۆ خۆی بە ڕەوا بینیوە بە لێكدانەوە (تأویل)ی قورئان، بەهەمان شێوە سزای تۆڵەسەندن (قصاص)یش ڕاگیراوە لە دژی كەسێكدا كە كوشتنی ئەنجام دابێت بە (تأویل)ی قورئان، نە ئەو دەسكەوتانەشیان لێوەردەگیرێتەوە

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٣ باسناد حسن.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٥٧ باسناد صحيح، والبيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٨٢.

٣) البيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٨٢ بسند فيه العطاردي ضعيف فى غير سماعه لسيرة ابن اسحق، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٥٦ـ ٢٥٧ مرسل ابس البختري ١٥: ٢٥٨، ٢٧٧ مرسل محمد الباقر.

٤) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢٦٩ـ ٢٧٠ باسناد صحيح ، والبيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٨١ ـ ١٨٢.

كە بەهەمان ڕێگا بە دەستیان كەوتووە، مەگەر شتێك بێت هی كەسێكی دیاریكراوبێت، ئەوە پێویستە بدرێتەوە خاوەنەكەی"[1]

چەندین ڕیوایەتیش یەكدەگرن، ئەوە دوپاتدەكەنەوە كە پێغەمبەر ﷺ عەلی ئاگاركردوەتەوە سەبارەت بە مەسەلەیەك كە ڕوو دەدات لە نێوان خۆیو عائیشەدا، ڕاسپاردەشی پێكردووە چاكەی لەگەڵدا بكات، بۆیە ڕووداوەكانی ئاژاوە، نیشانەیەكە لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی، كە لە نەوەی هاوەڵاندا (ڕەزای خوایان لێبێت) هاتەدی[2]

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١٠: ١٢٠ـ ١٢١ باسناد صحيح الى الزهري.

٢) الهيثمي: كشف الاستار ٤: ٩٣ـ ٩٤ نقلا عن البزار، واحمد: المسند ٦: ٣٩٣ من زوائد ابنه عبدالله، والطبراني: المعجم الكبير ١: ٣١٤ رقم ٩٩٥ ومداره على الفضيل بن سليمان وهو صدوق له خطأ كثير (التقريب ٢٩١٢) ولكن ابن حجر حسَّن سند عبدالله و البزار (فتح الباري ١٣: ٥٥) وله شاهد حسنه ابن عساكر (مناقب امهات المومنين ٧١ رقم ١١).

## بەشی چوارەم:

# جەنگی صیففین

### جەنگی صیففین:

عەلی (رەزای خوای لێبێت)، ماوەیەکی زۆر نەمایەوە لە بەصرە پاش شەڕی جەمەل، هەرئەوەندەی کە بەیعەتی لە خەڵکەکە وەرگرتو بارو دۆخەکە ئارام بوویەوە، ئیتر ڕووی کردە کووفە بە سوپاکەیەوە، چونکە لەوێ پشگیریەکی بەهێز پیشان دەدرا لەلایەن خەڵکەکەوە بۆ بەرەنگاری موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لە شام، کە سوور بوون لەسەر سزادانی بکوژانی عوسمان پێش ئەوەی بەیعەت بدەن بە عەلی، لە ئاخاوتنێکدا لەگەڵ هەندێك لە قورئان لەبەران، هەڵوێستیمان بۆ ئاشکرا دەبێت، وەکو لەم ڕیوایەتەدا هاتووە: "ئەبو موسلیمی خەوەلانی لەگەڵ کەسانێکی تر هاتنە لای موعاویەو وتیان: ئایا تۆ بەربەرەکانی لەگەڵ عەلی دەکەیت، یان تۆ وەکو ئەوی؟ موعاویە وتی: نەبەخوا، من ئەزانم عەلی لە من چاکترە، لە منیش مافدارترە، بەڵام ئایا ئێوە نازانن کە عوسمان بە ستەم لێکراوی کوژرا، منیش ئامۆزای ئەوم، من تەنها داوای خوێنی عوسمان دەکەم، بچن بۆلای عەلی با بکوژانی عوسمانم بداتە دەست منیش بەیعەتی پێدەدەم، ئەوانیش هاتنە لای عەلیو قسەیان لەگەڵ کرد، ئەویش ڕازی نەبوو"[1] موعاویە هەمیشە ئەم واتایەی دووپاتدەکردەوە "من لەگەڵ عەلی شەڕم نەدەکرد بە بۆنەی عوسمانەوە نەبێت"[2]

موعاویە خۆی بە مافدار دەزانی، لەوەی کە تۆڵەی عوسمان بکاتەوە، چونکە خۆی سەرگەورەی بەنی ئومەیە بوو، فەرمودەکانی پێغەمبەریش ﷺ ئاماژە بەوە دەکەن کە عوسمان بە ستەملێکراوی

---

١) ابن عساكر: تأريخ دمشق ١٦: ق ٣٥٦، والذهبي: سير اعلام النبلاء ٣: ١٤٠، وابن حجر: فتح الباري ١٣: ٨٦ و حسن ابن حجر اسناد يحيى بن سليمان الجعفي ـ احد شيوخ البخاري ـ في كتاب صففين.

ئەو کتێبە لە ناوچووە، وەکو چەندین دانراوی تر لەسەر ئەو جەنگە، بۆ نموونە کتێبی "صففين"ی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، و کتێبی "صففين"ی ئیبنو دیزل (ابو اسحق ابراهيم بن الحسين بن ديزل وثقة الذهبي في تذكرة الحفاظ ٢:٦٠٨).

٢) ابن ابى شيبه: المصنف١١: ٩٢ باسناد حسن.

دەکوژرێت، بەڵکو ئەوە باسدەکەن کە ڕاسپاردەی پێکردووە کە واز لە خیلافەت نەهێنێ، ئەوانەش کە هەڵدەسنەوە لە دژی ناویانی بە مونافیق بردووە.[1]

کەعبی کوڕی موڕەی بەهزی (هاوەڵ) شایەتی داوە لە پێش سەربازەکانی موعاویە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی عوسمانی کوڕی عەففان فەرموویەتی: "لتخرجن فتنة من تحت قدمي هذا- او من بين رجلي هذا - هذا ومن اتبعه يومئذ على الهدى". واتە: لە ژێر ئەم پیەمەو- یان لەنێوان هەردوو پێمەوە- ئاژاوەیەك سەرهەڵدەدا هەرکەسێکیش دوابکەوێ لەسەر ڕێگا ڕاستە. جا ئەگەر بەرگریکەران لەسەر عوسمان لەسەر ڕێگای ڕاست بن، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە شۆڕش دەکەنە سەری کە لەسەر گومڕاین. لەم حاڵەتە هەڵوێستەکە لە دیدی سەربازگەی موعاویەوە بە سەر خۆیاندا دێتە دی کە لەسەر ڕاستنو نەیارەکانیان لە گومڕایدان، بەم شێوەیش شەڕکردنیان لەگەڵ عەلی بە ڕەوا بینی، هەڵەی هەڵوێستیانیش دەرنەکەوت ئەوکاتە نەبێت کە عەمماری کوڕی یاسر کوژرا لە صیففینو موخددەج لە نەهرەوان، ئەوانەی کە پشتیان دەبەست بە دەقە شەرعیەکان لە دیاریکردنی هەڵوێستەکانیان، ڕووبەڕووی بەرەنگاری دەقەکان دەبوونەوە، ڕووداوەکانی ئاژاوەیش کاریگەری دەکرد لە پێگەیشتنی ڕاوبۆچوونی شەرعیو ڕێگەشی دەگرت لەبەرچاو ڕوونی.

ژمارەیەکیش لە شارەزایانی هاوەڵان لە دەرەوەی ململانێکە ڕاوەستان وەکو سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری، عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو چەندان هاوەڵی تر ڕەزای خوا لە هەموویان بێت. ئینجا عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد، ڕیوایەتەکان مەزەندەی دەکەن لە نێوان پەنجا بۆ سەدو پەنجا هەزار کەس[2]، ئەمە لەکاتێکدا سوپای موعاویە مەزەندە کراوە بە شەست هەزار یان حەفتا هەزار یان بیست هەزار[3] کەس، جا ئەگەر دیوانی سەربازەکان لە سەرەتای خیلافەتی عەلی سەد هەزار جەنگاوەری تیا تۆمار کرابوو لە

١) احمد: المسند٦: ٧٥، ٨٦ـ ٨٧، ١٤٩، والترمذي: السنن (تحفة الاحوذي ١٠: ٢٠٠)، وابن ماجة: السنن ١: ٤١، ١١٢، ١١٣، وصححه الالباني (صحيح ابن ماجة ١: ٢٥).

٢) خليفه: التأريخ ١٩٣ بسند حسن.

٣) هەندێ ڕیوایەتی لاواز مەزەندەی سوپاکەی کردووە بە حەفتا هەزار، نەوەت هەزار، سەد هەزارو، سەدو دە هەزار و سەدو بیست هەزار. (الذهبي: دول الاسلام١ : ٢٨ بدون سند، وخليفة: التاريخ ١٩٣ بسند فيه مجاهيل، وابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٢٦٠، وابن دحية: اعلام النصر ق ١٤ بدون سند، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتأريخ ٣: ١١٣ بسند منقطع، وابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٢٦٠، وراجع عن دراسة الروايات عبد المجيد علي ناصر: خلافة علي، الملحق رقم ١٧٢).

خەڵکانی بەصرەو کووفە[1]، لەو حاڵەتە دەبێت سوپای عەلی ژمارەی لە پەنجا هەزار جەنگاوەر تێپەڕێت، بەڵام هەواڵگێڕەوەکان ئاماژە دەکەن بۆ دواکەوتنی هۆزی ئەزد لە بەصرە،[2] هەروەها ئەشتەر پەرۆشیی بۆ شەڕ کەمی کرد، بەڵکو ورەی خەڵکەکەشی داگرت کاتێك داوای لێکردن وردبینەوە لە مەسەلەکە، عومەیری کوڕی سەعیدی نەخەعی کووفی (١٠٧ ك) دەڵێت: کاتێك عەلی لە جەنگی جەمەل گەڕایەوەو خۆی ئامادەدەکرد بۆ جەنگی صیففین، هۆزی نەخەع کۆبوونەوەو چوونە لای ئەشتەر، وتی: ئایا ئەم ماڵە لە نەخەعی زیاتری تیایە؟ وتیان: نەخێر. وتی: ئەم نەتەوەیە ڕوویکردە باشترین کەس تیایداو کوشتی، ئێمەیش چووین بۆ بەصرە، کەسانێك ئێمە بەیعەتمان پێدابوون، زاڵبووینە سەریاندا چونکە ئەوان پەیمانەکەیان شکاندبوو، ئێوەیش سبەینێ بەرەو لای خەڵکی شام دەچن، کەسانێکن بەیعەتیان لە گەردەندا نی یە بەرانبەرتان، جا هەرکەسێك لە ئێوە با بزانێت جێگای شمشێرەکەی کویە"[3] ئەم ئامۆژگاریە سەنگینەش بە لە خواترسان، ئاماژە دەکات بۆ تووڕەبوونی ئەشتەر، بەهۆی دەست نەکەوتنی بۆ ئەوەی کە پێشبینی دەکرد لە فەرمانڕەوایەتی بەصرە کە درایە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس[4]، هەروەها ئەو قسانەشی دەربڕین ناکەن لە گۆڕانێکی هەمیشەیی لە هەڵوێستی لە بەرەنگاری مەوعاویەو خەڵکانی شام، چونکە خۆی لە هاندەرانی ئاژاوە بوو لە دژی عوسمان. موعاویەش داوای سەری ئەمو هاوشێوەکانی دەکات لەوانەی کۆبوونەوە بۆ کوشتنی عوسمان.

لە بەرانبەریشدا، ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمیو هۆزەکەشی بەشداریان کرد لە سوپای عەلی، لەکاتێکدا ئەو دوورکەوتەوە لە بەشداریکردن لە شەڕی جەمەل بە ڕێگەپێدانی خودی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت).[5]

سوپاکەی عەلی لە ناوچەی نوخەیلەی ڕۆژئاوای کووفە کۆبوونەوە، هەندێ لەو هاوەڵانەشی تیادا بوو کە بەشداری جەنگی بەدرو بەیعەتی (رضوان)یان کردبوو،[1] عەوانەی کوڕی حەکەمی

١) صالح العلي: امتداد العرب في صدر الاسلام٢٥، ٢٦.

٢) البلاذري: انساب الاشراف:٢: ق ٥١ أ عن ابى مخنف وغيره، ئەبو میخنەف لایەنگرێکی بەهێزی عەلییە، بۆیە ڕێدار نییە بە ئەنقەست بەشداریکردنی هۆزەکەی لەو شەڕەدا کەم بکاتەوە.

٣) ابن ابي شيبة: المصنف ١١: ١١٢و ١٥: ٢٦٥، والحاكم: المستدرك٣: ١٠٧ بسند حسن.

٤) الطبري: تأريخ ٤: ٤٩٠ بسند حسن.

٥) البلاذري: انساب الاشراف ٢:ق ٥١ ا عن ابى مخنف وغيره.

هەواڵگێڕەرەوەیش دەگێڕێتەوە کە عەلی لە نوخەیلەوە دوانزە هەزار جەنگاوەری نارد بە ئاڕاستەی موصڵ، دوای بەرەو مەدائین تێپەڕی، لەوێشەوە سێ هەزار جەنگاوەری ڕەوانەکرد[٢]، ئەمجا عەلی بە سوپاکەیەوە، لە مەدائینەوە بەڕێکەوت بەرەو قەراغەکانی موصڵ (نەینەوا)[٣] دواتر لە فوراتەوە پەڕیەوە ئەوبەر بۆ نزیك ڕەققە، لەوێش لە ناوچەی صیففین دابەزین، شارەکانی جەزیرەیش وەکو ڕەققەو قەرقیسیاو عاناتو هیت، لایەنگری موعاویە بوون، زۆربەشیان لە بەنی ئەڕقەم بوون کە گەڕەکێکی هەرە گەورەیە لە کیندە، ئامادەی شەڕەکەیش بوون لەگەڵ موعاویە.[٤]

سوپای خەڵکی شام سەربازگەیان لە صیففین ڕاگرتو دەستیان گرتەسەر ئاوەکاندا، سوپای عێراقیان لێقەدەغەکرد، بۆیە ئەشعەسی کوڕی قەیس ـ بە فەرمانی عەلی ـ هەڵسا بە دەرکردنی ئاوەکان لە دەستی سوپای خەڵکی شام،[٥] ئەوەش لەسەرەتای مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی ٣٦ کۆچیدا بوو، دوای ئەوە شەڕەکان هەر بەردەوام بوو بە شێوەی دەستە سوار بۆماوەی هەفتەو مانگی یەکەم لە موحەڕەمی ٣٧ك، بەبێ ئەوەی هەردوو لەشکرەکە یەکبگرن، چونکە هەموان هیوای ئاشتیان هێشتا هەر مابوو هەواڵ گێڕەرەوەکان پیان وایە ژمارەی شەڕە بچوکەکان زیاتر لە حەفتا شەڕ بووە،[٦] ئینجا لە چوارشەممەی داهاتوودا هەردوو سوپاکە یەکیان گرت، سەرلەشکرانی سوپای عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بریتی بوون لە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، عەمماری کوڕی یاسر، موحەممەدی کوڕی حەنەفیە، هاشمی کوڕی عوتبە، میرقال، ئەشعەسی کوڕی قەیس.

١) (ابن دحية) زیاد ەرەوی کردووە لە مەزندەکردنی ژمارەکاندا، تەنانەت وتویەتی حەوت کەسی لە بەشداربوونیانی (رضوان) تیادا بووە، بۆ دەرخستنی ئەوەی کە هەق لەگەڵ عەلی دابووە، بەڵام پەسەند کردنی هەڵوێستی عەلی ئاشکرایەو پێویستی بەم زیادە ڕەویانە نەدەکرد (عبد الحميد علي ناصر: خلافة علي ١٨٨ـ ١٨٩.

٢) الطبري: تأريخ ٤: ٥٦٥ باسناد منقطع.

٣) احمد: المسند ١: ٨٥، وابو يعلى الموصلي: المسند ١: ٢٩٨.

٤) ابن سعيد: الطبقات الكبرى، تحقيق عبد العزيز السلومي (اطروحة دكتورا بجامعة أم القرى. وهى قطعة ساقطة من المطبوع) ٢: ٦٣٨ـ ٦٤٠ بدون سند، والبلاذري: أنساب الأشراف ق٥١أ، وإبن حجر: الإصابة ١: ٢٥٩ـ ٢٦٠، وصالح العلي: امتداد العرب في صدر الإسلام ٩٨ـ ٩٩. وعبد الحميد على ناصر: خلافة على ١٨٩ـ ١٩٠.

٥) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٩٤، وخليفة: التأريخ ١٩٣ بسند حسن.

٦) ابن حجر: فتح الباري ٣: ٨٦ نقلا عن تأريخ ابن ابي خيثمة، واما المصدر المتقدم في ذكر الخبر فهو نصر بن مزاحم (صففين ٢٠٢).

سەرلەشکرانی سوپای موعاویەش (ڕەزای خوای لێبێت) بریتی بوون لە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، عەمری کوڕی عاص، (ذو الكلاع)ی حیمیەری، حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فیهری، موخاریقی کوڕی صەباحی کولاعی[1] عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص[2].

ئەبولعالیەی ڕیفاعیی ـ شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوە ـ باسی شەڕەکە دەکاتو دەڵێت: "لەکاتی عەلیو موعاویە، لاوێك بووم شەڕکردنم بەلاوە خۆشتر بوو لە خۆراکی خۆش، خۆمم ئامادەکرد تاکو پیا گەیشتم، بینیم دوو ڕیزن ئەو سەریان دیار نی یە، ئەگەر ئەمانە بڵێن (الله اكبر) ئەوانیش دەڵێن (الله اكبر)، ئەگەر ئەمانە بڵێن (لا اله الا الله) ئەوانیش ئەڵێن (لا اله الا الله). وتی: منیش بەخۆمدا هاتمەوەو وتم: کام کۆمەڵیان بکەم بە کافر، کامیشیان بکەم بە ئیماندار؟ ئیتر نەمهێشت خۆرم لەسەر ئاوا بێت گەڕامەوەو بەجیانم هێشت"[3].

تەنها ئەبولعالیەش نەبوو کە توشی دڵەڕاوکێ بێتو واز لە شەڕکردن بهێنێت، ئائەوە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصە ڕاستیی هەستی خۆی دەردەبڕێت، لە کاتێکدا لە تەنیشت باوکیدا ڕاوەستاوەو ئالایشی هەڵگرتووە لە پێشەوەی لە شکری موعاویە.. ئەو دەیوت: "چیم دابو لەم شەڕە، چیم دابوو لە شەڕی موسڵمانان!! خۆزگە دەساڵ پێش ئێستا مەرگم بچەشتایە، سوێند بەخوا نە شمشێرێکم وەشاندووەو نە ڕمو تیرێکم هاویشتووە"[4] عەبدوڵلایش پیاوێکی زاناو فەرموودەناسە، کەچی دڵی پڕ بە گومانە بەرانبەر ڕاستی هەڵوێستی لە ئەم ئاژاوە بێئەوەی ئەم مەسەلە لەگەڵ خۆیو دواتر لە گۆڕەپانی جەنگ یەکلابکاتەوە، چونکە باوکی زۆری لێکردبوو لەسەر ئەوەی بەشداری لەشکری خەڵکی شام بکات، فەرموودەی پێغەمبەر ﷺی یاد دەخستەوە "اطع اباك مادام حيا" واتە: بەقسەی باوکت بکە تا لەژیاندایە. ئەویش مەرجی ئەوەی کرد لەگەڵیان ڕاوەستێتو بەشداری نەکات[5]، تۆ بڵێی لەبیری چوویێت گوێڕایەڵی لەچاکەدا دەبێت؟[6]... ئەی

١) خليفة: التأريخ ١٩٣ بسند صحيح الى شاهد عيان.

٢)ابن سعد: الطبقات ٤: ٢٦٦ بسند صحيح.

٣) ابن سعد: الطبقات ٧: ١١٤ باسناد فيه يحى بن خليف السعدي، حديثه عن الثوري منكر وليس هذا عنه (ابن عدي: الكامل٧: ٢٧٠٠ـ ٢٧٠١).

٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ٢٦٦ـ ٢٦٧ باسناد صحيح.

٥) احمد: المسند ـ بتحقيق احمد شاكر ـ ١١: ١٣٨ـ ١٣٩ بسند صحيح.

٦) مسلم: الصحيح ـ بشرح النووي ـ ١٢: ٢٢٧.

خوایەگیان چ حاڵێك بوو سەربازانی موسڵمانی تێدا بوو!! نەفرین لە ئاژاوەو پەشێوی کە پیاوی عاقڵ سەرسام دەکات.

لە ڕاستیدا هەردوو لایەنەکە یەکتریان بە بێباوەڕ نەدەزانی، بەڵام هەندێ لە سەربازە دڵگەرمەکانی سوپای عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)، نەفرینیان دەکرد لە خەڵکی شام و بە کافریانیان دەزانین، بەڵام سەرکردەکانیان تیانیان دەخوڕی و بۆیان ڕووندەکردنەوە "لە ڕۆژی صیفیندا پیاوێك وتی: خوایە لەعنەتی تۆ لەسەر خەڵکی شام. بۆیە عەلی ((ڕەزای خوای لێبێت)) وتی: جنیو مەدە بەهەموو خەڵکی شام، پیاو چاکیان تێدایە، پیاو چاکیان تێدایە، پیاوچاکیان تێدایە"[١]

زیادی کوڕی حارسەی صەدائی ـ هاوەڵ و شایەتحاڵەـ دەڵێت: "لە تەنیشتی عەممارى کوڕی یاسر بووم لە شەڕەکەی صیففین، ئەژنۆم لە ئەژنۆی دەدا. پیاوێك وتی: خەڵکی شام کافر بوون. عەممار وتی: وا مەڵێن، پێغەمبەرمان یەکێکە، ڕووگەمان یەکێکە، بەڵام ئەوانە خەڵکێکن عەقڵو ژیریان نەماوەو لە جادەی ڕاست لایانداوە، بۆیە پێویستە لەسەرمان شەڕیان لەگەڵ بکەین تا بیانگێڕینەوە"[٢].

لە نێوان هەردوو سوپاکەشدا ڕقو کینە نەبوو، بەڵکو هەرلایەنێك بەرگریی دەکرد لەوەی کە باوەڕی پیەتی و ڕاستە، بۆیە هیچ نی یە شایەتحاڵێکی وەکو عەبدوڕەحمانی سولەمی بڵێت: "لە صفین لەگەڵ عەلیدا بووین، جا ئەو کاتانەی کە موادەعەمان[٣]دەکرد، ئەوان دەهاتنە ناو سەربازگەی ئێمە، ئێمەش دەچوینە نا سەربازگەی ئەوان"[٤].

هەروەها سەیر نی یە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لەپێش موعاویەدا ـ لەوکاتەی دوو پیاو شەڕیان بوو، هەردووکیان دەیانوت من عەممارم کوشتووە ـ بڵێت: "من گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دەستە زۆردارەکە دەیکوژێت" موعاویەش سەرسام بوو لەم لێدوانەی عەبدوڵڵا

---

١) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٢٤٩ باسناد صحيح.

٢) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٩٠ وله شواهد فی المصنف ١٥: ٢٩٠ ايضا، وابن عساكر: تأريخ دمشق (تحقيق المنجد) ٣٣٢، ٣٣٣و يعتضد بشواهده الى الحسن لغيرة.

٣) موادەعە لەنێوان هەردوو سوپاکەدا بریتییە لە شەڕ ڕاگرتن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە مەبەستی ناشتنی مردووەکان، یان لەبەر هەر هۆیەکی تر، کە هەردوو لایەنەکە بەلایانەوە پەسەند بێت.

٤) الهيثمي: مجمع الزوائد ٧: ٢٤٠ـ ٢٤١ وقال: رواه الطبراني واحمد باختصار، وابو يعلى بنحو الطبراني، ورجال احمد وابى يعلى ثقات.

و وتی: ئەی ئیتر بۆ لەگەڵمانی؟ وتی: باوکم سکاڵای کردم لای پێغەمبەر ﷺو ئەویش فەرمووی: گوێڕایەڵی باوکت بە تاکو زیندوو بێتو لە قسەی دەرمەچۆ، بۆیە من لەگەڵتانمو بەشداری ناکەم". [1]

بەم شێوەیش بە ڕاشکاوی دەردەکەوێت لە هەقداو هەموو کۆسپەکانی ڕووخۆشیو شەرم تێدەپەڕێنێت.. چونکە ئەو فەرموودەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص گێڕایەوە بەڵگەیەکی زۆر بەهێز بوو کە عەلیو سوپاکەی لەسەر ڕاستنو مەعاویە زۆردارە، بەڵام موعاویە فەرموودەکەی بە بارێکی تردا لێکدایەوە: "ئەو کاتەی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا عەمری کوڕی حەزم هاتە لای عەمری کوڕی عاصو وتی: عەممار کوژراو من گوێم لێبووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستە زۆردارەکە دەیکوژێت. ئینجا عەمر هەڵسا هەر دەیوت (انا لله وانا اليه راجعون) تۆقیبوو، تا چووە لای موعاویە. موعاویە پێی وت: ئەوە چیت لێقەوماوە؟ وتی: عەممار کوژرا. موعاویە وتی: عەممار کوژرا ئەی دوای ئەوە چی؟ عەمر وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوابوو ﷺ دەیفەرموو: "دەستە زۆردارەکە عەممار دەکوژێت. موعاویە وتی: قسەکەت پوچەڵە، ئایا ئێمە کوشتومانە؟ ئەو کەسە کوشتی کە لەماڵی خۆی دەریکردو هێنای بۆ ژێر ڕمەکانی ئێمە"[2].

موعاویە بەم لێکدانەوەی بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ورەی سەربازەکانی شامی بەرز کردەوە، هەروەها ورەی سەرکردەکەشی عەمری کوڕی عاص بەهەمان شێوە قوتار کرد، دوای ئەوەی هەستی بە ترسێکی زۆر دەکرد، بەڵکو هەڵسا بە لێکدانەوەی فەرموودەیەکی تریش بە بارێکی تردا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "ان قاتله وسالبه فی النار". وتیان ئەوەتا تۆ شەڕی لەگەڵ دەکەی؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بکوژەکەی و تالانکەرەکەی"،[3] واتە: دەقەکە تایبەتە بە بکوژی ڕاستەقینەی بە تەنیا، بەم شێوەیش بە کوشتنی عەممار بۆیان دەرکەوت کە عەلی لەسەر ڕاستەو موعاویە زۆردارە، جا ئەگەر (تأویل) کردن دادی سەربازانی شامی دا بەخۆقایلکردن، بەڵام سوپای

---

١) احمد: المسند ١١: ١٣٨ـ ١٣٩ وقال احمد شاكر: اسناده صحيح.

٢) عبد الرزاق: المصنف ١١: ٢٤٠ باسناد صحيح. وحديث: "تقلته الفئة الباغية" متواتر(السيوطي: الخصائص الكبرى، ط. الهراس ٢: ٤٩٦، وانظر الحديث فی صحيح البخاري ـ فتح الباري ١: ٥٤و ٦: ٣٠و صحيح مسلم ٤: ٢٢٣٥ـ ٢٢٣٦) وراجع حول تواتر الحديث عبد الحميد علي ناصر: خلافة علي ٢١٢ـ ٢١٩. ئەم فەرموودەیە لەدوای کوژرانی عەمماری کوڕی یاسر ناوبانگی پەیداکرد.

٣) احمد: المسند (الفتح الرباني ٢٣: ١٤٣ بسند صحيح). وابن سعيد: الطبقات الكبرى ٣: ٢٦٠ بسند صحيح.

عێراق بە کوشتنی عەممار ورەیان بەرز بوویەوەو گومانیان نەما کە لەسەر هەقن، بەرانبەرەکەشیان زۆردارن. ئەمەش لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی بوون[1] واشدەردەکەوێت کە لەدوای سێ ڕۆژو سێ شەو شەڕی سەخت[2]، سەرکەوتن دیاریدا بۆ کۆمەڵی عەلی ((ڕەزای خوای لێبێت)) و هەردوو لایش پابەند بوون بە حوکمەکانی زۆرداران (البغاة)، ئەبو ئومامە ـ هاوەڵو شایەتحاڵ ـ دەڵێت: "من بەخۆم ئامادەی جەنگەکە بووم، کەسم نەبینی هەڵکوتێتە سەر برینداریك، یان شوێنی هەڵهاتوویەك بکەوێت".

هەروەها ئەبو فاخیتە (٩٠ك)[3] ـ شایەتحاڵێکی متمانە پێکراوە ـ دەڵێت: "دراوسیەکم قسەی بۆکردم و وتی: دیلێکم هێنا بۆ لای عەلی لە ڕۆژی صفین، پێی وتم: ئازادی بکە، خۆ زیندانی ناکەم تاکو بمرێت، من لە پەروەردگاری جیهان دەترسم، ئینجا بە دیلەکەی وت: چاکەت تیایە؟ بەیعەت بدە. بەوەشی وت کە هێنابووی: شتەکانی بۆ خۆت ببە".[4]

موحەممەدی کوڕی سیرینیش (تابیعیەکی گەورەیە لە ١١٠ك وەفاتی کردووە) ژمارەی کوژراوەکان لە جەنگی صفین مەزەندە دەکات بە "حەفتا هەزار، نەیاندەتوانی بیانژمێرن بە قامیش نەبێت، لەسەر هەموو کوژراوێك قامیشێکیان دانا، ئەمجا قامیشەکانیان بژارد".[5]

بەهەمان شێوە شایەتحاڵێکی تر کە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزایە دەڵێت: "کوژراوەکان گەیشتنە حەفتا هەزار، چلو پێنج هەزار لە خەڵکی شام و بیست و پێنج هەزار لە خەڵکی عێراق، دەشڵێن کوژراوەکان شەست هەزار بوونە"[6] ئینجا پرسیار کرا لە عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی حاڵی کوژراوان، فەرمووی: "کوژراوانی هەردوو لامان لە بەهەشتدان، مەسەلەکە هەمووی لەسەر منو

١) ابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٢٦٧.
٢) ابن كثير: البداية والنهاية ٧: ٢٧٢ـ ٢٧٣.
٣) ابن سعد: الطبقات ٧: ٤١١، والحاكم: المستدرك ٢: ١٥٥ وصححه الألباني (إرواء الغليل ٨: ١١٤)
٤) عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٢٤ باسناد صحيح، وسعيد بن منصور: السنن ٢: ٣٣٩.
٥) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٢٩٥ باسناد صحيح لكنه من مرسل ابن سيرين، وخليفة: التأريخ ١٩٤ مختصرا.
٦) خليفة: التأريخ ١٩٤ باسناد ضعيف بسبب تدليس يزيد بن عبد الرحمن، وضعف عبد الله بن عبد الرحمن بن ابزى فهو مقبول يحتاج الى متابع. ولبعض الرواية شاهد عند خليفة: التأريخ ١٦٤ وهو تقديرهم بسبعين الفا.

موعاویەیە"[1] واتە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت لەگەڵ موعاویە دەربارەی ڕووداوەکان، لێپرسینەوەشیان لەگەڵ دەکرێت[2].

شایەتحاڵێکی تر، ناوی سالیمی کوڕی عوبەیدی ئەشجەعیەو هاوەڵیشە، وەسفی هەڵوێستی عەلی دەکات (ڕەزای خوای لێبێت)و دەڵێت: "من چاوم بە عەلی کەوت پاش جەنگی صففین، دەستی گرتبووم، بەناو کوژراوەکاندا ڕێماندەکرد، عەلیش هەر داوای لێخۆشبوونی بۆیان دەکرد تاکو گەیشتە لای کوژراوەکانی شام، پێم وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئێمە لەناو کوژراوانی سەر بە سوپای موعاویەین!؟ عەلی وتی: لێپرسینەوە لەسەر منو موعاویەیە"[3].

دەستاڕی مەرگ بەهەزاران موسڵمانی هاڕیی، ئەوانەش مانەوە بەجارێك ماندوو شەکەت بوون، ئالێرەدا زەینی عەمری کوڕی عاص کرایەوە لەسەر بیرۆکەی دادکاری (تحکیم) کە سوپای شامی قوتارکرد لە شکست، موعاویە پیاوێکی نارد قورئانێکی بەدەستەوە بوو بۆ لای عەلیو پێی وت: قورئانی خوا لەنێوانماندایە، عەلی وتی: ئێمە مافدارترین ئەو قسەیە بکەین. واشدەردەکەوێت کە زۆربەی سەربازانی عێراق مەیلیان هەبوو لە دادکاری، بەڵام زۆربەی ئەوانەی قورئانیان لەبەر بوو بەوە ڕازی نەبوونو وتیان: فەرمان تەنها بۆ خوایە. عەلی وتی: وتەیەکی ڕەوایە، مەبەستیان لێی ناڕەوایە[4]. بەڵام ئەو قورئان لەبەرانە دابڕانو خۆیان لە لەشکری عەلی جیاکردەوە، بەڵگەشیان ئەوەبوو کەڕازی بوو وشەی (امیر المؤمنین) لەسەر ناوی خۆی بسڕێتەوە[5]. ئینجا ئەبوموسای ئەشعەری نوێنەرایەتی عەلی کرد، عەمری کوڕی عاص نوێنەری موعاویە بوو لە کۆبوونەوەی ناوبژیکارەکان لە دەومەتولجەندەل، کۆمەڵێك لە هاوەڵانیش ئامادەی کۆبونەوەکە بوون وەکو: عەبدوڵلای کوڕی عومەر، کە عەمری کوڕی عاص هەوڵیدا ڕایبکێشێت بۆ ڕیزی موعاویەو پێی وت: "ئێمە پێمان چاکە

---

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٣٠٣ باسناد صحيح، والطبراني: المعجم الكبير ١٩: ٣٠٧، وسعيد بن منصور: السنن ٢:٣٤٤ـ ٣٤٥ من طريق اخر فهو شاهد له.

٢) ابن عساكر: تأريخ دمشق نقلا عن كاتب صففين لابن ديزل، واسناد ابن ديزل حسن، وابن العديم: بغية الطلب في تأريخ حلب ١: ق ٢٠٢ ـ ٣٠٣.

٣) سەرچاوە پێشووەکان.

٤) ابن حجر: فتح الباري ٨: ٥٨٧.

٥) البلاذري: انساب الشراف: ٢: ق ٦٠ أ باسناد صحيح، وابو نعيم: حلية الاولياء ١: ٢٩٣ـ ٢٩٤ باسناد صحيح، والذهبي: سير اعلام النبلاء ٣: ٢٢٦ـ ٢٢٧.

بەیعەت بە تۆ بدەین، ئایا ڕازی دەبیت ماڵو سامانت پێبدەینو تۆ بەجێی بهێڵی بۆ کەسێك کە لە تۆ سوورترە لە سەری؟ ئیبنو عومەر لەم قسە زۆر تورە بووو هەڵسا، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر کردی بەچمکی کراسەکەیداو داینیشاندو ئەمجا وتی: بەڵام لێتدا ئەی عەمر!! دوارۆژت بە دونیا فرۆشتووە، سوێند بە خوا من نە پارەی بۆ دەدەمو نە پارەشی لەسەر وەردەگرم، وەریشی ناگرم بەرەزامەندی سەرجەم موسڵمانان نەبێت[1]. عەمر وتی: مەبەستم ئەوە بوو تاقیت بکەمەوە"[2] ئیبنو عومەر پێش چەندین جار بەڕاشکاوی وتبووی کە خیلافەت قبوڵ ناکات بەیەکدەنگی موسڵمانان نەبێت[3] واتای ئەوەیش ئەوە دەگەیەنێت کە لە بنچینەوە نایەوێت وەریبگرێت.

جارێکیش عەمری کوڕی عاص تاقیکردەوەو وتی: ئەی ئەبو عەبدوڕەحمان، چی ڕێگرە لەوەی دەرچیتو ئێمە بەیعەتت پێبدەین، کە تۆ هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ و کوڕی عومەری کوڕی خەتتابیت، تۆیش لە هەموو کەس مافدارتری پێی؟

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وەڵامی دایەوە: ئەگەر کەس نەمایەتەوە سێ گومڕا نەبێت لە هەجەر، من پێویستم پێی نەدەکەوت". ئینجا عەمری کوڕی عاص پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات بەیعەت بە موعاویە بدات: "ئایا بەیعەت دەدەیت بە کەسێك خەڵکی ئەوەندەیان نەماوە لەسەری کۆببنەوە، ئەویش ئەوەندە ماڵو سامانو زەویت بۆ بنووسێت کە چیتر نە خۆتو نە نەوەیشت پێویستیان بەهیچ نەبێت دوای ئەوە؟ ئیبنو عومەر وتی: بەڵات لێکەوێ، من ئاینم بە دینارو درهم نافرۆشم، داواکاریشم لە خوای گەورە، لەم دونیایە دەرچم بە دەستێکی سپیو پاکەوە"[4].

ئیبنو عومەر سەرەڕای خۆ بەدوورگرتن لە ئاژاوە، بەڵام بە ڕاشکاوی دەیووت هەق لەگەڵ عەلیدایە، دەیوت: "بەهیچ خەمبارنیم، ئەوەندەی بەوە خەمبارم بەشداریم نەکرد لە جەنگدا لەگەڵ عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)"[5].

١) هەمان سەرچاوە پێشووەکان.

٢) ابو نعيم: حلية الاولياء ١: ٢٩٣ـ ٢٩٤ باسناد صحيح.

٣) ابن سعيد: الطبقات الكبرى ٤: ١٥١ باسناد صحيح.

٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٤: ١٦٤، وابن عساكر: تأريخ دمشق (ترجمة عبد الله بن عمر) ق ١٤٥ـ ١٤٦، والذهبي: سير اعلام النبلاء ٣: ٢٢٨، ويقوى شواهده الى الصحيح لغيره.

٥) ابن عبد البر: الاستيعاب ١: ٧٧، والحاكم: المستدرك٣: ١١٧ وقال: صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي. والهيثمي: مجمع الزوائد ٧: ٢٤٢ وقال: رواه الطبراني بأسانيد واحدها رجاله رجال الصحيح.

سەبارەت بە کەسایەتی دووەم کە ناوبانگی دەرکرد لە ڕووداوەکانی ناوبژیوانکردندا، ئەبوموسای ئەشعەری بوو، شایەتحالێك کە مەسروقی کوڕی ئەجدەعە دەربارەی دەڵێت: "من لەگەڵ ئەبوموسا بووم لەو بەیانییەدا چمکی خێوەتەکەی لاداو وتی: ئەی مەسرووقی کوڕی ئەجدەع. وتم: لە خزمەتتدام ئەی ئەبوموسا. وتی: فەرمانڕەوایی ئەوەیە کە فەرمانڕەوایی تیادا ئەنجام بدرێت، مولْکیش ئەوەیە کە بە زۆری شمشێر بەدەست بێت"[1].

لە ڕاستیدا موعاویە هەوڵیدا ـ لەکاتی ناوبژیکردنەکەیان پاش ئەوە ـ کە ئەبوموسا بۆلای خۆی ڕابکێشێت، بەڵام بێسوود بوو، ئەبوموسای وتی: "موعاویە لەنامەیەکیدا بۆی نووسیبووم: سلاوی خوات لێبێت، دوای ئەوەش دەڵێم: عەمری کوڕی عاص بەیعەتی پێداوم لەسەر ئەو شتانەی کە بەیعەتم لێی وەرگرتووە، سوێند بەخوای گەورەیش، ئەگەر تۆیش لەسەر ئەو شتانە بەیعەتم پێبدەیت، هەردوو کوڕەکەت دەکەم بە فەرمانڕەوا، یەکێکیان لەسەر بەصرەو، ئەوی تر لەسەر کووفە، هیچ دەرگایەکیش بە ڕووتدا دانەخرێت، هیچپیش بەبێ تۆ ئەنجام نەدرێت، ئینجا من بە خەتی دەستی خۆم بۆم نووسیوی، تۆیش بەخەتی خۆت وەڵامم بدەرەوە. ئیتر ئەبوموسا بە ئەبو بوردەی کوڕی وت: کوڕم من دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ فێری خەت نووسین بووم. وتی: وەکو دوو پشك بۆت دەنوسم. دوای سوپاسو ستایشی خوا، تۆ دەربارەی مەسەلەیەکی گەورە بۆ منت نووسیوە کە تایبەتە بە ئوممەتی موحەممەد ﷺ، پێویستم نی یە بەو شتانەی پێشنیارت کردووە بۆم"[2]

ڕیوایەتگەلی لاوازیش هەوڵیداوە وێنەیەکی نابەجێ دروست بکەین بۆ ئەبوموسای ئەشعەری، گوایە ئەو لە لایەن سەربازانی عێراقەوە هەڵبژێردراوەو سەپێنراوەتەوە سەر عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)، هەروەها لاوازیی و بێئاگایی نیشانداوە لەکاتی ناوبژیوانەکە، گوایە عەمری کوڕی عاصیش بارودۆخەکەی قۆستووەتەوە بە فێڵی خۆی، بەڵام لەڕاستیدا عەلی ڕازی بوو لە هەڵبژاردنی ئەبوموسای ئەشعەری "ئەحنەفی کوڕی قەیس بە عەلی وت: کاتێك ویستی ئەبوموسا بنێرێت بۆ ناوبژیوانی کردن: تۆ

---

١) ابن سعد: الطبقات ٤: ١١٣ باسناد صحيح.

٢) ابن سعد: الطبقات ٤: ١١١ـ ١١٢ باسناد صحيح. وابن عساكر: تأريخ دمشق ٥٤١ـ ٥٤٢ (ترجمة ابي موسى الاشعري). والذهبي: سير اعلام النبلاء ٢: ٣٩٦، وتأريخ الاسلام (٤١ـ ٦٠هـ) ص١٤٥.

کەسێکی لادێی ناسك دەنێریت... من بنێرە لە جێگەی ئەو بەڵگەنامەت بۆ دەهێنم، دەتخەمە جێگەی گونجاوی خۆت، ئیبنو عەباس پێی وت: ئەی ئەحنەف لێمان گەڕێ، خۆمان باشتر دەزانین چی بکەین"[١].

شاراوەش نی یە کە ئەبوموسا دێرینترو بەتواناترە لە ئیسلامدا، هەروەها شارەزاترو دیندارترە، با دان بەوەشدا بنرێت کە ئەحنەف وریاترو زیرەکترە. ئینجا خۆبەدوورگرتنی ئەبوموسا لە ڕووداوەکانی ئاژاوە، بەتواناتری دەکات لەسەر خۆڕاگرتنو پتەوکردنی کردارو گفتاری زیاتر لە ئەحنەف کە ناحەزێکی سەرسەختە بۆ خەڵکی شام. لەوانەشە یەکێك لە هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ئەبوموسا شارەزاییو کارامەیی بێت لە داوەریدا، جگە لە هەڵسانی بە شێوەیەکی کرداری بەو کارە بۆماوەی چەندین ساڵ لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیو خیلافەتی ئەبو بکرو عومەرو عوسمان[٢]

هەرەسهێنانی ناوبژیەکە ناگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی ئەبوموسا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەختیی چارەسەرکردنی کێشەکەو سووربونی هەردوو لایەنەکە لەسەر هەڵویستەکانی پێشووی خۆیان، هەروەها نەبوونی دەسەڵاتێکی بێلایەن بەدەستی ناوبژیوانەکانەوە بۆ جێبەجێردنی بڕیارەکان. یەکێك لە بەڵگەکانی بێعەیبی ناوبژیوانەکەو بێلایەنێتی، دەقی ئەو بەڵگەنامەیە کە جێگیرکرا، هەروەها ئەو لێبوردنەی کە پیشاندرا بەرانبەر ڕازینەبوونی عەمری کوڕی عاص لەسەر شێوازی بەڵگەنامەی ناوبژیەکە، کە ئاماژە دەکات بۆ وشەی (امیر المؤمنین)، چونکە خەڵکانی شام بەیعەتیان بە عەلی نەداوە بە خیلافەت[٣].

دەقی بەڵگەنامەکەش کێشەکە بنەبڕ ناکات، بەڵکوو چوارچێوەی گشتیی بۆ ڕوونکردنەوەکانە، کە زاڵ دەبێت بەسەر وتوێژەکانداو ئامانجەکەی ئاشکرا دەکات، کە بریتیە لە چاکسازیی لە نێوان خەڵکیداو ڕێگەنەدان بۆ دروستبوونی جیاوازیی و شەڕ، هەروەها کاتێکیش دیاری دەکات بۆ کۆتایی پێهێنانی، جێگای ناوبژیوانەکەش دیاری دەکات، کە شوێنێکی مامناوەندیە لە نێوان کووفەو شامو حیجازدا، مەرجیشیان دانابوو کە هەردوولا ڕازین لەسەر ئەو کەسایەتیانەی ئامادەی

١) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ٥٧ أ باسناد حسن، ورواية عن الاحنف هو محمد بن ابي يعقوب سيد بين تميم ثقة ويحكم مكانته فانه يسطتيع التحقق من صحة المعلومات.
٢) عبد الحميد علي ناصر: خلاقة علي ٢٦١ـ ٢٦٢.
٣) ابو عبيد: الاموال ١٥٨ـ ١٥٩ بسند حسن، عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٥٧، ويعقوب بن سفيان: المعرفتو التأريخ ١: ٥٢٢، والنسائي: خصائص امير المؤمينين علي ١٩٥.

وتووێژەکان دەبن، سەبارەت بە شایەتەکانیش.[1] ئەو بەڵگەنامەیە هەرمابوو تا ئەو کاتەی ئەبو ئیسحاقی شەیبانی (فەرموودە ناسێکی متمانە پێکراوە) چاوی پێکەوت، ناویشی بردووە بە: "لاپەڕەیەکی زەرد، لە سەر و ژێرەوە مۆرکرابوو، بە مۆری عەلیو موعاویە، نەخشی مۆرەکەشیان ـ محمد رسول الله ـ بوو"[2].

هەردوو ناوبژیوانەکەش لە دەومەتولجەندەل کۆبونەوەو نەگەشتن بەهیچ ڕێککەوتنامەیەك، موعاویە خۆیشی ئامادەبوو لەوێ، بەڵام عەلی ئامادە نەبوو، لەوانەشە جموجوڵی خواریجەکان کاریگەری هەبێت لەسەر ئەوە. موعاویە وتاریدا بۆ خەڵکەکەو وتی: "هەرکێ دەیەوێت لەم مەسەلەیەدا قسەیەك بکات باخۆی دەرخات، چونکە ئێمە لەخۆیو لە باوکیشی مافدارترین لەم مەسەلە، ئیبنو عومەر وتی: هەڵسامو هاتم بڵێم: ئەو کەسە مافدارترە کە لەسەر ئیسلام شەڕی لەگەڵ خۆتو باوکتدا کرد، بەڵام قسەیەك بکەم خەڵکی پەرتەوازە بکاتو ببێتە مایەی خوێن ڕشتن، بە شێوەیەکی تریش لێم بگێڕنەوە، بۆیە باسی ئەو شتانەم کرد کە خوای گەورە بۆ موسڵمانی ئامادەکردووە لە بەهەشت".[3]

بارودۆخەکە هەروەکو خۆی مایەوە، عەلی خەلیفەی موسڵمانانە، موعاویەش فەرمانڕەوای شامە، موعاویە بەیعەتی هەر نەدا بە خیلافەت تاکو دوای شەهید بوونی عەلی لەسەر دەستی خەواریجەکان، بەیعەتەکەشی لە (بیت المقدس) بوو لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠ك، لە پاش گەیشتنی هەواڵی شەهید بوونی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)[4].

---

١) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ق ٥٨أ.

٢) ابن سعد: الطبقات ٣: ٣٠ بسند صحيح. وانظر محمد حميد الله: مجموعة الوثائق السياسة ٥٣٨ـ ٥٤٤ حيث يمكن ملاحظة الاختلاف بين رواية البلاذري وابي مخنف والجاحظ واسماعيل التيمي.

٣) البخاري: الصحيح (فتح الباري ٧: ٤٠٣) وعبد الرزاق: المصنف ٥: ٤٦٥، وابن سعد: الطبقات ٧: ٤٠٣.

٤) ابن كثير: البداية والنهاية ٨: ١٣١.

بەشی پێنجەم:

# شەڕی نەهرەوان

ژمارەی ئەوانەی نارەزاییان دەربڕی لەسەر ناوبژیکردن لە صففین چوار هەزار کەس بوون، کەواتە ئەوان کەمینە بوون لە سوپای عەلی کە ژمارەیان دەگەیشتە پەنجا هەزار کەس پێش بەیەکگەیشتنی هەردوو سوپاکە.

عوروەی کوڕی حودەیری تەمیمی، بە شمشێر لە ولاخەکەی ئەشعەسی دا، لەو کاتەی ئەشعەس خەریکی خوێندنەوەی بەڵگەنامەی ئاگر بەستەکە بوو کە جەنگی پێڕاگیرا، ئینجا هۆزی تەمیم داوای لێبوردنیان کرد لە ئەشعەسو خزمەکانی سەبارەت بەو کارەی عوروە، عوروە دەیوت: "ئێوە ئادەمیزاد دەکەنە دادوەر لە فەرمانی خوا، حوکمو فەرمان تەنها هەر بۆ خوایە"[1] ئەم وتەیەیش بوو بە دروشمی بزوتنەوەی خاریجی، هەربۆیە ناونران بە (محكّمة)، ئەوانەی حوکمی خوا نەبێت حوکمی کەس وەرناگرن، هەروەها ناونران بە (خوارج) لەبەر دەرچوونیان لە فەرمانی عەلی کە خەلیفەی شەرعیی بوو، هەروەها پیان دەوترا (الحرورية) بەناوی لادیەکەوە لای کووفە، کە لەو شوێنەدا جیابوونەوە لە سوپای عەلی کە بەرەو کووفە دەگەڕایەوە.

واشدەردەکەوێت کە ئەوان بەردەوام بوون لە چالاکیی بانگەوازیی خۆیان لەناو سوپای عەلی، لە پاش ڕووداوی دادکاری، چونکە ژمارەیان گەیشتە هەشت هەزار کەس لە کاتی خۆڕاگەیاندنەکەیاندا[2]، دواتریش ژمارەیان زۆر زیاتر بوو، بەپێی هەندێ ڕیوایەتیش ژمارەیان گەیشتووەتە بیستو چوار هەزار کەس[3]. وادیارە ئەم ژمارەی دوایە دەربڕین لەدوای دابڕینەکەیان دەکات، ئاماژەیش دەکات بۆ پەرەسەندنی بانگەوازی خاریجیەکانو بەرزبوونەوەی ژمارەیان.. هەروەها هەڵسان بەرێکخستنی خۆیان بە سەرۆکایەتی عەبدوڵلای کوڕی کەڕرا و شەبەسی کوڕی

١) الطبري: التأريخ ٥: ٥٥، والمبرد: الكامل (اخبار الخوارج) ١٦.

٢) احمد: المسند ـ بتحقيق احمد شاكر ٢: ٦٥٦ وصححه، ١: ٨٦ـ ٨٧ وصححه ابن كثير (البداية والنهاية ٧: ٢٨٠ـ ٢٨١) وابو يعلى: المسند ١ :٣٦٧ـ ٣٧٠ قال الهيثمي: بأن رجال ابى يعلى ثقات(مجمع الزوائد ٦: ٢٣٥ـ ٢٣٧) والحاكم: المستدرك ٢:١٥٢ـ ١٥٤ وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي.

٣) عبدالرزاق: المصنف ١٠: ١٥٧ـ ١٦٠ باسناد حسن، والطبراني: المعجم الكبير ١٠: ٣١٢ـ ٣١٤.

ڕەبعی[1]، سەرکردەیەکیشیان دەسنیشان کرد بۆ نوێژو یەکێکی تر بۆ جەنگ. ئەم پەرەسەندنەی دوایش وایکرد لە ئیبنو عەباس، داوا لە عەلی بکات ڕێگەی بدات بۆ ئەنجامدانی ئاخاوتن لە گەڵیاندا، لە یەکێك لە کۆبوونەوە گەورەکانیان لە حەرورا، لەکاتی نیوەڕۆ گەیشتە لایانو دەڵێت: "چوومە لای خەڵکانێك، کەسم نەدیوە لەوان کوششکارتر بێت، دەستەکانیان دەتوت حوشترە، ڕوومەتیان شوێنەواری کڕنوشکی لەسەر دیاربوو.. ئیبنوعەباس پیاوێکی جوانو دەنگ گەورە بوو، پێشوازیان لێکرد، ئەمجا دەستی کرد بە وتووێژکردن دەربارەی ئەو گومانانەی لایان دروست بوو بوو لە ئەنجامی لێکدانەوەیان بۆ قورئان، ئاشکراشی کرد بۆیان کە دادکاری لە دەقی قورئاندا باسکراوە[2]، هەروەها سڕینەوەی نازناوی (امیر المؤمنین) لە ڕێکەوتننامەکە پێشینەیەکی هەیە لە ڕووداوی حودەیبەدا، ئینجا ئەوەشی ڕوونکردەوە کە شەڕکردنی عەلی لەگەڵ نەیارەکانیدا، بەبێ ئەوەی ماڵخواردنو ئافرەتەکانیان بۆ خۆیان بە ڕەوا بزانن، ئەوە حوکمی شەرعی ڕاستە، لە ئەنجامی ئەم قسانەدا دوو هەزار کەس بەرچاویان ڕوونبوویەوە[3] دووکەس لە دیارترین ئەو کەسانەی کە گەڕانەوە بریتی بوون لە عەبدوڵڵای کوڕی کەڕڕا و شەبەسی کوڕی ڕەبیعی[4]. بەڵام هیچ کەسێکیان لە هاوەڵان تیادا نەبوو.

لەپاش ئەم گفتوگۆیە خودی عەلی دەرچوو بۆ حەرورا، ئاخاوتنی کرد لەگەڵ خەواریجەکان، ئەوانیش بەهەڵە لە عەلی حاڵیبوون واتێگەیشتن کە واز لە مەسەلەی ناوبژیکردن (تحکیم) دەهێنێ، ئاوها ئەم جارەیش کەوتنە داوی هەڵە گەیشتنەوە، ئینجا گەڕانەوە بۆ کووفە لەسەر ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە، دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە، جا کاتێك بۆیان دەرکەوت لە وتارەکەی عەلی لە ڕۆژی هەینی کە

١) خليفة: التأريخ ١٩٢ بسند صحيح، وابن عساكر: تأريخ دمشق (ترجمة عبد الله بن ابى اوفى) ٣٩٥، ٣٩٨ صحيح مرسل الزهرى.

٢) لەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا) النساء ٣٥. هەروەها لەم ئایەتەدا: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّداً فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْياً بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَاماً لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ) ﴿المائدة : ٩٥﴾ ئیبنو عەبباس ڕونیشی کردەوە کە ئاشتی کردن لە نێوان خەڵکی بۆ قەدەغە کردنی خوێنی موسڵماناندا باسکراون: ئاشتبوونەوەی ئافرەت لەگەڵ مێردەکەیو، ڕاوکردنی کەروێشك یان مەلێك لەلایەن کەسێکەوە لە ئیحرامدا بێت...

٣) عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٥٧ـ ١٦٠ باسناد صحيح، واحمد: المسند ١: ٣٢٤، والنسائي: خصائيص علي ١٩٠ـ ٢٠٠.

٤) ابن أبي شيبة: المصنف ١٥: ٣١٧ـ ٣١٩، وابو يعلى: المسند ١: ٣٦٤، والالباني: ارواء الغليل ٨: ١١١ وصححه.

ئەو هێشتا نەگەڕاوەتەوە دادکاریو کوفر!! لە مزگەوتەکە دەرچوون، عەلی بە حەسرەتەوە هەڵوێستی خۆی ئاشکرا کرد بەرانبەریان: "نوێژکردنتان لێقەدەغە ناکەین لەمزگەوتەدا، بێبەشیشتان ناکەین لە پشکی خۆتان لە داهاتەکان، تا ئەوکاتەی دەستان لەگەڵ دەستماندا بێت، شەڕیشتان لەگەڵ ناکەین تاکو شەڕمان لەگەڵ نەکەن"[1] بەڵام ئەوان ئەو قسانەیان قبوڵ نەکرد، دەستیان کرد بە هاوارکردنیش لە سەرانسەری مزگەوتەکەداو دەیانوت: "لا حكم الا لله"[2] واتە: فەرمان بەس بۆ خوایە. سەرکردەکانیان هەوڵیاندا عەلی پەشیمان بکەنەوە لە ناردنی ئەبوموسای ئەشعەری بۆ ناوبژیکردنەکە، پێشنیاریشیان کرد لەگەڵی بچن بۆ هێرشکردنە سەر شام، بەڵام عەلی ڕازی نەبوو پەیمانەکەی هەڵوەشێنێتەوە لەگەڵ خەڵکی شامدا:"ئێمە تازە لەیەکتر جیابووینەوە لەسەر ئەوەو ناکرێت هەڵبوەشێنرێتەوە"[3] ئینجا هەندێ گفتوگۆی تر دروست بوو لەلایەن هاوەڵانو شوێنکەوتوانیان، لەگەڵ خەواریجەکان، ئەوەش وایکرد ژمارەیان کەم بێتەوە بۆ چوار هەزار کەسێك.[4] بەڵام ئەوان لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ڕاسیبی کۆبوونەوە، ویستیان یەکێك لە سەرکردەکانیان بکەن بە ئەمیری خۆیان، بەڵام کەسیان ئەو لێپرسراویەتیە یان وەرنەگرت، لە ئەنجامدا عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ڕاسیبی وەریگرتو وتی: "سوێند بە خوا وەریناگرم لە پێناوی دونیادا، وازیشی لێناهێنم لە ترسی مەرگدا". بەم شێوەیش هەڵسان بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەیعەتەی لە گەردەنیاندا بوو بۆ عەلی. لە دەی شەوالی[5] ساڵی سیو حەوتی کۆچی، بنەمای "خیلافەت لە قوڕەیشدایە"شیان شکاند. ئەمجا یەکێك لە وتەکانیان بووە ئەوەی خیلافەت دەبێت بە کەسێك بدرێت لە قوڕەیش نەبێت بە نەژاد.

عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ڕاسیبی ئەزدی بەکپی شوێنکەوتووانی دەرکرد بۆ نەهرەوان، نەوەکو کەسانێك ڕێگەیان لێبگرن، ئینجا لەوێ کۆبوونەوە، سەرەڕای ئەم بەرەنگاریکردنەش، عەلی (ڕەزای

---

١) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٣٢٧ـ ٣٢٨، والطبراني: الاوسط (مجمع الزوائد ٦: ٢٤٢ـ ٢٤٣)، والطبراني: تأريخ ٥: ٧٤، والبيهقي: السنن الكبرى ٨: ١٨٤ ويتقوى بمجموع طرقه الى الحسن.

٢) ابن أبي شيبة: المصنف ١٥: ٣١٢ـ ٣١٣ وصحح الالباني سنده (ارواء الغليل ٨: ١١٨ـ ١١٩) وقارن برواية الطبراني: التأريخ ٥: ٧٣ـ ٧٤.

٣) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ق ١٦٢أ ـ ١٦٤أ مدار الرواية على مجالد بن سعيد ليس بالقوي، لكنه يصلح للمتابعات.

٤) ابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٩١ـ ٩٣ باسناد حسن، والطبراني التأريخ ٥: ٩١ـ ٩٣ والهيثمي: السنن الكبرى ٨: ١٧٩

٥) البلاذري: انساب الاشراف ٢: ق ١٦٣ا ـ ١٦٤أ باسناد فية مجالد بن سعيد ليس بالقوي.

خوای لێبێت) بڕیاری نەدا شەڕیان لەگەڵ بکاتو بەهێز بیانگێڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی، بەڵکو تەنها هەڵەکانیانی بۆ ڕوونکردنەوەو بۆچونەکانیانی پووچەڵ کردەوە.

ئەوکاتەی کە هەردوو نابژیوانەکەش گەڕانەوە بەبێ هیچ ڕێککەوتنێك، خەواریجەکان نەگەڕانەوە بۆ لای عەلی، سەرەڕای ئەوەی کە عەلی لەشکری ئامادەکردبوو بۆ بەرەنگاریکردنی خەڵکی شامو سەربازگەی ڕاگرتبوو لە ناوچەی نوخەیلە، کە هەندێ لە ڕیوایەتەکان ژمارەی ئەو سوپایەی بە شەستو هەشت هەزارو دووسەد کەس مەزەندە دەکرد، لەم ماوەدا خواریجەکان هەڵسان بە کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی خەبابی کوڕی ئەرەت لەگەڵ دایکی منداڵەکەی،[1] هەروەها دووکەسی تریشیان کوشت[2]، چونکە وایان بەسەر هات ئەوەی لەگەڵیان ناکۆك بوایە خوێنوماڵیان بە ڕەوا دەبینیو دەیانکوشت[3] بۆیە عەلی بە سوپاکەیەوە ڕووی تێکردن لە موحەڕەمی ساڵی ٣٨ك، سەربازگەشی دیاریکرد لە کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری نەهرەوان، خەواریجەکانیش لەلای ڕۆژهەڵاتیەوە بوون،[4]، دواتر خەواریجەکانی بەصرەیش هاتنە پاڵیان کە ژمارەیان سێ سەد یان پێنج سەد کەس دەبوون بە سەرکردایەتی موسعیری کوڕی فەدەکی تەمیمی[5] ئینجا لەبەر ئەوەی ناوچەکانی چالاکی خەواریج کە توشی نەمانیی ئاسایشو جەردەیی دەبوونەوەو لەو شوێنانە بوون کە لەژێر لێپرسراوێتی عەلیدا بوون، بۆیە داوای کرد بکوژەکان بدەنە دەستەوە بۆ بەجێهێنانی سزای شەرعی لەسەریان، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: هەموومان کوشتومانە.[6] هەر بۆیە عەلی شەڕکردنیانی بەڕەوا بینی، پاداشتی شەڕکردنیشی لەگەڵیان ڕوونکردەوە بۆ سەربازەکانی، لەبەر ڕۆشنایی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: "يخرج قوم من أمتي يقرأون القران، ليس قراءتكم الى قراءتهم بشيء، يقرأون القرأن يحسبون انه لهم وهو عليهم، لاتجاوز صلاتهم تراقيهم، يمرقون من الاسلام كما يمرق الهم من الرمية". واتە: خەڵکانێك لە ئوممەتی من سەرهەڵدەدەن، قورئان خوێنن، خوێندنی ئێوە بۆ قورئان هیچ نی یە لەپاڵ

١) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٢١٠ـ ٢١١ بسند صحيح، ٣٠٨ـ ٣٠٩. والطبراني: المعجم الكبير ٤: ٦٨، والطبراني: التأريخ ٥: ٨١.
٢) الطبري: التأريخ ٥: ٨٢.
٣) ابن حجر: فتح الباري ١٢: ٢٨٤.
٤) الخطيب: تأريخ بغداد ١: ٢٠٥ـ ٢٠٦.
٥) البلاذري: انساب الاشراف ٦٣ بسند فيه مجهول، والطبري: تأريخ ٥: ٨ عن ابى مخنف.
٦) ابن ابى شيبة: المصنف ١٥: ٣٠٨ـ ٣٠٩ بسند صحيح.

خوێندنی ئەوان، نوێژ و ڕۆژووشتان هیچ نیە بەرانبەر نوێژ و ڕۆژووی ئەوان، قورئان دەخوێنن وا دەزانن لایەنگریانە کەچی دژیانە، نوێژکانیان لە قووڕگیان تێناپەڕێت، لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت"، ئینجا بەدوای ئەوەدا وتی: "ئەگەر ئەو سوپایەی شەڕیان لەگەڵ دەکات بزانن بەڵێنی چیان پێدراوە لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ، پشتیان بە کرداری چاکە نەدەبەست"، ئینجا باسی ئەو نیشانانەی کرد کە لەسەر خەواریجەکان دەچەسپێ، وەکو هەبوونی موخەددەج لە ناویاندا "بازووی هەیە و قۆڵی نی یە، لەسەر بازووەکەی شتێکی تێدایە وەکو نووکی مەمك چەند موویەکی سپی لەسەرە، ئێوە دەچن بۆ لای موعاویە و خەڵکی شام و ئەمانە بەجێدەهێڵن لە دواتانەوە بێننەوە لەناو ماڵ و منداڵەکانتان، سوێند بەخوا هیوادارم ئەمانە ئەو کەسانە بن، چونکە خوێنی ناڕەوایان ڕژاند، هێرشیان کردە سەر خەڵکیو لەسەر ناوی خوا بەرێکەون"[1].

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) چەندین کەسی نارد بۆ لایان، ئەوانیش هەڵسان بە کوشتنی نێردراوەکەی و لە ڕووبارەکەیش پەڕینەوە[2]، بۆیە عەلی فەرمانی کرد بە سوپاکەی شەڕیان لەگەڵ بکەن. شایەتحاڵێکی متمانەپێکراو کە زەیدی کوڕی وەهبی جوهەنیە دەڵێت: "کاتێك پێکگەیشتین، عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ڕاسیبی سەرکردەیان بوو، بە شوێنکەوتووەکانی وت: ڕمەکانتان بهاوێژن و شمشێرەکانتان هەڵکێشن، چونکە دەترسم سوێندتان لێبخۆن و داوای ڕێکەوتنتان لێبکەن، وەکو ئەوەی لە ڕۆژی حەرورا ڕوویدا"[3]، ئینجا هەردوو سوپاکە تێکچڕان لە شەڕێکی خێرای نابەرابەردا، کۆتایی پێهات بە شکاندنی خەواریجەکان، سەرەڕای هەموو ئەو نەبەردی و خۆڕاگریەی کە پیشانیاندا، سوپای عەلی توانیان لەناویان بدەن، بێئەوەی شتێکیان پێبکرێت، ئەوە نەبێت چەند

١) مسلم: الصحيح ٧٤٨ـ ٧٤٩، وعبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٤٧ـ ١٤٩.

٢) ابن أبي شيبة: المصنف ١٥: ٣٢٥ـ ٣٢٧ بسند حسن.

٣)مسلم: الصحيح ٢: ٧٤٨، وابن أبي شيبة: المصنف ١٥: ٣١٧ باسناد صحيح، واحمد: المسند: ٣: ٤٨٥ باسناد صحيح، وابوداود: السنن: ٤: ٢٤٤.

کەسێکیان لە سوپای عەلی کوشت[1]. سەبارەت بە سوپای خەواریجەکانیش کەسی لێدەرنەچوو بە زیندوویی، بریندارەکان و ئەوانە نەبێت کە هەڵهاتن، ئەوانەش ژمارەیەکی کەمبوون[2].
عەلی ((ڕەزای خوای لێبێت)) گرنگیدا بە گەڕان بە دوای موخەددەجی مەمکداردا تاکو دۆزیەوە[3]، چونکە ئەو کەسە شایەتێك بوو لەسەر ڕاستی هەڵوێستی عەلی، نیشانەیەکیش لەسەر گومڕایی ئەو خەواریجانە.
عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) مامەڵەی زۆرداران (البغاة)ی کرد لەگەڵیان، بۆیە بە کافری نەژماردن و ڕێگەشی نەدا بە سەربازەکانی شوێن هەڵهاتووەکانیان بکەون، یان هەڵکوتنە سەر بریندارەکانیان، ڕازیش نەبوو بکرێن بە کۆیلە [4] و ماڵەکانیان وەکو دەسکەوتی شەڕ بخورێت[5]، پرسیاریشی لێکرا: ئایا ئەوانە کافرن؟ وتی: لە کوفر هەڵهاتوون. وتیان دووڕوون؟ وتی: دووڕووەکان یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت. وتیان: ئەی ئەمانە چین؟ وتی خەڵکانێکن ستەمیان لێکردووین، ئێمەیش شەڕمان لەگەڵیان کرد.
لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە: کەسانێکن ستەمیان لێکردین، ئێمەیش سەر خراینە سەریان. لە ڕیوایەتێکی تردا: کەسانێکن تووشی ئاژاوە بوون، لەناو ئاژاوەدا کوێر و کەڕ بوون[6].
کەواتە بە خاوەن باوەڕانی دەزانی، نەکو بێباوەڕ و دووڕوو[7]. ئامۆژگاری موسڵمانانیشی کردووە سەبارەت بە شێوازی مامەڵەکردنیان و وتویەتی: "ئەگەر ناکۆکیان کرد لەگەڵ پێشەوایەکی زۆردار شەڕیان لەگەڵ مەکەن، چونکە قسەیان هەیە لەو حاڵەتەدا"،[8]یەکێك لەو شتانەی ڕۆشنایی دەخاتە

١) ابن أبي شيبة: المصنف ١٥: ٣١١، وخليفة: التأريخ ١٩٧ بسند صحيح، النسائي: خصائص على ١٩٠ بسند صحيح، ويعقوب بن سفيان: المعرفة والتاريخ ٣: ٣١٥.
٢) عبدالحميد علي ناصر: خلافة علي ٣٢٩.
٣) ابن ابى عاصم: السنة ٢: ٤٤٢ـ ٤٤٣ باسناد صحيح، وابن ابي شيبة: المصنف ١٥: ٣٢٥ـ ٣٢٧، والطبرى: التأريخ ٥: ٩١ـ ٩٢، والطحاوي: تهذيب الآثار ٤: ٢٣٦ـ ٢٣٨.
٤) البيهقي: السنن ٨: ١٨٢ بسند صحيح.
٥) عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٢٢ـ ١٢٣، وابن ابى شيبه: المصنف ١٥: ٣٣٢، وسعيد بن منصور: السنن ٢: ٣٣٩، والبيهقى: السنن الكبرى ٨: ١٨٣.
٦) عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٥٠، وابن ابى شيبه: المصنف ١٥: ٣٣٢ بسند صحيح، والبيهقى: التى الكبرى ٨: ١٧٤.
٧) ابن تيمبه: منهاج السنه ٥: ٢٤٣ـ ٢٤٤.
٨) ابن ابى شيبه: المصنف ١٥: ٣٢٠، وابن حجر: فتح البارى ١٤: ٣٠١.

سەر چۆنێتی خەواریج و ئاستی توانایان لە مشتومڕ و لەبەرکردنی قورئان و بەڵگە دەرکردنی لە قورئان، ئەوەیە کاتێك ئیبنو عەبباس گەڕایەوە بەصرە پاش هەرەسهێنانی ناوبژیکردن، خەواریجەکان مشتومڕیان لەگەڵ کرد بە توندی و تۆمەتباریشیان کرد بە بێباوەڕی "کوفرت کرد و هاوبەشت بۆ خوا بڕیاردا"، ئەویش پێی وتن: "بزانن کێ زاناتر و بەتواناترە لە دەرخستنی بەڵگەکانتان با قسە بکات"، ئەوانیش عەببادی تەغلیبیان هەڵبژارد، هەڵساو وتی: "خوای گەورە ئەمەی فەرمووە و ئەوەی فەرمووە، دەتوت ئەوەی پێویستە لە بەڵگەکانی قورئان لە یەك سوورەت دەری دەکرد"، توانای ئەو پیاوە دەرکەوت لە باسکردنی بەڵگە جیاجیاکاندا لە نێو سوورەتەکانی قورئان، وەکو چۆن لەیەك جێگادا بن، ئیبنو عەباسیش شایەتیدا بۆی: "من دەتبینم قورئانت چاك لەبەرەو زانای بەو شتانەی شیدەکەیتەوە و بە یەکی دەگەیەنیت"، ئەمجا ئیبنو عەباس هەڵەکانی خەواریجی خستە ڕوو، وتی: "ئایا ئاگادارن کە خەڵکی شام قورئانەکانیان بەرز کردەوە و داوای ناوبژیان کرد، ئێمەش بەوە ناڕەحەت و ناڕازی بووین، ئێوەیش کاتێك برینەکانتان زۆر بوو و ئاوی فوراتتان لێ قەدەغە کرا داوای هەمان شتتان کرد!؟ موعاویە پێی وتم ئەسپێکیان بۆی هێنا بۆ ئەوەی لەسەری هەبێت، دوای ئەوە یەکێك لە ئێوە چووە لای و وتی: من خەڵکی عێراقم بەشێوەیەك بەجێهێشتووە، بەیەکدا دەچوون وەکو چۆن حاجیان لە مەککەوە دەچنە مینا"، بەم شێوەیش ئاماژەی کرد کە جیاوازی و دووبەرەکیان هەڵوێستی عەلیان لاواز کردووە، بوو بە هۆکارێکیش بۆ ڕازی بوون بە مەسەلەی ناوبژیکردن... ئەمجا ئیبنو عەباس قسەکانیانی پوچەڵ کردەوە.[1] بێگومان شەڕی نەهرەوان برینگەلێکی قوڵی بەجێهێشت لە کووفەی سەر بە عەلی و بەصرەی لایەنگیری عوسمان پێکەوە، چونکە زۆربەی خەواریجەکان سەر بە هۆزەکانی ئەم دوو شارە بوون، هەندێکیش ناڕەزایان دەربڕی لەسەر کوژرانی ئەوانەی لەو شەڕە تیاچوون، هەندێ وردە شەڕیش ڕوویدا لە نێوانیاندا.[2]

لاوازیی و ناڕەحەتی تەنها تایبەت نەبوو بە کەسوکاری خەواریجەکانەوە، بەڵکو لەوان تێپەڕی بۆ زۆربەی سوپاکەیش کە هێشتا یادگاریە تاڵەکانی صەفین لە زەینیان مابوو، ئینجا شەڕی موعاویەی نەهرەوانیش ئەو برینانەی جارێکی تر کولانەوە، بۆیە عەلی توانای شەڕی موعاویەی تیاندا نەبینی

١) ابن ابی شیبە: المصنف ١٥: ٢٩٩ ـ ٣٠١ باسناد حسن.

٢) ابن ابی شیبە: المصنف ١٥: ٣٣١، وابن عساکر: تأریخ دمشق ٩: ق ١٦٧.

جارێکی تر، ئەمە لەکاتێکدا کە موعاویە سوودی وەرگرت لەم بارودۆخانەی دەوری عەلی دابوو، توانیشی دەسەڵاتی درێژ کاتەوە بۆ میسر، بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص و بە هاوکاری لەگەڵ لایەنگیرانی عوسمان لەوێ، ئەوەیش بێگومان هێزێکی چاکی پێبەخشی لە ڕووی مرۆڤەکان و ئابووریەوە، هاوکات نامەشی دەنارد بۆ سەرانی عێراق لە هەوڵێکدا بۆ راکێشانیان بۆ لای خۆی.

لە بەرانبەر لاوازی و دووبەرەکی و لاساری لە سوپای عەلیدا، عەلی توانای نەبوو هیچ هەڵمەتێك رێك بخات لە دژی هێزەکانی شام، دوا وتارەکانیشی ئاماژە دەکات بێزاری و ئازارێکی زۆر کاتێك دەڵێت: "خوایە گیان، من لیان بێزار بووم و ئەوانیش لە من بێزار بوون، خوایە قوتارم بکە لە ئەوان و ئەوانیش قوتار بکە لە من، ئایا چی رێگە دەگرێت لە بەدبەختێکیان ئەم ریشەم نگرۆ بکات لە خوێندا"،[1] ئەمەیش ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی کەسێك هەیە هەوڵی کوشتنی دەدات، یەکەم جاریش هەڵسا بە راگەیاندنی ئەو شتەی کە بیستبووی دەربارەی عەبدوولڕەحمانی کوڕی مولجیم بۆ کوشتنی،[2] پێشتریش ئاگادار کرابوویەوە کە پیلانێك هەیە بۆ کوشتنی "پیاوێك لە خێڵی موراد هاتە لای عەلی ـ لە کاتێکدا لە مزگەوت نوێژی دەکرد ـ پێی وت: وریابە، خەڵکێك لە خێڵی موراد بە تەمان بتکوژن"[3].

ئەوکاتەی ئیبنو مەلجیمی موڕادی لیدا لە نوێژی بەیانیدا، لە بیست و یەکی ڕەمەزان[4]، پێش گیان سپاردنی، عەلی راسپاردەی کرد لەگەڵ بکوژەکەیدا چاك بن: "ئەو دیلە، بۆیە لە شوێن و ڕێ چاك دایبنێن و چاکەی لەگەڵ بکەن، ئەگەر ژیام یان دەیکوژم یان لێی خۆش دەبم، ئەگەریش مردم، وەکو چۆن منی کوشت ئاوها بیکوژن، دەستدرێژیش مەکەنە سەری، خوای گەورە حەز لەوانە ناکات دەستدرێژیی دەکەن".[5]

دوای ئەوەی خەواریجەکان لە ناکاو عەلیشیان کوشت، حەسەنی کوڕی وازی لە خیلافەت هێنا بۆ موعاویە، بۆ ئەوەی کۆتایی بهێنێت بۆ قۆناغێك لە ململانێ و موسڵمانانیش جارێکی تر کۆ

---

١) عبد الرزاق: المصنف ١٠: ١٥٤ باسناد صحيح وله متابعات عند ابن عباس: الطبقات الكبرى ٣: ٢٣٤، وشواهد عند ابن ابى عاصم: الآحاد والمثاني ١: ١٣٧ باسناد حسن.

٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣٣.

٣) المصدر السابق ٣: ٣٤ باسناد صحيح.

٤) البخاري: التأريخ الصغير ١: ٩٩ ـ ١٠٠ باسناد فيه حريث بن مخش انفرد ابن حبان بتوثيقه.

٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى ٣: ٣٥، واحمد: فضائل الصحابة ٢: ٥٦٠، والحاكم: المستدرك ٣: ١٤٤ ويقوي بطرقه الى الحسن لغيره.

ببنەوە، پاش تێپەڕبوونیان بە هەندێ تاقیکردنەوەی ناخۆشدا، کە شوێنەواری قوڵی بەجێهێشت لە یادەوەری بە کۆمەڵدا، بۆ نەوەکانی دوای ئەو سەردەمە و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆی موسڵمانانیش.



## دانـــــــەر

- لەدایکبووی شاری موصڵ لە باکوری عێراق ساڵی ١٩٤٢ز.

- دەرچووی کۆلێژی پەروەردەیە لە ساڵی ١٣٨٤ك (١٩٦٣ز).

- بڕوانامەی ماستەری بەدەستهێناوە لە مێژووی ئیسلامی لە کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٣٨٦ك (١٩٦٦ز) ناونیشانی ماستەرنامەکەشی (بحوث في تأريخ السنة المشرفة) لەگەڵ لێکۆڵینەوەی (طبقات خليفة بن خياط).

- بڕوانامەی دکتۆرای بە دەستهێناوە لە مێژووی ئیسلامی لە زانکۆی (عين الشمس) لە قاهیرە لە ساڵی ١٣٩٤ك (١٩٧٤ز) لەسەر بابەتی (موارد الخطيب البغدادي في تأريخ بغداد).

- دەستی کردووە بە وانە وتنەوە لە کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٣٨٦ك (١٩٦٦ز) تاکو ساڵی ١٣٩٦ك (١٩٧٦ز) دواتر خزمەتەکانی گواستەوە بۆ زانکۆی ئیسلامی لە شاری مەدینە.

- لە نێوان ساڵەکانی ١٣٩٧ـ ١٤٠٣ك سەرۆکی بەشی خوێندنی باڵا بووە لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی منەوەرە.

- سەرۆکی ئەنجومەنی زانیاری بووە لە زانکۆی ئیسلامی لە نێوان ساڵەکانی ١٣٩٨ـ ١٤٠٣ك.

- مامۆستای مێژووی ئیسلامی بووە لە بەشی خوێندنی باڵا لە زانکۆی ئیسلامی لەوێش سەرپەرشتی دەیان نامەی ماستەر و دکتۆرای کردووە، دواتر مامۆستایی کردووە لە بەشی مێژوو لە کۆلێژی (الدعوة واصول الدين) تاکو ٢/٨/١٤١٥ك.

- ئێستا کار دەکات لە بەشی کاروباری زانستی لە کۆڕی شافەهەد بۆ چاپکردنی قورئانی پیرۆز لە شاری مەدینە، هەروەها ئەندامە لە ئەنجومەنی مەڵبەندی خزمەتکردنی سووننەت و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای دامەزراندنیەوە، ئەندامیشە لە ئەنجومەنی زانستی لە کۆڕی شافەهد بۆ چاپکردنی قورئانی پیرۆز لە مەدینە.

- سەرپەشتی دەیان ماستەرنامە و دکتۆرای کردووە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا لە زانکۆ عەرەبییەکان، بە تایبەتی لە زانکۆکانی عەرەبستانی سعودی، هەروەها هەڵساوە بەتاوتوێکردنی ژمارەیەکی زۆر لەو نامانە لە بواری فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، مێژووی ئیسلامی و پەروەردەی ئیسلامی.

**دانراوەکانی:**

١ـ السيرة النبوية الصحيحة، محاولة لتطبيق قواعد المحدثين في نقد روايات السيرة، مجلدان، ط٢، مكتبة العلوم والحكم ـ المدينة المنورة ـ ١٤١٤ك، زۆربەی وەرگێڕدراوە و بڵاویش کراوەتەوە بە هەر دوو زمانی تورکی ١٩٨٨ـ Istanbul و ئینگلیزی Maryland ـ1991 ـ V.S.A.

٢ـ بحوث فی تأريخ السنة المشرفة، پێنج جار چاپ کراوە لە بەغدا و بەیروت و مەدینە لە ساڵەکانی ١٩٦٧، ١٩٧٢، ١٩٧٥، ١٩٨٤، چاپی یەکەم و دووەمی بە یارمەتی زانکۆی بەغدا کراوە، دوا چاپیشی بە شێوەیەکی نوێ کراوە لە (٥٠٠) لاپەڕەدا.

٣ـ موارد الخطيب في تأريخ بغداد، لە دیمەشق چاپ کراوە لە ساڵی ١٩٧٥، لە بەیرووت لە ساڵی ١٩٨٤، چاپی یەکەمیشی بە یارمەتی زانکۆی بەغدا ئەنجام دراوە.

٤ـ دراسات تأريخيه، لە بڵاوکراوەی ئەنجومەنی زانستی زانکۆی ئیسلامیە لە مەدینەی منەوەرەـ ١٩٨٣ز.

٥ـ التراث والمعاصرة، دوو جار چاپ کراوە، بڵاوکردنەوەی کاروباری ئاینی، قەتەر ١٤٠٥ك هەروەها بە زمانی تورکی چاپ کراوە لە Istanbul لە ساڵی ١٩٩١.

٦ـ الإسلام والوعي الحضاري، بيروت ـ ١٤٠٨ك.

٧ـ تراث الترمذي العلمي. بڵاوکراوەی کتێبخانەی (الدار) لە مەدینە ١٤١٥ك.

٩ـ مناهج البحث وتحقيق التراث، بڵاوکراوەی (مؤسسة الرسالة) بەیروت ١٤١٥ك، (٣٦٠) لاپەڕەیە، گەشەپێدانێکیشە بۆ کتێبی "تعليقة فی مناهج البحث وتحقيق المخطوطات"، کتێبخانەی (الدار) لە مەدینە ١٤١٤ك.

١٠ـ قيم المجتمع الإسلامی من منظور تأريخی، بڵاوکراوەتەوە لە دوو بەرگدا، لەنێو زنجیرەی (كتاب الأمة) قەتەر ١٤١٤ك.

١١ـ التربية الروحية والإجتماعية والإسلام، بڵاوکراوەتەوە لە لایەن (مركز خدمة السنة) لە زانکۆی قەتەر.

١٢ـ عصر الخلافة الراشدة. محاولة لتطبيق قواعد النقد عند المحدثين على الرواية التأريخية، بڵاوکراوەی (مكتبة العلوم والحكم)، مەدینە ـ ١٤١٤ ك.

ـ عصر السيرة النبوية. ضمن مرجع فى تأريخ العرب. له ئامادەکردنی (المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم) کۆمەڵەی دەوڵەتە عەرەبییەکان، هێشتا بەچاپ نەگەیشتووە (٤٠٠ لاپەڕەیە).

١٣ـ من فقه السيرة النبوية العطرة، بڵاوکراوەی (النادی الأدبي) له مەککە (لەژێر چاپدایە).

١٤ـ الحياة الاجتماعية والاقتصادية في عصر السيرة النبوية (لەژێر چاپدایە).

لێکۆڵینەوەکان:

١٥ـ تأريخ خليفة بن خياط، سێ جار چاپ کراوە، عێراق ١٩٦٧ز، بە یارمەتی کۆڕی زانیاری عێراقی، دیمەشق ـ ١٩٧٧ز، ریاض ـ ١٩٨٤ز.

١٦ـ طبقات خليفة بن خياط ـ دوو جار چاپ کراوە، یەکەم جار لە بەغدا ـ ١٩٦٧ز. بە یارمەتی زانکۆی بەغدا، دووەم جار لە ریاض ـ ١٩٨٣.

١٧ـ المعرفة والتأريخ، یەعقوبی کوڕی سوفیان (ت٢٧٧ك) سێ جار چاپ کراوە، بەغدا ـ ١٩٧٤ز، لەلایەن وەزارەتی ئەوقافی عێراقی، دووەم جار لە لایەن (مؤسسة الرسالة) بەیروت ـ ١٩٧٦ز. سێ یەم جار لە لایەن (مكتبة الدار) لە مەدینەی منەوەرە ـ ١٩٨٨ز.

١٨ـ أزواج النبـى، ئیبنو زەبباله، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری لە زانکۆی ئیسلامی ـ١٩٨٢.

١٩ـ بقي بن مخلد القرطبي مقدمة مسنده عدد ما لكل واحد من الصحابة من الحديث، بەیروت ـ ١٩٨٤.

٢٠ـ مسند خليفة بن خياط، بەیروت ـ ١٩٨٥.

٢١ـ تركة النبـي، حەممادی کوڕی ئیسماعیل، بەیروت ـ ١٩٨٣ز.

توێژینەوەکان:

٢٢ـ منهج المحدثين فى النقد مقارنا بالميثولودوجيا الغربية، گۆڤاری (السنة)، زانکۆی قەتەرـ ١٤١٢ك.

٢٣ـ الخطيب البغدادى: سيرته الذاتية، بيئتة الحضارية، انتاجة الفكري واهتماماته التربوية، ضمن كتاب (من أعلام التربية العربية الاسلامية) جلد٢، بڵاوکراوەی (مكتب التربية العربي لدول الخليج) ـ ١٤٠٩ك (١٩٨٨ز).

٢٤ـ موقعة عين جالوت، بڵاوکراوەی گۆڤاری الشرطة ١٩٦٨ز

٢٥ـ القراءة المجدولة واثرها.

٢٦ـ الإستشراق، بڵاوکراوەی (مركز السنة والسيرة) زانکۆی قەتەر ١٤١٥ك.

**سەرچاوەکان:**

- قورئانی پیرۆز.
- إبن الأثير: أبو السعادات المبارك بن محمد الجزري (ت ٦٠٦ هـ).
- النهاية في غريب الحديث، تحقيق طاهر أحمد الزاوي ومحمود محمد الطناحي، نشر دار الفكر، بيروت.
- إبن الأثير: أبو الحسن علي بن محمد بن محمد بن عبدالكريم الشيباني (ت ٦٣٠ هـ).
- الكامل في التاريخ، دار صادر، بيروت ١٤٠٢ هـ (١٩٨٢ م).
- أسد الغابة في معرفة الصحابة، نشر دار إحياء التراث العربي، بيروت.
- أحمد بن حنبل (ت ٢٤١هـ).
- المسند، ط. بيروت (بالأوفسيت) عن الطبعة اليمنية، مصر ـ ١٣١٣هـ. وكذلك ط. أحمد محمد شاكر في القسم الذي حققه.
- والمسند، وبهامشه كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، ط. المكتب الاسلامي.
- فضائل الصحابة، تحقيق وصي الله بن محمد عباس، ط ١، مركز البحث العلمي بجامعة أم القرى ـ ١٤٠٣ هـ . وطبعة بدار العلم للطباعة والنشر، المملكة العربية السعودية.
- الزهد، دار الريان للتراث، ط١، القاهرة ـ ١٤٠٨هـ.
- العلل ومعرفة الرجال، تحقيق طلعت قوج ييكيت، واسماعيل جراح أوغلي، أنقرة ـ ١٩٦٣م.
- مسائل الامام احمد، برواية اسحق بن ابراهيم بن هانئ.
* الأزدي: محمد بن عبدالله البصري (ق٢).
- فتوح الشام، بعناية عبدالمنعم عامر، مؤسسة سجل العرب، القاهرة ـ ١٩٧٠م.
* الأزرقي: أو الوليد محمد بن عبدالله.
- تأريخ مكة، تحقيق رشدي الصالح ملمس، ط٣، ط. دار الأندلس، بيروت. ١٣٨٩هـ.
* اسحق بن راهويه (ت ٢٣٨ هـ).
- المسند، ط١، تحقيق عبدالغفور البلوشي، مكتبة الإيمان، المدينة ـ ١٤١٠ هـ.
* ابن اسحق: محمد (ت ١٥١ هـ).
- السير والمغازي، تحقيق سهيل زكار، نشر دار الفكر ـ ١٣٩٨ هـ (١٩٧٨م).
- السيرة، تحقيق محمد حميدالله، نشر معهد الدراسات والأبحاث للتعريب ـ ١٣٩٦هـ (١٩٧٦م).

* إبن أعثم الكوفي: أبو محمد أحمد بن أعثم الأزدي (ت ٣١٤هـ).
ـ الفتوح، نشر دار الفكر العلمية، بيروت ـ ١٤٠٦ هـ.
* ابن الأعرابي: أحمد بن محمد بن زياد بن بشر الأعرابي (ت ٣٤٠ هـ).
ـ المعجم (مخطوط)، وقد حقق أحمد ميرين قطعة منه نال بها درجة الدكتوراه من الجامعة الاسلامية بالمدينة المنورة.
* البخاري: أبو عبدالله محمد بن إسماعيل (ت ٢٥٦ هـ).
ـ الصحيح الجامع المسند من أقوال وأفعال الرسول ﷺ، حاشية السندي، ط. دار أحياء الكتب العربية، مصر.
ـ والصحيح (نسخة فتح الباري)، ونشر المكتبة السلفية بالقاهرة، وأحياناً ط. محمد علي صبيح، مصر (بدون تأريخ).
ـ التأريخ الكبير: تحقيق المعلمي اليماني، نشر حيدر آبادي الدكن، الهند، وأحياناً ط. دار الكتب العلمية، بيروت.
ـ التأريخ الصغير، تحقيق محمد إبراهيم زايد، ط. دار المعرفة، بيروت ١٤٠٦ هـ.
ـ الأدب المفرد، تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي، ط. دار الكتب العلمية، بيروت و ط٣ ، ط. دار البشائر الاسلامية ـ ١٤٠٩ هـ.
ـ خلق أفعال العباد، تحقيق عبدالرحمن عميرة، ط٢، نشر دار عكاظ، جدة.
* إبن بدران: عبدالقادر (ت١٣٤٦ هـ).
ـ تهذيب تأريخ دمشق الكبير لابن عساكر، نشر دار المسيرة، بيروت، ١٣٩٩ هـ (١٩٧٩م).
* البزار: أحمد بن عمرو (ت ٢٩٢ هـ).
ـ المسند، وهو البحر الزخار، تحقيق محفوظ الرحمن الأعظمي، ط١، مؤسسة علوم القرآن، ١٤٠٩ هـ (١٩٨٩ م).
* بقي بن مخلد:
ـ عدد ما لكل واحد من الصحابة من الحديث، تحقيق أكرم العمري، بيروت ـ ١٤٠٥ هـ.
* البكري (ت ٤٨٧ هـ)
ـ معجم ما استعجم، تحقيق مصطفى السقا، نشر عالم الكتب، بيروت (بدون تأريخ).

* البلاذري: أحمد بن يحيى بن جابر (ت٢٧٩ هـ).

ـ أنساب الأشراف، القسم الثاني، جزء ١و ٢ تحقيق محمد باقر المحمودي، بيروت ـ ١٩٧٤م و ١٩٧٧م.

والقسم الرابع، ج١، تحقيق إحسان عباس، بيروت ـ ١٩٧٩ م.

والقسم الرابع، ج٢، تحقيق محمد شلوسنغار، القدس ـ ١٩٣٨م.

والقسم الخامس، تحقيق س. غويتاين، القدس ـ ١٩٣٦ م.

والجزء الأول، ط١، مطبعة دار المعارف، مصر ـ ١٩٥٩ م.

وقسم الشيخين أبوبكر الصديق وعمر بن الخطاب وولدهما، تحقيق إحسان صدقي العمد، مؤسسة الشراع الغربي، الكويت ـ ١٩٨٩ م.

ـ فتوح البلدان، ط. القاهرة ـ ١٩٣٢ م. وأحياناً نشر مكتبة النهضة العربية (بدون تأريخ) وأحياناً ط. دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان ـ ١٤٠٣ هـ.

* البوصيري: الحافظ أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل بن عمر الكناني (ت٨٤٠هـ).

ـ إتحاف الخيرة المهرة بزوائد المسانيد العشرة، مخطوطة مصورة بمكتبة الجامعة الاسلامية بالمدينة المنورة.

* البيهقي: أبوبكر أحمد بن الحسين بن علي (ت ٤٥٨هـ).

ـ السنن الكبرى، ١٠ مجلدات، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدرآباد الدكن، الهند ـ ١٣٤٤ هـ.

ـ و السنن الكبرى، بذيلة الجوهر النقي، دار المعرفة، بيروت.

ـ دلائل النبوة ومعرفة أحوال صاحب الشريعة، تحقيق عبد المعطي قلعجي، دار الكتب العلمية، بيروت، ودار الريان للتراث، ط١، القاهرة ـ ١٤٠٨ هـ.

* الترمذي: محمد بن عيسى بن سورة (ت ٢٧٩ هـ).

ـ السنن، تحقيق أحمد شاكر وآخرين، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، مصر ـ ١٣٩٨ هـ، وأحياناً نسخة تحفة الأحوذي للمبار كفوري، تحقيق عبدالوهاب عبداللطيف، ط٢، المكتبة السلفية، المدينة المنورة ـ ١٣٦٨ هـ (١٩٦٣م).

ـ السنن (تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي)، نشر المكتبة السلفية، ط٢، المدينة المنورة ـ ١٣٦٨هـ (١٩٦٣م).

ـ الجامع الصحيح، تحقيق أحمد محمد شاكر ومحمد فؤاد عبدالباقي وإبراهيم عطوة عوض، القاهرة ـ ١٩٦٢م (١٣٨١هـ) و ط٣، دار الفكر ـ ١٣٩٨ هـ.

ـ مختصر الشمائل المحمدية، المكتبة الاسلامية، عمان ـ ١٤٠٥ هـ.

* إبن تيمية الحراني: أحمد بن عبدالحليم (ت ٧٢٨ هـ).

ـ منهاج السنة النبوية، تحقيق محمد رشاد سالم، نشر جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية، الرياض ـ ١٤٠٦ هـ.

ـ الفتاوى، جمع وترتيب عبدالرحمن بن محمد النجدي وابنه، نشر دار الإفتاء، الرياض.

ـ السياسة الشرعية في إصلاح الرعية، تحقيق أبو عبدالله علي بن محمد المغربي، دار الأرقم، الكويت ـ ١٤٠٦ هـ.

* الجاحظ: أبو عمرو عثمان بن بحر (ت ٢٥٥هـ)

ـ كتاب الحيوان، تحقيق عبدالسلام هارون، مصر ـ ١٣٦٤هـ.

* إبن جارود: أبو محمد عبدالله (ت ٣٠٧هـ).

ـ المنتقى من السنن المسندة عن رسول الله ﷺ، علق عليه عبدالله عمر البارودي، ط١، دار الجنات ومؤسسة الكتب الثقافية ـ ١٤٠٨ هـ.

* إبن الجزري: شمس الدين أبو الخير محمد بن محمد (ت ٨٣٣ هـ).

ـ غاية النهاية في طبقات القراء، بعناية برجستراسر، مطبعة السعادة، مصر ـ ١٣٥١ـ ١٣٦٤ هـ (١٩٣٨ ـ ١٩٤٥ م).

* الجهشياري: أبو عبد الله محمد بن أسيد بن عبدالله (ت ٣٣١ هـ).

ـ الوزراء والكتاب، تحقيق مصطفى السقا وابراهيم الأبياري وعبدالحفيظ شلبي، مصر ـ ١٩٣٨ م، و ط٢، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، مصر ـ ١٤٠١ هـ (١٩٨١ م).

* إبن الجوزي (ت ٥٩٧ هـ):

ـ نواسخ القرآن، تحقيق محمد أشرف علي المليباري، نشر المجلس العلمي بالجامعة الاسلامية بالمدينة المنورة ـ ١٤٠٤ هـ.

